ناوچەیە یا لەوڵاتەدا دەژیەن لا دەچێت . پێویستە خوشکی موسڵمان هەول بدات و تێبکۆشێت ئەو چوار زانستانە بەدەست بێنێت وفێریان ببێت ولە خۆیاندا بێنێتە دی. چونکە ئەم زانست وزانیاریانە دەقێکی زۆری لەقورئانی پیرۆزو لەسوننەتی پێغەمبەردا ﷺ لەسەر هاتون‌و ئاماژەی ڕاستەخۆیان پێ دەکەن‌وپلەو پایەکانی زانست ڕون دەکەنەوەو باسی بەرزی‌و بڵندی پلەکانی زانست‌و زانایان وزانیاران لەلای خواو بەرزی جێگاکانیان دەکەن جیاوازی پلەو پایەی ئەو کەسانە لەهەمبەر کەسانی تری نازانیارونازانا ڕادەگەیەنن، چونکە ئەوان شوێن هەڵگرو میراتگری پێغەمبەرن ﷺ.

إبن عبدالبر الأندلسي ڕەحمەتی خوای لێ بێت گوتویەتی: ( زانایان کۆ ڕان لەسەر ئەوەی کەزانست وزانیاری ئەوەی کەفەرزی خودیە(متعین) لەسەر هەموکەسێك پیاوو ژن ئەوە تایبەتە بەخودی خۆیەوەو هەردەبێ ئەنجامی بدەن، وەزانست وزانیایرش هەیە فەرزی بەسیەتیە(کفایة)  ئەوەیە کۆمەڵێك پێ ی هەستن لەسەر ئەوانی تر لادەچێت، تا ئەو کاتەی کەئەوفەرزە دەبێ هەموموسڵمانێك پێوەی پابەند بێت‌ومرۆڤ ناتوانێت لێ ی لابدات‌و پشت گوێ ی بخات دەبێ هەر فێری ببێت کەبریتیەلەتێکڕای  فەرزەکانی کەلەسەری فەرز کراون).

یەکێ لەڕێز لێنان وبەهەند زانینی خوشکانی موسڵمان لەئیسلامدا ئەوەیە کەفێر بونی زانست وزانیاری فێربون وتێکۆشان لەپێناوی دا وپێ بەخشینی پلەو پایەی زانست وزانیاری بەئافرەت داوە هەرچۆن داویەتی بەپیاو واتە بەیەکسانی وبێ جیاوازو تەنیا پیاوانی لەم بوارەدا تایبەتمەند نەکردون وئافرەتیشی پشت گوێ خستبێ. کۆی هەمو ئایەت وفەرمودەکان بەڵگەن لەسەر پلەو پایەی زانست وزانیاری وخۆ بەزانست کردن بۆ پیاو وژن وەکو یەك وبێ جیاوازی، وەك خوای گەورە وبالا دەست وکاربەجێ دەفەرموێ:﴿ يَرۡفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمۡ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ دَرَجَٰتٖۚ ﴾ المجادلة: ١١. (واتا: خوای گەورە پلەو پایەی ئەو کەسانەی بەرز کردۆتەوە کەبڕوایا بەتەواوی هێناوەو هەوڵی زانست وزانیاریان داوەو خوێندەوارو هۆشیارو زاناو دانان وبەرچاو ڕۆشنن بەجۆرێك

دوژمنان ناتوانن لەخشتەیان بەرن.(وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێ:﴿ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُولُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾ الزمر:٩. (واتا: ئەی محمد ﷺ بەموسڵمانان وبەخەڵکی گشتی بڵێ ك ئایا هەرگیز شتی وا هەبوە دەبێ کە ئەوانەی خوێندەوارو زاناو زانیارن‌و بەرچاو ڕۆشن‌و فامیدەن یەکسان بن لەگەڵ ئەو کەسانەی کەنەخوێندەوارونەزان نەفامن، دیارە هەرگیز شتی وانیەو نابێ کەواتە باهەمیشە هەوڵی لێبڕاوانە بدەن بۆ خۆزانست و زانیار کردن وهەرگیز سارد نەبنەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە ئەمانەتی گیانیان لێ وەردەگرێتەوە. لەجوانیەوە تا پیری و چەمانەوە لەتەمەندا.(وەرگێڕ).وەفەرمودەی خوای گەورە:﴿ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ ﴾ طه:١١٤. (واتا: ئەی محمدﷺ هەمیشە لەبەر پەروەردگاری خۆت بپاڕێوەو بڵێ: ئەی پەروەردگارا یارمەتیم بدەو مێشکم فراوان بکەو زانست وزانیاریم پێ ببەخشەوزانیارو داناو زانام بکە گەنجینەی تۆ گەلێك زۆرە ئەی خوار پەروەردگاری من.(وەرگێڕ). هەروەها فەرمودەی پێغەمبەرﷺ کەفەرمویەتی: {من سلك طريقاً يبتغي فيه علماً سلك الله به طريقاً إلى الجنة، وإن الملائكة لتضع أجنحتها رضاءً لطالب العلم ، وإن العالم ليستغفر له من في السماوات ومن في الأرض حتى الحيتان في الماء، وفضل العالم على العابد كفضل القمر على سائر الكواكب، إنَّ العُلماء ورثة الأنبياء، إنَّ الأنبياء لم يورثوا ديناراً ولا درهماً إنَّما ورثوا العلم، فمن أخذ به أخذ بحظ وافر}[1]. (واتا: هەر کەسێك ڕێگەیەك بگرێتە بەر لەپێناو بەدەست هێنانی زانست و زانیاری دا، وێڕای ئەوە کەلەدنیادا ئەو ڕێگەیە یان بۆ ئاسان‌و گەلاڵە دەکات، لەقیامەتیشدا ڕێگای بەهەشتی بۆ خۆش دەکات، وەفریشتەکانیش باڵیان بۆ ڕادەخەن لەبەر دەم ئەو فێرخوازو زانستخواز یەدا، ئەوەی کەلە ئاسمانەکان وئەوەشی

(١ ) رواه أبوداود برقم (٣٦٨٢) فى العلم، باب فى فضل العلم، والترمذى برقم(٢٢٣) فى العلم، باب ماجاء فى فضل الفقه على العبادة، وإبن ماجة برقم (٢٢٣) فى مقدمة، باب فضل العلماء والحث على طلب العلم.

وان لەزەوی دا داوای لێ خۆش بونی بۆ دەکەن لەلای خوای گەورە هەتاکو ماسی وحوت وزیندەوەرەکانی ناو ئاویش، پلەو پایەی زانا بەسەر خواپەرستێکی نەزاندا وەك پلەو پایەی مانگ وایە بەسەر هەمو هەسارەکانی (الكواكب) تردا، زانایان میراتگری پێغەمبەرن ﷺ، چونکە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) نەدینارو نەدرهەم لەدوا خۆیان بەجێ ناهێڵن، بەڵکو زانست وزانیاری لەدوای خۆیان بەجێ دەهێڵن، جاهەرکەسێك دەست بەو زانست وزانیاریەوە بگرێت ئەوە دەستی بەبەشێکی زۆرلەو زانستەوە گرتوەو بەشێکی زۆری لەو زانست وزانیاریە بەرکەوتوە.(وەرگێڕ).

ئەمەو گەلێ دەقی تر لەسەر زانست وزانیاری هەن لەقورئانو لەسوننەت کەبەڵگەی حاشا هەڵ نەگرن لەوەی کە گشتگیرو تایبەتن بۆ پیـاوو بـۆ ژن وەکـو یـەك بـێ جیـاوازی. ئائەمەتە ژنانی بـەرەی یەکـەمی ئـسلام نمونـەی زینـدوو بەرچـاون لـەم بـوارەداو ئەمـەش عائشة دایکی بڕواداران (رضى الله عنها) کەجوانترین نمونەی خوازیارانی زانستو زانیاریـەو پێـشبڕکێ ی لێبڕاوانـە دەکـات لـەم بـوارەدا، هـەتا بەشـێوەیەکی وا لـە زۆربـەی زۆری سەحابەکانﷺ شارەزاترو بەتوانا ترو زاناتر بو لەڕیوایەت کردنی فەرمودەکانی پێغەمبـەر ﷺو سەرچاوەیەکی گەورەو قوڵ بون بۆ سەحابەکانو بۆ باقی بڕواداران لەزۆربـەی زۆری کێشەو تەنگژە شەرعیەکانو هەندێ لەحوکمەکانی شەریعەتدا هەتا دنیا دنیایـەو لەگـەلێك لەسـەحابەکان زانـاترو زیـرەك تـرو شـارەزاتر بـو. ئەمـەو گـەلێکی تـر لـەژنانی بـڕواداران کەڕۆڵێکی فراوانیان هەبوە لەزانستو زانستخوازی دا[1].

مامۆستای دکتۆر عبدالرحمن الزنيدي ئەرکو بەرپرسیاریەتی زانـستیو ڕۆشـنبیری ئافرەتـانی موسـڵمانی لەناميلکەيـەك دا بەناونیـشانی (مـسؤولية المـرأة الثقافيـة) ڕون کردۆتەوە کەتیایدا وێنەکانی بەرەنگاریو بەگژداچونەوە کەڕو بەڕوی خوشکانی موسـڵمان دەبنەوە لەم چەرخەدا خستۆتە ڕو و زۆر بەجوانی باسیان لێوە دەکات کەدەکرێ ئێمـەش لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا ڕیز بەندیان بکەین:

---

( ١) تەماشای ( أسئلة النساء الرسول اللهﷺ) بکە کەلەئامادە کردنی نوسەری ئەم کتێبەیە کە کۆمەڵە پرسیارێکی زۆری دەربارەی ژنان لەخۆ گرتوە.

* وێنــەی یەکــەم: نــاڕونی (عــدم الوضــوح) ولێڵــی تێــڕوانینو وێنــا کرنــی ئیــسلامی: بەدەربڕینێکی تر ئەو هەمو نوچ دادانو تاریك بونو خڵتو خــاشو زەلو زورەی کەبــەڕوی بیرو باوەڕ(عقیــدة)ی ئیــسلامیماندا دراوەو دای پۆشــیوەو ڕاڕەوی ڕاســتەقینەی عەقیــدەی ئیسلامی شێواندوەو لەتێڕوانینو گرێ بەستیو پەیمانی تەنیا یەکخوا پەرستی خوداوەندی جیهانیــان (الله جــل جلالــه) و لــەژیانی ڕاســتەقینەو لەئامانجــەکانی پێــك هێنــانی بونــەوەر لادراوەو بــەبیرو بــاوەڕێکی ســادەو ســاکارانەو ســەقەتانە خــوای بــاڵا دەســتو کاربــەجێ دەپەرسترێ(١).

---

( ١) واتــە: بەســەدانو بگــرە بەهــەزارەها کــاری بیــدعی کەوتۆتــە نــاو پەرســتشو عەقیــدەی پــاکی ئیسلامیمانەوە وەك کەس پەرستی وگۆڕ پەرستی وهانا بردن بۆ غەیری خوای گەورەو سوێند خــواردن بەغەیری خوای گەورەو سەربڕین بۆ غەیری خوای گەورەو ...تد.لەیەکێ لەڕۆژەکانی ئەم ساڵانی ڕابردو کۆمەڵــە کەســێك چــوین بــۆ ســەردانی نەخۆشــێك خــوا عــەفوی بکــات ئێــستا نــەماوە، کەچــوین مامۆســتایەکیش لــەوێ بــو کــەئیمام وتــار بێژیــشە لەچــوارقوڕنە. قــسە هــات وچــو باســی بــێ دینــی وخراپەکاری و لەدین دەرچون کرا. منیش ڕوم کردە مامۆستایەکەو گوتم: والله مامۆستا بەڕاستی ئێمــە کەوتوینەتە ناو دەریای خورافیات و بیدعە و بیدعەچیەتیەوەو عەقیدەو بیروباوەڕمان لەگرێژەنە چوەو جۆگای بیرو باوەڕو عەقیدەی ئیسلامیمان پڕ بۆتەوە لەخڵت وخــاش و زەلو زورو ئــاوی پێدا نــاڕوات وپێویستە جۆمــاڵ بکرێــت. ئــەوەش بــەکێ دەکرێــت ئــەرکی ســەرەکی ســەر شــانی کــێ یــە؟ یەکــەمین کەسانێك ئێوەی زانایان ومامۆستایانی ئا بینین کەئەم ئەرکە قورســەتان لەســەر شــانە ئێــوەش هــەروا بەسادەو ساکارانە گرتوتانە جاهیلەکانمان بەیەکجاری تێدا نغرۆ بون. یەکەمین بەرپرس ئێوەن، چونکە ئێوە لەشەریعەتەکە حاڵین وهەڵگری مەشخەڵی ئایینی پــیرۆزی ئیــسلامن و میراتگری پێغەمبــەرن ﷺ گەر بەڕاستی شوێن هەڵگرو شوێنکەوتەی قورئان وسوننەت بن.بۆنمونە سوێند خــواردن بەغــەیری خــوا کوفرە یاهاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوای گەورە. خەڵکی نەخوێندەوارو بگرە خوێندەوارەکانی پێــشداش ئەو زانیاریانەیان نەبوە چونکە سەرچاوە نەبون ئەگەر هەش بوبن بەزمانی عەرەبی بونو ئێمەی کورد تــێ ی نەگەیــشتوین. بۆیــە هــیچ لەدینەکــەو عەقیدەکــەمان نەگەیــشتوین کەســوێندمان بەغــەیری خــوا خــواردوە یــا هــاوارو هانامــان بــەر غــەیری خــوا بــردوە. بــەڵام ئێــوەی مامۆســتا بۆ؟لەگــەڵ ڕێــزم بــۆ مامۆستایان ناڵێم هەمو بەڵکو بەشێك ئەگەر یەکێك لەخەڵکەکە بیگوتایە بەسەرەکەی تۆ مامۆستا تۆ

* پلەو شوێن وجێگای ئافرەتی موسڵمان لەپەیوەندی کۆمەڵایەتی بەپیاو و دەربڕینی ئەو پەیوەندیە لەهەڵوێستی هەندێ لەپیاوانو هەڵوێستی خراپی نەرێیەتی(السلبی) بەرامبەر بە خێزانەکەی، ئەو پەیوەندیە نارێکە ئافرەتی موسڵمان بەسنور بەزاندنی دەزانێتو لەئاست مافەکانی خۆی دا، چونکە ئەم هەڵوێستە لەگەڵ پەیوەندیەکانی

---

نەك وەڵامت نەدەدایەوەو تێت نەدەگەیاند بەڵکو پێشی بەرزە پێ دەبویت!!! دەنگ نەکردنی مامۆستای ئایینیش لەبەر دەم خەڵکی عەوام واتای بەشەرعی گەیاندنی ئەو قسە یا ئەو ڕەفتارانە بوە.
وەڵامی مامۆستا بۆ قسەکانی من ئەوە بو: خۆ کاك أحمد ئەوان کەگوتویانە بەسەری تۆ مامۆستا مەبەستیان ئەوە نەبوە کەسەری من بکەنە شەریکی خوا!!! یەکسەر یەکێك لەو کەسانەی کەلەوێ دانیشتبون ئەویش هەر ناوی أحمد بو هاتە قسە کردن و گوتی: ئەرێ والله مامۆستا ئێمە مەبەستمان ئەوەیە کەسوێند بەسەری مامۆستا دەخۆین مەبەستمان ئەوە نیە سەری مامۆستا یان یەکێکی تر بێنینە ڕیزی خواوە، بەڵکو دەڵێین ئەگەر بەدرۆ سوێند بخۆین بابەسەر ی مامۆستا یایەکێکمان بیخۆین.
منیش گوتم: نامامۆستا گیان، تۆ هەرگیز قسەی وامەکە چونکە ئەو قسەی تۆ بۆ ئەوان دەبێتە شەرعیەتی دان بەو قسەو کردارانەی کەدەیکەن. بۆ قسەکەی کاك أحمدیش خوای گەورە زۆر ڕقی هەڵ دەستێت کەسوێند بەدروست کراوەکانی خۆی بخورێت جا بەدرۆ بێت یان بەڕاست. خۆ لەوانەیە ئەگەر بەدرۆش سوێند بەزاتی پاکی خوا بخۆیت پێ ی خۆش تر بێت لەوەی کەبەڕاستی بەغەیری خوا بخورێت. ئیدی ئەو فەرمودەو ئایەتانەم باس کرد کەلەم بوارەدا هاتون وقەدەغەی سوێند خواردن بەغەیری خوا دەکەن .گوتم مامۆستا وانیە؟ مامۆستاش دەی گوت : بەڵێ هەموی وایە.
بۆیە وام دەگوت، چونکە خەڵکەکە بەسەری ڕوتی من بڕوایان نەدەکرد، ئەگەر هەمو قسەکانیشم ڕاست بن، بەڵام بەمامۆستا بڕوا دەکەن چونکە مەندیلی لەسەرەو بەمەلا باوە لەناویاندا، بۆیە منیش شاهیدی مامۆستام لەڕاستی قسەکانم بۆ خەڵکەکە وەردەگرت. خوا هەڵ ناگرێ مامۆستاش لایەنگیری منی دەکرد وبەشداری شەرحی ئایەت وفەرمەدەکان وهێنانەوەیانی دەکردم. جا ئەمەنمونەیەك بو لەخەراری بیدعەو خورافیات وبێ شەرعیەکان لەبیروباوەڕوعەقیدەکەماندا کەخوا پەنامان بدات سەر دەکێشن بۆ کوفرو هاوبەشی پەیدا کردنی گەورە بۆ خوای پەروەردگارمان وئێمەش پێ ی زیانمەند دەبین.(وەگێڕ).

پیاو وژنو خێزان هاو تەریب نین‌و وێکڕا نایەنەوە لەکاتێکدا پەیوەندی ئافرەت لەگەڵ خێزان دا زۆر پتەو و بەهێزە بەڵام پیاو تێکی دەدات و هیچ هەستیشی پێ ناکات هۆشیارو وریا نیە لەبەرامبەری دا.

* وێنەی سێ یەم: بەلبەلەو هات وهاواری فیکری کەشەپۆلی ڕۆشبیری نامۆو ڕامالەر کەئەم چەرخە شەپۆلی پێداوەو پالەپەستۆیەکی لەئەندازە بەدەری خستۆتە سەر بیرو زیهنی ئافرەتی موسلمان و خستویەتیە دلەڕاوکێو لەسەر بنکەو ڕێسمەی خۆی لەقاندویەتی‌و مل ملانێو دژایەتیەکی نامۆ و قیزەون‌و بێزراو لەبیرو باوەڕو عەقیدەی ساغی خواپەرستی لای داوەو تاوای لێ کردوەکەلکی پێوە نەماوەو بەرگەی حەیاو حەشمەتی لێ داماڵیوەو فێری جۆرەها بەناو هونەرو سەما کردن‌و گۆرانی بێژتن‌و گەلێ شتی تر لەکارە سەرەتاییەکانی کەئەمڕۆ ئافرەت گرنگی پێ دەداتو لەچەمك و سەرەتاکانی ژیانی خۆی دەژمێرێتو هەولی بێ پایانی بۆ دەداتو خۆی بەقوربان دەکات ئاوا بەم جۆرە بەگژ هەمو بانگەشەکارانی دا کردوەو بەرەنگاری هەمو گەورەو سەرپەرشتیارانی خۆی دەبێتەوە.

* وێنەی چوارەم:ڕاگەیاندن: گومانی تێدا نیە کەئەمەش بەرەنگاریی‌و بەگژداچونەوەیەك وسنور بەزانێکی ترە، بەو هەمو خراپەکاریی‌و دەم درێژیی‌و زمان لوسی‌و زمان شیرینی‌و هەنگوینی ئاساییەی کەلەتوێکانی خۆی دا هەلی گرتوەو پەخشی دەکات، هەروەها بەو ڕۆشنبیریە دژ بەدینەی کەمیشکی موسلمانانی پێ بۆگەن دەکات، ڕۆشنبیریەك کە دەبێتە هۆی گۆڕینی کەسایەتی موسلمان، ڕۆشنبیریەك منداڵەکان لەسەر ڕەش کردنەوەی کەسایەتیەکانیان گۆش دەکاتو هەر بەسەری شلکی‌و لەفیترەتی خۆیانەوە لەهەق‌و لەفیترەتی ڕاستەقینەی خۆیانیان لادەدات، ئیدی ئافرەتی موسلمان ئالەو کەشو هەوایەپیس‌و بۆگەنەدا دەژیەتو سافی‌و بێگەردی‌و ڕوناکی کاروانی ژیانی لێ لێلو لیخن‌و بەرچاو تاریك دەکاتو ژیانی

ڕاستەقینەی لێ دەشێوێنێ‌و دەیخاتە ژیانێکی ڕاڕایی‌و دڵەڕاوکێ‌و گرێ کوێرەی دەرونی یەکی بێ ئەندازەوە.

* وێنەی پێنجەم: لێرەدا وێنەی پێنجەمیش دەخەمە سەر کەبریتیە لەبەدڕەوشتی‌و ڕەفتاری خراپی چڕو پڕ کەلەهەندێ لەکۆمەڵگا موسڵمانشینەکان ڕۆ چوەوو شوێنەوارەکانی دڵ تەزێنی لێ کەوتۆتەوەو هێرشێکی دڕندانە دەکاتە سەر ئافرەتی موسڵمان کەوێنای شتەکان بەپێچەوانەی ڕاستەقینەی خۆیان دەخاتەڕو. وێنەی ئەو هەمو کارەساتە ناهەمواروبێ ڕەوشتیە قیزەونانەی کەلە هۆڵەکانی هونەر ئەنجام دەدرێن، وەهەروەها وەك ئەوانەی کەهەندێك لەنەفامان دروشم‌و زانیاریە ئایینیەکان بەکۆنەپەرستی‌و دواکەوتن دەخەنە ڕو ونـاوەزەدی دەکەن‌و ڕوخساری پاکی دەشێوێنن ورِوی سافی ئیسلام لێڵ‌و لیخن دەکەن. بەهۆی ئەم ڕەفتارە ناشیرینانەوە فەسادی‌و خراپەیەکی زۆر فراوان لەناو چین‌و توێژەکانی موسڵماناندا بڵاو بۆتەوەو بەهۆی لاسایی کردنەوەی کوێرانەی ڕۆژئاواییەکان، هاوسەر گیری شەرعیانە کۆت‌و زنجیرەو بەرەلایش خۆشی‌و خۆشگوزەرانی‌و چێژ وەرگرتنە لەژیان ئیدی بەم جۆرە.

* وێنەی شەشەم: بەجیهانی کردنی ئافرەت ئەگەر دەربڕینەکەمان ڕاست بێت (إن صح التعبیر)، کەبریتیە لەوەی کەڕۆژئاوای کافر بانگەشەی بۆ دەکات ودەڵێ: ئافرەتی نمونەیی لەجیهاندا ئافرەتی ڕۆژئاواییە یەکسانە بەپیاو لەگشت مافەکانی دا، دەبینی وەك پیاو ڕەنجبەرو کرێکارە لەکارگەکاندا، نمایش کەری جل وبەرگەکانە...هتد.

ئائەم پێ لێ هەڵ هێنان و دەست درێژی کردن وسنور بەزاندنانەیان لەکۆنگرەو کۆنفرانسەکانیانەوە سەری هەڵدا کەبانگەشەی بۆ دەکەن‌و نەتەوە یەکگرتوەکانیش پاڵپشت‌و چاودێریان دەکات‌و بانگەشە بۆ چەمك‌و سەرەتاکانیان دەکەن وەك ئەوەی کەئافرەتی کارگەر (کرێکار) ئافرەتی متمانە پێ کراوەو پەسەندو بایەخدارە، وئافرەتی ناومـاڵ بەچاوێکی سوك و دواکەوتوانەو کۆنەپەرستانە سەیر دەکەن، تـاوای لێ هـاتوە

کارەکە گەیشتۆتە ئەوەی کەزۆریك لە زاراوەکان بگۆڕدرێن وەك بەکار هێنانی وشەی( یەکسانی ـ المساواة) بۆ دەربڕین لە دەستەواژەی لابردنی جیاوازیو جیاکاری یەکانی نێوان ژنو پیاو، وەوشەی( گەشە کردن ـــ التنمیة) بۆ دەربڕین لەئازادی سێکسی(الحریةالجنسیة) و داهێزرانو لەبەر یەك هەڵوەشاندنو وبەرەڵایيو ڕەوشتی. بەڵام سەرەڕای ئەو وهەمو گەڕ پێکردنو پێ لەسنور تێپەڕاندنانەش هیوا درەوشاوەکانی ئەو ئافرەتە موسڵمانانەی کەبەڕاستی لەئایینەکەیان گەیشتونو هەستیان بەنەخشەو پیلانە گڵاوەکانی دوژمنانی خۆیان کردوەو تاکو ئێستاش زۆر بەڕونی لەئاسۆدا لەدرەوشانەوەدان، دەرونو گیانی خۆشو پاراو قەشەنگ ئاسۆ دەدرەوشێنێتەوەو پڕن لەئارامیو بڕوا بەخۆ بونو پێ دامەزراو تریان دەکات.

# کۆڵەکەو بنەماکانی تەلاری ڕۆشنبیری ئافرەتی موسڵمان

دەکرێ کۆڵەکەو بنەماکانی تەلاری ڕۆشنبیری ئافرەتی موسڵمان لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا کورت هەڵێنین:

١) ڕەسەنایەتی بیرو بۆچونو تێڕوانینی ئیسلامی ڕاستەقینە بەسیفەتی ئەوەی کەکۆڵەکەو بنەمای بناغەی بنچینە کە کۆشکو تەلاری زانستیو ڕۆشنبیری لەسەر دروست دەکرێت. ئەم بیرو بۆچونو تێڕوانینانەش ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

- ئەوەی پەیوەستە بە باوەڕەوە(الإیمان) هەروەك لەڕابردودا ئاماژەمان پێ کرد.
- ئەوەی کەپەیوەستە بەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پاکەوە لەڕوی پێگەو شوێنی یاندا لەژیانی ئافرەتی موسڵماندا.
- وەئەوانەشی کەپەیوەستن بەکۆڵکەو مرۆڤ. بنەماکانی ئسلامو تایبەتمەندیو جیاکاریەکانیەوە.
- وەئەوەی کەپەیوەستە بەبونەوەری دەوروبەری.
- وەئەوەی کەپەیوەندە بەژیان سروشتو قۆناغەکانی ژیانەوە.
- وەئەوەشی کەپەیوەندە بەخودی مرۆڤ خۆیەوە.

بۆ ئەوەی ئەم بیرو بۆچون وتێڕوانینە بەڕاست دەربچن پێویستە لەسەر خوشکی موسڵمان کەلەدو سەرچاوە بنەڕەتیەکەی ئیسلام سود وەربگرێتو زانستوزانیاریەکانی هەڵ بهێنجێت کەبریتین لە: قورئانی پیرۆزو سوننەتی پاکی پێغەمبەرﷺ، وبەو تێگەیشتنەی کەپێشینەی پیاو چاکانمان تێ ی گەیشتبون.

٢) تەواو کردنی ڕۆشنبیری شەرعی لەزانستو زانیاریەکانی ئسلام وەك: تەفسیر، فەرمودەو فیقە، ژیاننامەو خوو ڕەوشت (السیرة)، ...تد. بەوەی کەڕۆشنبیریەکە توندو تۆڵ وتۆکمە لەکەسایەتی ئافرەتی موسڵمان بەرپا دەکات، برِی ئەو بڕیار لەسەر

دراوانـە یائـەو بابەتـە گرنگانـە چـەندن؟ ئـەو بـڕە دیـار نیـەو نازانرێـت چـونکە ئەمـە پەیوەندە بەسروشتی هەر ئافرەتێك خۆیەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشـدا پێویـستە لەسـەر ئافرەتی موسڵمان کەلەم چەند خاڵانەی خوارەوە ئاگادارو هۆشیارو وریا بێت:

أ- دەبێ دەست پێشخەری‌و داهێنان‌و چالاکیە زانستیەکان باش بزانێت‌و ئاگادارو وریاو زرینگ بێت کـە هەمیـشە بنـەڕەت‌و بنـەمان وەك: دەسـت پێـشخەری‌و هـەنگاو نانـە گرنگەکانی بنەڕەت و بنەماکانی تەفسیر. هەروەها لەزانستەکانی فەرمودەدا.

ب ـ دەبێ بەو شتانەدا ڕۆ بچێتە خـوارو وەریـان بگرێـت کەپەیوەنـدن بەخۆیـەوە بەسیفەتی ئەوەی کەئافرەتە[١].

جـ ـ پتر کردن‌وبەردەوامی‌و داکردن‌وکەڵەکە کردنی زانست‌و ڕۆشنبیریە شەرعیە ئیسلامیەکان.

٣) خوێندن وخوێندنەوەی ئەوبەرهەمـە زانـست‌وزانیاری‌وڕۆشنبیریانەی کەئـەهلی زانـستە هاوچەرخیەکان دەیان نوسن بۆ تێگەیشتن‌و حاڵی بون لەو واقیعـەی کەتیایـدا دەژیـن، تەنیا ئەمەندە بەس نیە کەئافرەتی موسڵمان بگەڕێتەوە بـۆ کتێبـە بنـەڕەت وژێـدەرە ڕەسەنەکان ( المراجع) کەپێشینەکانمان نوسیویانن، چونکە ئەمە لـە واقیعـی ئـەمڕۆی ژیاندا کەنارگیرو دورە پەرێزی دەکات، ولەکاریگەری وهاوبەشی کەم دەکاتەوە.

٤) کۆڵکـەی چـوارەم: بریتـی یـە لەپاڵپـشت کردنـی ڕۆشـنبیریەکەی بەزانـستە یارمـەتی دەرەکانی تری وەك زمان‌و مێژو و وێژە، ئافرەتی موسـڵمان گـەر بـەم شـێوەیە بکـات زانست‌و زانیاریەکانی دەوڵەمەند تر دەبێت‌و گەنجینەیەك لەزانستی‌و ڕۆشنبیری گشتی بۆخۆی دادەکات‌و ئاکارو ڕەفتاری جوان دەبێـت‌و دەسـت مایـەی ڕۆشـنبیری‌و فیکـری پتر دەبێت.

---

( ١) واتە: ڕۆ چون وتێڕامان‌و لێ ورد بونەوەو فێر بون وناسین وەرگرتنی هەمو ئەو سیفەت و تایبەتمەندی‌و جیاکاریانەی کە پەیوەندن بەسیفەتی مێینەی خۆیەوە.(وەرگێڕ).

٥) وەیەکێکی تر لەکۆڵەکەکانی ئەوەیە هۆشیاری و وریا بونی ئافرەتی موسڵمان لەو هەمو کەندو کۆسپەو تەنگژانەی کەدەبنە شێواندنو پەك خستنو دواخستنی هەوڵو کۆششەکانی کەدێنە ڕێگەی لەکاتی دروست کردنو دانانی بناغەو تەلاری زانستوزانیاریاری‌و ڕۆشنبیریەکانی‌و هەمو ئەو هۆکارو پاڵ پشتیانەی کەهاریکاری دەکەن لەهەنگاو نانو بازدان بەسەر هەمو کەندو کۆسپ وکون وکەلەبەرو تەنگژانەدا کەبریتین لەمانەی خوارەوە:

أ ــ توێژینەوەو ورد بونەوەلەسیستمی ئیسلامی بەبیرو باوەڕ(عقیدة) و بەشەریعەت وبەڕەوشت وئاکارو بەها بەرزەکانو بەخێزانو بەگەلێ شتی تر، چونکە ئەوانە هەمویان وێکڕا کۆشكو قەلایەکی پتەو و دامەزراو دروست دەکەنو یەکتری دەبەستنەوە.

ب ــ هاوتەریبی‌وهاوکێشەیی لەدروست کردنی تەلاری ڕۆشنبیری بۆ ئەوەی هەمیشە لەتێڕوانینی دا هاوکێشەیی‌و مام ناوەندی بمێنێتەوە، وکەمو کورتی‌و کەمتەرخەمی لەئاست هەندێ لەبڕیارە دیارەکاندا نەنوێنێ، یاخود هۆشو گۆش لەئاست هەمو شتە بایەکی هەڵ کردو پەخش بو لە
ڕۆشنبیری ڕۆژهەلاتی‌و ڕۆژئاوایی بکاتەوەو وریاوزرینگ بێت، نەکا خوانەخواستە بکەوێتە ناو زەلکاوی ئەو سەر لێشێوای وگومڕاییەوە.

# بەرپرسیەتی ڕۆشنبیری ئافرەتی موسڵمان

دەتوانین بەرپرسیەتیەکانی ڕۆشنبیری ئافرەتی موسڵمان لەم چەن خاڵانەی خوارەوەدا گرد بکەینەوە:

## یەکەم : توخمەکانی بەرپرسیارێتی ڕۆشنبیری ئەمانەی خوارەوەن:

أ ـ هەستان یائەنجام دانی جموجوڵی پرۆگرامی بۆ دروست کردنی تەلاری کەسیەتی ئافرەتی موسڵمان فیکری‌و کارگێڕی‌و پرۆسەیی( پراکتیکی ـ عملی) لەمیانەی کارو بەرنامە پلەییەکان( تدرج)ی فیتری چڕو توندو تۆڵی وەستاو وبەند بەپەیڕەو وپرۆگرامی شەریعەتی ڕون‌و ڕەوان‌و ئاسانی خوای پەروەردگار.

ب ـ بەرۆشنبیر کردنی ئیسلامی لەقوتابخانەدا بۆ کیژۆڵە ساواکانی سەرەتایی‌و گەنج‌ولاوان‌و تەنیا پشت نەبەستن بە پەیڕەو پرۆگرامی خوێندن‌و بەس، چونکە ئەو پرۆگرامانە کاتین‌وتەنیا لەو بوارانەدا فێر دەکرێن کە مەنهەجی خوێندن بۆ بڕینی پلەکانی ساڵانەو بەدەست هێنانی بڕوانامەو سنوردارن، وتەنیا سود لەچالاکیە پرۆگرامیەکان‌و لەوانەی کەبڕیاری لەسەر دراوەو دەخوێندرێت وەردەگیرێت‌و بەس.

ج ـ دایەنگایەتی تەکنیکی دروستکەر پێ گەیەنەر بۆ منداڵ‌و زارۆکان: کۆرپە ساواکان بەپلەی یەکەم، ئەوانەی کەپەیوەندی بەخوشکانی موسڵمانەوە هەیە. بەپلەی دوەم. وەبەگشتی ئەگەر ئەو خوشکە دایك بێت. هەروەکو لەداهاتودا باس دەکرێت گەر خوای گەورەویستی لەسەر بێت ـ ئەوەی لەئافرەتی موسڵمان داوا کراوەو پێویستە لەسەری بەخێو کردن‌و پەروەردە کردنی منداڵەکانیەتی‌و هەروەها پارستن‌و چاودێری کردنیان لەتوش بون بەخراپەو خراپەکاری(الفساد) ولادان لەڕێگەی فیترەتی خۆیان (الإنحراف عن فطرتهم) . خوشکی موسڵمانی ڕاستەقینە پێویستە لەسەری کە دایەنگایەتیەکەی دەرچو سەرکەوتوانە بێت‌و گۆش کردو وخاوەن فیکرو ویست‌و بەتواناو لێ هاتو بێت بۆ ڕۆڵەکان

پێشەنگو چاولێکەرێکی ئەرێیەتیەکانی (الإیجانیة) بێت لەقوتابخانەو خوێندنگاکانیاندا لەگەڵ هاوڕێ و هاوکارەکانیدا، و لەکۆمەڵگادا، لەگەڵ دراوسێکانیدا، لەگەڵ هاوڕێکانیدا (أترابهم) بۆئەوەی ببنە توخم و سەرچاوەیەکی چاکو کاریگەرو بەسودو بەکەڵك.

د ــ دروست کردنی کەش وهەوایەکی ئیسلامی لەدەوروبەری خۆی دا، لەماڵەکەی دا ولەگەڵ دراوسێکانی داو لەگەڵ هاوڕێکانی دا. هەمیشە زیکرو ویردی خوای گەورە زیندو بکەنەوە. گرنگی وبایەخی دانی لێبڕاوانە بەفێرکردنی زانست وزانیاریەکانی ئایینی خواو چاوەدێری و وریا بون و خۆ دانوساندن لەبەرامبەر سەرپێچی یەکاندلو بن بڕ کردنیان.

هـ ــ جێبەجێ کردنی کردەکی( پراکتیکی ــ عملی) ودەرخستنو ڕەنگ دانەوەی نیشانەو شوێنەواری ئەو ڕۆشنبیریە لەکەسایەتی خۆی دا، ئەوندە ڕۆشنبیریە بەس نیە کەلەقوتابخانە دەیخوێنێت، بەڵکو دەبێ ڕۆشنبیریەکەی تیایدا ڕەنگ بداتەوەو دەربکەوێت لەجموجوڵو هەڵسو کەوتی دا لەگفتو گۆ وقسە کردنی دا لەبێ دەنگی دا لەڕەفتاری دا، لەدەرچونەکانی دا، لەجلو بەرگو پۆشاکی دا، لەزرینگیو زیرەکی داو لەچێشت لێنان، لەپەیوەندیەکانی لەگەڵ هاوسەرو ئەندامانی خێزانەکەی دا، هەروەها لەگەڵ خزمو کەسو کاری خۆیو مێردەکەی داو لەگەڵ دراوسێکانی دا، چونکە زۆر جار هەیە قسەو گفتو گۆ بەقەدەر هەڵس وکەوت و ڕەفتاری جوان کاریگەری نیە.

و ــ هەماهەنگیو یارمەتی دانی مێردەکەی ئەگەر بانگەشە کار بو. ئەو کاتە ژنەکە بەهێز ترین و باشترینو کاریگەر ترین پاڵپشتی ئەو مێردەی دەبێتو گەورەترین لایەنگیری دەبێت بۆ ئەو فیکرەی کە بانگەشەی بۆ دەکات، کارو بارەکانی بۆ ڕێك دەخات، وئاسانکاریەکی زۆری بۆ دەکات، دەستێکی باڵاو پتەو ودەست بارگەرێکی بەهێزو بەس دەبێت بۆ گەلاڵە کردنو ئەنجامدانی ئەو پرۆژانەی کەبەتەوییانە ئەنجامیان بدات، ئیدی ئەو ئافرەتە بەم کارانەی بەڕاستی بە ئەرکی سەر شانی خۆی هەستاوەو لە پاداشتو ئەجرو وەرگرتنەودا هاوبەشە لەگەڵ مێردەکەی دا لەڕۆژی قیامەتدا.

ز ـ هەماهەنگیو هاریکاری کردنو بەشداری کردن لەچالاکیو بوارە زانستیەکانی ژنان (النسوی)دا وەك وەرزە رۆشنبیریەکان لەهەندێ لەدامەزراوەکانو ناوەندە رۆشنبیریو زانستیەکانو گەلێکی تر.

ح ـ بەشداری کردنو هاوکاری کردن لەتوێژینەوەو لێکۆڵینەوەکانی کەگرنگی دەدەن بەکاروباری ژنان بەتایبەتیش لەکێشەو بوارەپێداگریەکاندا( إلحاح ) ، وەك کێشەکانی خوێندنو هاوسەرگیریەتی، ماڵداری و ماڵ کردن، هەڵ کردنو هەڵسو کەوت کردن لەگەڵ منداڵو زارۆکاندا، کێشەی دراوسێکان، کاریگەری بە کۆمەڵ، کاریگەریە فیکریو گرێ بەستیەکان(المؤثرات الفكرية والعقدية) لەسەر ئافرەت، شوێنەکانی گەشتو گوزارو کات تێدا بەسەر بردن، وگەلێ کێشەو تەنگژەی تری لەم جۆرانە، کەپێویستە ئافرەت شوێن پەنجەی تێدا دیار بێتو هاریکاری یان تێدا بکات وەك ئافرەتێکی موسڵمانی زاناو رۆشنبیر.

## دووەم : دارشتنی مەنهەجو بەرنامەی هێنانە دی ئەم بەرپرسیاریەتیە:

ئەوەی لێرەدا شایەنی ئاماژە پێ کردنو کار پێ کردن بێت بۆ وەدی هێنانی یارمەتیو هاوکاری کردن بێت لەنێوان خاوەن بەرپرسیاریەتیە رۆشنبیریو بانگەشەکارەکان بۆ خێرو چاکەو ورێنومایی کردنو هێنانە سەر رێ ی راستی خواییو بەرچاو رۆشن کردنەوەوهۆشیار کردنەوەو، خۆشەویستیو ئاشناییو رێکیو تەبایی، هەستان بە بەپرسیاریەتیو چالاکی رۆشنبیری لەکەناڵە جۆربەجۆرەکاندا، نەك تەنیا لەکەناڵی (محاضرات) داو بەس وەدەبێ لەگەڵ عەقڵو سۆزو دەروندا هەڵسو کەوت بکاتو یەك بگرێتەوەو دەبێ بەو هەمو گەرداو گەردەلولانەی کەلەم سەردەمەدا هەڵیان کردوەو باون فریو نەخوات بەبیانوی ئەوەی کە سەردەمی زانستو پێشکەوتنەو مۆدیلن، گومانی تێدا نیە کەسۆزیش شێوازێکی کاریگەری گەورەی بەهێزی هەیە، هەروەها وەئەو مەنهەجە قورئانیەی کەقورئانی پیرۆز بەکاری هێناوە شێوازێکی برەوپێدانو هەڵنان و ترسێنەری یە(الترهيب والترغيب) و مەنهەجو بەرنامیەکی فیتریە، وەلەمەنهەجی لێکۆڵینەوەو هێنانە دی و راپەراندنی بەرپرسیەتی چالاکی رۆشنبیری: رەخنە لەخۆ گرتنو

خۆ ڕاست کردنەوەی بەردەوام تاکو نەفسی خۆیو گەشە پێ کردنی لەبیر نەچێتەوە، یاخود بکەوێتە تۆڕو داو و تەپکەی بێ ئاگایی و شەیتانەوە.أ.هـ. ئەمە ئەو کورتەو پوختە باسەیە بو کە(الزنیدی) هێناویەتیەوە.

## سێ یەم: یەکێکی تر لەئەرکو بەرپرسیتی ئافرەتی موسڵمان دەربارەی نەفسی خۆی هەستانیەتی بەکاری چاکەو چاکەکاری :

کاری چاکە ئەوەیە کەبەڵگەیەکی زۆری لەسەرن لەقورئانولەسوننەتی پێغەمبەرﷺ وەکاری چاکەش لەڕوی حوکمەکانیەوە هەمە جۆرو هەمەچەشنەن وەك: فەرزەکان، کارە ڕێگەپێدراوەکان(المستحبات) و سوننەتەکان، وەلەڕوی جۆریشەوە دەکرێت بە:(جۆرێك کەسودەکەی تەنیا بۆ ئەو کەسەیە کەئەنجامی دەدات، جۆرێکی تری سودی بۆ کەسانی تریش هەیە). وەلەسروشتو سەرەتاکانی ئیسلام ئەوەیە کەئافرەت بەرپرسە لەکارو کردەوەکانی خۆی کەئەنجامیان دەداتو سزاو پاداشتی خۆشیان لەئاستدا وەردەگرێتەوە، ئەوەبو لەڕابردودا ئایەتەکانمان ئاماژە پێ کردن کەبەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستیە وەك: فەرمودەی خوای گەورە:﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ ﴾ آل عمران:١٩٥.وە خوای پاك وبێگەرد دەفەرموێ:﴿ وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ﴾ النساء :١٢٤. وەهەروەا دەفەرموێ:﴿مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ ﴾ النحل: ٩٧.

هەروەها لەبەرپرسیارێتیەکانی ئافرەتی موسڵمان سەرباری بڕوا بونوزانست، ئەوەیە کەدەبێ بەپێ ی دا خوازیەکانی ئەو زانستە کار بکات، هیچ ئەنجامو بەرهەمێکی چنگ ناکەوێت نەلەدنیاو نەلەڕۆژی دوایی دا گەر بەم شێوەیە نەجوڵێتەوە، خوای باڵا دەستو کاربەجێ دەفەرموێ:﴿ تَبَٰرَكَ ٱلَّذِي بِيَدِهِ ٱلۡمُلۡكُ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١ ٱلَّذِي

خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ﴾ الملك: ١،٢. (واتا: پیرۆزیو پاکو بێگەردی بۆ بۆ ئەو کەسەی کە خاوەندارێتی هەمو شتێك لەدەست ئەو دایەو بەسەر هەمو شتێك دا زاڵ وسەرکەوتوە، ئەو کەسەی کەمردنو ژیان وژیانەوەی داناوەولەچەنگ ئەو دایە، بۆچی؟ بۆ ئەوەی ئێوە بەتاقی بکاتەوە داخۆ کامتان کردەوەی چاك وباش دەکاتو کامەتانیش کردەوەی خراپ وبەدخو دەکات.(وەرگێڕ). عیاض گوتویەتی: وشەی (أحسن) بەواتای پوختەترینو چاکترینو دلسۆز ترینو پێکاو ترین کارو کردەوەیە.

**ئایەتەکان بۆ وەرگرتنو قبوڵ کردنی کردەوەکان دوو مەرج بڕیار دەدەن کەبریتین لەمانەی خوارەوە:**

- بڕوا بون بەخوای گەورەو دڵسۆزیو نیاز پاکی بۆ خوای گەورەوتاكوتەنیا، کارو کردەوەکانی هەموی لەپێناو خوادا بن بەسو هیچ نیەتو نیازێکی تری نەبێت مەبەستونیازەکانیشی بۆ کەسی تر نەبێت.
- کردەوەی چاك (العمل الصالح): هەر کردەوەیەکیش بکرێت گەر بەپێ ی ئەو بەرنامەو شەریعەتە نەبن کەپێغەمبەری خوشەویستﷺ هێناویەتیوئەنجامی داون واتە بەپێ ی سونەتی پێغەمبەرﷺ بێت.

هەروەها دو جۆر پاداشتی بۆ کارە چاکەکان دەست نیشان کردون: لەدنیادا ژیانێکی خۆش و بەبەرەکەت، لەڕۆژی دواییشدا بەهەشت .

ئافرەتی موسڵمان پێویستە لەسەری کەبەم کارە هەڵ بستێت ئەگەر کارەکان فەرز بون وەك نوێژە فەرزەکانوزەکاتی فەرزو ڕۆژوی ڕەمەزانو حەج کردن یەکجار لەژیاندا ئەگەر لەتوانای دا هەبو. وە باقی ئەرك وفەرزەکانی تر، جا پێویستە لەسەر ئافرەتی موسڵمان بەو پەڕی لێبڕاویو بەبێ کەمتەر خەمیو سستی وخاوی و تەمبەڵیو خۆبواردنەوە ئەنجامیان بدات.

بەڵام ئەوەی کەفەرز نیە لەسوننەتەکانو ڕێگە پێدراوەکان (المستحبة)کەخوای گەورە وەك سوپاس گوزاریەك بۆ خواو یارمەتیەكو دەستگیرۆییەك بۆ بەندەکانی لەسەر بەندە بڕوادارەکانی خۆی داناوە، پێویستە لەسەر ئافرەتی موسڵمان کەهەوڵ بدات بەگوێرەی توانا بەشێکی باش لەو گەنجینە بەسودانە لەکیس خۆی نەداتو ئەنجامیان بداتو وەدەستیان بێنێت بۆ ڕۆژی قیامەت لەدەفتەری کردەوەکانیدا دای بکاتو پێش خۆی بەرێ یان بکات لەبەر ئەم سودو کەڵکانەی خوارەوە:

- ئەو سوننەتانە کەمو کورپەکانی فەرزەکانمان بۆ پڕ دەکاتەوە.
- گوناحەکانو کارە خراپەکانمان ڕەش دەکاتەوە کەڕۆژانە کەڵەکە بون کە زۆر جار هەر هەستیشیان پێ ناکەیت.
- پلەو پایەی پێ لەلای خوای گەورە بەرز دەبێتەوە.
- مل ملانێو پێشبڕکێ لەگەڵ پیاوچاکانوئافرەت چاکان پێ دەکات.ڕێژەو بڕی باوەڕ( الإیمان) پێ پتر دەبێت.

جا ئافرەتی موسڵمانی ژیر ئەوەیە کەبەشێکی باش لەو پاداشتو خێری ئەو سوننەتانە (النوافل) بەدەست خۆی دێنێت چ ڕۆژو وچ نوێژ وچ حەجو عەمرەی ماڵی خوا بێتو چ بانگەشە کردن بێت بۆ ئایینی ئیسلاموفەرمان کردن بەچاکەو قەدەغەکردن لەخراپەو چ چاکەو چاکە کردن بێت و..و..تد. دەبێ هەمیشە ئەو واتەئافرەتی موسڵمان سور بێت لەسەر ئەنجامدانی جۆری سوننەتەکانی کەتەنیا بۆخۆی سودیان هەیەو ئەوانەشی کەبۆ خەڵکانی تریش سودیان هەیە. وەئەگەر کارەکان تێك گیران واتە ئەو کارانەی کەسودی بۆ خۆیو بۆ خەڵکی هەبو ئەو کات ئەو کارانە پێش بخات کە تەنیا سودی بۆ گشتی هەیە واتە سودی گشتی پێش سودی خۆی بخات. وەئەگەر دیسان کارەکان تێك گیرانو بەسەر یەکدا کەڵەکە بون با ئەو کارە سوننەتیانە پێش بخات کەسودی تەنیا بۆخۆی تێدایە وەك خوێندنی قورئانی پیرۆز، یاخود فێر کردنی

خوێندنەوەی قورئان، گومانی تێدا نیەو دەبێ ئەو کارە پێش بخات کەسودی بۆ هەموان هەیە.

وە من دەڵێم: لەئەرکی ئافرەتی موسڵمانە کەدەبێ بەرنامە بۆ کارەکانی ڕۆژانەو هەفتانەو مانگانەو ساڵانەی خۆی دابنێتۆ خشتەیەکی کاتی نزیکی یا ڕێژەیی دروست بکات بۆ ئەنجامدانو هەستان بەراپەڕاندنی کارەکانی، ودەبێ هاوتەریب بێت بۆ ئەوەی بەندایەتیو پەرستشی خوای گەورە لەسەر بەرچاو ڕۆشنیو بەرنامەڕێژی بکاتو ئەنجام بدات گەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت لەکۆتایی کتێبەکەماندا بەدرێژی باسی لێوە دەکەین.

**دەکرێ ئەم خاڵانەی خوارەوە لەژێر چەتری کردەوەی چاك دا گرد بکەینەوە:**

– ئەنجامدانی پێنج ڕوکنەکانی ئیسلام: کردنی پێنج فەرزەی نوێژەکان لەکاتی خۆیاندا، پارێزگاری لە هەمو مەرجو واجبەکانیو کردنی ئەوەندەی لەتوانادا بێت لەنوێژە سوننەتەکان.

– دانی زەکاتی ماڵ ئەگەر ئەو ماڵەی هەیە ئەوەندە بو زەکاتی لێ بکەوێت.

– گرتنی ڕۆژوەکانی مانگی ڕەمەزان.

– حەج کردنی ماڵی خوا لەتەمەندا جارێك ئەگەر توانای ماڵیو ڕێگەی هەبو، سەبارەت بەئافرەتی موسڵمان دەبێ (محرم) ی خۆی لەگەڵ دا بێت.

– پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: {إذا صلّت المرأة خمسها، وصامت شهرها، وحفظت فرجها، وأطاعت زوجها قيل لها أدخلي الجنّةَ من أي أبواب الجنّة شئت)(١).

ـ ئەنجامدانی ئەرکەکانی سەرشانی وەك: پۆشینو پارێزی کردن لەپۆشاکی شەرعی فەرز کراو، ئەو پۆشاکەی کەدەبێ هەمو لەشی داپۆشێت بەدەمو چاو ودەستەکانیشیەوە لەبەر دەم پیاوانی بێگانەدا . هەروەها پارێزگاری کردن لەخۆداپۆشینو حەیاو حەشمەتو داوێن پاکی خۆی .

---

(١) لەڕابردودا (تخريجة)کەو واتاکەیمان نوسی ل١١.

بەڵگەش لەسەر ئەمە گەلێك زۆرن. خوای گەورەو باڵا دەست دەفەرموێ: ﴿يَـٰنِسَآءَ ٱلنَّبِىِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ ٱلنِّسَآءِ ۚ إِنِ ٱتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِٱلْقَوْلِ فَيَطْمَعَ ٱلَّذِى فِى قَلْبِهِۦ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا ﴿٣٢﴾ وَقَرْنَ فِى بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ ۚ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ الأحزاب:٣٢- ٣٣. (واتا: ئەی ژنانی پێغەمبەرﷺ ئێوە وەك ژنانی تری سادە نین، ئێوە خێزانەکانی پێغەمبەرن دەبێ هەم شتێکتان لەوانی تر جیاواز بێت ئێوە چاکەو خراپەتان دو هێندانەیە . دەی ئەگەر خۆتان بپارێزن لەخوای خۆتانو هەرگیز سەرپێچی خوای گەورەو بێ فرمانی نەکەنو خۆ لەهەمو شتێکی خراپ بپارێزن بەنازوو بەعیشوەو لەنجەو لار مەڕۆنو دەنکی خۆتان ناسكو بەنازو نوز مەکەنو لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا قسە مەکەنو بەنەرمو نیانو ناسکەوە گفتو گۆ مەکەن چونکە ئەمە دەبێتە هۆی هەست بزواندنی ئارەزوی پیاوانو خوانەخواستە با خراپەکاریو بێ ڕەوشتی لێ نەکەوێتەوە، چونکە دەنگی ناسكو نەرمی ئافرەت هەمیشە هەستی ئارەزو بزوێنە بۆ پیاوانو لەم ناوەندەشدا شەیتانی نەفرین لێ کراو بەهەلی دەزانێتو ڕۆڵی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ خستنەوەی خراپی و داوێن پیسیو بەد ڕەوشتی .بۆیە خوای گەورە ئامۆژگاری دایکی بڕواداران دەکات کەلەم سیفەتە دور بکەونەوە .ئەوە لەکاتێك دا یە کە پێغەمبەرﷺ لەژیاندا ماوەو گەرمەی ڕاگەیاندنی پەیامی پیرۆزی ئیسلام وهاتنە خوارەوەی ئایەتەکان وبنەماو ئەحکامەکانی قورئانە بۆ سەر گرۆهی مرۆڤ لەسەر زەویو لەباشترینولەپاکترین سەردەمدا خوای گەورە ئاوا ئامۆژگاری پاکترینو بەرز ترین ئافرەتی ئاکارو ڕەوشت بەرز دەکات ئەدی دەبێ لەڕۆژگاری ئەمڕۆی پڕ فەسادیو بەد ڕەوشتیوئەو هەمو ڕوتو قوتو بەرەڵاییەی کەهەیە ئەو بێ ڕەوشتی بێ ئەخلاقیەی کەهەیەو نەك خەڵکی بەڵکو دەسەڵاتداران ئەمڕۆ بانگەشەی بۆ دەکەنو هەمو هۆکارەکانی ڕاگەیاندنیان لەخزمەتدا خستۆتە گەڕو یەکەمین دەلاقەو یەکەمین دەرگاشیان ئافرەت بو

کەوەك دەست کەلایەك بۆ ئەم نیازە گلاوانەی خۆیان گرتۆتە دەست خوای گەورە پەنامان بدات . بارودۆخەکە زۆر مەترسی دارە . خوای گەورە دەفەرموێ : ئێوە بەم شێوەیە واتە بەناسکیو نازوعیشوەوە مەدوێن نەبادا ئەوانەی نەخۆشی یان لەدڵدایە لەپیاوانی چاو چلێسو دڵ کرمێ ئەمە بەهەل بقۆزنەوەو هەوڵی خراپە کاریو داوێن پیسی بدەن . ئەو پیاوانەی کەدڵی یان پڕیەتی لەنەخۆشیو ڤایرۆسی داوێن پیسیو ئارەزو بازی ئێوە دەرگایان بەڕودا دابخەنو گاڵتەو گەپو قسەی ناسكو نەرمو نازو نوزیان لەگەڵدا مەکەن . لەجیاتی ئەمە قسەی باش و ئامۆژگاری چاکە بکەنو بەقسەو گفتاری بەڕێزوسەنگینو بەئاکری بەرز لەگەڵ خەڵکی دا بدوێن . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ : ئێوە ئەی ئافرەتان لەناو ماڵی خۆتان بمێننەوەو ئۆقرە بگرنو ئیشو کاری ماڵەوەو پەروەردەی منداڵەکانتان بەباشترین شێوەو لە سەر بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامی خوای گەورە پەروەردە بکەن . لێرەدا کەدەفەرموێ لەماڵ دا ئۆقرە بگرن مەبەست ئەوە نیە کەدەبێ سەر لەماڵ نەهێننە دەرو وەك باڵندە لەناو قەفەزدا دەرگا لەسەر داخراو بن، نەخێر بەڵام مەبەست ئەوەیە کەخوای گەورە پیاو وژنی دروست کردوە هەر لایەو ئەرکو بەرپرسیەتیو شوێنی ئەرکو کار کردنەکەشی بۆ دیاری کردوەوهەر خۆی دەزانی هەریەکێ لەو دو ڕەگەزە چی لەگەڵ تواناو سروشتی دا دەگونجێ . ئیدی ماڵەوەی بۆ ئافرەت داناوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری ناو ماڵو پەروەردە کردنی ڕۆڵەکان بەدروست ترین شێوەو شێواز . ئەگەر ژن بچێتە دەرو ماندو شەکەت بێت لەناو فەرمانگەکانو کارو کۆمپانیاو کۆڕوکۆبونەوەکان دا، کەلەگەڵ جستەی ئافرەتیش هەر ناگونجێت ئەو جەستە ناسکەی ئافرەت کەی بەرگەی ئەوە دەگرێت ، ئەوە نەی توانی کاروبارەکانی ناو ماڵ وەك پێویست ڕابپەڕێنێت ومنداڵەکان بەو سۆزوگۆشەی کەخوای گەورە بۆی داناوە پەروەردە بکات بۆ یە ماڵ هەر سەقەت دەردەچێتو منداڵەکان سەقەت پەروەردە دەبنو دور نیە لاسارو نارێك دەر بچن وبێ بەش بن لەهەمو سۆزێکی دایکایەتی ئەمجاریش لەسۆزو عاتیفەی کۆمەڵایەتی بی بەش دەبن . پیاویش بەرپرسە لەپەیدا کردنی نان وبژێوی

خۆی ومالّ ومندالّەکانیو بۆ کارە قورسەکانی دەرەوە دانراوە لەهەمو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا. ئەمجار خوای گەورە بەئافرەتان دەفەرموێ: ئەی ئافرەتان ئێوە خۆتان ڕازاوەوڕوت مەکەنەوەوخۆتان لەدرو دەرمانی خۆ جوان کردن وڕازاندنەوەو ماکیاج دا شەلاڵ مەکەن وبۆ ئەوەی سەرنجی پیاوان بۆ لای خۆتان ڕابکێشن وئەنجام ببێتە هۆی کەوتنەوەی خراپەو خراپەکاری وبێ ڕەوشتی وبێ ئەخلاقی .زەکات لەمالّی خۆتان دەر بکەنوگوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەری خواﷺ بکەنو لەبەرنامەی خوا لامەدەن کەبریتیە لەقورئان وسوننەت .خوای گەورە بێ نیازە لەئێوە چی لەئێوە ناوێت تەنیا دور خستنەوەی خراپەو خراپەکاری نەبێت لێتان وئەوەی لەئێوەی دەوێت تەنیا ڕەوشت بەرزی وحەیاو حەشمەت وژیانی پاك وتەمیزو وسەربەرزی وسەرفرازیە ئەی ئەهل وئەی ئەندامانی مالّی پێغەمبەری خواﷺ وە خوای گەورە دەیەوێ ئێوە پاك وپوختە ڕابگرێت وپاك وئاکار بەرز بمێننەوە. دیارە کەخوای گەورە ڕو لەمالّی پێغەمبەر وخێزانەکانی ئەو دەکات تەنیا داواو حوکمەکە هەر بۆ ئەوان نیە بەتەنیاو بەس، بەلّکو بۆ هەمو موسلّمانانە بەپیاو و بەژنەوە ڕوی دەمی لەهەمو مرۆڤەکانە تا دنیا دەبڕێتەوە بۆیە دەبێ ئێمەش بەپیاو وبەژنەوە ئەو حوکم وداواکاریانە وەرگرین وگوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکەینو دەنا چارەنوسمان ڕەشو تاریك دەبێت (پەنا بەخوای گەورە)، وەرگێر

هەروەها دەفەرموێ :﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتَ ٱلنَّبِيِّ إِلَّآ أَن يُؤۡذَنَ لَكُمۡ إِلَىٰ طَعَامٍ غَيۡرَ نَٰظِرِينَ إِنَىٰهُ وَلَٰكِنۡ إِذَا دُعِيتُمۡ فَٱدۡخُلُواْ فَإِذَا طَعِمۡتُمۡ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسۡتَـٔۡنِسِينَ لِحَدِيثٍۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ يُؤۡذِي ٱلنَّبِيَّ فَيَسۡتَحۡيِۦ مِنكُمۡۖ وَٱللَّهُ لَا يَسۡتَحۡيِۦ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ وَإِذَا سَأَلۡتُمُوهُنَّ مَتَٰعٗا فَسۡـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٖۚ ذَٰلِكُمۡ أَطۡهَرُ لِقُلُوبِكُمۡ وَقُلُوبِهِنَّۚ وَمَا كَانَ لَكُمۡ أَن تُؤۡذُواْ رَسُولَ ٱللَّهِ وَلَآ أَن تَنكِحُوٓاْ أَزۡوَٰجَهُۥ مِنۢ بَعۡدِهِۦٓ أَبَدًاۚ إِنَّ ذَٰلِكُمۡ كَانَ عِندَ ٱللَّهِ عَظِيمًا ﴿٥٣﴾ ﴾ الأحزاب: ٥٣. (واتا: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە

لەخۆوە مەچنە ماڵەکانی پێغەمبەر ﷺو هەرلەخۆوە خۆ مەکەن بەماڵەکانی دا ، مەگەر ڕێگەتان پیێ بدەن‌وبۆ خواردن بانگتان بکەن‌وداوەتان بکەن، ئەگەر مۆڵەتیشیان دان‌و داوەتیان کردن ئێوە ئەوەندە زو مەچن لەویێ پاڵ بدەنەوەو چاوەڕوانی بکەن تا خواردنەکە پیێ دەگات و بکەونە قسەی پڕو پوچ وبیێ واتاوە و بێزارو وەرسیان بکەن ئاخر ئەوان شەرم دەکەن لەڕوتان بدەن، بەڵکو هەر کاتێك خواردنەکە ئامادە بو وبانگیان کردن ئەو کات بچن، کەخواردنەکەتان بۆ دانرا خێرا خواردنەکە بخۆن‌و بڕۆن وبڵاوەی لیێ بکەن‌و چاوەڕوانی قسە کردن‌و گێڕانەوەی بەسەر هات وحکایەت‌و قسەی پڕوپوچ مەبن و دیسان خاوەن ماڵ بێزارو وەرس بکەن، چونکە ئەم جۆر سیفەتانە دەبنە هۆی تورە بون‌و بێزار کردنی پێغەمبەر .ﷺئاخر پێغەمبەرﷺ شەرم دەکات پێتان بلیێ :دەی ئەوە خواردنەکەتان خوارد وهەستن بڕۆن، بەڵام خوای گەورە لەشتی هەق شەرم ناکات وتاوتان دەدات‌و ئاگادارتان دەکاتەوە لەم سفەتە خراپ وقێزەونە.هەروەها خوای گەورە دەفەرمویێ: ئەگە داوای هەر شتێکتان وەك قاپ وقاچاغو خواردن لەخێزانەکانی پێغەمبەر کرد لەدوای پەردەوە داوایان لیێ بکەن وڕاستەوخۆ ڕو بەڕو مەچنە پێش وداوایان لیێ بکەن چونکە ئەمە باشترو پاکترە بۆ دڵی ئێوەش وبۆ دڵی ئەوانیش . بۆ ڕاگرتنی کۆڵکەی ئاکارو ڕەوشتی بەرز لەنێواندا . ئاخر ئێوە بۆتان نیە بەهیچ شێوەیەك ئازاری دڵی پێغەمبەرﷺ بدەن ونابیێ لەدوای خۆی واتەلەدوای وەفات کردنی خێزانەکانی )ژنەکانی (مارە بکەنەوە چونکە ئەوان دایکی بڕواداران‌ن ولەئێوە حەرامن‌و کردنی ئەم کارە لای خوای گەورە تاوانێکی گەلێك گەورەو قێزەونە). وەرگێڕ.) ئەم ئایاتانە بەئایەتی پۆشاك ناودەبرێن.

ئەگەر ئەم دو ئایەتانە لەسەر داوێن پاکی خێزانانی بڕواداران لەباشترین‌و چاکترین‌و پاکترین چەرخدا هاتونە خوار، کەواتە پۆشاك پۆشینی شەرعی بۆ ئەو ئافرەتانەی دوا ئەوان گەلێك پێویست ترو لەپێشترە، ئەم فەرمودەی خوای گەورە ئەم قسەیەمان پشت ڕاست دەکاتەوە کەدەفەرموی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزۡوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ

ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٥٩﴾ الأحزاب:٥٩. (واتا: ئەی پێغەمبەرﷺفرمان بکە بەخێزانەکانتو کچەکانتو خێزانی بڕواداران کەکاتێك شەوانە دەچنە دەرەوە ، باچارۆکەو بەرهەڵبێنەکانیانلەلەشو جەستەو سەرو ملی خۆیانەوە بپێچن، بۆ ئەوەی لەکەنیزەکان جیا بکرێنەوەو بناسرێنەوەو بزانرێت کەئەمانە ئافرەتانی بڕواداری سەربەستو ئیدی کەس نەوێرێت تخونیان بکەوێو خۆیان لێ بدەنو قسەو قسەلۆکو تیرو توانجیان لێ بدەن، چونکە کەنیزەکان عادەتیان وابو کەدەهاتنە دەرەوە سەرو سینکو ملو بەشێك باسکو قاچی خۆیان بەدەردەخست هروەکو چۆن ئێستاو لەسەردەمی ئێمەدا ئافرەتانی عەوامی موسڵمان هەمان شێوە بەکار دێنن. تەفسیری گوڵشەن ب٢ ل١١٠٧ز وەرگێڕ).

– وەلەوانەی کەلەژێر کردەوە چاکەکاندا کۆ دەبنەوە بریتین لە: سوننەتەکانو ڕێگە پێدراوەکان (المستحبات) کەهەمو موسڵمانان چ پیاو وچ ژن پێویستیان پێ ی هەیە کەئەنجامیان بدات خوێندنی قورئان وزیکرو ویردەکان، سوننەتەکانی نوێژو ڕۆژو بەخشین هەروەکو لەڕابردودا باسمان لێوە کرد.

– هەروەها ڕەوشتوئاکاری جوان کەپێویستە ئافرەتی موسڵمان خۆی پێ برازێنێتەوە، وەك ڕاستگۆیی لەکارو کردەوەو قسەکاندا، درۆ نەکردن، ئارام گرتنوخۆڕاگری، هەڵسوکەوتی جوان لەگەڵ کەسانی تردا، نەرمونیانیو لەسەرخۆیی مەندی لەقسەو گفت وگۆدا، ڕو خۆشیوڕوگەشی لەکاتی بەیەك گەیشتن لەگەڵ خەڵکی دا، چاودێری کردنی ڕەوشتوئاکاروشێوازە گشتی یەکان لەڕۆیشتن دا لەخواردندا لەخواردنەوەدا، لەنوستن دا، ولەقسەو گفتوگۆدا، لەدانیشتنوکۆڕو کۆبونەوەکاندا، ولەگەڵ بواری تری ژیاندا لەڕەوشتە بەرزە ئیسلامیەکان. زۆر پێویستە لەسەر ئافرەتی موسڵمان کەخۆی بەم ئاکارو ڕەوشت وبەها بەرزانە برازێنێتەوەو خۆ بەو ڕەوشتە جوانوبەرزانە سەنگینو خاوەن کەسایەتی موسڵمان بکات.

- هەروەها لەکردەوە چاکەکان: خۆشەویستی خوای بالا دەستوکاربەجیو ترسانوداوا کردنولەبەر پاڕانەوە و.. .تد. وەهەمیشە وا بزانێت کەخوای گەورە ئاگای لێ یەتیوهەمیشە چاودێری دەکات ئەمانە لەکارەکانی دڵ دەژمێردرێنو هەر دەبێ لەخوای گەورەیان بزانێت.

- وەلەکردەوە چاکەکان: ئەو کردەوەو چالاکیانەن کەسودی بۆخۆشیو بۆ غەیری خۆشی هەیە لەخێر کردنو بڵاو کردنەوەی زانستیو زانیاریو فێرکردنی خوێندنەوەی قورئان، پەندو ئامۆژگاری دادان، خێرو چاکە کردن وبەخشین بەهەژاران، دەستگیرۆیی موحتاجان، بەزەیی هاتنەوە بەهەتیو وبێوەژنان ، بەدەنگەوە هاتنو کردنەوەی گرێ کوێرەکانی کێشەو تەنگو چەڵەمەکانی لێ قەوماوان، لابردنی خەم و خەفەتو شپرزەییەکان، فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردن لەخراپەوگەلێکی تر لەم جۆرە کارو کردەوە چاکانە کەبەویستی خوا لەدواتردا بەدرێژی باسیان لێوە دەکەینو دەی خوێننەوە.

- هەروەها لەوانە: پارێزگاری کردنی داوێنوزمانو چاو داخستنونەڕوانینی حەرام(غض البصر) خوای گەورە دەفەرموێ:﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ﴾[1] النور:٣١. (واتا: ئەی محمدﷺ بەئافرەتانی موسڵمانان بڵێ: باچاوی خۆیان لەئاست پیاوانی بێگانەدا دابخەن وتەماشای حەرام مەکەن و بادامێنی خۆیان بپارێزنو زینا نەکەن). وەرگێڕ( وە پێغەمبەرﷺ لەفەرمودەی ڕابردودا فەرموی(وحفظت فرجها) لەخاڵ بەندی مەرجەکانی چونە ناو بەهەشتی دانا.

بەداخەوە کەزۆرێك لەخوشکان زۆر کەمتەرخەمو سستی دەنوێنن لەئاست ئەندامەکانی خۆیان جڵەوی چاویان بەرەڵا دەکەنو حەرام وحەڵاڵی پێ دەبینن چ

( ١) شێخی دکتۆر أبو زید ڕوەکانی شاهیدی وبەڵگەکانی لەئایەتە پیرۆزەکانی کەلەکتێبە بەنرخەکەی خۆی دا (حراسة الفضيلة) دا بەدرێژی باس کردوە.

بەشێوەی ئاسایی‌و چ لەئامێرەکانی تەلەفزیۆن‌و کەناڵەکان‌و لەگۆڤارو ڕۆژنامەکان‌و لەبازاڕداو لەهەمو شوێنێکی تر، هەروەها زمانی خۆیان خستۆتەکار بۆ باس کردنی عەرزو نامووس‌و کاروباری موسڵمانان بەپیاو وبەژنەوە بۆیە زۆر بەئاسایی غەیبەت کردن‌و دوزمانی وفیتنە گێڕان وئاشوب نانەوەو درۆ کردن‌و گەلێ سیفاتی خراپی تر باویان هەیە ئەمڕۆ بونەتە مۆدێلی سەردەم.

– وەلەو کردەوە باشانە ئەنجامدان‌و دانی مافەکانی مێردەکەیەتی، گرنگی‌و بایەخدان پێ ی لەبەر گەورەیی‌وبایاخی سایەی ئەو پیاوەو جەخت کردنەوەی پێغەمبەرﷺ لەم بارەوە، وەلەبەر ئەوەی مافی مێرد لەسەر ژن لەگرنگترین مافەکان لەدوای مافەکانی خوای بالاّ دەستوکاربەجێ‌و پاك‌و بێ گەرد دەژمێردرێت.

وەلەمافەکانی مێرد لەسەر ژنان ئەمانەی خوارەوە دەکەونە بەر چاو:

* ڕازی کردن‌و توڕە نەکردنی مێرد بەهیچ شێوەیەك.

* ئەنجامدان‌و هەستان بەکاروبارە تایبەتیەکانی مێرد لەجل‌و بەرگ‌و لەخواردن‌و لەخواردنەوەوهەمو پێداویستیەکانی.

* چاوەدێری کردنی نەفسیەت‌و دەرونی مێرد.

* زۆری بێزار نەکەیت بەداواکاری‌وشتی زۆرەوە بەتایبەتیش ئەگەر مێردەکەت دەستی کورت بو(کورد گوتەنی بەقەد بەرەی مێردەکەت پێ ڕابکێشە.وەرگێڕ).

* هەمیشە لەسەر کردەوەی باش هانی بدە وڕێنومایی باشی بکە.

* بۆ لای خوا بانگی بکە، بەتایبەتی ئەگەر مێردەکەت لەم بوارەدا کەمتەرخەم بو، زۆر بەنەرم ونیانی ئامۆژگاری بکەو لەگەڵی دا بجوڵێوە.

* لەسەر ئیش‌و کارەکانی هانی بدەو هەمیشە ورەی بەرز بکەوە.

* لەهەمو کاروکردەوەو ڕێگەیەکی خێردا پاڵ پشت‌ویارمەتی دەری بە.

* فرمانەکانی جێ بەجێ بکەو لەقسەی دەرمەچو، مەگەر کارەکە یافرمانەکانی سەرپێچی خوا بێت ئەو کات بەقسەی بکەیت گوناحبار دەبیت(١).
* لەسەر پێچی وکاری خراپەدا یارمەتی مەدەو خۆی لێ دور بگرە.

ئەمانەو گەلێکی تر گەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت بەدرێژی دەیان خوێنیتەوە.

چوارەم: وەئەوەی کەدەکەوێتە ژێر خاڵبەندی بەرپرسیەتی لەنەفسی خۆی: پارێزگاری کردن و دورخستنەوەی نەفسی خۆی لە سەرپێچی و کارە بەهیلاك بەرەکان وداخستنی هەمو دەرگاو پەنجەرەکان لەرِوی شەیتان، سەرکەوتن وجڵەوگیری هەواو ئارەزوەکانە. ئەوەی لێرەداو لەم بوارەوە بگوترێت و دەقی لەسەر هاتبن ئەمانەی خوارەوەن:

- سستی نەکردن لەفرمانی بەندایەتی وپەرستشیە ڕاستەوخۆکان بۆ خوای پاك وبێگەرد وەك سستی کردن لەنوێژ کردن وڕۆژو گرتن، بەتایبەتیش نوێژ نەکردن لەکاتی خۆی دا.
- وریا بون لەنەفس نزمی ومتمانە نەبون بەخوای گەورەوپاك وبێگەرد وباڵا دەست و شوێن نەکەوتنی جادوگەرو سیحربازو قۆڵبڕو دەجالەکان و فاڵ گرەوەکان و کاهینەکان و خوێنەرەوەکانی دوارِۆژە چارەنوس ولەم جۆرانە لەئەهلی کوفر خراپەکاران و سەرلێشێواوان وگومراکان مەکەون ، کەبەداخەوە زۆرینەی ئەوانەی بەدوای ئەم جۆرە کەسانەدا هەڵوەدان لەچینی ژنانن.
- دورکەوتنەوە لەسەرپێچیەکانی خوای گەورە : کەم وزۆر، بچوك وگەورە،وریا بون لەوەی نەبادا بکەویتە ناویەوە،کەدەقێکی زۆر هەن کەفرمان بەمە دەکەن هیچ دەقێك نیە کەفرمان بەگوێ ڕایەڵی وبەندایەتی کردن بۆ خوا کردن بکات ئیللا بەڕاشکاوی ئاگاداریشمان دەکاتەوە لەسەرپێچیەکان.

---

(١ (( لاطاعة لمخلوق فی معصیة خالق) واتە بەهیچ شێوەیەك نابێ گوێ ڕایەڵی دروست کراوەکانی خوا بکرێت لەسەرپێچی کردنی بەدی هێنەر کەخوای گەورەیە.·وەرگێر) .

ـ ئاگادار بە نەكەویتە ناو باس كردن و غەیبەت كردنی ئافرەتانی موسڵمان كەلەناو زۆرێك لەژناندا تەشەنەی كردوەو بوەتە میوەی ناومەجلیسی غەیبەت كردن ودوزمانیو فیتنە بازیو قسەی ساختەو بوختان وتوانج وتەشەنەدانو پلار تێ گرتنەلەسەرفلان پیاوەو لەسەر فلان ژنە.

ـ وریابە نەكەویتە ناو داوی لاسایی كردنەوەو خۆ چواندن بەئافرەتانی كافران لەڕواڵەت، موعجیب بیت پێ یانەوە، شوێن خو ورەوشتیان بكەویت ولەجل وبەرگ دا لاسایان بكەیتەوەو ڕەچاوی ئەو پۆشاكە هاوردەو نامۆیە بەرەوشت وپۆشاكی شەرعی، بەجۆرێك وای لێ هاتوە كەزۆرێك لەژنانی موسڵمان شوێن هەمو قرەكەرێك دەكەوێت چ پیاوو چ ژن لاسایی دەكاتەوە لەشێوەو لەقژو لەپۆشاكو جلو بەرگولە هەمو شتێك دا.

ئەمە ئەو نمونانە بون كەئافرەتی موسڵمان دەبێ زۆر خۆیان لێ بپارێزێتو وریا دار بێت ، چونكە چۆن لەسەر ئەنجامدانی كاری چاكەو گوێ ڕایەڵی فرمانەكانی خوای گەورەو پێغەمبەری خوا ﷺ پاداشت وەردەگریتەوە ئاواش لەسەر وازهێنا وپشت كردن لە سەرپێچیەكانیان پاداشت دەدرێیتەوە بۆیە بەرپرسیارێتی ئافرەتی موسڵمان بەرامبەر بەوازهێنانو دور كەوتنەوە لەسەرپێچیەكانی خواو پێغەمبەری خوا گەورەیە بەرهەمەكەی دەچنێتەوە، هەروەكوچۆن بەرپرسیاریەتی دەربارەی گوێ ڕایەڵیو فەرمانبەرداری خوای گەورە گەورەیەوبەرهەم دەچنێتەوە.

## چوارچێوەی دووەم: بەرپرسیاریەتی ئافرەتی موسڵمان لەناو ماڵەکەیدا:

ماڵ: ئەو شانشینە بچکۆلانەیە کەتوخمە سەرەکیو بنەڕەتیەکان لەباوەش دەگرێت کەبەزۆری بریتن لەمانە:(مێردو ژن ودایك وباوك ومنداڵەکان)ئەمەش بەخششو نیعمەتێکی خوایە کەخوای گەورە بەبەندەکانی داوە هەروەکو دەفەرموێ:﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنًا﴾.(واتا: خوای گەورە ماڵ وخێزانی پێ بەخشیون تا تیادا بحەسێنەوەوەرگێڕ(، بەهاو نرخی ئەم ماڵە نازانرێت تەنیا لای ئەو کەسانە نەبێت کەلە پەناگەو چادرو لەسەر شەقامەکانو لەژێر پردەکانو لەسەر جادەو ڕێگاکاندا ژیان دەبەنە سەر. خێزان نیعمەتێکە بەتایبەتمەندیو جیاکاریەکانیو بەهەمو کارو بارەکانیەوە، ئەندامانی لەگەرماو لەسەرماو پێوەدانی مارو مێورو مەگەز(القر) دەپارێزێت. خوای گەورە ئەو نازو نیعمەتە بەرزەی بۆ باس کردوین لەقورئانی پیرۆزدا کەدەفەرموێ:﴿ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنًا﴾ النحل:٨٠.

إبن كثير دەربارەی ئەم ئایەتە دەڵێ: ( خوای باڵا دەست وکاربەجێ تەواوی نازو نیعمەتەکانی خۆی بۆ بەندەکانی خۆی باس کردوە کەماڵو خانوو شوێنی نیشتەجێ ی بۆ فەراهەم هێناون کەتیایدا دەحەوێنەوەو دەگەڕێنەوە ناویو خۆیانی پێ دادەپۆشنو بەهەمو شێوەیەك سودی لێ وەردەگرن([1]).

لەبەر گرنگیو بایەخی ئەم ماڵو خێزانەو گەورەیی ئەرکو کارو بارەکانی بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام کاروبارو فرمانەکانی زۆر حەکیمانە ڕێك خستوەو ئەرکی سەرشانو بەرپرسیاریەتیەکی تۆکمەی دابەش کردوە بەسەر ئەندامانو توخمەبنەڕەتیەکانی ئەم

---

(١) تفسير إبن كثير، تفسير سورة النحل آية ٨٠.

خێزانە وبەتایبەتیش ئەوەی کەپەیوەستە بەئافرەتی موسڵمانەوە کەبریتیە لە: دایك لەماڵدا، هەروەها بریتیە لە لەژن واتەخێزانی پیاو، کچ وخوشك، بۆیە مافی ئافرەت لەماڵدا گەلێك زۆرو گەلێك گەورەیەو بەرپرسیاریەتیەکەی گەورەترە لەئەندامەکانی تر لەو شانشینە بچکۆلانەیەدا کەدوژمنانی ئیسلام زۆر چالاکانەو لێبڕاوانە هەوڵی تێك دانو هەڵوەشاندنەوەی دەدەن،بۆ؟ چونکی پەنجەرەو دەلاقەیەکی زۆر گەورەو قاییمە لەسەر کۆمەڵگادا گەر ئەو کرایەوە ئیدی دەست بەسەر ئەو کۆمەڵگایەدا گیرا وئەگەر ئەو خراپو بۆگەن بو ئیدی ئەو کۆمەڵگایەبەگشتی هەمو بۆگەنو خراپ دەبێت ، بۆیە ئەوان بەرەو ڕوی دوتوخمی گرنگ وگەورە چون لەکۆمەڵگای ئیسلامی دا کەبریتین لەئافرەتو لەمنداڵ.

**١ـ ڕێڕەوە( منطلقات ) شەرعیەکان لەئەرك و بەرپرسیاریەتی ئافرەت لەناو ماڵەکەی دا :**

ڕێڕەوە شەرعیەکان لەبەرز کردنەوەی ئەرك وبەرپرسیاریەتی ئافرەت پێ دادەگرێتکە بەرپرسیاریەتیەکی پارێزگاریە لەمیانەی ئەوەی کەئەو بەرپرسیاریەتیەی ئافرەت ئەمانەتێکی گشتی داوا کراوە (مكلفة بها) خوای گەورە وبالاّ دەست دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَخُونُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ وَتَخُونُوٓاْ أَمَٰنَٰتِكُمۡ وَأَنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ٢٧﴾ (الأنفال:٢٧)[١].

هەروەها ئەم بەرپرسیاریەتیە لەوەوە دەردەچێت کەبەرپرسیاریەتیەکی پارێزەریە(وقائية) ئافرەت ناچار دەکات کەپێیەوە پابەند بێت هەروەکو چۆن پیاو ناچارە کەپێیەوە پابەند بێت.خوای بالاّ دەست وکاربەجێ دەفەرموێ:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾ (التحريم:٦). (واتا: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە خۆتان وماڵ ومنداڵەکانتان بپارێزن لەئاگری دۆزەخ ئەو ئاگرەی کە سوتەمەنیەکەی مرۆڤەکان وخەڵك وگابەردی زل زل وگەورە گەورەن و چەندان فریشتەی بەرپرسیاری لەسەرن کەزۆر

---

( ١) واتە : ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە خیانەت لەخواو لەپێغەمبەری خوا ﷺ مەکەن بەوەی کە خیانەت لە سپاردەو ئەمانەتەکانتان بکەن . (وەرگێڕ).

ڕق ئەستور وبەهێزودڵ ڕەقن هەرگیز سەرپێچی خوای گەورە ناکەن وهەر فرمانێکیان پێ بکات ملەجرِێ ی لێ ناکەن وخۆی لێ نابوێرن وسستی نانوێنن ودەست بەجێ وخێرا جێ بەجێ ی دەکەن.(وەرگێڕ). وەهەروەها شەریعەتی ئیسلام بەو چاوە دەڕوانێتە ئەو بەرپرسیاریەتیانە کەچاوەدێریەکی گشتی بەرپرسە لەسنوری دەسەڵاتەکانی (صلاحیات) ی جەمسەری ناو ماڵی مێردو ژن.

لەهــەردو فــەرمودە ڕاســتەکاندا(الــصحیحین) کەلــەإبن عمــرەوە رضي الله عنه هاتوەکەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ ألا كلكم راعٍ وكلُّكم مسؤولٌ عن رعيتهِ إلى أن قـال ــ والمرأةُ راعيةٌ على بيت بعلها وولده وهي مسؤولةٌ عنهُمْ} (واتـا: هـەر یـەکێ لـەئێوە شـوان وچاودێرە بەسەر ئەوانـەی کەلەبـەر دەسـتاندان وبـەو ئەرکـەی کـەپێ ی دەسـپێردرێت ، تادەگاتە ئەو شوێنەی کەدەفەرموێ :{ئافرەت چاودێر و شـوانە بەسـەر مـاڵی مێردەکـەی وبەسەر منداڵەکانی داو چاودێرە بەسەریانەوە.(وەرگێڕ).

هەروەها بۆچونی ئیسلام بۆ ئەو بەرپرسیاریەتە ئەوەیە کەجەخت لەسەر بایـەخی هاوسەنگێتی و هاوتەریبی لەمافـەکانو ئەرکـەکان لـەنێوان ژنو پیـاودا دەکاتـەوە.ئـەهلی سوننە لـە عمـری کـوڕی عاصـەوە ڕیوایـەت دەکـەن کـەگوێ ی لەڕەسـولی خـوا ﷺ بـوە لەحەجی ماڵ ئاوایی دا، کەدەی فەرمو:{ألا إنَّ لكم على نسائكم حقاً ولنسائكم عليكم حقاً: فأمـا حقكـم علـى نـسائكم فـلا يـوطئن فرشـكم مـن تكرهـون، ولا يـأذن فـي بيـوتكم لمـن تكرهون، ألا وحقهنَّ عليكم أن تحسنوا إليهن في كسوتهنَّ وطعامهن}[1]. واتـا: ئایـا دەزانـن کەئێوەی پیاو مافتان بەسەر ژنەکانتانەوە هەیە وهەروەها ئەوانیش مافیـان بەسـەرتانەوە هەیە. مافی ئێوە بەسەر ژنەکانتانەوە ئەوەیە دەبێ ژنـەکانتان نـەهێڵن هەرکەسێك ئێـوە چارەتان نەوێت وپێتان خۆش نەبێت بێتە سەر فەرش وماڵەتانەوە وپێ بنێنـە ماڵتانـەوە

(١ ) رواه الترمذي برقم(١١٦٣) في الرضاع، باب ماجاء في حق المرأة على زوجها، وإبن ماجة برقم(١٨٥١) في النكاح، باب حق المرأة على الزوج قال الترمذي هذا حديث حسن صحيح.

و خیانەتان لێ نەكەن ومۆڵەتی كەس نەدەن بێتە ناو ماڵەكەتانەوە كەئێوە خۆشتان ناون وچارەتان ناون. وەمافی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە بریتیە لە تەواوی مافی خۆیان و دەبێ مافی خۆیانیان پێ بدەن لەهەمو ڕویەكەوە لەجل وبەرگ و پۆشاك ولەخواردن وخواردنەوەو لەگەڵیاندا باش بن و هەڵس وكەوتی باشیان لەگەڵدا بكەن وستەمیان لێ مەكەن .٠وەرگێڕ ).

## ٢ ـ درێژەی ئەو بەر پرسیاریەتە( تفاصیل تلك المسؤولیة ):

## أ ـ بەرپرسیاریتی ئافرەت بەو سیفەتەی كەژنی ( خێزانی ) پیاوە:

ئەم بەرپرسیاریەتیە بەئەركی سەرەكی سەر شانی ئافرەت دادەنرێت دەربارەی مێردەكەیو مافی مێردەكەیو لەمافی باوكی گەلێك گەورە ترە بەسەر شانیەوە لەكاتێك دا مافی باوك ودایك لەدوای مافی خوای گەورەوەن كەچی مافی مێرد بەسەر ژنەوە هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ النساء:٣٤). (واتا: ج پیاوان بالاّ دەستن بەسەر ژنانەوە بەو یاساو ڕێسایەی كەهەندێكتان بەسەر هە ندێكتا ندا بەرز كردۆتەوە .(وەرگێڕ).ونكە پیاو بەرپرسە لەپاراستنو بژێوی وژیانی ئافرەتو بەتوانا ترە لەڕوی هێزی جەستەییو مەعنەویو غیرەتو تواناوە بەسەر ئافرەتو بەسەر بوارەكانی ژیانی دنیایی دا وچاودێرو سەرپەرشتیاری كاروبارەكانیەتی.دەربارەی پیاو لەبەرامبەر ژنەكەی دا ﷺ فەرمویەتی:{لایصلح لبشرٍ أن یسجد لبشرٍ، ولوصلح لبشرٍ أن یسجد لبشرٍ لأمرت أن تسجد لزوجها من عظم حقه علیها}[1]. (واتا: ناكرێ ونابێ ودروست نیە كەمرۆڤ كڕنۆش بۆ مرۆڤ بەرێت، خۆ ئەگەر ببوایە مرۆڤ كڕنۆش بۆ مرۆڤ بەرێت ئەوە فرمانم دەكرد بەئافرەت كەكڕنۆش بۆ مێردەكەی بەرێت لەبەر گەورەیی مافی مێرد بەسەر

---

(١ ) رواه أحمد فی باقی مسند المكثرین برقم(١٢٢٠٣).

ژنەوە.(وەرگێڕ). وەپرسیار لەعائشە(رضی الله عنها) کرا: چ کەسێك مافی لەهەمو کەس گەورە ترە بەسەر ژنەوە؟ گوتی: مێردەکەی. وەهەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {أیما إمرأةٍ ماتت وزوجها عنها راضٍ دخلت الجنّة}[1]. (واتا: هەر ئافرەتێك بمرێت ولەدنیادا مێردەکەی لێ ی ڕازی بوبێت ئەوە بەدڵنیاییەوە ئەو ژنە دەچێتە بەهەشتەوە.(وەرگێڕ).

**مافەکانی مێرد بەسەر ژنەوە لەم خاڵانەی خوارەوەدا گرد دەبنەوە:**

- گوێ ڕایەڵی ڕەها بۆ مێردەکەی تەنیا لەسەرپێچیەکانی خوادا نەبێت .پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {إذا صلّتِ المرأةُ خمسها، وصامت شهرها، وحفظت فرجها، وأطاعت زوجها قیل لها: أدخلی الجنّةَ من أی أبواب الجنّة شئتَ}[2]. لەپێغەمبەریان ﷺ پرسیار کرد:کام ژن لەهەموان باشترو چاکترە؟ فەرموی: {الّتی تسره إذا نظر، ویطیعهُ إذا أمر، ولا تخالفه فی نفسها ومالها بما یکره}[3]. (واتا: ئەو ژنەی گەر مێردەکەی تەماشای بکات و پێ ی دڵخۆش وگوشاد ببێت واتە خۆی بۆ مێردەکەی ڕازاندبێتەوە نەك بۆ خەڵکی تر وەکو ئافرەتانی ئەمڕۆ ڕەچاوی دەکەن بۆ مێردەکەشی بۆگەن وچرچ ولۆچ وناشیرین. وەدەبێ ڕو خۆش و ڕوگەش بێت لەگەڵ مێردەکەی داو واڵاو کراوە بێت بۆی و خۆی لێ نەگرێتەوە واتە. وەئەگەر مێردەکەی هەر فرمانێکی پێ کرد بەگوێ ی بکات وخۆی لێ نەگرێتەوە واتە ئەگەر داوای کاری سێکسی شەرعی لێ کردنابێ خۆی نەدات بەدەستەوەو ملی خۆی بابدات، بەڵکو دەبێ گورج خۆی بۆ ئامادە بکات بەشێوەیەك خۆی بۆ بڕازێنێتەوە و کەیف خۆش و دڵخۆشی بکات و وەڵامی بداتەوە،هەروەکو لەفەرمودەیەکی تردا ﷺ فەرمویەتی: هەر ژنێك کەمێردەکەی داوای کاری شەرعی لێ کرد ئەگەر دەستی لەهەویریش دابێت دەبێ دەست هەڵ بگرێت وداواکاری مێردەکەی جێ بەجێ بکات ، لەفەرمودەیەکی تردا

---

( ١ ) أ ـ رواه الترمذي برقم(١١٦١) في الرضاعن باب ماجاء في حق الزوج على المرأة، وقال هذا حديث حسن غريب، وابن ماجة برقم(١٨٥٤) في النكاح، باب حق الزوج على المرأة.

( ٢ ) لەڕابردودا ولەلاپەڕە() (تخريج )ەکەیمان و واتاکەیمان نوسی.

(٣ ) أ ـ رواه النسائي برقم(٣٢٣٣) في النكاح، باب أي النساء خيرٌ.

فەرمویەتی: ئەگەر شەو مێرد داوای کاری شەرعی لە ژنەکەی کردو وەڵامی نەدایەوەو داواکەی جێ بەجێ نەکر فریشتەکان تا بەیانی نەفرین لەو ژنە دەکەن.وەنابێ هەر کارو هەر شتێك مێردەکەی پێ ی خۆش نەبێت بیکات. وەرگێڕ).

ـ هەڵس و کەوت کردنی باش لەگەڵ مێردەکەی و خراپ نەبون لەگەڵی داو ئازار نەدانی ، هەمیشە ڕازی کردن‌و چاودێری کردنی دەرونی مێردەکەی‌و نەرم‌و نیانی لەگەڵی دا.

پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{لاتؤذی إمرأة زوجها فی الدنیا إلاّ قالت زوجته من الحور العین: لاتؤذیه قاتلك اللهن فإنّما هو عندك دخیلٌ یوشك أن یفارقك إلینا}[1]. ( واتا: هەر ژنێك لەدنیادا مێردەکەی ئازار دەداتو لەگەڵی دا خراپە حۆریەکانی بەهەشت کەهی ئەو پیاوە بڕوادارەن بەو ژنە دەڵێن: ئازاری مەدە هەی خوای گەورە لەناوت بەرێت، ئەو پیاوە ئێستا لەدنیادا لەگەردنی تۆدایە و ئەمانەتە لات هاکا بمرێت ولێت جیا ببێتەوە وبێت بۆ لای ئێمە.(وەرگێڕ).

ـ خۆ شیرین کردن‌و دەربڕینی خۆشەویستی بۆ مێرد، بەوەی کەهەمیشە کەخۆتی لاخۆشەویست بکەیت وهەمیشە بەڕاستی لەناخی دڵەوە خۆشت بوێت ولەڕوی دا هەم دەم ڕوخۆش‌و دەم بەزەردەخەنە بیت‌و لەگفت‌و گۆو قسە کردن لەگەڵی دا نەرم‌و نیان بیت، ئەوەتەخوای گەورەژنانی بەهەشت بە(عُرُباً أتراباً) لە سورەتی (الواقعة:٣٧) دا باس دەکات.وشەی (العروب) بەواتای ڕو خۆش‌و ڕو گەش‌و خۆشەویست دێت لەڕوی مێردەکانیاندا.

ـ لەکاتی لەماڵ نەبونی مێرد دا دەبێ نەفسی خۆی‌و ماڵ‌و منداڵی مێردەکەی بپارێزێت. کەپێشتر فەرمودەمان لەسەر هێنایەوە .

ـ ئەگەر مێردی ژن لەماڵ بو نابێ بێ مۆڵەتی مێرد ڕۆژوی سوننەت بگرێت. ئەوەتە پێغەمبەرﷺ لەم بوارەوە فەرمویەتی:{لایحل للمرأة أن تصوم وزوجها شاهدٌ إلاّ بإذنه،

---

(١ ) رواه الترمذی برقم (١١٧٤) فی الرضاع ، باب الوعید للمرأة علی إیذاء المرأة زوجها ، وإبن ماجة برقم (٢٠١٤) فی الطلاق، باب فی المرأة تؤذی زوجها.قال الترمذی: حدیث حسن.

ولا تأذنَ فی بیتهِ إلاّ بإذنهِ}[١]. (واتا: ئەگەر ژن مێردەکەی لەماڵ بـو نـابیٚ و دروسـت نیـە ڕۆژوی سوننەت بگرێت مەگەر بەمۆڵـەتی مێردەکـەی بێـت، هـەروەها نـابیٚ ودروسـت نیـە کەس بهێڵێ بێتە نـاو مـاڵی مێردەکـەی، یـاخود شـتێك لـەماڵی مێردەکـەی بـدات بەکـەس وبیبەخشێ و لێ ی حەرامە مەگەر بەمۆڵەت وپیٚ خۆش بونی مێردەکەی بێت .(وەرگێڕ).

ـ پاراستن‌و ئاگاداری کردنی ماڵی مێردەکەی نابیٚ بهێڵێ هیچ کەسێکی بێگانـە پـیٚ بنێتـە ناوماڵەکەیەوە کەمێردەکەی پیٚ ی ناخۆش بێت ئـەو کەسـە بێتـە نـاو ماڵەکـەی جابـا ئـەو کەسە برای ژنەکە خۆشی بێت، پێغەمبەرﷺ فەرمویـەتی: {ألا إنَّ لكـم علـى نـسائكم حقـاً ولنسائكم عليكُم حقاً: فأماً حقكم على نسائكم فلا يوطئنَّ فرشكم من تكرهونَ، ولا يؤذن فی بيوتكم لمن تكرهون، ألا وحقهنَّ عليكم أن تحسنوا إليهنَّ فی كسوتهنَّ وطعامهنَّ}[٢].

ـ نابیٚ باری سەر شانی مێردەکەی زۆر قورس بکات‌و ڕۆژانە داواکاری زۆری لیٚ بکات لەڕۆزی‌و ڕسق‌و بژێوی قورس‌و جل‌و بەرگ‌و بەدوای مۆدێل‌و مۆدیلکاری دا وێڵ بێت‌و هەمیشە داوای دڕو دەرمان‌و جروجانەوەری ماکیاج‌و خۆ جوان کردن‌و شتی وا بکات کەکۆڵو باری سەر شانی مێردە چارەڕەشەکەی ئەوەندە قورس بکات نەتوانێت لەبنی دا هەڵ بستێتەوەو سیٚ بەندەی پشتی بشکێت، دەبیٚ بەزەیی بەمێردەکەی دابێتەوەو لەقەد بەرەکەی ئەو پیٚ رابکێشێت‌و پتر لەتوانای خۆی داوای لیٚ نەکات. ئەوەتە خوای باڵا دەست‌و کاربەجیٚ دەفەرمویٚ:﴿ لِيُنفِقْ ذُو سَعَةٍ مِّن سَعَتِهِۦ ۖ وَمَن قُدِرَ عَلَيْهِ رِزْقُهُۥ فَلْيُنفِقْ مِمَّآ ءَاتَىٰهُ ٱللَّهُ ۚ﴾ الطلاق:٧. (واتا: پێویستە بەپیٚ ی تواناو دەست ڕۆیشتویی خۆیان ماڵ خەرج بکەن وزێدە ڕەوی نەکەن دەبیٚ ئافرەتان بەپیٚ ی تواناو دەست ڕۆیشتویی مێردەکانیان

---

(١) رواه البخاري برقم (٥١٩٥) فی النكاح، باب: لاتأذن المرأة في بيت زوجها لأحدٍ إلاّ بإذنـهِ، ومسلم برقم (١٠٢٦) في الزكاة، باب ما أنفق العبد من مال مولاهُ.

(٢) (تخریج) و واتاکەیمان لەلاپەڕە(٢٦) وپەراوێزی ژمارە(٤٤) دا نوسیوە.(وەرگێڕ).

خەرج بکەن وئەرکی سەر شانی مێردەکانیان قورس نەکەن تا ئەو کاتەی کەخوای گەورە ماڵی پێ دە دان با ئەو کات بەپێ ی بونی خۆیان خەرج بکەن وزیادە ڕەوی نەکەن. وەرگێڕ).

ــ هێنانــە دی خواســتو داواکاریــە تایبەتیــەکانی مێردەکــەیو نــابێ بــەبێ عــوزر خــۆی لێ بگرێتەوەو بەدەنگیەوە نەچێت ئەوەتە لـەم بـوارەدا فـەرمودە هـاتوە کەفەرمویـەتی: {إذا دعا الرجل إمرأتهُ إلىَ فَراشهِ لإأبت أن تجيء لعنتها الملائكة حتـى تـصبح}[1]. (واتـا: ئەگـەر مێرد(پیـاو) داوای سـەرجێ یـی لەژنەکـەی کـردو داواکـەی جـێ بـەجێ نـەکرد وسـەرجێیی نەکرد و وەڵامی نەدایەوە ئەوا فریشتەکان نەفرەت لەو ژنە دەکـەن تـا بـەیانی دەبێتـەوە. وەرگێڕ).

ــ خـۆ جـوان کـردنو خـۆ ڕازاندنـەوە بـۆ ئـەوەی سـەرنجی مێردەکـەی بـەلای خـۆی دا ڕابکێشێت،وا لەمێردەکەی بکات کەهەمیشە خەیاڵو ئەندێشەکانی بەدەوری بالآی خۆیەوە کێشو گیرۆدە بن، تائەو مێردە چاوەکانی لەئاستی حەرامدا بەرەلآ نەکاتو لەئاست ژنـانی تری بێگانەدا چاوەکانی دابخاتو توشی کاری خراپ وحەرام نەبێتن دەبێ هەمیـشە هـەوڵ بدات وبزانێت مێردەکەی بەچ جۆرە خۆڕازاندنەوەیەك کـەیف خـۆش دەبێـت بـەو شـێوەیە خۆی بۆ برازێنێتەوە، نابێ بهێڵێ چاوی ئەو مێردەی لەخۆی دا لـەجوانیو سـەرنج ڕاکێش بەولاوە هیچی تـر ببینێـتو بەکـەیفی ئـەو خـۆی جـوانو ڕازاوە بکـاتو نـابێ مێردەکـەی لەبۆنی خۆش بەولاوە هیچ بۆنێکی تری لێ بون بکات،(واتە خۆی بۆ مێردەکـەیو بەکـەیفی مێردەکەی خۆی بۆن خۆشو ڕازاوە بکات.وەرگێڕ)هەروەکو نابێ لەقـسەی خـۆشو نـەرمو هیچ قسەیەكو دەربڕینو دەستەواژەیەکی جوانو ڕێـكو پێکـی تـر بـەولاوە هیـچی تـری لێ نەبیستێتو ڕو گرژو قسەڕەقو دڕدۆنگ نەبێت لەگەڵی دا.

---

( ١) رواه البخاري برقم (٥١٩٣) في النكاح، باب إذا باتت المرأة مهاجرة فراش زوجها، ومسلم برقم (١٤٣٦) في النكاح، باب تحريم إمتناعها من فراش زوجها.(وەرگێڕ).

ـ ددان نان بەبەخشندەیی‌و فـەزڵی پیاوەکـەی‌و سـپڵەو پـیٚ نـەزان نـەبێت لەئاسـت نـازو نیعمەتـەکانی دا، چـاکەکانی هـەمو ڕەت نەکاتـەوەو جـارانی(ضـرب) سـفریان نـەکات بەتایبەتیش ئەگەر دڵسۆزی‌و ڕێك‌و پێکی ورەفتـاری بـاش‌و مـل کەچی‌و مکوڕی‌و ڕیـك‌و پێك‌و خزمەت کردنی خۆی‌و مـاڵ‌و منداڵـەکانی لەمێردەکـەی بینـی‌و مێردەکـەی مرۆڤێکـی باش‌و دڵ سافـ‌و هێدی‌و هێمن‌و لەسەرخۆ بوو، پێغەمبـەرﷺ فەمویـەتی:{تـصدقن فـإن أكثركنَّ حطب جهنم} وەهۆیەکەشی ڕون کردنەوەو فەرموی.{لأنَّكنَّ تكثرن الشكاة وتكفرن العشير)[1]. (واتا: خێرو چاکە زۆر بکەن، چونکە زۆربەی ئێوەی ژنان سوتەمەنی ودەسـتە چیلەی ئاگری دۆزەخن . نوێنەری ئافرەتان گوتی : ئەوە هۆی چی یە ئـەی ڕەسـولی خـوا ؟پێغەمبـەرﷺ وەڵامـی دانـەوەو هۆیەکەشـی بـۆ ڕون کردنـەوەو فـەرموی: زمانتـان ڕاناوەستیٚ و هەمیشە هاوارو فیغانتانەو زۆر شکات کەرو خۆڕانەگرن وهەمیـشە پەرێـشانی حـاڵی خۆتـان دەخەنـە ڕو ولەگـەڵ مێردەکانیـشتان بـەزۆری خـراپن.(وەرگێـڕ). وەلەفەمودەیـەکی تـردا فـەرموی:{لـو أحـسنت إلى إحـداهن الـدهر ثـمَّ رأت منـك شـيئاً قالت:مارأيت منك خيراً قط)[2]. (واتا: ئەگەر مێرد بە درێژایی ژیان چاکە لەگەڵ خێزانـی دا بکات، پاشان یەك خراپەی لیٚ دیتن پی ی دەڵێـت: ئـۆۆۆف بەدرێـژی تەمـەنم چـاکەم لـەتۆ نەدیوە. وەرگێڕ).

ـ لەماڵ دەرنەچون بەبیٚ مۆڵەتی مێرد: هەتاکو ئەگەر بۆ سـەردانی بـاوك‌و دایکیـشی بێـت دەق‌و فەرمودەش لەم بوارەدا گەلێك زۆرن.

ـ ئەنجام دان‌و هەستان بەکارو بارەکانی ناوماڵ‌و سستی نـەکردن تیایـدا لـەئامادە کردنـی خواردن‌و خواردنەوەو پاك‌و خاوێنی‌و هـەمو ئیـشەکانی ناومـاڵ، هـەروەها ئامـادە کـردن‌و ڕاپەڕاندنی کاروبـارە تایبەتیـەکانی مێـرد وەك شوشـتن‌و پـاك ڕاگرتنـی جـل‌و بەرگـەکانی، ئامادەکرنی خواردن‌و خواردنەوەی خۆش بۆی . بوخـاری‌و موسـلم لەفـەرمودەی ئـەسمای

(١ ) رواه مسلم برقم (٨٨٥ ـ ٤) في صلاة العيدين .

(٢ ) رواه البخاري برقم (٢٩) فی الأيمان

كچی ئەبوبەكرەوە ﷺ ڕیوایەت دەكەن كەگوتویەتی:زبێر منی مارە كرد لەسەر ئەم گۆی زەویەدا نەماڵ ونەسامان ونەهیچ شتێكی نەبو بێجگە لەناعور(ناضح) ێك وئەسپەكەی نەبێت، بۆخۆم ئالیكی ئەسپەكەم دەدا، ئاویشم دەدا،.......(أخرز غربه) وهەویریشم دەشێلا ونانیشم بۆ دەكرد(وأعجن).(١)

وەئەمەش فاطمة( رضی الله عنها) كچی پێغەمبەرﷺ لەئەنجامی كاریگەری دەستهاڕ(الرحی) شوێن كردن لەسەر دەستیو تلۆق كردنی داوای خزمەتكارێك دەكات كەیارمەتی بدات لەڕاپەڕاندنی ئیشو كارەكانی دا، پێغەمبەرﷺ ڕێنومایی دەكاتو دەفەرموێ:{ألا أدلكما على ماهو خيرٌ لكما من خادم؟إذا أويتما إلى فراشكما أو أخذتما مضاجعكما فكبر ثلاثاً وثلاثين وسبحاً ثلاثاً وثلاثين وأحمدا ثلاثاً وثلاثين، فهذا خيرٌ لكما من خادم.}(٢). (واتا: ئایا حەزدەكەن شتێكتان فێر بكەم گەلێك باشتر بێت بۆ ئێوە لەخزكوتكارو پاسەوان؟ ئەگەر شەو چونە سەر جێگە بۆ خەوتن سیو سێ جار بڵێن(الله أكبر) وسیو سێ جار بڵێن(سبحان الله) وەسیو سێ جار بڵێن(الحمدلله). وەرگێڕ).

## ب ـ بەرپرسێتی ئافرەتی موسڵمان بەسیفەتی ئەوەی كەدایكە:

دایك مافێكی یەكجار گەورەی هەیە، بەڵكو لەهەمو مافێك گەورە ترو بەرز ترە لەدوای مافی خوای گەورە هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴿٢٣﴾ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ

---

(١) رواه البخاري برقم (٥٢٢٤) في النكاح، باب الغيرة، ومسلم برقم (٢١٢٨) في السلام، باب جواز إرداف المرأة الأجنبية إذا أعيت في الطريق.

(٢) رواه البخاري برقم (٦٣١٨)في الدعوات، باب التبكير والتسبيح عند المنام، ومسلم برقم (٢٧٢٧) في الذكر والدعاء، باب التسبيح أول النهار وعند النوم.

ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾.( الإسراء:٢٤،٢٣)

(واتا: پەروەدگاری تۆ فرمانتان پێ دەکات کەلەو بەرولاوە هیچ کەس وهیچ بەرنامەیەك وهیچ شتێکی تر نەپەرستن ودوای پەرستن وگوێ ڕایەڵی خوای گەورە ش فرمانتان پێ دەکات کە گوێ ڕایەڵی دایك وباوکتان بکەن وهەمیشە چاکەیان لەگەڵ دا بکەن و هەمیشە نەرم ونیان بن لەگەڵیاندا ومل کەچیان بن. ئەگەر یەکێکیان یاخود هەردوکیان پیر بون دەبێ زۆر چاوەدێریان بکەن وبەوپەڕی مل کەچیەوە خزمەتیان بکەن وهەرگیزاو هەرگیز نابێ لەڕوی یاندا هەرچی پێت بکەن وهەرچی پێت بڵێن تەنیا وشەی ئۆفیش لەبەرامبەریاندا لەدەمت نەیەتە دەرەوە . نەکەی هەرگیز توڕەیان بکەیت یا دەریان بکەیت وخزمەتیان نەکەیت وبێزاری خۆت دەربڕی لەگەڵیاندا ونەیان حەوێنیەوە ئەگەر پیر بون ولێ یان قەوما بەرەڵای کۆڵانان وبەردەرگاو سەرشەقامەکانیان بکەیت هەروەکو ئێستا لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەچاوی سەری خۆمان پیرەژنەو پیرە پیاوەکان دەبینین لەسەر جادەو کۆڵان وشەقامەکان دا وخەڵکی پاروە نان وچۆرە ئاوێکیان لەبەر دەم دادەنێت وجەنابیشتان لەگەڵ ژن ومال ومنداڵی خۆتاندا ژیانێکی های لایف دەبەنە سەرو هەر پێشت عەیبە بڵێ ی ئەوە دایك یاباوکی منە.بۆ کوێ دەچی خۆ نەلەئلسمانی خوادا دەردەچیت ونەلە زەوی خوای گەورەدا دەردەچیت هەشت بەسەر ئەنجام دەگەڕێیتەوە بەردەستی حاکمی هەمو حاکمەکان کەخوای گەورەیە. نەخێر دەبێ هەمیشە قسەوگفتاری نەرم ونیانیان لەگەڵ دا بکەیت وباڵی مل کەچی وڕەحم وبەزەییتیان بۆ ڕابخەیت و زۆر سوپاس وستایشی خوا بکەیت وبڵێ ی: ئەی پەروەردگاری من سۆزو بەزەییت بەدایك وباوکم دابێتەوە ولێ یان خۆش ببیت وهەمیشە چاکەو خێریان بۆ فەراهەم بێنیت وسەربەرز وسەرفرازیان بکەیت هەروەکو چۆن ئەوان منیان بەو هەمو ئازارو ئەشکەنجەو ماندو بون شەو نوخونی ولێبڕاویەوە لەمەلۆتکەییەوە پێ گەیاندوەو گەیاندویانم بەم پیاوە یابەم ژنە جوان وڕێك وپێکەی کەمن ئێستا وام تیایدا خواەیە لێ یان خۆش ببیت وپاداشتی بەخێریان بدەیتەوە آمین.وەرگێڕ).

هەروەها ئەو ئایەتە پیرۆزانەی کەلەم ئایەتە دەچن هەمان چەمکو واتاو کاریان هەیە.

١

وەلە أبی هریتوە ﷺ دەگێڕنەوە کەگوتویەتی:( جارێکیان پیاوێك هاتە خزمەت ڕەسولی خواﷺ وگوتی: کێ مافدار ترین کەسێکە بۆ هاوڕێیەتی لەگەڵ دا کردنی ؟ فەرموی:(دایکت) پیاوەکە گوتی: ئەدی دوای ئەو؟ فەموی:((هەر دایکت)) گوتی: ئەدی دوای ئەو؟ فەرموی: ( هەر دایکت)، گوتی: ئەدی ئەوجار کێ؟ فەرموی:( ئەوجار باوکت).

ئەو مافی دایکەش بریتیە لە چاکە کردنو باش بونو خزمەت کردنی دایکت بەهەمو چەشنەکانی چاکە لەگەڵدا کردنو قسەو گفتو لفتی خۆشو نەرمو نیان جا ئەم چاکە لەگەڵدا کردنە دەبێ بەکردەوە بێتو نەك هەر بەقسەو لەمەیدانی کردەوەشدا هیچت دیار نەبێتو دەبێ بەلەشو بەماڵو بەسەرو سامانەوە بێت. وە لە بەرامبەری ئەم مافانەدا دایکیش بەرپرسیاریەتێکی گەورەی لەئەستۆدایە، بەڵکو ئەمانەتێکی گەورە، و گەورەترینی بەرپرسیاریەتیەلەسەرشانی دایك لەم ژیانە جەنجاڵەدا کەپەروەردە کردنوڕاهێنانی منداڵەکانیەتی لەسەربەرنامەی خوای پەروەردگارو قورئانوسوننەتولەسەرڕەوشتوئاکاری پێشینەی پیاو چاك.

سەرچاوەی ئەم بەر پرسیەتیەش لەفەرمودەی خوای باڵا دەست وکاربەجێوە سەرچاوە دەگرێت کەدەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾[1] التحريم:٦.

الحسن دەڵێ: فەرمان بەمنداڵەکانتان بکەن بە فەرمانداری وتاعەت وگوێ ڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکەن و فێری خێرو چاکەو ڕێگەی ڕاستیان بکەن .پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {کلکم راع وکلکم مسؤول عن رعيته }[2]

ئیمامی (إبن القيم) ڕحمەتی خوای لێ بێت گوتویەتی:( فرمانو ئامۆژگاری خوای گەورە بۆ باوکان لەهەمبەر منداڵەکانیان دا پێش فرمانو ئامۆژگاری کردنی مناڵەکانە لەبەرامبەر باوکیاندا، جاهەر کەسێك پەروەردەکردنو فێرکردنی منداڵەکانی پشت گوێ

( ١) واتاکەیمان لەڕابردودا نوسی.(وەرگێڕ).

( ٢) لەڕابردودا ( تخريج) و واتاکەیمان نوسی.( وەرگێڕ).

خستو گوێ ی پێ نەدانو پەروەردەیەکی ڕاستو دروستی نەکردنو ئامۆژگاری بەکەڵکو سودبەخشی نەکردنو لەشتی خراپو کاری قێزەوەن نەی گێڕانەوەو لەخراپە کاری دەستی نەگرتنو بەرەو چاکەو کاری باش نەی گێڕانەوە، بەڕاستی ئەوە کارێکی یەکجار خراپی کردوە دەربارەی منداڵەکانیو هەرخۆی بەرپرسە لەئاست خراپیو ئاڵۆزیو دەرون نزمی منداڵەکانیو هەر خراپەیەك بکەن گوناح بارە، دەبینین زۆرینەی منداڵەکان کەخراپ دەردەچن خەتای دایكو باوکیانەو گوناحەکان لەئەستۆی ئەواندانو ئەوان کەمتەر خەمی تیادا دەکەن گوێ یان پێ نادەن وهەروا بەفشە بەرەڵایان دەکەن وپەروەروەردەیەکی موسڵمانانەو باشیان ناکەن وهەرگیز فێری فەرزو سوننەتەکانی دینەکەیان ناکەن، هەربەساوایی لەدەستیان دەردەچن ودوایش دەسەڵاتیان بەسەردا ناشکێن[1]، لەمنداڵیەوە پەروەردەو جۆشوگۆشیان ناکەنو کەگەورەش بون پێ یان ناوێرن ولەدەستیان دا نامێننو جڵەویان لەدەست دەدەن .جانەسود بەخۆیان دەگەیەننو نەسودیش بەدایكو باوكو نەبەدەوروبەری خۆشیان دەگەیەنن. هەروەکو هەندێك لەباوكو دایکان گلەیی وسەرکۆنەی منداڵەکانیان دەکەن کەسەرپێچی دایكو باوکیان دەکەنو لەدەستو دویان دانینو بەڵکو ئازاریشیان دەدەن.منداڵەکانیش لەوەڵامدا دەڵێن:

ـ ئەی باوکی خۆم تۆ بەبچوکیو ساوایی منت تورە کردو پەروەردەیەکی باشت نەکردمو بەرەڵای سەرجادەو کۆڵانەکانت کردمو جڵەوت نەگرتمەوە چ شتێکی خراپو لاساری هەبو کردمو لەسەری ڕاهاتم کەسێکی خواروخراپم لێ دەرچو، منیش ئێستا بەگەورەیی

---

( ١) ئاخر دایك وباوکی ئێستا خۆیان پەروەردە نەکراون لەخراپەو چاکە ناگەڕێنەوە ئەوەی حسابی بۆ نەکەن ئایین وبەرنامەی خوای گەورەیە و پێ یان شتێکی ئەفسانەو کۆنەپەرستیە ، ئەدی چاوەڕوانی چی لەمنداڵەکانی دەکەیت . ئاخر کورد دەڵێ: ( گیا لەسەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە) دەی کەواتە باوك ودایك چۆن بن منداڵەکانیش هەروا دەبن لەوان چاکتر نابن مەگەر ئەوەی کەخوای گەورە هیدایەتی بدات وپێچەوانەی باوك ودایکیان دەربچن وموسڵمانێکی پابەندیان لێ دەربچێت، هەروەها پەندی کوردی دەڵێ: مەنجەڵ چی تێدابێت هەر ئەوەی لێ دەڕژێ.(وەگێڕ).

سەرپێچیت دەکەمو ئازارت دەدەم.بەمندالّی منت لەدەست دا، ومنیش ئێستا بەپیری تۆ لەدەست دەدەم [1].( کوردیش دەڵێ: دارێك كەبەشلكی واتە بەنەمامی دانەهاتو ڕاست نەکرایەوە ئێستا ڕاست نابێتەوەودەشکێ. یاگوتویانە هەرکەسێك لەمندالّیو گەنجی دا پەروەردە نەکرێت یا لەگەڵ باوك ودایکی دا خراپ بێت دوایی لەپیریو لێ قەوماندا مندالّەکانی لەگەلّی دا خراپ دەبنو ڕاست نەکردنو پەروەردە نەکردنی مندالّەکانی دێنەوە ڕێگەی سزاکەیان هەر لەدنیادا دەچێژێتو وەری دەگرێتەوەو سزای ڕۆژی قیامەتیش لەوێ ڕاوەستێ و سەربارو بن بار – وەرگێڕ).

ئەمە کورتەی بەرپرسیەتی باوكو دایك بو، بەلّام بەرپرسیەتی دایك لەبەرامبەر مندالّەکانی دا بەم شێوەیەی خوارەوەیە:

## یەکەم: هەڵبژاردنی باوکی مندالّەکانی:

– سەرەتای بایەخیو گرنگی دانو بەرپرسیەتی لەقۆناغی هەڵبژاردنێکی قورسەوە دەست پێ دەکات، لەهەڵبژاردنو گەڕان بەدوای باوکی مندالّەکانیو هەڵبژاردنو قبول کردنی باوکێکی موسلّمانو پابەند بەبەرنامەی خوای گەورەو باوکێکی باش. دیارە نابێ هەرچی هاتە پێش بۆ خواستنو داواکردن وبەستنی گرێ بەستیو هاوسەرگیرێتی قبولّی بکاتو پێ ی ڕازی بێت پێش لێکوڵینەوەو لێ ورد بونەوە، بەڵکو دەبێ بەو پێ یە بێت کەپێغەمبەر ی خوا ﷺ چەند پێوەرێکی ڕونو بەنرخی بۆ دیاری کردونو بۆی دارشتون لە هەڵبژاردنو قبولّ کردنی مێردەکەی یامێرد بۆهەڵبژردنی دایکی مندالّەکان سەبارەت بەپیاوان.ئەوەتە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:(إذا أتاكم من ترضون خُلُقَهُ ودينهُ فزوجوهُ، إلاَّ تفعلوا تكن فتنة فى الأرض وفسادٌ عريض) (واتا: هەرکەسێك هاتە داخوازیتان یاهاتە داخوازی کچتان، خوشکتان یا هەر کەسێکی ترتا بێت، ئەگەر لەئاکارو ڕەوشت ودینەکەی ڕازی بون ئەوا مێردی پێ بکەن یان کچەکەتان، خوشکەکەتانی .. بدە نێ وخزمایەتی لەگەڵدا بگرن.

---

( ١) لەکتێبی( تحفة المورود ) ل٣٨٧.

ئەگەر وا نەکەن ئەوا فیتنەو ئاشوب لەسەر زەوی دا بڵاو دەبێتەوەو دەبێتە هۆی بڵاو بونەوەی خراپەو خراپەکاریەکی بەربڵاو.(وەرگێڕ).

دەی کەواتە پێوەری ئەم بابەتە گرنگە سێ شتن:( ئایین، ئاکارو ڕەوشت، عەقڵ وژیری ـ الدین،الخلق والعقل).

ئەگەر هاتو ئەم سێ داواکاریانەی تێدا بون ئەوا ئێوە قبولی بکەنو پێ ی ڕازی بن ولەدەست خۆتانی مەدەن، ئەمە تەواو پێچەوانەی ئەوەیە کەئەمڕۆ زۆرینەی خەڵکی بۆی چونو بیری لێ دەکەنەوە، ئاخر هەر کەسێك بڕوانێتەماڵو سامانی کەڵەکە بوی زۆرو بڕوانامەی زانستی و وەزیفەی فەرمی(الرسمی) یابڕوانێتە پلەو پایەی کۆمەڵایەتی یاشێوەو بەژن وباڵاو جوانی یاشۆرەتو ناوو ناتۆرەو ناوبانگی، ئەمانەو هەر پێوەرێکی تر ڕەچاو بکرێت جوێ لەپێوەرەکانی شەریعەتی ئیسلام شتێکی ئەوتۆ نین وجێ ی باس کردن نین لەبەرامبەر ئەو پێوەرو داواکاریانەی کەپێغەمبەری خوا ﷺ بۆی دارشتوینو ڕەنگی بۆ ڕشتوین لەم بوارەدا.

بۆچی؟ چونکە بەختەوەریو خۆشگوزەرانیو ژیانی خۆشو چارەنوسی درەوشاوەیی لەدنیاو لەقیامەتدا لەو پێوەرە جوانانەی پێغەمبەردا ﷺ بەچەنگ دەکەونو دەدرەوشێنەوە.

لەپیاوی بێ دین وخوانەناسو خراپدا حەتمەن ئافرەت دوچاری ستەم وستەم لێ کردن دەبێت، منداڵەکانی بەرەو هەڵدێرو هەڵدێرو مل شکانو لەناو چونو لادانو هەڵدێری کاکی بەکاکی دەبنو سەرگەردان وگومڕاو سەرلێشێواو دەبنو کەسێکی دژوارو ناحەزیان لێ دەردەچێت. گومانی تێدا نیە کەیەکێك ڕەوشتو ئاکاری باشو چاکی تێدا نەبێت کەسێکی سەقەتەو ژیان بردنە سەر لەگەڵ ئەو کەسەدا تاڵ وتفتو قورسو ناخۆشەوخراپ دەچێتە سەرو دوچاری خراپیو هەڵسو کەوتی خراپو وێك هەڵ نەکردن و بەریەك کەوتن دەبن، منداڵەکانی توش دەبن .

وە پیاوی بێ عەقڵ وگێل ژیان لەگەڵی دا زۆر ناخۆشەو ئەو ئلفرەتە ڤوڕ بەسەرە توشی سەدان نەخۆشی دەرونی وەك: نائارامیو تەنگەتێلکەییو ڕاڕاییو وژیانی ناخۆش دەبێت، منداڵەکانیان پێ دامەزراو بەردەوامو ئارام گرتو(الإستقامة)نابنو ئاڵۆزو کەم زاناو نەفامو فام کاڵ دەردەچن چونکە کەس نابێت گوێ یان پێ بدات پەروەردەیەکی زانستیانەو ڕاستو دروستیان بکات. دەی باوکی خواناسو بەدینو خاوەن ڕەوشتو ئاکاری بەرزو جوانو ژیرو زاناو دانا منداڵەکانیان بەجوانترینو بەباشترین شێوە لەسەردینی خوا پەروەردە دەکاتو جوانو دروست گۆشیان دەکاتو بەشێوەیەکی چاكو دروستانە دروستیان دەکاتو دەریان دەهێنێ وئامادەیان دەکاتو بۆ ئەوەی سودیان بۆ دنیاو قیامەتی خۆشیانو منداڵەکانیشیان هەبێت، هەمیشە مکوڕو سور دەبێت لەسەر داڕشتنیان لەقاڵبێکی ئاکارو ڕەوشتو شێوازی جوانو بەرزو بەها بەرزەکاندا.

## دووەم: چاودێری کردنی کۆرپەلەکەی:

ـ گرنگی دانو چاودێری کردنو بایەخ دان بەکۆرپەلەکەی هەر لەوکاتەوەی کەبەسەرەمێکوتەیی لەتۆوی مێردەکەیەوە دەکەوێتە ناو منداڵدان، دەبێ زۆر بەوردی چاودێری تەندروستی ولەش ساخی بدات بەو شێوەی کەسود بەکۆرپەلەکەی دەگەیەنێ، ئەویش بەهۆی خواردنو خواردنەوەی باش وجموجوڵەکانی(حرکتها) شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە کەئافرەتی دوگیان لەکاتو ماوەی درێژی دوگیانی دا دوچاری زۆر هەڵوێستی تاڵو تفتو نەخۆشی دەرونیو جەستەیی دەبێت، دەبێ ئاگادارو تێبینی هەمو ئەو بارانە بێتو وریای کۆرپەلەکەی بێت، بۆ ئەوەی ئەو کۆرپەلەی ساغو تەندروستو تەواو دەربچێت، ئەمەش یارمەتی دەدات لە پەروەردە کردن وپاراستنی کۆرپەلەکەی لەروی تەندروستی و جەستەیی وژیریەوە( صحیاً وجسمیاً وعقلیاً) .

**سێیەم: چاودێری کردنی کۆرپەڵەکەی کاتی منداڵی واتە دوای لەدایك بونی:**

ـ دوای دانانو لەدایك بونی کۆرپەڵەکەو لەو قۆناغە ناسكو گرنگەدا چەند مافێکی ئەو منداڵە بەهاوکاری هەردو لایان واتە دایك وباوکی منداڵەکە دەکەوێتە سەر شانیانو دەبێ بێ سستی وکەمتەرخەمی ئەنجامیان بدەن بۆ پێگەیاندنی منداڵەکەیان وەك چۆن سوننەتی خواو پێغەمبەرﷺ لەسەری واجب کردون کەخۆی لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا دەنوێنێ:

❖ بانگ دان بەگوێ ی ڕاستی دا بۆ ئەوەی بەیەکەمینو شەیەك کەدەی بیستێ با وشەو زاراوەی یەکتاپەرستی خوای گەورە بێت واتەتەنیا خوا پەرستی بێت.

❖ ناونانی بەناوێکی جوانو خۆشو پڕ واتاو ئاگادار بن ناوێکی ناخۆش یان ناوێکی ناخۆش وناوێك نەبێت کەواتایەکی خراپو ناشیرینی هەبێت. یاخود بەناوی کافرانەوە ناویان بنێیت وناوێك بێت دژو پێچەوانەی شەریعەتی خوای گەورە بێت .

❖ لەڕۆژی حەوتەمدا لەگەڵ ناونانی دا سەریشی بتاشن .

❖ بەکێشی موەکانی سەری زیوی بۆ بکەنە خێر.

❖ مەڕە منداڵەی بۆ بکەن، دو مەڕ بۆ کوڕو مەڕێك بۆ کچ، پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی:{الغلام مرتهن بعقيقته، يذبح عنه يوم السابع ويسمى ويحلق رأسه}[1].

(واتا: منداڵ بارمتەیە بەمەڕە منداڵەکەیەوە ( بعقيقته) لەڕۆژی حەوتەمیدا بۆی سەر دەبڕدرێتوناویشی لێ دەنرێتو سەریشی بۆ دەتاشرێت. وەرگێڕ).

ـــ دەبێ گۆ کردنو زمان پژاندنی بەوشەو زاراوەی یەکتا پەرستی خوای گەورە(التوحيد) بێت، چاندنی واتا بەرزەکان لەدڵو دەرونی ئەو منداڵەدا بەتایبەتیش

---

(١ ) رواه الترمذي برقم (١٥٢٢) في الأضاحي، باب من العقيقة، وأبو داود برقم (٢٨٣٧) في الضحايا، باب في العقيقة، والنسائي برقم (٤٢٢٥) في العقيقة، باب متى يعق، وابن ماجة برقم (٣١٦٥) في الذبائح، باب العقيقة.

لەپێنج ساڵی یەکەمدا. توێژەرەوان سەلماندویانە کەمنداڵ لەساڵەکانی سەرەتای ژیانی دا زوترو پتر فێر دەبێت بەپێچەوانەی ئەوەی دایکان‌و باوکان بۆی چون‌و بیری لێ دەکەنەوە[(١)].

ئەوەتە لە٩٠٪ پرۆسەی پەروەردەیی منداڵان لەساڵە سەرەتاییەکانی تەمەنی دا دێتە دی‌و زۆر بەئاسانی وەری دەگرن[(٢)].

جا ئەوەی لێرەدا گرنگە دەبێ ئەو ماوەیەو ئەو قۆناغەی تەمەنی منداڵ بەهەل وەربگیرێت هەروەکو لەداهاتودا بەدرێژی دەی خوێنیەوە. إبن الجوزی دەڵێ: بەهێزترین‌و ڕاوەستاو ترین‌و باشترین پەروەردە کردن‌و ڕاست کردنەوەو گۆش کردن لەتافی ساوایی دا دەبێت. خۆ ئەگەر منداڵ لەوتافەدا واز لێ بهێنرێت وبدرێتە دەست سروشت‌و تەبیاتی خۆی ئەوا لەسەر ئەو سروشتەی خۆی دروست دەبێت‌و بەدوای هەواو ئارەزوەکانی خۆی دەکەوێت‌و لەسەر ئەو ئارەزوەی خۆی گەشە دەکات ئەو کاتە ڕاست کردنەوەی زۆر قورس‌و ناخۆش دەبێت.هەروەکو شاعیر دەڵێ:

---

( ١) چونکە لەسەرەتادا خانەو شانەکانی مێشکی ئەو منداڵە پاك وخاوێن وبەتاڵ وهیچی لەسەر تۆمار نەکراوە و هەروەکو دەڵێن مێشکی منداڵ وەك هەویری خاو وایە زۆر بەئاسانی دەتوانیت هەرشتێکی بتەوێت لێ ی دروست بکەیت و هەر زانیارەکت بوێ لەسەری تۆماربکەیت.

کاتێك ئامۆژگاری باوك ودایکان دەکەیت ودەڵی برام یاخوشکم: هەر لەئێستاوە واتە بەسەری شلکی منداڵەکانت لەسەر دینی خواو یەکتاپەرستی پەروەردە بکەو بیرو باوەڕەکەی تۆکمەو توندو تۆڵ دابرێژە با بیرو باوەڕ وعەقیدەکەی پۆڵاین دابمەزرێت و دروشمەکان و واجباتەکانی خوای گەورەی بخەرە ناومێشکی منداڵەکانت وفێریان بکە .لەوەڵامدا دەڵێن: قەیناکا جاریێ منداڵن باگەورە بېن فێر دەبن . نەخێر ئەمە هەڵەیکی زەق وهەست نەکردن بەبەر پرسیاریەتی وجۆرێك لەبەرەڵا کردن وگوێ نەدانە بەمنداڵەکانت وئەنجام خوارو خیچ ونەزان ولادەرو خوانەناس دەردەچن و سەر لێشێواو دەبن خوای گەورو پەنامان بدات.(وەرگێڕ).

( ٢) کورد گوتەنی:(منداڵ ومێشکی منداڵ هەویری خاوە چی لێ دروست بکەیت، ئەوەی لێ دروست دەبێت.(وەرگێڕ).

إنَّ الغصـون إذا قومـتها إعتدلـت ولا يلين إذا قومته الخشـــــــــب
قـد ينفـع الأدب الأحدث في مهــل وليس ينفع في ذى الشـيبـة الأدب[1]

وەئەوەی لێرەدا گرنگەو پێویستە دایکان وباوکان ئەنجامی بدەنو هەست بەبەرپرسیەتی خۆیان بکەن ئەمانەی خوارەوەن:

- ڕاهێنانی منداڵو فێرکردنو پڕاندنی زمانی بـەویردەکانی (لاإلـه إلاّ اللهَ، محمد رسـول الله، سبحان الله، الحمد لله، الله أكبر، لاحول ولا قـوة إلاّ بـالله) و گـەلێکی تـر لـە زیکرو ویردەکان لە تافی ساوایی‌و منداڵی دا.
- چاندنی خۆشەویستی لەدڵو دەرونی منداڵەکاندا.
- چاندنو ڕسکاندنی گەورەیی خوای گەورەو ترسان لەخوا لەدڵو دەرونی منداڵەکاندا.
- فێـر کـردنو تێگەیانـدنی منداڵـەکانمان لەچـاودێری ئاگـایی خـوای گـەورە بەسـەر خەڵکیەوە.

---

( ١) واتە: ئەگەر دار بەشلکی وبەنەمامی ڕاست بکرێتەوە زۆر بەئاسانی ڕاست دەبێتەوە، بـەڵام ئەگـەر بەدرەختی یا کەبو بـەدارو ڕەق بـو ڕاسـت بونـەوەی زۆر زەحمەتـەو ڕاسـت نابێتـەوە بـەڵکو دەشـکێ. پەروەردە کردن وگۆش کـردن بەرەوشـت وئاکـاری جـوان وبـەها بـەرزەکان لـەتافی سـاوایی دا گـەلێك ئاسان وسود بەخشە، بەڵام کەگەورە بو و کەوتە قۆناغی هەرزەکاری وپێگەیشتن و پـیری ئیـدی دابـی نـاداو هەوڵـدان لەگـەڵی دا بـێ سـود وبـێ هودەیـە دەتـارێ وسـەرکەش وکەڵلـە ڕەق دەبێـت و بـۆت ناگیرێتەوە ولـەرو هـەڵ دەگەڕێتـەوە بەسـەدان کێشەو تەنگژەت بـۆ دەنێتـەوە هـەروەکو لـەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەبینین منداڵەکان بەتایبەتی کوڕان چەندە سەرکێشن وجڵەویا ن لەدەست دەرچوە وسەرو سامان بەباوکیان دەفرۆشن وسەری خۆیان هەڵ دەگرن وبەرەو هەندەران بەرەو وڵاتی کافران دەڕۆن و دەگەن بەو بەهەشتە درۆینەی بۆ ڕۆڵەکان وبۆ گەنجە سەرکەش وناپەروەردەکانی موسڵمانی لە ئـایین وبەرنامەکەی خوای گەورە حاڵی نەبو هێناوەتە کایـەوە وگـەنج ولاوانـی موسـڵمان لـەوڵات وکۆمـەڵگای موسڵمانان دور دەخەنەوە وکۆمەڵگای موسڵمانان لەبەر یـەك هەڵدەوشـێنن ودای دەڕزێـنن بـێ ئـەوەی موسڵمانی نەفام هەستیش بەخۆیان بکەن.(وەرگێڕ).

- ڕاهێنـانی لەسـەرو شـەو زاراوە جـوان وبۆنـدارەکانی وەك:چـاکت کـرد(أحـسنت)، سوپاس، خوا پاداشتتی خێرت بداتەوە، دەستت خۆش بێت...تد.
- فێـر کـردنو ڕاهێنـانی لەسـەر زیکـرو دوعـاو نـزاو پاڕانـەوەو ویـردە گرنگـەکانی وەك ویردەکانی: نوستن، خواردنو خواردنەوە، چونە سەر پێش ئاو...تد.
- فێرکردنو ڕاهێنانی منداڵ لەسەر ئەوڕەفتارە هەڵسو کەوتەی کەپێغەمبەرﷺ لەگەڵ حسنو حسین دەی کردو دوعای بۆ دەکردن ودەی فـەرمو:(أعیـذك بکلمـات الله تامـة، من کل شیطان وهامـة ومـن کـل عـین لامـة)(١) هـەتاکو شـەیتان نـەتوانێ لەخـشتەیان بەرێتو دوچاریان بکات.

ـ وەئەوەی پێویستە بگوترێ کەتایبەتە بەمنداڵ هەر چەندە لە ڕابردوشدا ئاماژەیەکی پێ کرا: سەرەتا پێویستە لەناو ماڵدا هەوڵی لەگەڵ دا بدرێت کـە قورئـانی پـیرۆزی پـێ لەبـەر بکرێـت، هـەروەها گـوێ گـرتن بـۆ قورئـان ، هـەروەها ئاشـنا بـونو لەبـەر کردنـی شـتێ لەسوننەتی پێغەمبەرﷺ بەتایبەتیش فەرمودە کورتەکان.

ـ باس کردنو بۆ گێڕانەوەی چیرۆكو بەسەر هاتو سەرگوزشـتەی گـرنگ بـۆ منداڵـەکان بەتایبـەتی ژیاننامـەی پێغەمبـەرﷺ بەشـێوازێکی وا کەلەگـەڵ قۆنـاغی تەمـەنی ئـەودا بێنەوە، ئەو چیرۆكو بەسەر هاتانە واتـاو پەنـدو ئامۆژگـاریو شـتی بەسـود دەخاتـە دڵو دەرونو بیرو هۆش ومێشکی ئەو منداڵانەوە، ڕەوشت وئاکـاری بـەرزو ڕاسـتیان لەدەرونـدا دەڕوێنێت. وای لێ دەکات کەهیوا بخوازێت وەکو ئەوەپاڵەوانی ئەو چـیرۆكو بەسـەرهاتانە بن کەلەچیرۆکەکان دەیان بیستن.

ـ پەرەپێدانو گەشە پێـدانی تـەماحو هێـواو ئاواتـەکانی منـداڵ هەرلەمنـداڵیو سـەرەتایی ساواییەتیەوە، وە هەڵ نانیان لەسەر هیواو ئاواتو بەهاو ئاکارو ڕەوشتە بەرزەکان .هەوڵ بدرێت کە تۆوی ئەو ئاکارو بەهابەرزو هێواو ئاواتە گرنگانە لەدڵو دەرون ومێشکی منداڵو

(١) پەنات دەگرم بەوشە تەواوەکانی خوای گەورە، لەهەمو شەیتانو شەڕەنگێزێکی لەخشتە بەرو فێڵباز، وەلەهەمو چاوێکی پیسی بەدکۆ(وەرگێڕ).

ساوايەكاندا بڕوێندرێتو هانیان بدات كەزاناو داناو زیرەك بن وەك فلان زاناو ڕێك وپێك بن وەك فلانو ببنە نوژدارو پزیشك وەك فلانو چاو لەوانی پێش خۆی بكات وبڕوانێتە خاوەن كەسایەتیو ئاكارو ڕەوشتو پلەبەرزەكان نەك بڕوانێتە نزم تر لەخۆی .

ـ هەوڵ دان بۆ دۆزینەوەو شارەزا بون لە هیواو ئارەزوەكانی منداڵەكان هەر لەسەرتای منداڵی وساواییەتیانەوە وپەرەپێدان وگەشە پێدانی بەهرەكانی (مواهبە) بۆنمونە ئەگەر بینی منداڵەكەی حەزو ئارەزوی لەخوێندنەوەیە با بەوپەڕی تواناوە هەوڵ بدات ئەو هیواو ئارەزوانە لەدڵو دەرونی دا بڕوێنێت وگەشەیان پێ بداتو هەمیشە هەوڵ بدات كتێبو چاپكراوی گونجاو باشو بەسودی بۆ پەیداو ئامادە بكاتو بیان خاتە بەردەستیو هانی بدات كەبیان خوێنێتەوە، وەروەها ئەگەر بینی منداڵەكەی حەزی لەیاریو وەرزشە باشەو یاریانەی بۆ پەیدا بكات كەلەگەڵ تەمەنو قۆناغی ژیانی دا دەگونجێو گەشە بەتواناكانو بیروزیهنو عەقڵی بداتو كەرەستەو هۆكارەكانی بۆ پەیدا بكاتو بیان خاتە بەردەستی ...وەروەها.

ـ وەلە تەمەنی حەوت ساڵی دا قۆناغێكی تر لەهەڵسو كەوت كردن لەگەڵ منداڵ دا دەست پێ دەكات. ڕەسولی خوا ﷺ مەشخەڵە بەرزو بنەڕەتیەكانی بۆ ئەم قۆناغە دارشتوەو پێ ی ڕاگەیاندوین كەدەفەرموێ: {مروا أبناءكم بالصلاة لسبعٍ، واضربوهم عليها لعشرٍ وفرقوا بينهم في المضاجع}[1]. واتا: ئەگەر منداڵەكانتان گەیشتنە تەمەنی حەوت ساڵی فرمانی نوێژ كردنیان پێ بكەن، وەكەبونە دەساڵی و نوێژیان نەكرد لێ یان بدەن لەسەر نوێژ نەكردن، هەروەها لەگەڵ خوشك وبرایان جێگەی نوستن وخەوتنیان لێك جیا بكەنەوە.(وەرگێڕ). وەئەم مەشخەڵانەش بریتین لە:

---

(١ ) أخرجه الإمام أحمد في المسند، مسند المكثرين من الصحابة، رقم(٦٤٦٧،٦٤٠٢)، وأبو داود في سننه رقم (٤١٨).

١) سەرەتا فرمان بەمنداڵەکان بکەن بەنوێژ کردن، چونکە نوێژ سەرو دۆندی هەمو بەندایەتی وپەرستشیە کردەکیەکانە(العملیة) وهەڵنانیان لەسەر نوێژ کردن وبوار نەدان وشلی نەنواندن لەگەڵیاندا. هەوەها هەمان هەڵوێست بنوێنن لەئاست باقی بەندایەتی وپەرستشیەکانی تر بۆ خوای گەورە وەك: ڕۆژو گرتن و زەکات دان وحەج کردن ووهەمو واجبەکانی تر. وای تیٚ بگەیەنرێت کەهەمو کارو کردەوەو ئیشە باش وچاکەکانی لەژیانی دنیادا هەر بەندایەتی کردن وپەرستشیەك بۆ خوای باڵا دەست وکار بەجیٚ بکریٚ لەخوات نزیك دەکاتەوەو پاداشت وسزایان لەسەر وەردەگریتەوە.
ـ لێدانێکی سوك ونزۆر توند وقورس نەبێت دوای گەیشتنیان بەتەمەنی دە ساڵی ئەگەر سەرپێچی و سەرکێشیەکانی دوبارەوە وچەند بارە کردەوە.
ـ دور خستنەوەو لێك جیا کردنەوەی جێگەی نوستنی کورو کچەکان واتە نێرو میٚ لەیەکتری.

وەئەوەی یارمەتیوهاریکاری ئەم قۆناغانەی ڕابردو دەدات ئەم شێوازە پەروەردەییانەی خوارەوەن:
أـ سزادان بێجگە لەسزادانی جەستەیی، لەکاتێك دا نوێژەکانی نەکردن وبەردەوام بو لەنوێژ نەکردنو چەند جار دوبارەی دەکردەوە: بەوەی کەپارەی ڕۆژانە یاپێدانەدانی ئەو بەخششەی کە بڕیار بو بیدەیە، یا هەڕەشەی لێدانی لیٚ بکە، یاداواکاریەکانی بۆ جیٚ بەجیٚ مەکە.

وەئەگەر سزای جەستەییت دا با زۆر توندو تیژ نەبێتولێدانێکی سوك ونەرم بێت، ولەشوێنی وای بدە کەزیانی پیٚ نەگەیەنێت وەك سەرو گویٚوچاوولوتو ئەم جۆرە شوێنە ناسکانە. ئەمەش کەگەیشتە تەمەنی دەساڵی.
ب ـ جەخت کردنو پیٚ داگرتن لەسەر تایبەتمەندیو جیاکاریە جەشنیە جۆربەجۆرەکانی ڕەگەزی نێرو میٚ:

تێگەیاندنی هەریەکێ لەکوڕو کچ کەهەریەکەو تایبەتمەندیو جیاکاری خۆیان هەیەو وەرکەس هەست و تایبتمەندیەتی دەرونی خۆیان هەیە دەبێ بەهەند وەربگیرێنوحسابی تایبەتی خۆیان بۆ بکرێت. ئەم تێگەیاندنوهەست پێ کردنەش لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کەجێگەی نوستنی هەردو لا لەیەکتری جیا دەکرێتەوە کەتەمەنیان دەگاتە دەساڵی، ئەمەش بۆ رێگەگرتن لەبرو بیانوی نزیك بونەوەو ڕودانی خراپەکاری کەدوای ڕودانی پاشماوە خراپەکانی چارەسەر ناکرێنو داخو کەسەرێکی زۆری بەدواوە دەبێت . هەروەکو مەشقو ڕاهێنانێکیشە بۆ وەرگرتنی سەربەخۆییو تایبەتمەندیەتی خۆیان.

ج ـ مەشقو ڕاهێنانی پراکتیکی لەسەر ڕەوشتو ئاکارەکان:

ئەمەش بریتیە لەمەشق پێ کردنو ڕاهێنانو پراکتیزە کردنی لەسەر ئاکارو ڕەوشتە جوانو بەرزەکان، ئاشناکردن پێ یانو ڕەنگ دانەوەیان لەخۆو لەمنداڵەکاندا وەك : ڕاستگۆیی لەهەڵسو کەوت ورەفتارو بەها بەرزەکان چ لەگفتو گۆ وقسەکردنو ئاخاوتن داو چ لەکارو کردەوەکاندا لەژیانی ڕۆژانەدا، هەرگیز دوانەخستنو پێچەوانە نەبونی پەیمانو بەڵێنەکان.

د ـ هاندەرو پاڵنەرەکان (الحوافز):

ئەمەش کۆمەڵە هاندەرێکن کەیارمەتیو هاریکاری پرۆسەی پەروەردە کردن دەدات لەتافی ساوایێتیو بچوکی داو کۆمەڵێك هاندەرو پاڵنەری گونجاو و لەبارن بۆ کارو هەڵسو کەوتەکان، دیارە شتێکی بەڵگە نەویستە کەکاریگەریەکی تەواوی هەیە بۆ سەر مرۆڤەکان هەتاکو ئەگەر لەتافی ساوایێتیو بچوکیش دابن.

هـ ـ چاودێریو بەدوادا چونی هاوڕێ (برادەر ـ الصاحب): گرنگی دان بەکاروباری هاوڕێو برادەرو ئەوانەی لەتەنیشتیەوەن لەهەرکوێ بێ هەر لەبچوکیەوەو پشت گوێ نەخستنو کەمتەر خەمی نەکردن تیایدا کارێکی زۆر گرنگوپێویستە. بەئامۆژگاری کردن بۆ کاری چاکەو گێڕانەوە لەکاری خراپو ڕاهێنان لەسەر قسەو ئاخاوتنی باشو خوو

ڕەوشـتو کـاری چـاك، هەمیـشە هـەوڵ بـدەیت لـەو کەسـانە نزیـك ببیتـەوە کەلـەماڵو بنەماڵەیەکی باشو لـەو کەسـانەش دور بکەویتـەوە کەلەژینگەیـەکی خـراپو بـەدرەفتاردا دەژیەنو منداڵەکانیشت هەر بەسەری شلکیەوە لەسەر ئەم شێوازو رەفتارە ڕابهێنیت.[(١)]

## چوارەم: چاودێری کردنی منداڵ لەتافی لاوێتی( هەرزەکاری ) دا:

لـەم تەمەنـەی منـداڵ دا بەرپرسـیەتی دایـكو بـاوك پـترو قورسـترە لەئاسـت منداڵەکانیاندا، بەرپرسیەتی دایك لەم قۆناغەی تەمـەنی منداڵەکانیـدا لـەم چـەند خالانـەی خوارەوەدا گرد دەبنەوە:

- هاریکاری کردنی دایك لەگـەڵ بـاوك دا بـۆ ڕاپەڕانـدنو جـێ بـەجێ کردنـی چـاودێریو سەرپەرشتی کردنو گرنگی دانو بایەخ دان بەمنداڵەکانیان.
- بـەدوادا چـون ولێپێـچانەوەی منداڵـەکان لەناوماڵـدا، کەبریتیـە لەهانـدانو هـەڵنانو ڕاهێنـانو پـەروەردە کردنـی منداڵـەکانیان لەسـەر کـاری خێـرو چـاکەو گێڕانـەوەیان لەکاری خراپەو ترساندنیان لەئەنجامدانی کاری خراپەو ناشیرین ونابەجێ.
- تێگەیاندنو هەست بەبەرنانی کوڕو کچ بەبەهاو بایەخی کەسیەتی خۆیان، ئەگەر کـوڕ بـو وای هەسـت پـێ بکـەیتو بیخەیتـە مێشکیەوە کـەتۆ لـەڕێزی پیـاوانی، ولەسـەر پیاوەتی وتایبەتمەندێتی پیاوەتی خۆی ڕای بهێنی، گومانی تێدا نیە کـە بـاوك دەبـێ بـاری بەرپرسـێتی خـۆی هـەڵ بگرێـت و هەست بەبەرپرسیارەتی خـۆی بکـاتو لـەم بوارەوە کەمتەرخەم نەبێت، بەڵام ئەگەر کچ بو هەنگاو بەرەو قۆنـاغێکی تـر دەنێـتو

---

( ١) واتە: هەوڵ دان بۆ ئامۆژگاری کردنی خراپەکاران وگێڕانـەوەیان بـۆ ڕێگـەو ڕەوشـتی پـاك وبـاش .هەمیشە هەوڵ بدەیت لەهاوڕێ و برادەرو کەسانی باش نزیك بکەویتەوە کەلەبنەماڵەی ئا یین پەروەرو ڕێك وپێك وخاوەن بەها بەرزەکانن و لەو کەسانەش دور بکەویتەوە یا بەواتایەکی تر لەهاوڕێ ی خـراپ ولەو کەسانەی کەبنەماڵەیەکی خراپ و لادەرو ڕەوشت وئـەخلاق نـزمن دوربکەویتـەوەو هـاوڕێ بـەتیان لەگەڵ دا نەکەیت ومنـداڵ وزارۆکەکانیـشت لەسـەر هـەمان شێواز هـان بـدەیت وپـەروەردەیان بکـەیت ولەخۆت ولەمنداڵەکاندا ڕەنگ بداتەوە.(وەرگێڕ).

لەژینگەوە دەگوازێتەوە بۆ ژینگەیەکی تر وەك ڕاهێنانی لەسەر بەرپرسیەتی دوا ڕۆژی خۆی، دەبێ بەدوا داچونی تایبەتی بۆی هەبێت، چاودێریو سەرپەرشتی بکاتو مەشقو ڕاهێنای پێ بکاتو گرنگی تەواوی پێ بدات بزانێ چی دەخوێنێتەوەو بەدوا چی دەگەڕێت، ڕەوشتو ئاکاری چاك ڕەچاو دەکات یان هی خراپ، چاودێریو بەدوا داچونی هەبێت بۆ وانەکانی بۆ جلو بەرگو پۆشاکی، پۆشاکی شەرعی لەبەر دەکات یان هی بێ شەرعی؟

- هاوبەشی کردنی کچەکەی لەئیشو کارەکانی داو سەرەتا بەقۆناغی سەرەتاو لەقۆناغی هاوڕێ یەتی هەڵسو کەوتی لەگەڵ دا بکاتو وا لەکچەکەی بگەیەنێ کەمن هاوڕێ یەکی تۆم وهەرچەندە دایکتم بۆ ئەوەی کچەکەی لەدڵی دا شتێك دروست نەبێت کەلەوانەیە بەزیانی کچە تەواو ببێت.(١).
- ئەرك پێدانو بەشداری کردنی کچ بەبەشێك لەکارو بەرپرسیەتی لەناوماڵ داو پشت گوێ نەخستنو بەرەڵا نەکردنو ڕانەهێنانو پەروەردە نەکردنو کار پێ نەکردنی بەجۆرێك هەرچی
- ویستی بیخاتە بەر دەمیو هەمو نازێکی بکێشێ (مدللة) وئەنجام هیچ بەرپرسیاریەتیەك هەڵ نەگرێتو فێری هیچی لا نەکاتو دەستو پێ سپیکە دەربچێتو هیچ نەزانێت(٢).

---

( ١) واتە: لەڕوی دایکی دا شەرم بکات و پرسیاری فێر بونی کارەکانی لەدایکی نەکات بەنەزانی بمێنێتەوە و هیچ فێر نەبێت دوا ڕۆژیش کە شوی کرد و کەوتە ماڵێکی ترەوە نامۆیە لەو ماڵەدا تارا نێت لەگەڵ ئەو ژینگە تازەدا و بەرپرسیەتیەکی قورس وگرانی دەکەوێتە سەر شانی .ئەگەر دایکی پێشتر لەماڵە باوان هەوڵی لەگەڵ دا نەدات وفێری هەمو شتێکی نەکات و ژیر بێت و وەك هاوڕێ ورەفیقێك ڕەفتاری لەگەڵ دا بکات وئەو بەربەستە شەرمیە نەهێڵێت وئەو کات کچەکەی بەڕاشکاوانە هەمو شتێك لەدایکی دەپرسێت وهەمو شتێك فێر دەبێت وکارامەو ولێهاتو و زیرەك دەردەچێت ، کورد گوتەنی باش دەرەهاتوە.(وەرگێڕ).

( ٢) لێرەدا مەبەست قۆناغی سەرەتای ژیانی کچانە لەماڵەباواندا ، کەپێویستە وئەرکی سەر شانی دایکانە کە کچەکانیان بەتەواوەتی فێری کاروئیشەکانی خۆیان بکەن و بە شێوەیەکی کارامەو ئازاو

• هەست کردن و ئاگاداری باوك بەهەمو ئەو کارو پرۆسانەی کەلەم بوارەدا ئەنجام دەدرێن و پێویستە باوك لەگەڵ دا دایك دا هاریکار بێت لەپرۆسەی پەروەردە کردن و ڕاهێنانی منداڵەکان کەتایبەتە بەم قۆناغەو نەپۆشین و چاو نەنوقاندن لەئاست هەر هەڵس و کەوت و ڕەفتارێکی خوار و خێچ و خراپ کەلەلایەن منداڵەکانەوە ڕو دەدەن چ کوڕو چ کچ.

قوڵی و بێ بنی ئەم بەرپرسیاریەتیانە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەدایك خۆی دایەنەو پەروەردیارەو چاودێرەو مامۆستاو فێرکەرەو بەڕێوەبەرەو ڕاپەڕێنەریشە، هەر دایکە کەپێگەیەنەری زانایان و پەروەردیاری جگەرگۆشەکانەو ڕاهێنەری پیشەوەران و جوتیاران و دروستکەری پاڵەوانانە، چێنەری واتاو وشە بەرزو پیرۆزو گەورەکانە، دیارە ئەم ئەرك و کارە گرنگانە هەروا سادەو سانا نین هەروەکو توێژێك لەدایکان بۆی چون بەڵکو زۆر لەوە بەرز ترو گرنگترو قورسترین ئەرکێکە لەسەر ڕوی زەوی دا بۆ؟ چونکی گەورە پیاوان و زانایان و تێکۆشەران و بانگەشەکاران و چاکەکاران هەمویان لەو قوتابخانەو زانکۆو دانشتگایەی باوەشی دایکانی پەروەردیارو زاناوە دەردەچون و دەردەچن.

## ج ـ بەرپرسیاریەتی ئافرەتی موسڵمان وەك کچێك:

کچ لقێکە لەو بنەڕەتە واتە لەدایك، کەخوای گەورە بەو پلەو پایە جیای کردۆتەوەو تاتیبەتمەندی کردوەو ئەو ڕێزە گەورەی پێ بەخشیوەو لەباوکی پێ

---

زرنگ و دەست ڕەنگین ودەست پاك و داوێن پاك ئامادەو دروستیان بکەن.لەماڵەوەدا مەشق وڕاهێنانیا ن پێ بکەن لەو ماڵە سەرەتاییەی باوکیاندا ولەهەمو بوارێکدا ڕایان بهێنن وکورد گوتەنی کابانێکی زرنگ ووریا یان لێ بەرهەم بێنن وکەسایەتیەکی بەرز وشکۆدارو وتوندو تۆڵ وتۆکمەیان لێ دروست بکەن. کار یان پێ بکەن و پشت گوێ یان نەخەن، چونکە ئەمڕۆ باری بەرپرسیەتی لەسەر شانی کچان نیە لەماڵەوە باوانیاندا، ئەمە قۆناغی ئامادە کردن وڕاهێنانە، سبەینێ مەیدانی کار کردن وماڵە مێردان وخاوەنی بەرپرسیەتی وقۆناغی پراکتیکیە و قۆناغی ئامادەکردن وڕاهێنا ن بەسەرچو بۆیە ئەمە ئەرکێکی گەورەی سەر شانی دایکانە بەرامبەر بەکچەکانیان.(وەرگێڕ).

جیاکردۆتەوە ئەگەر بێت بەپیێ ی شەریعەتی ئیسلام واتە بەرنامەی خواو بەو پیێ یەی کەخوای گەورە بۆی داناوە پەروەردە بکرێت، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمویەتی: {من عال جاريتين حتى تبلغا جاء يوم القيامة أنا وهو} وضم أصابعه[1]. أي في الجنَّة}.(واتا: هەر کەسێك دوکچان بەخێو بکات و جوانو ڕێکو پێك لەسەر شەریعەتی خواو بەپیێ ی بەرنامەی قورئانو سوننەت پەروەردەیان بکات هەتا بلوغیان دەبێتو بەشوێنی خۆیان دەگەیەنێو منەتیشیان بەسەردا ناکات. ئەوە منو ئەو کەسە لەڕۆژی قیامەتدا وەك ئەم دو پەنجەیەم لەیەکەوە نزیکینو دراوسیێ ی یەکترین. هەردو پەنجەکانی شایەتمانو ئەوی تەنیشتی بەیەکەوە جوت کردن..(وەرگێڕ).

کچ لەدڵی باوكو دایك دا جێگەی تایبەتی خۆی هەیە بەهۆی بێ هێزیو بێ دەنگیو لەسەرخۆییو هێدیو هێمنی بێ کێشەیی خۆیەوە.

هەروەکو کچ مافی بەسەر باوكو داکیەوە هەیە کەلەلاپەڕەکانی ڕابردودا ئاماژەمان بۆ کردن، وەلێ لەگەڵ ئەمەشدا کچ خۆشی لەم بەرپرسیەتیو واجبە بێ پشك نیە. بۆیە لەدیار ترلاینو بەرچاو ترین بەرپرسیاریەتی ئافرەت وە کچ ئەمانەی خوارەوەی لەسەر شانە:

- گرنگی دان بەئەرکە کەسایەتیەکانی خۆی، خوێندنو فێر بونی، دەبێ بەرنامەیەکی زانستیانە بۆ خۆی دابڕێژێت بەپیێ ی ئەو بەرنامەیە لەژیانی ڕۆژانەی خۆی دا کار بکات. یارمەتی دایکی بداتو هاریکاری مامۆستاکانی بەبەردەوامیو بێ کەمتەرخەمی بکات. پێویستە لەسەر کچ گرنگی تەواو بدات بەزانستە شەرعیەکانو ویژەکان وەك تەفسیری قورئانو فەرمودەکانو ویژەو ڕۆشنبیریە گشتی یەکان و ڕۆشنبیریەکانی ژنانەو لەم جۆرانە. هەروەکو لەڕابردودا لەبەشی بەرپرسێتی زانستیانەی ئافرەت لەگەڵ نەفسی خۆی دا باسمان کرد.

(١ ) رواه مسلم برقم (٢٦٣١) في البر والصلة، باب فضل الإحسان ألى البنات.

ـ هەمیشە گوێ ڕایەڵی دایكو باوك بۆ دەنگەوە چونو وەلامدانەوەی خوای بالا دەستو کاربەجێ کە دەفەرموێ:﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾ الإسراء:٢٣. (واتا:واتە پەروەدگاری تۆ فرمانت پێ دەکات کە لە(الله) بەلاوە هیچ کەسو هیچ بەرنامەو هیچ شتێکی تر نەپەرستن و گوێ ڕایەڵ و چاکە لەگەڵ دایكو باوکتاندا بکەن.(وەرگێڕ). بەڵام بەداخەوە دەبینین زۆرێك لەکچان ئەم گوێ ڕایەڵیەیان پشت گوێ خستوەو لێ ی دور کەوتونەوە ( کوڕان خراپتریش ـ وەرگێڕ) ، بەڵکو زۆرێکیان گوێ ڕایەڵی دۆستو برادەرەکانیان بەسەریاندا زاڵەو گوێ ڕایەڵی ئەوان دەکەنو پێش گوێ ڕایەڵی باوك دایکیان خستوە، ئەمەش گەورەترین هەڵەو مەترسیدار ترین هەڵەیەکە کەکوڕانو کچان تێ ی کەوتونو باجەکەشی دەکەوێتە سەرشانی وەچەو نەوەی داهاتوی کوڕو کچان، چونکە ئەم زیانە لەدوا ڕۆژدا بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، چونکە گوێ ڕایەڵیوچاکە کردن لەگەڵ باوكو دایکاندا قەرزێکی زۆر خێراو بەپەلەو زو وەردەگیرێتەوە یازو دەدرێتەوە.[1]

ـ یارمەتی دانوهاریکاری کردنی دایك لەو کارو ئیشانەی کەدەتوانێت ئەنجامیان بدات وەك:

---

( ١) واتەك هەر کەسێك یا ڕونتر بڵێین هەر کوڕو کچێك لەسەرەتادا لەگەڵ باوك ودایکی دا خراپ بێت ولەژیانیاندا لەگەڵیاندا چاك نەبێتوگوێ ڕایەڵیان نەکان سونەتێکی ژیانە کەخۆشی مێردی کرد یا ژنی هێناو مالو منداڵی پەیدا بون کوڕو کچەکانی خۆشی هەمان هەڵسو کەوتی لەگەڵ دا دەکەن لەدوا ڕۆژدا. بەپێچەوانەوەش ئەگەرکوڕ یاکچ لەگەڵ باكو دایکی دا چاك بوو گوێ ڕایەڵی کردن ئەوا منداڵەکانی خۆشیان لەدوایی دا لەگەڵی باش دەبنوگوێ ڕایەڵی تەواوی دەکەن. زۆرێکی وامان د یتن کەباوك دایکی خۆیان فڕێ داوەو تەنیا پێشی عەیب بوە نەك پێ ی بڵێ یادایە یا بابە بەڵکو هەر پێ ی عەیبیش بوە پێ ی بڵێن کوڕی یا کچی فلان یافلانە کەس. دواتر دیتمانەوە خۆشی هەمان دەردی بەسەر هاتۆتەوەو تامەکەی چێشتۆتەوە، بۆیە گوتویانە ( گوێ ڕایەڵی وخزمەتکردنی دایك وباوك قەرزێکی زو دراوەیەو زو وەردەگیرێتەوە بەهەردو بارەکەیەوە.(وەرگێڕ).

- چێشت لێنان‌وشوشتن‌وپاك كردنەوەی قاپ‌وقاچاغ‌وپاك‌وخاوێنی‌و تەمەڵی نەكردن لەئیشەكاندا و پشت نەبەستن بەخزمەتكارز كار نەكردن‌و ئەم پشت بەستنە بەخزمەتكار وات لێ دەكات كە كچێكی تەمەڵ‌و كارنەكردەو بێ خێرت لێ دەربچێت‌و دوا ڕۆژ واتە دوای شو كردن ناتوانیت ئەركی سەرشانی خۆت ڕاپەڕێنیت‌وتوانای هەڵ گرتنی ئەو بەرپرسیاریەتیەت نابێت.
- یارمەتی دانی دایك لەپەروەردە كردنی براو خوشكەكانی بچوكتر لەخۆت لەسەر خوو ڕەوشتی جوان‌و بەها بەرزەكان كەلەبەشی بەرپرسیەتی دایكدا بەدرێژی باسمان كرد.
- ڕاپەڕاندن‌و ئەنجامدانی هەندێ لەئەرك‌و ئیش‌و كارەكان لەبری دایك‌و یارمەتی دانی یا ئەنجامدانی هەندێ كاروبار واتە نوێنەرایەتی كردنی دایك لەو كارانەدا.
- فێر كردنی دایك بەخوێندەواری‌و نوسین ئەگەر دایك نەخوێندەوار بوو تۆ خوێندەوار بویت بەتایبەتیش فێری دروشم‌و بوارە زانستیەكانی ئایینی بكە وەك فێر كردنی نوێژو قورئان‌و ئەو ویردانەی كەلەنوێژدا دەخوێندرێن بەتایبەتیش سورەتی فاتیحە، هەڵەكانی بۆ ڕاست بكەوە. بەتایبەتی لەكاتی بێ ئیشی‌و دەست بەتاڵی دا هەوڵی لەگەڵ دا بدەو دەوری قورئان خوێندن و هەندێ لەزانستە شەرعیەكانی لەگەڵ دا بدە بۆ ئەوەی سودیان لێ وەر بگرێت، كەبەڕاستی ئەمە لایەنێكی گرنگی فەرامۆش كراوە كەزۆرێك لەئێمە لێ ی بێ ئاگاین. چونكە ڕۆژانە پرسیارێكی زۆر دەكرێت لەلایەن ئەو ژن وپیاوانەی كەخوێندنی سورەتی فاتیحە نازانن یان خوێندنەكەیان ڕەوان نیە، كەچی كچەكانیشیان لەزانكۆو دانشتگاو دواناوەندی‌وئامادەییەكاندا دەخوێنن یان فێرخوازن،ئالێرەداوئەمەبەرپرسیەتی‌و ئەركی سەرشانی كچان بەدەردەخات [1].

---

( ١) ئەدی بۆ ئەمە نالێین كە زۆرێك لەو كوڕو كچانەی كەخاوەنی بڕوانامەی دكتۆراو ماستەریشن وەك نەخوێندەواران وان بەڵكو لەوانیش كۆڵەوار ترو نەزان ترن‌و نازانن سورەتی فاتیحە بەڕەوانی بخوێنن؟!!! بۆ. چونكی هەگیزاو هەرگیز بەلای قورئان وزانستە شەرعیەكاندا نەك هەر ناچن وناگەڕێن بەڵكو قورئان هەر ناش خوێنن و زۆرێكیان هەر بڕواشیان پێ نیە . خۆلە خوێندنەوەی كتێب

## وریایی وئاگاداری لەمانەی خوارەوە گەلێك گرنگ وپێویستە :

- بەسەر نەبردنی کاتی بێ ئیشیوردەست بەتاڵی بەشتێك کەسودی نەبێت وەك: شوێن کەوتن و ئالودە بون بەئامێرەکانی ڕاگەیاندنە جۆربەجۆرەکان وئەو هۆکارە پەیوەندیانەی تر کە ئەمڕۆ لەجیهاندا هەن، کەبەڕاستی کاتێکی زۆر لەکیس مرۆڤ دەدەن لەکاتی سەیر کردنی ئەو دیمەنە سەیرو سەمەرە وبێ ئایرۆیانەو ئەو فیلمە بێ سودو بێ کەڵکانە کەلە شاشە زێوینیەکانی کەناڵ و تەلەفزیۆنە جۆربەجۆرەکانی دەرەوەو ناوەخۆ نیشانی هاوڵاتیان دەدرێن بەتایبەتیش هەرزەکارانی کوڕو کچ، نەك هەر ئەمە بەڵکو کاتێکی زۆریش لەسەرپێچی خوای گەورەو ڕابواردن وشوێن کەوتنو شل کردنی جڵەوی هەواو ئارەزوەکانی نەفسوشەیتانو لەخراپەکاری دا بەسەر دەبرێت. چونکە مرۆڤ دەبێ باش بزانێت کەبەرپرسە لەو کاتەی کەخوای گەورە بۆ ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی ژیانی هەروەك خۆی بۆی دارشتوین نەك بەهەواو ئارەزوی خۆمان ئەو کاتەش کە بریتیە لەژیانو تەمەنی مرۆڤ کەبەنرخ ترینو بەرز ترین شتێکە کەمرۆڤ لەبونەوەردا هەیەتی، دەی ئەگەر هەمو لەگەڵ ئەو داموو دەزگایانەدا بەخوڕاییو بەبەلاشو بێ سود بەسەر ببرێت حەتمەن توشی زیانێکی زۆر گەورە دەبین لەدنیاو لەقیامەتدا، کەزۆر بەداخەوەو زۆر جێ ی دڵگرانیو دڵ تەنگیە کەبەشی هەرە زۆری کاتی کیژە لاوانو کچان (هەروەها کوڕان لەکچان خراپتر - وەرگێڕ) ئەو کاتە زێڕینە واتە ئەو تەمەنە بەپێزە لەگەڵ کەناڵوهۆکارەکانی ڕاگەیاندنی گەندەڵ کەری وەك تەلەفزیۆن وکەناڵە ئاسمانیەکانو یالەگەڵ بڕادەرو ڕەفیقە خراپەکانیان لەبازاڕە بێ ئابروەکانی ئەمڕۆ یا لەگەڵ تەلەفۆنو تەلەفۆنکاریو مۆبایل دا بەفیڕۆ دەدەن. دیارە کەگومانی تێدانیە کەبەهۆی ئەم کەمتەرخەمیو بێ ئاگاییەوە کارو

---

وچاپکراوە شەرعیو زانستە شەرعیەکان هەر گەڕێ! ! دەبێ بڵێین ئەوانە دەبێ لەپێشەوە خۆیان فێر بکەن وبگەڕێنەوە بۆ ڕێگەی قورئان وسوننەت و بیرو باوەڕەکەی خۆیان واتە عەقیدەکەی خۆیان سەرلەنوێ نۆژەن بکەنەوەو ئەمجار دایك وباوکیان فێر بکەن وبیرو باوەڕو عەقیدەکەیان بن کوڵ بکەن وڕاستی بکەنەوە.(وەرگێڕ).

ئیشێکی زۆر گرنگ لەدەست دەچن‌و ئەنجام بەرهەمێکی زۆر لەداهات‌و سەرو سامانی تاکی‌و نەتەوەیی لەکیس دەچن‌و ولات خەسارەتمەند دەبێت. کاتێکی زۆریش لەسەرپێچی‌و بێ فرمانی خوای باڵا دەست‌و کاربەجێ دا بەفیڕۆ چوو بەسەر بردرا.

- دور کەوتنەوە لەبرادەری خراپ کەوەك پریشکی گڕدار وان کەکەوتە سەر هەر شتێك دەست بەجێ ئەویش گڕ دەگرێت وهەمو گیانی دەسوتێنێ، لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا پەیوەندی وبرادەرایەتی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆ گەلێك زۆرن. دەبێ کچی ژیرو موسڵمانی خاوەن باوەڕی تۆکمە زۆر لەو دۆست‌و برادەرە خراپانە وریاو ئاگادار بێت. نیشانەی ئەوانە ئەوەیە کەهەمیشە خراپەو ئامرازەکانی خراپەیان پێوە دیارەو هەم دەم بڵاوکەرەوەی خراپەو خراپەکارین، وهەمیشە شەڕەنگێزن‌و خراپە هێنەرو خەڵکی بۆ خراپەکاری هەڵ دەنێن‌و تۆوی خراپەکاری دەوەشێنن‌و فرمان بەخراپە دەکەن‌و قەدەغەی چاکەکاری دەکەن، وێنەی ئەم دۆست‌و برادەرانە پێویستە زۆر لێ یان وریا بیت‌ولێ یان دور بکەویتەوە.
- شوێن کەوتنی ئافرەتانی کافرو بێ باوەڕو بەکار هێنان‌و لەبەر کردنی ئەو جل‌و بەرگو پۆشاکانەی(الموضة) کەکافران‌و خراپەکاران بەدیاری بۆمانی دەهێنن، هەروەکو لەڕابردودا زانیمان کە دوژمنانی ئیسلام هەمیشە سورن لەسەر ئەم کارەیان‌و بەردەوام نوچ نادەن‌و ناسەکنن، بۆ ئەم مەبەستەش هەمیشە لەهەوڵی لێبڕاوانەی خۆیان ناکەون بۆ خراپ کردن‌و لادانی کچانی موسڵمان‌و لەکەدار کردنیان بەهەر شێوەیەکی بۆیان بکرێت، بەهەر هۆکارێك بێت یەکێك لەو هۆکارانە کەگرتویانەتە بەربڵاو کردنەوەی ئەو هەمو جل‌وبەرگ‌وپۆشاکە ناشەرعی یە جۆربەجۆرانەی کەلەناو کۆمەڵگای موسڵمانان‌و لەناو ئافرەتانی موسڵماندا بڵاویان کردۆتەوەو ئافرەتی موسڵمانیان ڕوت کردۆتەوەو لەپۆشاکی شەرعی‌و ئاوەڕوتیان کردوەو لەحەیاو حەشمەت‌و ڕو سوریەتی فیترەتی خۆیان دورخستۆتەوەو لێ یان دارنیوە. بۆیە کچان‌و ئافرەتانی بڕواداری موسڵمانان زۆر پێویستە کەبەرهەڵستکاری‌و بەرپەرچی ئەم پلانە گڵاوەی دوژمنانی ئیسلام بدەنەوەو دوای هەمو

قـرە قـڕ کـەرێك نەکـەون‌و وەڵامیـان نەدەنەوەوشـوێن هـەمو دەنگدانەوەیـەك (الـصدى) نەکەون.

■ دەرچون بۆ بازاڕەکان بەبێ کاری پێویست: بەڕاستی ئەمە دەردو پەتایەکی ترسناك‌و مەترسی دارە کەلەناو ئافرەتاندا بڵاو بوەتەوە وەك بڵاو بونـەوەو کەوتنـەوەی ئـاگر لـەناو پوش‌و پەڵاش دا، بەجۆرێك وای لێ هـاتوە کـەزۆرێك لەکچانی موسـڵمان لـەناو بازاڕەکانـدا هەڵبەزو دابەز دەکەن و دوچاری سەدان هەڵەو کاری بـێ شـەرعی یـان دەکـەن‌و دەکەونـە داوی شـەیتانەوە یەکـەمین کەسێك‌و یەکـەمین شـتێك کەلـەو بازاڕانـەدا بکەونـە داویـەوە شـەیتانە، چـونکە بازاڕەکـان بنکـەو بارەگـای شـەیتان‌و خراپـەکاران‌و دەبـێ خوشـکانی موسڵمان‌و بەکچ‌و بەژنانەوە زۆر وریا بن‌و خۆ لەچونە ناوبازاڕەکان بەدور بگرن، خۆ ئەگەر هەر ناچار بون کەدەبێ هەر بچن ئەوا بالەگەڵ سەرپەرشتیارێکی خۆی یایەکێ لەئەندامانی مەحرەمی خۆی دا بچێت‌و خێرا پێداویستیەکانی بکڕێت‌و بەپەلەبگەڕێتەوە لانەکـەی خـۆی کەماڵەکەیـەتی. دەی باثافرەتـان لەسـەر ئـەوە ڕابـێن کـەبۆ پێویـستی نـەبێ نەچـنەدەر، چونکە گومانی تێدانیە ئەو چونە دەرەوەیان دەرگەی هـەمو خراپـەو شـەڕێکە بـۆ ئـەوان، باباش بـزانن ئـافرەت هەرکەچـوە دەرەوە شـەیتان یەکسەر پێشوازی لێ دەکـات‌و وەری دەگرێـت بەکـەیفی خـۆی دەی هێنـێ‌و دەیبیـات هـەروەکو لەپێغەمبـەرەوەﷺ ئەمـە چەسپاوە. [1] چەندان ئافرەتی موسـڵمان کەوتونـە داوی سەرشـۆڕی‌و ڕەزالەتـەوە بـەهۆی ئەم دەرچونە بێ شەرعیانەی ئافرەتانـەوە، بۆیـە پێویـستە کـچان زۆر لـەم حاڵەتـە وریـاو ئاگادار بن‌و لەم کردەوانەی خوارەوە بسڵمنەوەو لێ ی دور بکەونەوە:

---

( ١) لەفەرمودەی عبالله کوڕی مسعود ﷺ کەلەپێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە کەفەرمویـەتی:{ المـرأة عورة فإذا خرجت إستشرفها الـشيطان} رواه الترمـذي في الرضـاع، بـاب إستـشراف الـشيطان المرأة إذا خرجت وقال:هذا حديث حسن غريب.

واتە: ئافرەت عەورەتە گەر لەماڵ هاتە دەر شەیتان پێشوازی لێ دەکات ودەی تۆزێتەوەو بەکەیفی خۆی هەڵس وکەوتی لەگەڵدا دەکات. (وەرگێڕ).

- دەرچون بۆ ئەو شوێنانەی کەپێ یان دەگوترێت شوێنی سەیرانگاو ڕابواردن‌و کات تێدا بەسەر بردن (الملاهی) باخۆی لەشەڕی ئەو شوێنانە بپارێزێت چونکە توشی ڕابواردن‌و کاتەکانت بەفیڕۆ دەچێت‌و کۆلێك شەڕو خراپەکاری‌و گوناح‌و تاوانت بۆ بەدیاری دێنێت‌و دەیخاتە گەردنت[1].

- بەکار هێنانی تەلەفۆن‌و مۆبایل بەبێ سودو لەکاری پڕوپوچدا: تەلەفۆن‌و مۆبایلەکان چەکێکی دوسەرن بۆ پێویستی‌و ناچاری نەبێت ناکرێن‌و دانانرێن. جێگای داخە کەزۆرێك لەکچان شێوازێکی وا دەگرنە بەر لەبەکار هێنانی تەلەفۆن‌و مۆبایل، کەمرۆڤ بێز لەخۆی دەکاتەوە، هەرکە (سماعة) یا مۆبایلەکەیان بەدەستەوە گرت ئیدی پێیەوە دەلکێ‌و تاماوەیەکی دورو درێژ بەری نادەن ئەوەندە قسەی بێ سودو بێ کەڵك‌و درێژدادڕی

---

( ١) باخوشك وبرایانی خوێنەر وا تێنەگەن کەلەڕابواردن وخۆشگوزەرانی ڕێك وپێك وپابەند بەمەرجە شەرعیەکانەوە یان لێ قەدەغە دەکەین نەخێر بەڵکو مەبەستی ئێمە ئەوەیە کەلەزۆرێك لەوشوێنەکان لەکۆمەڵگاکانی موسڵماناندا بڵاوەو کاری بێ شەرعی تێدا دەکرێت و پابەند نین بەشەریعەتی خواوەو ئاپۆرەیەکی خەڵکی زۆری تێدا کۆدەبنەوەو بەهەزاران بێ شەرعی تێدا دەکرێت وەك خواردنەوەی مەی و ڕەش بەڵەکی ودەهۆڵ وزوڕناو مۆسیقاو گۆرانی گوتن وسەماو سوڕدان و تێکەڵ بونی ژن وپیاو و گەلێکی تر لەبێ فەرمانی وبێ شەرعیەکانی تر لە شوێنەکانی وەك هاوینە هەوارەکان وسەیرانگاکان و شوێنەکانی تر. بەڵام ئەگەر ئەم دەرچونانە بۆ گەشت وگوزارەکانی سروشتی خوای گەورە کەپابەند بن بەمەرجە شەرعیەکان وەك ئەوەی هەر کەس خۆی و خاوو خێزانی بچنە شوێنێك لەشوێنە خۆشەکانی ئەو چیاو چۆڵ وپێدەشتانەی کە چۆلن وکەسی تێدا نین یاخود کەلێشی بن کەمێکن وتێکەڵی تێیدا ڕو نادەن وهەر خۆیان بن ئەوە چی تێدا نیەو ڕێگە پێدراوە (مباحة) وحەرام نیەبەڵکو هەندێ جار بۆ هەندێ لەتەمەنەکان لەسەریشت پێویستە بچنە دەر وسوننەتە بۆ بینینی دەسەڵات ونیشانەکان و توانا لەبن نەهاتوەکانی خوای گەورە.

دەتوانن بۆ ئەم مەبەستە وبۆ زانیاری پتر سەیری کتێبی( الترفیه) لەنوسینی دکتۆر عبدالله السدحان بکەن. کەزانیاریەکی باش وپڕ بەسودو دەوڵەمەندی لەم بارەیەوە تێدایە، خوا پاداشتی بداتەوە وسەرکەوتوی بکات. آمین.

دەکەن، ئای لەو خەسارەتمەندیەو لەو کات بەفیڕۆ دانە، بەشێوەیەك دەبێتە پاچێکی تێك دەرو دەرگاکانی شەڕو خراپە بەڕوی کچانی موسڵماندا دەکرێنەوە لەڕێگەی ڕاستی خۆیان لادەدەن ولەگرێژەنەیان دەبەن وکچان لەم ڕێگەیەوەخراپ ناو زەد دەبن. تکایە زۆر زۆر وریاو ئاگادار بن لەم پیشە قێزەونە[1].

## د – بەرپرسیارێتی ئافرەتی موسڵمان وەك خوشكێك:

خوشك لەنزیکترین نزیکەکانی برایە، هەردو لا مافی هاوبەشیان هەیەبەسەر یەکتریەوە. بەڵکو بەرپرسیەتی خوشك گەورە ترو گشتی ترو بەرچاو ترە لەناو ئەو ماڵەی کەتیایدا دەژیات. ئەوەی کەلەبەر پرسیەتی کچدا باسمان کرد بەتەواوەتی بریتیە لەبەرپرسیەتی خوشك لەبەرامبەر خوشکەکانی و براکانی بەگەورەو بەبچوکەوە. لێرەدا دەتوانین چەند بڕیارو بەرپرسیەتێکی تر بخەینە سەر ئەو بڕیارو بەرپرسیەتیانەی

---

( ١) بەڵێ چ تەلەفۆن‌و چ مۆبایل دو دەمن‌و دو تیغی بڕندەن کەیفت لێ بێ لەکاری باشە بەولاوە چیدی پێ ئەنجام نادەیت وتەنیا ئیش‌و کارە زەروریەتەکانی ژیانی ڕۆژانەی خۆتی پێ ئەنجام دەدەیت، وهەوەسیشت لێ بێت چ کارێکی خراپ وفیتنەوئاشوبی پێ لەناو خەڵکی دا بڵاو دەکەیتەوە. هەمومان باش دەزانین کە مۆبایل وتەلەفۆن بۆ کاری باش وخزمەتگوزاریە سود بەخشەکانی ژیانی ڕۆژانەی مرۆڤ دروست کراوە نەك بۆ خراپەکاری ویەخەڵکی ڕابواردن وپەیوەندی بەستن ودڵداری وین دیوارو بن پەسیوان . زۆرمان لەگەنج ولاوانی کچان وکوڕان دیوە کە شەرم ناکات لەهەمو شوێنێك لەبازاڕ لەماڵ لەفەرمانگەو ولەشوێنی دەوامەکەی خۆی دا مۆبایلەکە بەبنانگوێ یەوە دەنێت هەرگیز شل و وەرز نابن و سەعاتێك تا دوسەعات‌و بگرە سێ سەعاتیش سەماعەی مۆبایلەکەی بەبنانگوێ یەوەیەو قسە لەگەڵ دڵدارەکەیاندا دەکەن‌و مراجعەکانیشیان وا بەدیاریانەوە ڕاوەستاون‌و چاوەڕوانن هەر لێ نابنەوە تا کارەکانیان بۆ ڕاپەڕێنن بەلام بێ سودە. زۆر جار ڕوی داوە بابای مراجع لەدوری دورەوە لەگوندو لادێکانەوە هاتوە بۆ دائرەو مەسرەف‌و خەرجیەکی زۆریشی کردوە ئەو ڕۆژە ئیشەکانی بۆ ناکرێن بۆ بەیانی یان دەگەڕێنەوە یا لەماڵی خانە خوێ دەمێننەوە ، بەشکو خوابکات بەیانی کابرای فەرمانبەر دڵی بتلیسێتەوەو ئیشەکەی بۆ ڕابپەڕێنێت. تاوانی ئەمە لەئەستۆی کێ دایە هەیاران؟ (وەرگێڕ).

کەلـەخاڵی (بەرپرسـیەتی ئـافرەتی موسـڵمان وەك كـچ) دا خرانـە ڕو کەلـەم خاڵانـەی خوارەوەدا دەیان گوشین:

– ڕێز گرتنو بەهەند زانینی بـراو خوشـکەکانی کەلـەخۆی گـەورە تـرن. چـونکە خوشـکی گەورە لەماڵدا لە جێگەو پلەی دایك دایە، وبراگەورەش لەجێگـەو پلـەو پایـەی بـاوك دایـە. مافی پەیوەندیو خزمایەتی و نەسەبیان بەسەر یەکەوە هەیە واتە مافی خوشكو برایەتی، پێویستە لەسەر ئەو خوشکە کەیارمەتیان بدات ئەگەر پێویـستیان بەیارمـەتی هـەبو، وەك یارمەتی دانی ماڵیو مـڕادی(المـادی) کردنـەوەی گـرێ کوێرەکـانی تـەنگو چـەڵەمەکانیان کـاتی تـوش بونیـان. یارمـەتی دانیـان لـەکاتی خوێنـدنو سـەعی پـێ کـردن ویادداشـتو زانستەکانیاندا.

بڵاو کردنەوەی خێرو چاکە لەناوماڵدا بەخوێندنەوەو بیستنو گوێ لێ گرتنو بـانگ کردنو فریاکەوتن و فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردن لەخراپەو ئەم جۆرە شتانە.

– ئامۆژگاری کردنو ڕێنومایی کردن بۆ ئەوانەی پێویستیان پێیەتی لەناو ماڵدا.

## چوارچێوەی سێ یەم: بەرپرسیاریەتی ئافرەتی موسڵمان لەبەرامبەر کۆمەڵگەو ئوممەتدا:

بەرپرسـیەتی ئـافرەت فـراوانو بـەربڵاوە بەشـێوەیەك هـەتا هـەمو چـوار چـێوەو پانتایی کۆمەڵگەو ئوممەت بەگشتی دەگرێتـەوە. ئـەو بەرپرسـیاریەتیە بریتیـە لەهەسـتان بـەکاری بانگەشـە کـردن بـۆ لای خـوای گـەورە، بەرپرسـیارە لەفـەرمان کـردن بەچـاکەو قەدەغە کردن لەخراپە، بەرپرسیارە لەئامۆژگاری کردنو ڕێنومـاییو چـاکەکاریو ئیـسلاح لەناو کۆمەڵگەدا .

لێرەدا هەندێ دەقی شەرعی دەهێنمەوە لەبەر گرنگیو بایەخی ئەو بانگەشەو واجب بون و بەرهەمەگشتی یەکانی، ئەمجار ئەوەی کەپەیوەندەو تایبەتی بەئافرەتەوە

هەیە. خوای باڵا دەست و کاربەجیێ دەفەرموێ:﴿ وَمَنْ أَحْسَنُ قَوْلًا مِّمَّن دَعَآ إِلَى ٱللَّهِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا وَقَالَ إِنَّنِى مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٣٣﴾ وَلَا تَسْتَوِى ٱلْحَسَنَةُ وَلَا ٱلسَّيِّئَةُ ۚ ٱدْفَعْ بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ فَإِذَا ٱلَّذِى بَيْنَكَ وَبَيْنَهُۥ عَدَٰوَةٌ كَأَنَّهُۥ وَلِىٌّ حَمِيمٌ ﴿٣٤﴾ ﴾ فصلت: (٣٣،٣٤). (واتا: توخوا چ قسەو گفتارو چ کردەوەیەك لەقسەو کردەوەی ئەو کەسە باشترە کەبانگەشە بۆ لای خوای گەورە دەکاتو خۆشی کردەوەی باش دەکاتودەڵێ من لەگروپی موسڵمانانمو بڕوادارە، شتێکی بەڵگە نەویستو شتێکی سەرەتایی خوا کردە کە هەرگیزاو هەرگیز چاکەو خراپە یەکسان نینو وەك یەك نینولەیەك تای تەرازو دانین دەی کەواتە هەمیشە خراپە بەچاکە پاڵ پێوە بنێنو ڕایان بماڵن واتە کەخراپەتان کرد گورج چاکەیەکی بەدوادا بکەن بۆ ئەوەی خراپەکەت بسڕێتەوە، چونکە چاکەکان خراپەکان دەسڕنەوە. ئەگەر چاکە لەگەڵ ئەو کەسەدا بکەیت کە ناخۆشیو دوژمنایەتیان بەیەکەوە هەیەودەست پێشخەری بکەیت لەئاشت بونەوەو چونە دوای ئەو چاکە کردنەو ئاشت بونەوەیە وای لێ دێت ودەبێتە دۆستێکی زۆر خۆشەویستو گەرمو گوڕو دڵسۆزی لێ دێت .(وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێ:﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾ آل عمران:١٠٤. (واتا: واتە: ئەی بڕواداران: با لەئێوە کۆمەڵێك پێکبێت بۆ ئەوەی ڕێگەی چاکەو خێر پیشانی خەڵکی بدەنو ئایینی خواو حوکمەکانی بۆ موسڵمانان ڕون بکەنەوە، فرمانیان بەچاکە پێ بدەنو لەخراپەو خراپەکاری دەستیان بگرنو بیان گێڕنەوە، بۆ ئەم مەبەستەش دەبێ ئەو کەسانە زۆر بەچاکی لەفرمانو لەحوکمەکانی ئایینی ئیسلام تێگەیشتبنو زاناو زیرەكو بەرچاو ڕۆشن بنو زۆر لەسەرەخۆو هێدیو هێمن بنو بەنەرمو نیانی و ڕوی گەشو ڕو خۆشیەوە ئامۆژگاری خەڵکی بکەن، نەك توندو تیژو قسە ڕەق بن، دەبێ بزانن چۆن قسە لەگەڵ خەڵکی دەکەنو دەیان دوێننو دەبێ زۆر دڵفراوان بن. جا ئەگەر وابن ئەوانە لەدنیاو قیامەتدا سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتو دەبن، لەڕەوتی قسەکاندا دەردەکەوێت کەمەبەستی

زانایانە نەك مەبەستی پێ دروست كردنی حیزبی سیاسیو پەرتەوازە بونی ئوممەت هەروەكو حیزبییەكان بەڵگە بەم ئایەت دێننەوە بۆ ڕەوا دانی دروست كردنی فرە حیزبی لەئیسلامدا. بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل١٤٩..(وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێ:﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾ النحل:١٢٥. (واتا: ئەی پێغەمبەر: زۆر ژیرانەو لەسەرخۆونەرمو نیانەوە بانگەشە بۆ لای خوا بكەو بەژیرانەو بەئامۆژگاری ژیرانەو هێدی وهێمنانە خەڵكی بانگ بكەو بەباشترین شێوە دایەلۆك قسەیان لەگەڵ دا بكە بۆ ئەوەی بەو شێوە نەرم ونیانیەوە دڵی یان نەرم بێتو بێنە سەر ڕێگەی ڕاستو بەپێچەوانەوە لێت دور بكەونەوەو بانگ كردنەت لەبری سودو قازانج زیانی هەبێت ولێت دور بكەونەوە.(وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێ:﴿ فَلَوۡلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرۡقَةٖ مِّنۡهُمۡ طَآئِفَةٞ لِّيَتَفَقَّهُواْ فِي ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُواْ قَوۡمَهُمۡ إِذَا رَجَعُوٓاْ إِلَيۡهِمۡ لَعَلَّهُمۡ يَحۡذَرُونَ ﴾ التوبة:١٢٢. (واتا: موسڵمانان ناكرێ هەمویان لێكڕا بۆ غەزاكردن واتە بۆ شەڕكردن لەگەڵ كافران دەربچن بەڵكو لەهەر كۆمەڵە ولەهەر عەشیرەت وتیرەیەك كۆمەڵێك دەر بچن و هەندێكیش لەناو موسڵمانان بمێننەوە لەوانەی كەبۆ شەڕ دەرنەچون بۆ ئەوەی فێری شەرع وحوكمەكانی ئایینەكەیان بكەن وئاگایان لەو ئایەت وحوكمانە بێت كەبۆ سەرپێغەمبەرﷺ دێنەخوار وهەم ئاگاشیان لەو ماڵ ومنداڵ وپیرەژن وپیرە پیاوانە بێت كەلەوێ ماونەوە. هەروەها ئەوانەی كەلەجیهاد گەڕانەوە ئاگادار بكەن بەو حوكم وئایەتانەی كەلەدوای ئەوان هاتونەتە خوار وئاگاداریان بكەنەوە لەحوكمەكانی ئایینەكەیان.ئەم ئایەتە هەڵوەشێنەرەوەی ئایەتی ٣٩ی سورەتی (التوبة إلاّ تَنْفِرُواْ..) وئایەتی پێش خۆیەتی هەروەكو (القرطبي) لەتەفسیرەكەی خۆی دا هێناویەتی (وەرگێڕ).هەروەها دەفەرموێ:﴿ قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُواْ إِلَى اللهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَاْ وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللهِ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾ یوسف:١٠٨. (واتا: ئەی محمد بەو بێباوەڕو بتپەرستانە بڵێ ئایینی ئیسلام ڕێبازی ڕاستو ئاشكرای منە كەپێتان ڕادەگەیەنم ڕێگەی

من و ئەوانەی شوێن من دەکەون وبەبەرچاو ڕۆشنیو لەسەر عیلم وزانستی ئیسلام بانگی خەڵکی دەکەم بۆ ئایینی خوا، بۆ بەتەنها خوا پەرستیو بەجێ هێنانی فرمانەکانی خوای پەروەردگار، خوای پاكو بێگەرد لەوە گەورە ترو بەرز ترە کەهاوبەشو هاوێنەی بۆ دانێن، من باوەڕم تەنیا بەخوای گەورەو تاكو تەنیا هەیەو پاك وبێگەردی بۆ خوای گەورەو من هەرگیز لەهاوبەش پەیدا کەران نیم ونابم.(وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتُ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ التوبة:٧١. (واتا: : بڕواداران چ پیاو وچ ژن دۆست وپشتیوانی یەکترین و فرمان بەچاکە دەکەن وقەدەغە لەخراپە دەکەن ، دیارە مەبەست لەبڕوادارانی ڕاستەقینەیە ئەوانەی کەدەستیان گرتوە بەقورئان وبەسوننەتەوە بەپێ ی تێگەیشتنی پێشینەی پیاو چاکان .(وەرگێڕ).

هەروەها بەپێچەوانەی ئەوانەوە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡمُنَٰفِقُونَ وَٱلۡمُنَٰفِقَٰتُ بَعۡضُهُم مِّنۢ بَعۡضٖۚ يَأۡمُرُونَ بِٱلۡمُنكَرِ﴾ التوبة:٦٧. (واتا: : بەپێچەوانەی بڕواداران گروپێکی تر هەن کەخوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: دووڕوان چ پیاو وچ ژن هاوکارو پشتیوانی یەکترین وهەمیشە وەك پیشەی پێشینەی خۆیان فرمان بەخراپە دەکەن و قەدەغە لەچاکە کردن دەکەن وخراپە کاری وفەسادی لەجیهاندا دەنێنەوەو تۆوی فیتنەو فەسادی دەوەشێنن.(وەرگێڕ). هەروەها دەفەرموێ:﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ ٣﴾ العصر:٣. )واتا: : مرۆڤەکان خەسارەت مەندن تەنیا ئەوانە نەبێت کەبڕوای تەواویان بەخوای گەورەو بەپێغەمبەرەکەیﷺو بەبەرنامەکەی خوا هێناوەو دەستیان گرتوە بەقورئانو سوننەتەوەو ئامۆژگاری خەڵکی دەکەن بۆ چاکە کردنو بانگی خەڵکی دەکەن بۆ لای خوای گەورەو ئامۆژگاری خۆیان وکەس وکارو خەڵکی بەگشتی دەکەن بۆ ئارام گری وخۆڕاگری وپێ دامەزراوی لەسەر ئایینی وخواو بەرنامەی خوای پاك وبێگەرد.(وەرگێڕ). وەلەفەرمودە ڕاستەکانی مسلم و لەفەرمودەی تمیم کوڕی أوس الداری هاتوە کەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی :{الدین نصیحة) قلنا لمن؟ قال: (لله

ولكتابهِ ولرسولهِ ولأئمةِ المُسلمين وعامتهم}(١). (واتا: ئایین هەموی ئامۆژگاریە. گوتمان بۆ کێ ئەی ڕەسولی خوا ؟ فەرموی: بۆ خوای گەورەو بۆ کتێبەکەی کەقورئانەو بۆ پێغەمبەرەکەیو بۆ هەمو پێشەوایانی موسڵمانانو بۆ هەمو موسڵمانان بەگشتیو بۆ عامیەکانیان.(وەرگێڕ). هەروەها لەمسلمەوە لەفەرمودەی (سعید الخدری)ەوە ﷺ لەپێغەمبەرەوەﷺ کەفەرمویەتی:{من رأى منكم منكراً فليغيره بيده فإن لن يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الأيمان}(٢).

هەروەها بوخاری ڕیوایەتی کردوە لەفەرمودەی عبدالله کوڕی عمر وئەویش لەپێغەمبەرەوەﷺ کەفەرمویەتی:{بلّغوا عني ولو آية}(٣). (واتا: زانست وزانیاری لەمنەوە ڕابگەیەنن جابا بە تەنیا یەك ئایەتیش بێت.(وەرگێڕ).هەروەها فەرمویەتی:{مَثل القائم على حدود الله والواقع فيها كمثل قوم استهموا على سفينة فأصاب بعضهم أعلاهاوبعضهم أسفلها، فكان الذين في أسفلها إذا استقوا من الماء مروا على من فوقهم، فقالوا: لو أنا خرقنا في نصيبنا خرقاً ولم نؤذ من فوقنا، فإن يتركوهم وما أرادوا هلكو جميعاً، وإن أخذوا على أيدهم نجوا ونجوا جميعاً}(٤). (واتا: وێنەی ئەو کەسانەی کەدەستی یان گرتوە بەقورئانو سوننەتو هەرگیز سنورەکانی خوای گەورە نابەزێننو ئەو کەسانەی پێچەوانەی گروپی یەکەمن وەك ئەو دو گروپە وان کەلە کەشتیەك دان، گروپێکیان

(١ ) رواه مسلم برقم(٥٥) في الأيمان، باب بيان أن الدين النصيحة.

(٢ ) رواه مسلم برقم (٤٩) في الأيمان، باب بيان كون النهي عن المنكر من الأيمان، وأن الأيمان يزيد وينقص، وأن الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر واجبان.

بۆ زانیاری پترو وتوێژینەوەی پتر دەربارەی ئەم فەرمودەیە بڕوانە: کتێبی خۆم (دراسة حديث أبي سعيد الخدري رواية ودراية).

ب – واتاکەیمان لە ڕابردودا ڕون کردۆتەوە.(وەرگێڕ).

(٣ ) رواه البخاري برقم (٣٤٦١) فيأحاديث الأنبياء، باب ماذكر عن بني إسرائيل. بۆ شارەزا بون وزانیاری پتر بڕوانە :(كتاب الأمر بالمعروف لعبدالغني المقدسي) بە توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی خۆم لەگەڵ بۆ نوسینی پێشەکیەك.

(٤ ) رواه البخاري برقم (٢٤٩٣) في الشركة، باب هل يقرع في القسمة والأستهام فيه؟

لەنهۆمی سەرەوەن و هی دوەمیش لە نهۆمی خوارەوەی کەشتیەکەدان. جا ئەوانەی لەنهۆمی خوارەوەن دەڵێن: ئەگەر ئێمە لەخوارەوەو لەلای خۆمان کونێك لەکەشتیەکە بکەین و ئاوی خۆمان لێرەوە هەڵێنجین باشترەو خەڵکی سەرەوە عەزیەت نادەین ، دەنا ئەگەر وانەکەین دەبێ بەسەر ئەوانەی سەرەوەدا بچینە قاتی سەرەوە ئەمجار ئاو هەڵێنجین. جائەگەر ئەوانەی سەرەوە لێ بگەڕێن لەبنەوە کەشتیەکە کون بکەن ئەوا ئاو دێتە ناو کەشتیەکەو هەردو لا لەئاودا نقوم دەبن و دەخنکێن، وەئەگەر دەستیان بگرن و نەهێڵن ئەوا هەردولایان ڕزگاریان دەبێت. دەی ئەگەر لێ گەڕێن خراپەکاران لەسەر خراپەی خۆیان بەردەوام بن. مەی خۆران بەئاشکراو بێ شەرمانە مەی بخۆنەوە، ئافرەتان بەکەیفی خۆیان خۆی لێ ڕوت بکەنەوو سفورو ماکیاج کردن و لەسەر بەرەڵایی خۆیان بەردەوام بن بەناوی ئازادی ومافو سەربەستی و یەکسانی ژنانەوە شەرم لەخوای گەورە نەکەن و سنورەکانی خوا ببەزێنن، دایکان، باوکان کچەکانیان لەسەر بەرنامەکەی خواو لەسەر پۆشاکی شەرعی پەروەردەو ڕانەهێنن خوای گەورە توشی بەڵامان دەکات لەدنیاداو لەقیامەتیش توشی سزای بەسفتو سوێ دەبین. گەر لێ بگەڕێین ستەمکاران ستەممان لێ بکەن و بەکەیفی خۆیان تەراتێن بکەن دەستیان نەگرین ئەوا فیتنەو فەسادی هەمو وڵات دەگرێتەوەو چارەنوسێکی ڕەشمان دەبێت. هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {انصر أخاك ظالماً أو مظلوماً}سەحابەکان گوتیان: باشە ئەی ڕەسولی خوا ئەوە زانیمان کە لەسەر ستەم لێکراو بکەینەوەو یارمەتی بدەین، بەڵام ئەدی ستەمکار چۆن یارمەتی بدەین و لە سەری بکەینەوە؟ فەرموی: دەستی بگرن و مەهێڵن ئەو ستەمانە بکاتو بیگێڕنەوە لەستەم و خراپەکاری ئەوە یارمەتی دان و لەسەر کردنەوەیەتی. فرمان کردن بەچاکە کارێکی زۆر گرنگو بایەخدارە لەشەریعەتی خوادا . هەر گەلێك وهەر قەومێك فرمان کردن بەچاکە وقەدەغە کردن لەخراپەیان تێدا نەما دەستیان لێ بشۆ . فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردن لەخراپە بەسێ قۆناغ دەبێت قۆناغی یەکەم بەدەست: دەبێ بەدەست ئەگەر دەسەڵاتێکی ئیسلامی ڕاستەقینە هەبو خراپە کار بگێڕدرێتەوەو دەستی بگیرێت لەخراپەو فیتنەو فەسادی و زیناو مەی خواردنەوەو دزی و داوێن پیسی و دەست پیسی و گەندەڵی. قۆناغی دوەم: دەبێ بەزمان

بگوترێت لەکاتێکدا کەدەسەلاتێکی ئیسلامی نەبو یان لەتر سی کەوتنەوەی فیتنەی گەورە تر نەتوانرا بەدەست بگێڕدرێتەوە دەبێ بەزمان لەخراپە بگێڕدرێتەوە وبلێ ی کاکە ئەوە گوناحەو خراپەیە لێ ی دور بکەوە. ئەگەر بەقسەت کرا ئەوە باشە دەنا بەقسەت دەکات یان ناکات ئەوە کاری تۆ نیەو عایدی خوای گەورەیە گرنگ ئەوەیە تۆ فرمانەکەت کرد بەچاکەوئەرکی سەر شانی خۆت ڕاگەیاند. قۆناغی سێ یەم: ئەگەر لەترسی فیتنەی گەورەتر نەت توانی بەقسەش بیلێ ی ئەوا دەبێ بەدڵ پێت ناخۆش بێتو ڕقت لەو خراپەکارە، لەو ستەمکارە، لەو دکتاتۆرە، لەو خیانەتکارە ببێتەوەو پشتی نەگرێت ولەگەڵی دا نەڕۆیتو هاریکاری نەکەیتو دەستی نەگریتو دۆستایەتیت بۆی نەبێتو تەنانەت دەبێ مەیلێکی زۆر کەمیشت بۆی نەبزوێ دەنا لەلای خوای گەورە تۆش بەشداری لەو تاوانو ستەموگوناحو ستەمودەست پیسیو داوێن پیسی یەی کەئەوان دەی کەن. هەروەکو لە فەرمودەکەی ڕابردودا ئاماژەمان پێ کرد.(وەرگێڕ).

هەروەها چەند داڕشتەو پاساو لەدەست دان کەئافرەت ناچار دەکەن کەئەو بەرپرسیارێتیە گرنگە هەڵ بگرێتو نەتوانێت لەبەرپرسیاریەتی دەربارەی نەفسی خۆیو لەبارەی خێزانەکەی جیاببێتەوەو دەست بەرداری ببێت کەدەتوانین ئەم بەڵگەوپاساوانە لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گرد بکەینەوە:

### ١- پەیوەندی ئافرەت بەکۆمەڵگاکەیەوە:

بریتیە لەو پەیوەندیەی کەوا لەئافرەت دەکات کەببێتە تەوەرەیەك بۆ پەیوەندیە پتەو توندو تۆکمەکانو پردێکی پەیوەندی بەگشت لایەنەکانی کۆمەڵگاوە، خزمایەتیو گرێ بەندیەك دروست دەکات کەئافرەت ناتوانێتو هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری ببێت وەك ئەوەی دەبێتە خێزان(ژنی ) پیاو، یاخود خوشکی، یاکچ، وپورو دایك و.و..تد پیاوە. هەروەها پەیوەندیەکانی ژنو ژنخوازیو زاواو خەزورێتی، دراوسێیەتی، برادەرایەتیو دۆستایەتی دەکەونە چوارچێوەی ئەم پەیوەندیە کۆمەلایەتیانەوە. هەروەها ئافرەت وەك ئەندامێکی کۆمەڵگاو ئوممەتو وەك توخمێك لەتوخمەکانی کۆمەڵگا، هەمو ئەم

پەیوەندیانە لەکۆمەڵگەوە وا لەئافرەت دەکات کەببێتە خاوەنی بەرپرسیێتیو ئەرکو بەرپرسیەتێکی گرنگوگەورەی بکەوێتە ئەستۆ کەواتە خزمایەتیو ڕەحمو بەزەیی مافێکی زۆر گەورەی ئافرەتە. خوای گەورەو باڵا دەستو کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿فَهَلْ عَسَيْتُمْ إِن تَوَلَّيْتُمْ أَن تُفْسِدُوا فِي الْأَرْضِ وَتُقَطِّعُوا أَرْحَامَكُمْ ﴿٢٢﴾﴾ محمد:٢٢. (واتا: ئەوە چیتان دەوێ، دەتانەوێ دیسان جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ گومڕایی وسەرلێشێواوی وفیتنەو ئاشوب نانەوەو خوێن ڕشتن وداوێن پیسی وەمەی خواردنەوەو دەست پیسی وزمان پیسی وخوانەناسی وشەڕواڵ پیسی. هەروەکو چۆن پێش موسڵمان بونتان وپێش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام تیایدا بون. سیلەی ڕەحم بپچڕێنن وخزمایەتی نەهێڵن وڕقتان لەیەکتر ببێتەوە و برا ڕقی لەبرا ببێتەوەو کوڕلەباوك ودایك و، ژن لەپیاو و بەپێچەوانەوەش هەروەکو ئێستا دەی بینین بەهۆی ئەو هەمو لایەن لایەن وگروپو وگروپ وفرە حیزبیە خۆتان گۆتەنی ، کەس کەسی خۆش ناوێت، ڕەچاو کردنی ئەم سیاسەتە چەواشەیە کەبوەتە هۆی دابڕ دابڕ کردنو داهێزران و لەبەر یەك بردنی شیرازەی کۆمەڵگاو ئەندامانی تاکە خێزان هەمو لەیەکتری بونە دوژمن ولەیەکتری چونە سەنگەرەوە.و.و....تد.(وەرگێڕ). هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{من سره أن له في أو ينسأ له في أثره فليصل رحمه}[1]. ( واتا: هەرکەسێك دەیەوێت ڕزق وڕۆزی فراوان بێت یابۆی زۆر بێت باهەمیشە سیلەی ڕەحم بەجێ بگەیەنێت وسەردانی خزم وکەس وکارو دۆست وبرادەرەکانی بکات.(وەرگێڕ). هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَأَنذِرْ عَشِيرَتَكَ الْأَقْرَبِينَ ﴿٢١٤﴾﴾ الشعراء :٢١٤. (واتا: ئەی محمد ﷺ پێش هەمو کەسێك لەخزم و کەسو کار هۆزو عەشیرەتەکەی خۆتەوە دەست بکە بەبانگ کردن بۆ لای خوا

---

(١ ) رواه البخاري برقم(٢٠٦٧) في البيوع، باب من أحب أن بسط في الرزق، ومسلم برقم (٢٥٥٧) في والصلة) في البر والصلة، باب الرحم وتحريم قطيعتها.

وبیان ترسێنە لەڕۆژێك کەکەس فریای کەس ناکەوێتو کەس ناتوانێت یارمەتیت بدات لەخوا بەولاوە چونکە مافی پاراستنیان لەئەستۆی تۆدایەو پێویستە لەسەرت لەئاگری دۆزەخ بیان پارێزیتو دوریان بخەیتەوەو بەرەو نازو نیعمەتەکانی خوا وەریان بچەرخێنیەوە کەبەهەشتی پڕ نازونیعمەتە.(وەرگێڕ). هەروەها دراوسێ مافێکی گەورەی بەسەر دراوسێوە هەیە، بەڵگەی ئەمەش فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ کەفەرمویەتی:{من کان یؤمن بالله والیوم الآخر فلیکرم جاره }[1]. (واتا: هەرکەسێك بڕوای هەیە بەڕۆژی دوایی واتە زیندو بونەوە لەڕۆژی قیامەت بارێزی دراوسێو میوانەکانی بگرێت.·وەرگێڕ).هەروەها لەفەرمودەیەکی تردا فەمویەتی:{مازال جبریل یوصینی بالجار حتی ظننت أنّه سیورثه}[2]. (واتا: جبریل ئەوەندەی ئامۆژگاری کردم دەربارەی دراوسێ وام زانی دراوسێ میراتی دراوسی دەگرێت .(وەگێڕ). هەروەها دۆستو هاوڕێ مافی برادەریو هاوڕێیەتیو برایەتی گشتیو تایبەتی لەسەر برادەر هەیە، تاکەکانی ئەم کۆمەڵگایە هەمویان مافیان بەسەر یەکتریەوە هەیە هەر وەکو لە ڕابردودا ئەمەمان ڕون کردەوە، هەروەها ناموسڵمانەکانیش مافی ئەوەیان هەیە بۆ ئیسلام بانگ بکرێنو دەستیان بگیرێت بۆ لای ئایینی پیرۆزی ئیسلام ولەگومڕایی بێ باوەڕی بهێنرێنە دەر[3].

ئافرەتی موسڵمان ئەندامێکی کاراو کاریگەرە لەم کۆمەڵگایەدا، وئەرك وبەرپرسیاریەتی تەواوی لەسەر شانە بەرامبەر بەوانە هەمویان هەرکەس بەگوێرەی خۆی.

---

(١) رواه البخاري برقم (٦٠١٩) في الأدب، باب من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يؤذي جاره ، ومسلم برقم (٤٨) في الإيمان، باب الحث على الإكرام الجاروالضيف ولزوم الصمت إلاّ على الخير،وكون ذلك كلّه من الإيمان.

(٢) رواه البخاري برقم(٦٠١٦) في الأدب، باب الوصاءة بالجار، ومسلم برقم (٢٦٢٥) في البر والصلة، باب الوصية بالجار والإحسان إليه.

(٣) ئەم مافانەم لەکتێبەکەی خۆم (دروس في الحقوق) دا بەدرێژی باس کردوە دەتوانن بگەڕێنەوە لای وسەیری بکەن.

**٢ـ ئافرەتان لە پیاوان بەتوانا ترن:** دیارە شتێكی بەڵگە نەویستو ئاشكرایە كەئافرتان لەپیاوان بەتوانا ترن لەبواری قسە كردن لەگەڵ یەكتری داو بەتایبەتی لەو بوارانەی كەتایبەتن بەژنان خۆیانەوەو وەبەتایبەتی تریش لەپێكهاتەی لەش وئەندامەكان وئەو كارە دەرونی و كۆمەڵایەتیانەی كەلێ یان دەكەونەوە، بێ شەرمانەو بێ پێچو پەنا دەتوانن لەیەكتری بكۆڵنەوەو پرسیار بكەنو دەتوانن بگەنە پلەیەك كەپیاو هەگیز ناتوانێت بگاتە ئەو پلەودەرئەنجامەیە لەتوێژینەوەو لەیەكتری كۆڵینەوە، دیارە بەپێچەوانەش پیاوان لەگەڵ یەكتری دا بەهەمان شێوە.

**٣ـ ئافرەت تواناى تەواوى بەسەر ڕێگاكانی چاكەو چاكگوزرای دا هەیە:** هەروەها ئافرەت دەتوانێت هەمو ئەو ڕێگا چاكگوزاریانە لەگەڵ كچانی هاوڕەگەزی خۆی دا بەهۆی ئەوەی كەهەمیشە لەگەڵیاندا تێكەڵە بگرێتە بەر، و بەئاسانیو زۆر بەوردی سەرنجو تێبینی هەڵسو كەوتو ڕەوشتەكانیان بداتو دەست نیشانی هەمو ئەو هەڵەو پەڵانە بكات كەتێ ی دەكەون. ئەنجام بگاتە ئەنجامی لێ حاڵی بونو زانینی هەمو نهێنیە ڕواڵەتیە تایبەتیەكانیان كەهەمیشە بۆی یەكتری باس دەكەنو نهێنیوشاراوەكانی ناو خانەو شانەولاپەڕەكانی دڵیان بۆ یەكتری دەكەنەوە، سەرباری ئەمەش ئافرەتان هەمو ڕاستیو زانیاریە شاراوەكان بەچاوی سەری خۆیان دەبینن بەپێچەوانەی پیاوان كەلەگواستنەوەی هەمو زانیاریەكان دەبێ پشت بەسەرچاوەی ڕاگواستنو وەرگرتن لەمو لەو ببەستێتو كەمتر زانیاریەكان بێ هەڵەو پەڵە دەردەچن، دیارە شتێكی بەڵگە نەویستیشە كەئەوەی زانیاریەكانو ڕوداوە ڕاستیەكان بەچاوی خۆی ببینێ لەڕاستیەوە نزیكترو بەهێز ترن.

**٤ـ بواری كار كردنی ئافرەت پێشەنگیە:** بواری كاریگەرێتی لەخێرو چاكە كردنو ڕاپەڕاندنو جێ بەجێ كردنی زانیاریەكانو دروشمەكانی ئاین پێشەنگ ترو پابەند بونو پێ دامەزراویو بەردەوامی لەسەر پەیڕەو پرۆگرامو بەرنامەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام كاریگەر ترو پاراو ترو ڕەوان ترە لەقسەو باسەكانی خەڵك واتە ئەو زانیاریانەی كەلەدەم یا لەپێنوسی خەڵكەوە وەریان دەگرێت. دەی كەواتە پێشنگیەتیو كاریگەریەتی ئافرەت كاریگەریەكی زۆری هەیە لەدڵو دەرونو مێشكی ئەو كەسانەی كەبانگیان دەكات بۆ لای خواو بۆ بەرنامەكەی خوای گەورە.

٥- **ئامۆژگـاری تـاکیو بانگەشەی کەسیەتی لەنێوان ئافرەتاندا**: پیاو ناتوانێ وەك ئافرەت ئەم کارە گرنگو قورسە ئەنجام بدات، گومانی تێدا نیە کەدەبێ ئافرەتێك لەوان هەر پێ ی هەڵ بستێ وەك ڕون کردنەوەی پێویستیەتی (فرض) خۆ داپۆشینو تێکەڵ نەبونو بەتەنیا نەمانەوە لەڕوی پیاوانی نامحرەمدا.

٦- **ئافرەت ئەندامێکی ناکارامە نیە**: بەهیچ شێوەیەك ئافرەتی موسڵمان ئەندامێکی ناکارامەو کەم تواناو سەرنەکەوتو(فاشل) نیە لەناو کۆمەڵگادا، بەڵکو ئافرەت هەمیشە جێگەی کار تێکردن وکاریگەریە، بەڵێ ئافرەتی موسڵمان هەم دەم بانگخوازو ئامۆژگاری کارایە، گومانی تێدا نیە کەدەبێ ئافرەتی موسڵمان

بەشداری تەواوی هەبێت لە دامەزراندن وبینا کردن وئاراستەکردنو بانگەشە کردن بۆ دینی خوا.

٧- **ئافرەتانی موسڵمان پێشەنگ بوون**: ئافرەتانی پێشینەو پێشەنگەکانمان ئاوەها بون، لەسەروی هەمویانەوە ئافرەتە سەحابیە بەڕێزەکانمان، ئەوانەی کەبەرزو دیارو ناودار بونو جێ پەنجەیان لە بوارەکانی چاکسازیو هاوبەشیو هاریکاری دا دیار بوەو ڕۆڵی گرنگی خۆیان لەمێژوی پڕ شکۆی ئیسلامدا تۆمار کردوەو لەمێژوی ئیسلامدا هەتا دنیا مابێت لەئاسمانی دێرۆكو شارستانیەتی مرۆڤایەتیدا دەدرەوشێنەوە. لەو ئافرەتە بەڕیزانەی موسڵمانان کەناویان هەمیشە دیارو بەرز بوە دایگانی بڕواداران بون، ئائەمە عائشەیە(رضی الله عنها) کەفەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ ئوممەتی ئیسلامی دەگێڕێتەوەو ڕیوایەتیان دەکاتو کاروبارو حاڵو گوزەرانی ماڵەوەی خۆیان بۆ سەحابەکان ڕادەگوێزیو بۆیان دەگێڕێتەوەو تێ یان دەگەیەنێو کێشەی موسڵمانان بەفەرمودەو چارەسەریە بن برەکانی پێغەمبەری خوا چارە سەر دەکات. ئەوەش زەینەبەی کچی جەحشە ( رضی الله عنها) بەسەر هەزارەکان ڕا دەگاتو هەرچی شتی خۆی هەیە پێ یان دەبەخشیو خۆشی هیچی بۆ نامێنێتەوە. نمونە گەلێك زۆرترن لەوەی کەئێمە بتوانین بیان خەینە ژێر دەست خۆمانو کۆنترۆڵیان بکەینو بیان نوسین. ئائەوانەش ژنانی بەڕێزی موسڵمانانن لەپێشەنگیو خاڵی چاو لێ کردن کەبەدرێژایی مێژوی مرۆڤایەتیو تا دنیا ماوە لەئاسمانی زێڕینی مێژوی ئیسلامەتی دا دەدرەوشێنەوە.

**٨ـ هـەوڵ و كۆشـشی دوژمنـانی ئیـسلام بـۆ پـیس كردن وچـلكن كردنـی سـیمای ئـافرەتی موسلمان:**

هـەوڵ وكۆشـشی دوژمنـانی ئیـسلام لـەڕوی ئـافرەتی موسـڵماندا لـەدوو ڕوەوە بوە:

**یەكەم:** چڕ بونەوەو پێداگرتنیان لەسەر پیس كردن و تێكدان و شێواندنی سیمای لەخودی ئافرەتی موسڵمان.

**دووەم:** ئەمجار بـەكار هێنـانی خـودی ئـافرەت دوای كـۆنترۆڵ كـردن وپـیس كـردن ولادانی ئافرەت وەك دار دەستێك بـۆ تێـك دان ولادان و هەڵـدێران و چەواشـە كـردن و گـومڕا كردن و سەرلێـشێواندنی خـەڵكی تـر لەپیاوولـەئافرەتانی موسـڵمانان و زڕانـدنی كەسـیەتی ئافرەتی موسڵمان.

واقیعی كافران و مولحیدان و دوڕوان و چەواشە كراوان و ئاژاوە گێڕی و پیلان گێڕیـان ئەم ڕاستیەمان بۆ دەسەلمێنێ. جابۆیە ئەركی حەتمی و زۆر پێویستی سەر شانی ئافرەتی موسڵمان ئەوەیە كەدەبێ

بەهـەمو توانـای خۆیـەوەو بەهـەمو شـێوەو شـێوازێكەوە بـەرەنگاری ئـەو پیلانـە پـۆخڵ و ئـاژاوە گێڕیـە بۆگەنانـە بكـات و بەرپـەرچـی ئـەو شـالاوە گومڕاییـەی كـافران و چەواشـەكاران و چەواشـە كـراوان بداتـەوەو لەبەرامبـەردا بـەڕۆڵی چاكـسازی خـۆی هـەڵ بـستێت و كـچان و ئافرەتـانی هاوڕەگـەزی خـۆی هوشـیار بكاتـەوە لـەو پیلانـە گـڵاوەی دوژمنانی خواو پێغەمبەرو دینی خوا تائەنجام كۆمەڵگای موسڵمانان تـەواو وریـاو هۆشـیار بن نەبادا بكەونە تەڵەو داوی پیسی ئەو كافرانەوە.

**٩ـ هاوكـاری پیـاوان لەگـەڵ ئافرەتانـدا پێویـستێكی حەتمیـە لـەم بـوارەدا:**

پێویستەپیاوانیش لەم كـارو ئاكـارە بـەرزو بـێ هاوتایەونەركـە چـاك و پـیرۆزەدا هاریكـارو هاوبەشی ئافرەتان بكەن و باشترین كاری خێری و بـەرزترین ڕێگەپێدراووسـوننەتێك بریتیـە لەهەسـتان بـەكارو پرۆسـەی چاكـسازی و بانگەشـە كردنـی كۆمـەڵگای موسـڵمانان. كەلەداهاتودا شتێك لەم بارەوە بەدرێژی باس دەكەین گـەر خـوای گـەورە ویـستی لەسـەر بێت.

**٢ – داخوازیو داوا کاریەکانی ئەم بەرپرسیەتە :**

لەگەڵ ئەو هەمو بەرپرسیەتیە گشتی یانەی کەلەڕابردودا باسمان لێوە کردن چەندان داخوازیو گرێنتیەك دێنە پێش کەدەتوانین لەم چەند خالانەی خوارەوەدا کورتیان هەڵێنین:

A.**لایەنی خزمان:** نزیكو دورەکانیان، بەتایبەتیش ئەو ئافرەتە خزمانەی کەئافرەت دەتوانێ بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵ بستێتو بەردەوام بێت لەگەڵیاندا لەمیانەی ئەمانەی خوارەوە :

- ڕاپەڕاندنو ئەنجام دانی مافە پێویستەکانیان(حقوقهن الواجبة).
- چاودێری کردنی ڕواڵەتی شەرعیانەیان لەجلو بەرگو پۆشاکی شەرعیو لەقژو لەقسەکردنو گفتو گۆدا.
- قسەو هەواڵو گفتوگۆ کردن لەگەڵیاندا هەر جارە ناجارێ، وپرسیار کردن لەحاڵو گوزەرانیان بەتایبەتیش ئەو ئافرەتانەی کەحاڵو گوزەرانی تایبەتیان هەیە وەك پرسیار کردن لەنەخۆشیو ساغو سەلامەتیو دوعای چاك بونەوە بۆی.
- قۆستنەوەو بەهەڵ زانینی کۆڕوکۆبونەوەکانیان بەکردنی قسەی باشو ئامۆژگاری کردنی چا كو چاکسازیانەو هەمو قسەو کارێکی تری باش لەم بوارانەدا، ئامۆژگاری کردنی چاكو وەعزدادانو ئامۆژگاری کردنیان، دڵنیا کردنیان لەوەی کەئەگەر کارو کردەوەو قسەی بەسود چاك بکەن سودی باشی لێ وەردەگرنو دێتەوە ڕێگایان، ئاگادار کردنەوەو گێڕانەوەیان لەخراپەو خراپەکاری،

زیاد کردنی یەکێکی تر لەئافرەتی بانگەشەکار بۆیان، یاخود ئەنجامدانی پێشبڕکێ یەکی گشتی لە نێوانیاندا کەلەگەڵ تەمەنە جۆربەجۆرەکانیاندا بگونجێت، یاخود کاسێتێکی بەسودیان بۆ لێ بدات یاچیرۆکێکی بەسودو پڕ ئامۆژگاریان بۆ بگێڕێتەوە ئەمانەو گەلێ شتی تری لەم جۆرانە.

- دیاری پێدانی گونجاوو دابەش کردنی خەڵات بەسەریاندا هەرچەندە کەکەمو کەم نرخیش بن، چونکە کاریگەری دیاری هەمیشە لەدڵو دەرونەکاندا زۆرەو ڕامالەری ڕق وکینەو دڵ تەنگیو کردنەوەی گرێ دەرونیەکانەو چڵكو چەپەڵیەکانی سەر دڵ

دەشواتەوە. تارمایی و ڕەشاییە دەروونیەکان سپی دەکاتەوە، پەیوەندی یەکان توندو تۆڵ و سفت و لوس و ساف دەکاتەوەو حیقدو بوغزەکان لادەبات، وە خەڵکان لەیەکتری نزیك دەکاتەوە.

- یارمەتی دانی هەژارەکانیان، وسۆزو بەزەیی هاتنەوە بەهەژارو دەست کورتەکانیان، بەزەیی هاتنەوەو یارمەتی دانی بێوەژنەکانیان و لابردنی و پڕ کردنەوەی پێداویستی یەکانی موحتاجەکانیان دەست گیرۆیی کردنیان.
- ئەوەی جێگەی باسە سەردانی نەخۆشەکانیان و دڵ نەوازی کردن و دڵدانەوەیان و خۆشی بەخشین و ئارامی و دڵفراوانی خستنە دڵیان و کردنەوەی هیواو ئومید وەبەرنان و بەرز کردنەوەی ورەو خۆڕاگری ئارامگری و دوعا بۆکردن و هیوا خواستنی چاك بونەوە لەو نەخۆشیەو، هەروەها بەشداری کردنی ناخۆشی و تەنگو چەڵەمەو ئامۆژگاری کردنیان بۆ خۆڕاگری لەبەرامبەرتاقی کردنەوەکانی خوای گەورە وەك مردو لێ مردن و ئەم جۆرە خەمناکیانەی کەتوشیان دەبێت. هەروەها دوعا بۆ کردن و ئامادە دەربرین بۆ یامەتی و هاریکاری کردنیان بەهەر پێویستیەك بێت.
- کارکردن و گەڵاڵە کردن و ئەنجامدانی پرۆژەی بانگسازی(الدعوة) هاوبەش وەك کۆکردنەوەی پیتاك ویارمەتی ودەستگیرۆیی هەژاران یاخود کڕینی کتێب و چاپکراوە ئایینیە بەسودەکان و دابەش کردنیان بەسەریاندا..وگەلێ شتی تری لەم جۆرە کارە باشانە.

B. **لایەنی دراوسێ یەتی**: ئەو کارو چالاکیانەی کەدەچنە ناو چوارچێوەی ئەرك و بەرپرسیتیەکانی ئافرەتانی دراوسێو لەگەڵ دراوسێکانی دا ئەمانەی خوارەوەن:

- هەستان بەمافی شەرعی ئافرەتانی دراوسێ.
- ئافرەت پێویستە ئافرەتانی دراوسێ ی بناسێت و خۆیانی پێ بناسێنێ و هەڵسوکەوتی باش لەگەڵ ئافرەتانی دراوسێ ی دا بکات هەر کەسەو بەپێ ی نزیکی و بەپێ ی پلەی تێگەیشتن و ڕۆشنبیرێتی و کەسایەتی خۆی. هەمیشە سەریان لێ نەبڕێت و لەبیریان نەکات.

- خواردنوچێشت پێدانیان لەو خواردنو چێشتەی کەبۆ خۆیان دەی خۆن [١] دەگێڕنەوە کەپێغەمبەری خوا ﷺ فرمانی بەئافرەتێك کردوە گۆشتوخواردن بەشی دراوسێکەی بدات بابەجگەمەرێکیش بێتو لەمەرەگەوچێشتەکەی بەشی دراوسێکانی لێ بدات.[٢]

(١) جاران لەناو موسڵماناندا وا باو بو، من لەزەمانی منداڵی خۆم بیرم دێت کەدایکم ڕەحمەتی خوا لەئەویشولەمردوی هەمو موسڵمانانیش بێت، ئێواران بەم لاو بەولادا چێشتی پێدا دەناردم بۆ ماڵە دراوسێکان، وابو ئەوانیش قاپەکەیان بۆ پڕ دەکردەوە لەچێشتی خۆیانو دەم بردەوە بۆ ماڵی خۆمان، هەروەها بەیانیان بەماستو دۆو پەنیرو کەرەو ئەو جۆر شتانە. ئەوە جۆرە خۆشەویستیو ئالوگۆڕیەکی برایانەو کاسە جیرانەتی لەدڵەکاندا دەڕسکاندوپەیوەندیەکانی پتەو تر دەکرد. بەلام سەد مەخابنو بەناشکوری نالێم لەم چەرخو زەمانەی ئەمڕۆی پڕ جەنجاڵیو مل ملانێو ڕکابەرایەتیو دژایەتی یەکتری کردن بەهۆی تەشەنە کردن وبلاو بونەوەی ئەو هەمو فیکرو بیروبۆچونە بۆگەنانەو دابڕ دابڕ کردنی ئەوچینایەتیە هاوردەی لەولاتانی کوفرەوە بۆ ئێمە هێنراون نەك کۆمەڵگاو دراوسێ بەڵکو ناوکی کۆمەڵگاکان کەخێزانە لەبەر یەك هەڵوەشاوەو هەریەکە لەلایەکەوە چاڵ بۆ یەکتری هەڵ دەکەنن وبەیەکتریەوە خەریکیان کردونو بەسەرو گوێ ی یەکتری دادەنوسێنو دوژمنانی ئیسلامیشیان هەر لەبیریش چۆتەوە کەچۆن لەولاتانی ئیسلامی دا بەکەیفی خۆیان تەراتێن دەکەنو ئەم دەکوژنو ئەو دەبڕنو سەروسامانی موسڵمانان بەتالان دەبەنو هەر کەسێکیش دەنگ بکات یانوقەی لێوە بێت هەردەمەو زاراوەیەکی ناشیرینی بەبالادا دەبڕنو لەناوکۆمەڵگەی جیهانی دا بەتاوانبارو بە تابوری پێنجەمو تیرۆرستو نازانم چی وچی تاوانباری دەکەنو بەهەموان چەپۆکی زڕدایکانەی بەسەر دادەدەنو لەناوی دەبەن ،... ،.... تد.(وەرگێڕ).

( ٢) لەفەرمودەکەدا کەلەأبي هريرە وە ﷺدەگێڕنەوە کەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{يانساء المسلمات لاتحقرن جارة لجارتها ولو فرسن شاة}رواه البخاري برقم (٢٥٦٦) في الهبة وفضلها والتحريض عليها، باب فضل الهبة، ومسلم برقم (١٠٣٠) لە مانشێتی زەکاتدا، دەرگای هەڵنانو هاندان لەسەر ئەنجامدانی بەخشندەیی وخێرو چاکە کردن جاباکەمیش بێت. نەکەی دەست بگریتەوەونەبەخشی بلێ ی نیەمەو ئەوەی هەمە بڕێکی کەمەو پێم عەیبە یالێم وەرناگیرێت..وەلەفەرمودەیەکی تردا هاتوە کەلە أبی ذرە وە هاتوە گوتویەتی: پێغەمبەرﷺ پێ ی فەرموم :{ ياأبا ذر إذا طبخت مرقة فأكثر ماءها وتعاهد

- ناوە ناوە سەردانی كردنی ژنانی دراوسێو بەهەل زانینی ئەو سەردانانە بەقسە كردنی بەسود وئامۆژگاری كردنی چاك وبانگ كردنیان بۆلای خوای پەروەردگار هەروەك چۆن ئامۆژگاری خزمو كەسوكاری خۆت دەكەیت بۆ لای خوای گەورەو پەروەردگار[1].
- نابێ بەهیچ شێوەیەكو بەهیچ جۆرێك ئازاری دراوسێكانت بدەی چ بەقسە بێت یا بەكردەوە.
- ناوە ناوەش تەلەفۆنیان بۆ بكەو لەحاڵوگوزەرانوتەندروستیو ساغوسەلامەتیان بپرسە.
- ڕاستەخۆ ئامۆژگاری كردنیان هەر كەداوایان لێ كردی، یالەكاتی لێ بینینی هەر كارو قسەیەكی بێ شەرعیانە.

C ـ **لایەنی كۆمەلایەتی ژنان:** كەئافرەت لەژیانی كۆمەلایەتی دا پێ ی گەلێك لەو كۆبونەوە دا تێ دەپەڕێت. كۆبونەوە زۆرە بەزۆریەكان (إلزامیة)جارێكو سەرپشكیەكان

---

جیرانك} رواه مسلم برقم (٢٦٢٥) في البر والصلة، باب الوصية بالجار والإحسان إليه.واتای فەرمودەكە: ئەی ابي ذر ئەگەر مەرەگەیەكت لێنا ئاوی زۆر تێ بكە بۆ ئەوەی برەكەی زۆر بكات وبتوانیت بۆ ماڵە دراوسێكەشتی بنێریت .(وەرگێڕ).

( ١) نەك وەك ژنانی ئێمە ئێستا هەركەدەچنە لای یەكتری یاكەلەبەر دەرگاكان كۆدەبنەوە كەكارێكی زۆر ناشیرینو بێ شەرعی یە، وێڕای كۆڵێك سەرپێچی كردنی خوای گەورە لەخۆ دانەپۆشینولەشولارو سەرو قژی ڕوتو بێ سەرپۆشو لینگ وقاچ ڕوت یا كۆشیان هەڵ دەكەنو گیانیان دەردەكەوێتو سەرنج ڕاكێش . دەم وزمان و لەشیان بۆ گەن دەكەن ودەكەونە باسی ئەم وئەو وغەیبەت كردن و عەرش وقورش دەهێننە گۆڕێ وكەس نامێنێ لەبەر یەكی هەڵنەوەشێنن وسەدان فیتنەو ئاشوب نەنێنەوە. ئەنجام لەكۆتایی دا شەیتان لەخۆیان ڕازی دەكەن وخوای پەروەردگاریش لەخۆیان توڕە دەكەن وبەكۆڵێك گوناحەوە دەگەڕێنەوە ماڵی خۆیان، زۆریشیان ئاگایان لەخۆ نامێنێ دەمەو ئێواران یانیوەڕۆیان چێشت وخواردنەكەیان بەبنی قابلەمەوە لەسەر ئاگر دەسوتێ ودەبێتە خەڵوزو قەلەبروت.(وەرگێڕ).

(إختياريــة) هەنــدێ جــاری تــر، لەهــەردو بارەکەیــدا ئــافرەتی موســڵمان کۆمــەڵێكو بەرپرسیاریەتی لەئەستۆدان لەوانە:

ـ بۆنمونە لەکۆبونەوەو تێکەڵیە ناچاریەکاندا واتە ئامادە بونو تێکەڵ بونلەشوێنانێك کەبەویستی خۆت نیە (الإلزامي) وهەر دەبێ بەشدار بێت. مرۆڤ لەم ژیانەدا هەمیشە دوچاری نەخۆشیو بەڵاو ناخۆشیو تەنگو چەڵەمە دەبێتو پێویستی بەسەردانی نوژدارو دکتۆر دەبێتو بەدوای هۆکاری شەرعی دا دەگەڕێت بۆ شیفاو چاك بونەوە، جا کەڕۆیشتە لای نوژدارو چاوەڕوانی چونە ژورەوە دەکات بۆ لای نوژدارەکە. ئالەو ماوە کورتەدا لەگەڵ ژناندا لەهۆڵی چاوەڕوانی دا کۆدەبنەوەو شتێکی ئاشکراشە کە ژنان هەمیشە لەپیاوان کۆمەڵایەتی ترن، بەزۆری وایە لەگەڵ یەکتری دا دەکەونە قسەو گفتو گۆ. باشترین شتێك ئەوەیە کەئافرەتی موسڵمان ئەو جۆرە کۆبونەوەو بەیەك گەیشتنانە بەهەل بزانن ئامۆژگاری ئەوانە بکا کەلەگەڵیاندا بەیەکتری دەگەن. و پێویستە ئەم کارانەی خوارەوە ئەنجام بدات:

- لەگەڵ خۆ بردنی دیاری هێمایی (رمزي) لەکتێبوکاسێتی دەنگیو ڕەنگی بەدیاری ببات بیدات بەو ژنانەی کەلەگەڵی دا لەچاوەڕوانی دکتوردا لەهۆڵی چاوەڕوانی دا دادەنیشن، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو کاسێتوشریتانە باس لەحاڵو گوزەرانی نەخۆشو ئەو حوکمە شەرعیانەی لەم بارەوە دەدوێن.
- باس کردنو بەیاد هێنانەوەی ئەو چیرۆكو بەسەرهاتانەی کەلەگەڵ نوژدارو نەخۆشەکاندا بەسەری هاتونو بینیونیوپەندو ئامۆژگاریو عەقڵو دەرسیان لێ وەربگرێت.
- باس کردنو بەیاد هێنانەوەی حاڵەتە نەخۆشی یەکانو بەسەر هاتە ناخۆشیەکانی نەخۆشی، ئامۆژگاری کردنیان بەئارام گرتنو پشت بەستن بەخوای گەورە کەدڵ ئارامیو فێنکیو دڵ فراوانیو ئومێد دەخاتە دڵی نەخۆشەکانەوە کەلەگەڵ ئەودا لەهۆڵی چاوەڕوانی دا کۆبونەتەوە

وەك پێشەکیوڕێ خۆش کردنێكو ئەمجار چونە ناو بنەڕەتی مەبەستو ناو ئەو قسەو ئامۆژگاریانەی کەدەیەوێت بیان کاتو مەبەستیەتی بیان گەیەنێتو سود بەخش بن.

- لەگەڵ خۆ بردنی گۆڤاری ئیسلامی باش‌و سود بەخش بۆ ئەوەی بەو كۆمەڵە ئافرەتانەیان بناسێنێت كە پێ یان دەگات‌و لەگەڵیاندا لەچاوەڕوانی دا دەمێننەوە، باسی سودو كەلكەكانی و خاڵە ئەرێ یەكانی(الأیجابیة) كەچەندە سود بەخش‌وبەسودن‌و پێویستە بیان خوێننەوە.

ـ وەلە كاتی كۆبونەوە سەرپشكیەكاندا: ئەم جۆرە كۆبونەوانە وەك ئامادە بونی ئافرەتە سەر كەوتوەكانی كەلەخولەكانی لەبەر كردنی قورئانی پیرۆز بۆ ژنان ــ ئەو ڕواڵەتە دروستیانەی كەلەم وڵاتە پیرۆزەدا دەستی كردوە بەبڵاو بونەوە — وئامادە بونی ئافرەتی سەركەوتو یامامۆستای ئافرەتی هاوبەش یاخود ئامادە بونی خوێندكار ئافرەتی فێرخوازوسود وەرگرە، یامیوانێكی هاندەرە، یاكەسێكی تر بێت. ئیدی لەهەمو ئەم حاڵەتانەدا پێویستە ئافرەتی موسڵمان بونی خۆی لەو جۆرە شوێنانەدا بەهەل بزانێت‌و خۆی بسەلمێنێت جالەهەر بارێك لەهەر ئاستێكدا بێت، مامۆستا بێت یا فێرخواز یا لەهەر توێژێكی تری كۆمەڵایەتی دا بێت كەلەداهاتودا بەدرێژی باس لەبڕگەو بڕیارەكانی دەكەین گەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێت. وەئەگەر بانگەشەكار بو ئەوا دەبێ بەكاری بانگەشەیی خۆی هەڵ بستێت لەم بوارەدا، وەئەگەر میوانێكی هاندەر(زائرة مشجعة) بوو بەسەردان هاتبو تێدەكۆشێ بۆ هاندانی بەڕێوەبەرەكان‌ومامۆستاكان‌و بانگ كردنیان بۆ لای ئایین‌و شەریعەتی خوا دوعا بۆ كردنیان، چونكە ئەمە لەگەورە ترین فاكتەرو پاڵنەرەكانە بۆ سور بون‌و مكوڕی‌و بەردەوام بون لەسەر كارە گرنگ‌و بەرزەكەیاندا، لەبەرز كردنەوەی ئاستی هۆشیاری ئافرەتان لەم بوارەدا.

هەروەها یارمەتی دانی دەزگاكە بەماڵو پارە ئەوەندەی كەلەتوانای دا هەبێت‌و دەستی بڕوات، جابا بەشتێكی كەمیش بێت، چونكە كەم لەگەڵ كەمدا زۆرە، جۆگەو جۆبارو سێڵاوەكانیش لەكۆبونەوەو یەكگرتنی دڵۆپە ئاوەكان پێك دێت[1]. ئەم ئافرەتە بانگەشەكارە هەر كاتێك داوای لێ بكرێت ئەوەی لەتوانای دا هەبێت قسوری ناكات و وەڵام دەداتەوە.

---

(١) كوردیش گوتویەتی: دەریا لەدڵۆپە پێك دێت.وەرگێڕ).

شتێکی بەڵگە نەویستوئاشکرایە کە دەربڕینی ئافرەتی موسڵمان لەئەنجامدانو ڕاپەڕاندنی ئەم کارە پیرۆزو گرنگانە هەموی دەرگایەکی گەورەوفراوانە لەدەرگاکانی بانگەشە کردنو تێکۆشان لەڕێ ی خوادا وبۆ چاکەو یارمەتیو هاریکاری کردن لەسەر چاکەو خۆ لەخوا پارێزی(التعاون علی البر والتقوی). ئیدی هەمو کۆڕو کۆبونەوەکانی تری ئافرەتان لەسەر ئەم دو کۆڕو کۆبونەوەو بەیەگ گەیشتنانەی ئافرەتان کەباسمان کردن پێوانە دەکرێن واتە پێویستە ئافرەتی موسڵمان بەهەمان شێوە ڕۆڵی خۆی ببینێت لەکارکردن بۆ ئایینەکەیو بانگەشە کردن بۆلای خوای پەروەردگارو بەرز کردنەوەی ئاستی هۆشیاری ئافرەتانی موسڵمان لەم بوارە گرنگەدا.

## D – کۆڕو شوێنە گشتی یەکانو ئەرکی سەرشانی ئافرەتی موسلمان تیایاندا:

لەدیاردەو ڕواڵەتەکانی ئەم سەردەمەی کەئێمە تیایدا دەژین کرانەوەیە بەڕوی ڕۆشنبیریە جۆربەجۆرەکاندا، وێڕای بەیەك گەیشتنە زۆرو تێك چڕژانە ڕۆشنبیریەکان (اللقاءات الثقافیة) وزۆری کۆڕو کۆبونەوەو ئاهەنگەکانو گەلێ شتی تری هاو وێنەی ئەمانەو هەر چەندە ناو و زاراوەکانیان لێك جیا بێت.

وەئەوەی کە عەلمانیەکانو هاو شێوەکانیان پێ ی پێشکەوتون واتە دەستی خۆیان پێ پێش خستوەو پروپاگەندەی پێشکەوتن دەکەن بریتیە لەهاندانو وروژاندنو پاڵ نانی سەرچاوەکانی ئافرەتان بۆ خۆخزاندنە ناو شوێنی ئەو کۆڕو بارەگاو نادیانەودابۆشینو دەست بەسەرداگرتنیان بەفیکرە بۆگەنو لادەرەکانی خۆیان. لەهەمو بوارێکەوە دەست پێشخەریان کردوە بۆ دور خستنەوەوی موسڵمانانو کۆمەڵگەی موسڵمانان لەسەر ڕێگەی فیترەتی خواییو لەبەرنامەوئایینی پیرۆزی ئیسلامو چەواشە کردنی موسڵمانان بەتایبەتی ئافرەتانی موسڵمان. ئەو دەرگاو پەنجەرەیەش کەگرتویانەتە بەر بۆ پیاهاتنە ژورەوەی مەنزڵگەی ئیسلام وموسڵمانانو ئافرەتانەوە. بۆیە کاتی ئەوە هاتوە کەئافرەتی موسڵمانی بڕوادارو هۆشیارو چاوکراوە بەئەرکو بەرپرسیاریەتی خۆی هەڵ بستێتو ڕۆڵی خۆی ببینێت لەبەر پەرچ دانەوەی ئەو شاڵاوە بۆگەنەی دوژمنانی ئیسلاموموسڵمانانوهۆشیار کردنەوەو بەرچاو ڕۆشن کردنەوەی ئافرەتانی موسڵمانی هاو ڕەگەزەکەی خۆیو بەم کارە گرنگانەی خوارەوە هەڵ بستێتو

دەستیان بەسەردا بگرێت و چوار دەوری شالاوە فیکریە بۆگەنەکەی ئەو دوژمنانی ئیسلام و دوژمنانی خواو پێغەمبەری خواو موسڵمانان بگرێت و دای بپۆشێت وتەنگیان پێ هەڵبچنێت:

* هاوبەش کردنێکی بنچینەیی و کارامەو کاریگەر بۆ ڕون کردنەوەو تێگەیاندنی هەرچی ئاینەکەی داوای لێ دەکات لەعەقیدەو بیرو باوەڕو شەریعەتی خوای گەورە، ورەوشت و ئاکارو شێوازو بەهابەرزەکان لە ئافرەتانی هاو ڕەگەزی خۆی واتە لەئافرەتانی موسڵمان و هۆشیار کردنەوەیان وئاگادار کردنەوەیان لەو هێرشە فیکری و دوژمنکاریەی دوژمنانی ئیسلام و ئاگادارکرنەوەوحاڵی کردنیان لەهەمو شەڕو ئاژاوەو خراپەو فیتنەیەك کەمەترسی هەیە بۆ سەر ئایین و عەقیدەو باوەڕە پیرۆزەکەیان.

* خۆ تێ خزاندن وچونە ناو کۆڕو کۆبونەوەکان و بەشداری کردن و هاندان بۆرێگەی چاکەو خێرو چاکسازی و ئامۆژگاری کردنی ئافرەتانی موسڵمان هۆشیار کردنەوەیان لەفێڵ و تەڵەکەی دوژمنانی ئیسلام و موسڵمانان و ئاگادارکرنەوەو دەست گرتنیان لەلادان و پێ هەڵ خلیسکاندنیان لەڕاستە شەقامی ئیسلام و دورخستنەوەیان لەشەڕوخراپەکاری و فیتنەو ئاشوب گێڕی و نەکەوتنە ناوتەڵەی دوژمنانی ئیسلام و موسڵمانان و بەکرێ گیراو کلك و وابەستەکانیان و دو ڕوان و لادەرانی سوکەڵەو بودەڵەکانی کەلە پێست و گۆشت و زمانی خۆمانەن.

* لێدان و پوچەڵ کردنەوەی بەڵگە پوچەڵەکانیان بەبەڵگەی شەرعی و واقعیەکان بەجۆش و خرۆش و پاڵ پشت بەهۆشیاری و بەرچاو ڕۆشنیەوە.

* خستنەڕو وبەرز کردنەوەی ڕاستیە( الحقائق)ئیسلامیە پراکتیکیەکان، کەدەبێتە پێشەنگێك بۆ ئافرەتانی ئامادە بو لەو کۆڕو کۆبونەوەو دواندنگایانەدا بەو ئامۆژگاری و بڵاو کردنەوەی زانیاریە سود بەخشانەی کەپێویستە ئالەو کات و شوێنە گرنگانەدا ئافرەتی موسڵمان بەئەرکی سەر شانی خۆی هەڵ بستێت و بیان گەیەنێت و بیان خاتە ڕو چ بەشێوەو چ بە ناوەرۆك.

* هەر نەبێ ئامادە بونی ئافرەتانی هۆشیارو بەرچاو ڕۆشنی موسڵمان لەوشوێن‌و کۆڕو کۆبونەوانە بۆ پتر کردنی ڕەشایی ( سواد) ئەهلی خێرو چاکەخوازان‌و چاکەکاران[1].

* هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتارو ئاکارو ڕەوشتی جوان‌و باش کردن لەگەڵ ئەو ئافرەتانەی کەلەو شوێن‌و کۆڕوکۆبونەوانەدا ئامادە بون هەرچیەك‌و هەرچۆنێك بن‌و هەرچەندە لەخراپەکاران (فاسقات) ولە لادەران (منحرفات) بن، چونکە بەئاکارو ڕەوشتی جوان‌و کاریگەر ترو گەیەنەر تر لەقسە کردن‌و گفت‌و گۆو ئاخاوتنی نەرم‌و لەسەرخۆو هێمنانە دڵەکان نەرم دەبن‌و سەرنجیان ڕادەکێشیت، دیارە ئافرەتی موسڵمانیش بەڕەفتارو هەڵس‌و کەوتی جوان وڕێك‌و پێك فرمانی پێ کراوە.

* گەمارۆدانی سەرپێچیەکانی کەلەو کۆڕو کۆبونەوانەدا دەکرێن‌و ڕودەدەن‌و ئاگادار کردنی بەرپرسان‌و پەیوەندیداران بەو خراپەکاری‌و سەرپێچیانەو هاریکاری‌و یارمەتی دان بۆ دانانی سنورێك بۆ ئەو سەرپێچیانەو بڵاو نەبونەو تەشەنە نەکردنیان‌و بەتەواوی ئابڵوقە دانی ڤایرۆسە کاریگەریەکانیان لەناو کۆمەڵگای موسڵماناندا.

E **ـ کارکردن،** بەشداری کردنی ژنان لەگەڵ پیاواندا، لەم چەرخ وسەردەمانەدا کەتیایدا گۆڕەپان‌و مەیدانەکانی کارکردنی ژنان گەلێك زۆرن، ئافرەتانیش پشکێکی زۆریان لەم گۆڕەپانانەدا هەبوەو هەیە. وخۆی خستۆتە زۆرێك لەم گۆڕەپانانەداو ڕۆڵی خۆی بینیوە، ئێمە بۆ بونی ئەم جێگاو گۆڕەپانانە دو نمونە دێنینەوەو باقی گۆڕەپانەکانی تریش لەسەر ئەم دو شوێن‌و گۆڕەپانانە پێوانە دەکرێن: نمونەی یەکەم: پەروەردەو فێرکردن یا فێرکردن و وانەبێژی: لەگرنگترین ئامۆژگاریەکانی مامۆستای ئافرەت ئەنجامدان‌و ڕاپەڕاندن‌و گەیاندنی پەیامەکەی‌و هەستان بەئەرك‌و بەرپرسیەتی سەرشانی کەلەم خاڵانەی خوارەدا خرپیان دەکەینەوە:

---

( ١) واتە: پتر کردنی ژمارە و قەبارەی موسڵمانان وبڕواداراني ئەهلی خێرو چاکەکارو چاکخواز لەبەر دەم ولەبەرچاوی ئەهلی کوفرو خوانەناسان ودوژمنانی ئیسلام وموسڵمانان ودوڕوان وهەڵ گەڕاوەو خۆفرۆشان بەندەکانی دینارو دۆلاری ناوەخۆولەپێست وگۆشت وزمانی خۆمانە.(وەرگێڕ).

- هەست كردن بەگەورەیی‌و بەهەند هەڵ گرتنی ئەرك‌و بەرپرسیەتی سەر شانی خۆی - بەرپرسیەتی پـەروەردەو فێركـردن ــ وهەسـت كـردن بـەوەی كەئـەركێكی گـەورەی لەئەستۆدایە، وابیر بكاتەوە كەئەو عەقڵە بچوك‌و گەورانە وان لەژێر كاریگەری ئـەودا، و هەمیشە دڵنیا بێت كەخوای پاك‌و بێگەردوتاك‌و تەنیا لەو ئەرك‌و بەرپرسیاریەتیەی كەلەئەستۆیاندایە دەپرسێتەوەوهەروا بەهەوەنتە بەسەریاندا ڕانابورێـت، ئـەو خـوای پـــەروەردگارە لەهـــەمو شـــوانو لەهـــەمو بەرپرســـێك‌و لەهـــەمو چـــاودێرێك‌و سەرپەرشـتیارێك دەپرسـێتەوەو لـەمافی ژێـر دەسـتەكانیان دەپێـچێتەوە. پرۆسـەو كـاری پـــەروەردەوفێركردن زۆر گـەورەو بـەرزو گرنگـە، گـەورەیی‌و گرنگـی ئـەم پرۆسەیەش لەوەدا دەردەكەوێت كە پرۆسەو كاری پێغەمبەرﷺ بوە. جاماموسـتای ئافرەت دەبـێ بزانێـت كەلـەم پلەیـەدا میراتـی پێغەمبـەری هـەڵ گرتـوە، ئـاخر ئـەو پەروەردیارێكی گەورەیـەو بـەكاری دایكایـەتی بـەڵكو گـەورە تـریش هـەڵ دەسـتێت ئەویش بەهۆی كاریگەیەتی‌و ڕەنگ دانـەوەی مامۆسـتا لەسـەر فێرخـوازو لەڕواڵـەت‌و دڵ‌و دەرونی خوێنكار یافێرخوازو قوتابیەكانی دا لەهەمان كاتیشدا ئەو ئاڕاستەكەرو ڕێنومایی كارە. ئەو ئاراستەو ڕێنومایانەی بەشێوەیەكی بـەرفراوان لێ وەردەگیرێـت و بەگوێچكەو دەرونی گوێ گرەكانیدا ڕۆ دەچێت‌و بەعەقڵ‌ودەرونەكاندا دەگەڕێ ئەو وێـچواندن‌و وێنـا گرتنـەی كەشـەوقی لـەم دێـرە هۆنراوەیـەدا بەسـە بـۆ ئـەرك‌و ڕاسپێریەكانی مامۆستا كەگوتویەتی .

قم للمعلم وفيه تبجيلا　　　كاد المعلم أن يكون رسولا

(واتا: لەبەر مامۆستاكەت هەلبستەو هەمیشە ڕیزی بگرە چونكە ئەرك‌و كاری مامۆستا زۆر گرنگ‌و بەرێزو بەرزە وەك كارو ئەركی پێغەمبەرﷺ وایە.(وەرگێر).

ئـا لێـرەدا دەردەكـەوێت كـە مامۆسـتای ئـافرەت چ ئـەرك‌و فرمـانێكی قورسـی لەئەستۆدایە، پێویستە لەسەری كەبەو ئەركە هەڵ بستێت‌و سستی تێدا نەكات‌و بێ كـەم‌و كوڕی ئەنجامیان بدات. سـەرەتای ئـەم ڕاپەڕاندنـەش هەسـت كردنـە بـە بەرپرسـیاریەتی‌و ئەركی سەرشانی.

- باش ئەنجامدانی ئەرکە بنەڕەتیەکەی سەرشانی کەلەبەرامبەری دا پلەو پایەیەکی هەیەو موچەیەك وەردەگرێت بۆیە پێوستە لەسەری کەزۆر هەوڵ بداتو بیّ وچان تێبکۆشێتو وانەکانی ئامادەو وێنا بکات بۆ گوتنەوەیانو فێر کردنی خوێندکارەکانی بەدڵسۆزانەو بیّ ڕەخاوەتولێبڕاوانە کار بکات بۆ پەیداکردنو بەدەست هێنانی شێوازی باشو دروستیانەی وانەکانو پەیدا کردنی هۆکارە پێوستەکانی وانە گوتنەوەو پەروەردەو فێرکردنی قوتابیانو خوێندکارەکانی بۆپرۆسەی وانە گوتنەوەکانی، چونکە خوای گەورەو باڵا دەست کەسێکی خۆش دەوێت کەکارێك دەکات وبەباشی ئەو کارە وەردەگرێتو لەئەنجامی پراکتیك کردنی ئەو کارەدا پسپۆڕیو شارەزایی تەواوی لێ بەدەست دێنێتو تیّ ی دا کارامەو زیرەكو لیّ هاتوەو بەدڵسۆزیو نیاز پاکیەوە ڕای دەپەڕێنێتو ئەنجامیان دەدات.
- دەبیّ ئافرەتی موسڵمان لە ڕواڵەتو لەڕەوشتو ئاکارو لەئاخاوتنو جموجوڵو هەڵسو کەوتەکانیدا پێشەنگ بێت بۆ فێرخوازو قوتابیەکانی. پێشتر ڕونمان کردەوە کەکاریگەری و شوێنەواری کاری پراکتیکی(العملي) گەلێك کاریگەر ترو پاراو ترە لەهی لێوەکی (قسەو ئاخاوتن ــ القولي) چونکە شتێکی بەڵگەنەویستو ئاشکرایە زۆرینەی فێرخوازانو خوێندکاران پەیوەستو شوێن کەوتەی مامۆستاکانیانن و هەمیشە چاو لەوان دەکەنولاسایی یان دەکەنەوە هەتاکو لەجلو بەرگو پۆشاكو جموجوڵوچالاکیو هەڵسو کەوتەکانیشو لەشێوەشیاندا . بەڵیّ، ئافرەتی موسڵمانی شکۆمەندهەمو جموجوڵێکیو هەمو ئاخاوتنو قسەیەكو کارو کردەوەو پۆشاکێکی جێگەی تێڕوانینو چاولێکەریە لەلایەن قوتابیەکانیەوە ئەگەر مامۆستاکان باشو ڕێكوپێكو ڕەوشت جوانو ئاکار بەرز بون ئەوا لەقوتابیەکانیشی دا ڕەنگ دەدەنەوەو لەدیدیاندا وێنا دەبیّ وهەمیشە چاوەڕوانی خێرو چاکەو ڕەوشت بەرزیان لیّ دەکرێت، وەبەپێچەوانەوەش گەر مامۆستا خوار خێچ وهیچ لەباردا نەبو بو ئەوا هەمان سیفەت وهەمان ئاکاروشێوەش لەقوتابیەکانیدا ڕەنگ دەداتەوە. دیارە مامۆستای سەرکەوتو ئەوەیە کە دەبیّ حساب بۆ هەمو شتێك بکاتو بیر لەهەمو ئەو کاروبارو ئەرکانە بکاتەوەوبەتەواوی گرنگیان پیّ بداتو نەخشەیان بۆ بکێشێتو

خۆیـان بـۆ ئامـادە دەکـات بـۆ ئـەوەی کاریگـەری یـان هـەبێتو سـودبەخش بـن بـۆ خوێندکارو قوتابیەکانی.ئەم جۆرە مامۆستایانە لە دو ڕووەوە پاداشت وەردەگرنەوە. خوای گەورە نمونەی ئەم جـۆرە مامۆسـتا دڵسۆزو نیازپاکانەهەمیـشە پتر بکاتو وایان لێ بکات کەهەمیشە لەم بوارەدا واتە لـەبواری پـەروەردەو فێرکردنـدا سورو مکوڕو بیٚ وێنە بن .

- دەبیٚ وا دابنـێ کـەقوتابیانو خوێنـدکارەکانی هـاوڕێو ڕەفیقـی خـۆنی، بەتایبـەتیش لەقۆناغەکانی خوێندنی ناوەندیو دواناوەندی، بەڵام لەقۆناغەکانی سەرەتاییو پـێش سەرەتایش وا دابنێ کەئەو دایکی ئەو قوتابیانەیە کەکـەسو کـاری داویانەتـە دەسـت ئەو و بەویان سپاردوە، پێشتر باسی کارو ئەرکی دایکمان کرد. ئەگەر هاتو مامۆستا ئاوای بیر کردەوەو هەستی بـەم هەڵوێـستە جوامێرانەیـە کـرد ئـەوا کاریگەریـەکی زۆر گـەورەترو پـتر دەبێـت لەسـەر قوتابیـەکانیو شوێنەوارەکەشـی پـتر لـەدڵو دەرونـی قوتابیانو هاو وڵاتیان دا ڕەنگ دەداتەوەو پتریش دەمێنێتەوە.
- باش ڕەفتار کردن لەگەڵ قوتابیەکانی داو هەڵسوکـەوت کـردن لەگەڵیانـدا بـەڕەفتارو ئاکاری جوانوڕێك وپێك. گومـانی تێدا نیـە کـەڕەفتاری بـاشو جـوان کاریگەریـەکی زۆری هەیە، خۆت بەزلو بەگەورە مەزانە لەبەرامبەر قوتابیەکانتو شانازیان بەسـەردا مەکەو، پێویستە لەسەر مامۆستا کەقوتابیە باشوزیرەكو بەئەخلاقەکان هـان بـداتو سۆزو بەزەییشی هەبێت لەگەڵ قوتابیە بچوكو بیٚ هێزەکانـدا، کێشەو تەنگژەکانیان بـۆ چارەسـەر بکـاتو گـریٚ کوێرەکانیـان بـۆ بکاتـەوە، چـاودێری حـاڵو گـوزەرانی ماڵەوەشـیان بکـات، هـەروەها چـاوەدێریو تێبینـی بـاری دەرونـیو ئـەو بارودۆخـە کۆمەڵایەتیانـەیان بکـات کەبەسـەریاندا دێـت. یائاگـاداریو چـاودێری حاڵەتـە دەرونیەکانی قوتابیە کچەکان بکات کەلەکاتی مانگانەدا توشیان دەبێت.
- هاوبەشـی کـردن لەچالاکیەی کـەپیٚ ی دەگوترێـت چـالاکی نـاپرۆگرامی (اللامنهجـی) کەلەنزیکـەوە خـۆ بەقوتابیـە کـچەکان دەناسـێنیٚوتێکەڵاویان دەبێـتو دەچـێتە

ناخیانەوەوهەوڵ دەدات هیواو ئاواتوئارەزوەکانو تواناکانیان بخوێنێتـەوەو بزانێـت. لەم کارەی دا پشت بەباش ئاراستە کردن ورێنومایی کردنیان دەبەستێت[1].

- کردنەوەی دڵی خۆی بۆ قوتابیەکانی بەشێوەیەك هـیچ شـتێك لەیـەکتری نەشـارنەوە، قوتابیـەکان هەرچـی کێشەو گـرێ کـوێرەو تەنگژەو ناخۆشـیەکی خۆیانومـاڵـەوەیان هەیـە بـۆ مامۆسـتاکەیان بـاس بکـەن لێ ی نەشـارنەوەو ڕاوێـژ بەمۆسـتاکەیان بکـەن لەچارەسەر کردنی دا بەتایبەتیش ئەو قوتابیانەی کەکەسو کارەکانیان گوێ یان پـێ نـادەنو بەدوایانـدا ناچـنو لێ یـان ناپێـچنەوەو ئاگایـان لەمنداڵـەکانیان نیـەو وێڵیـان دەکەنو هیچ گرنگیەك نادەن بەچۆنیەتی پەروەردە کردنیان بەشێوەیەکی دروسـتانە بۆیـە ئـەم جـۆرە دایـكو بـاوكو کـەسو کارانـە منداڵـەکانیان سـەقەتو بـێ کـەڵك دەردەچن، ئالێرەدا بەرپرسیەتیو ئەرکی سەرشانی ئافرەتی سەرکەوتو گەورەترو پڕ سـود تـر دەبێـت کەبەچـاکە بـچێتە نـاو ئـەو قوتابیانـەو خـۆی لەکێـشەکانیان هـەڵ بقورتێنێتو ڕۆڵی باشو چاکگوزاری خۆی ببینێتو ئامۆژگاریان بکـاتو ڕێنوماییـەکی دڵسوزانەیان بکـاتو دەسـتیان بگرێـت لـە ڕێگـەی خراپـەوە بـۆ ڕێگـەی بـاشو چـاك وەریان بگێڕێتەوەو تەنگژەو تـەنگو چـەڵەمەکانیان بـۆ حـەل بکـات، چـونکە ئەگـەر کچێك، قوتابیەك یاهەرکەسێکی تر لەدەستی ئەو ڕێنومایی بکرێت بـەرەو ڕێگـەی ڕات بگەڕێتەوەو هیدایەت بدرێت ئەوە بۆ ئەو باشترە لە نیعمەتی سور(حمر النعم) واتە لـە حوشتر هەروەکو لەفەرمودەی ڕاستی پێغەمبەرداﷺ هاتوە[2]

---

( ١) واتە: بەجوانترین شێوەو بەنەرم ترین شێواز لەگەڵیاندا ڕەفتـار دەکـاتو نـاخی دەرونیـان دەخوێنێتـەوەو دواتر بەو شێوازانە زانیاری وئامۆژگاریەکانی خۆی ئاراستە ی قوتابیەکانی دەکـات کـەلێ ی تـێ دەگـەن وزۆریـە ئاسانی و بەسنگ فراوانیەوە لێ ی وەردەگرن وکاریگەری خۆی دەبێت لەسەردڵ ودەرونیان.(وەرگێڕ).

( ٢) لەفـەرمودەی سـهل کـوڕی سـعید کەگوتویـەتی: پێغەمبـەرﷺ لـەڕۆژی خەیبـەردا بـەئیمامی علـی ی ﷺفەرموە:{ فوالله لأن يهدى اللهُ بكَ رجلاً خيرٌ لك من أن يكون لك حمر النعم} رواه البخاري في الجهاد والسير، باب فضل من أسلم على يديه رجل (٣٠٠٩) ، ومسلم في فضائل الصحابة، باب من فضائل على بن أبي طالبﷺ (٢٤٠٦).

واتە: سوێندم بەخوا ئەگەر خوای گەورە پیاوێك، کەسێك لەسەر دەستی تۆ هیدایەت بـداتو موسـڵمان ببێت باشترە بۆ تۆ لەباشترین وبەنرخترین مێگەلە حوشترێك.(وەرگێڕ)

- قۆستنەوەو بەکارهێنانی کەرستەی زانستی لەکاتی شرۆڤە کردنو گوتنەوەی وانەکانداو ئاراستە کردنو بەکار هێنانی ئەو کەرستە زانستیە بەرەو ئامۆژگاری کردنو بەرەو خێرو چاکەو ڕێنومایی کردنی قوتابیانو کەسانی تر بۆ ڕێگەی هەقی خواییو بەرەو ڕەوشتو ئاکارو بەها ئیسلامیە بەرزەکان لەبڕیارەکانو لەهەمو هەڵسو کەوتو ڕەفتارەکانی ڕۆژانەی ژیانی مرۆڤدا بەتایبەتیش لەبوارەکانی زانستە شەرعیەکانو عەربیو کۆمەڵایەتیو هەتا لەبواری زانستە مرۆییەکانی تریش دا نابێ سستی بکەیت لەئاراستە کردنو ئامۆژگاری پێ کردن بەرەو چاکەو ڕێگەی خێروبەها بەرزەکان، وەدەبێ ئەمەژی بزانین کە ئەم ئاراستەو ئامۆژگاری کردنو دەست گرتنی خەڵکو ڕێنومایی کردنیان تەنیا لەسەر مامۆستای زانستە شەرعیەکان کورت هەڵ نەهاتوەوتەنیا ئەرکی سەرشانی ئەو نیە بەتەنیاو بەس، هەرچەندە گومانی تێدا نیە کەئەرکی سەر شانی ئەو گەورە تـرو قورسترە، بەڵام ئەمەش وا ناگەیەنێت کەمامۆستاکانی تر لەم ئەرك وبەرپرسیاریەتە بێ بەشو هیچ لەئەستۆیاندا نەبێتو پاڵی لێ بدەنەوە. لێرەدا ئێمە چەند نمونەیەك لەسەر ئەم قۆستنەوەو دەست بەسەرداگرتنە بەسودە دەهێنینەوە:

ـ نمونەی یەکەم: پێویستە لەسەر مامۆستا کەسورەتی (القارعة) لەقورئانی پیرۆزدا بڵێتەوەو شرۆڤەوراڤەی بکات بۆ قوتابیەکانیو پێ یان بڵێت، چونکە شتێکی ئاشکرایە کەئەم سورەتی (القارعة) باس لەڕۆژی قیامەتو پێش دەستیە گەورەکانی دەکات لەگۆڕانکاریەکانی باری زەویو چیاکانو ئانەنجام مرۆڤـ لەبەهەشت یا لەدۆزەخدا جێ گیرو دەگیرسێتەوە. دوای ئەم ڕون کردنەوەو شرۆڤە کردنی واتاکانی سورەتەکە کۆمەڵێك پرسیاریان ئاراستە بکات وەك: چۆن دەبیتە ئەهلی بەهەشت؟ هۆکارەکانی چونە ناو ئاگری دۆزەخ چین؟ دوای وەڵامدانەوەیان لەلایەن قوتابیەکان باسی ڕونکردنەوەیەك لەسەر سیفاتی بڕواداڕانو سیفاتی کافرانو دو ڕوەکان بخاتە ڕو . .. وەهەروەها ئەمجار ئەو سیفەتانە لەسەر ئەمری واقیعی خەڵکەکە ئەنجام بداتو خاڵە ئەرێییەکان (الإيجابية) و خاڵە نەرێییەکان (السالب) لەژیانی خەڵکی دا ڕون بکاتەوە.

— نمونەی دوەم: کەمامۆستای ئافرەت وانەی فیقه دەڵێتەوە: بێ نوێژیو خوێنی منداڵ بون (الحیض والنفاس) دوای شرۆڤە کردنو ڕونکردنەوەو گوتنەوەی ماددە زانستیە بڕیار لەسەر دراوەکە (المادة العلمیة المقررة)، دەچێتە ناو چۆنیەتی ئاراستە کردنی گونجاو ولەبارو خستنە ڕوی مەبەستی خۆی، بۆقوتابیە کچەکانی ڕون دەکاتەوە کەئەم بێ نوێژیە خوای گەورە تاتیبەتی کردوە بەژنان جویێ لەپیاوان واتە تەنیا ژنان ئەم حاڵەتەیان بەسەر دا دێتو پیاوان نای بینن، لەبەر ئەوەی چونکە سروشتی ژن جیاوازە لەگەڵ سروشتی پیاو، هەندێ لەجیاوازیو جیاکاریەکانیان بۆ شروڤە دەکات تادەگاتە ئەوەی کەچەندان حوکم هەن کەخوای گەورە تایبەتی کردون بەئافرەتەوە نەك بە پیاوانەوەو پیاوان ناگرێتەوە. هەندێ لەو حوکمانە: خۆدا پۆشینو پۆشاکی شەرعیو دورکەوتنەوە لەشوێنو جێگای پیاوان واتە تێکەڵ نەبون لەگەڵ پیاوانی نامحرەم....تد.

— نمونەی سێ یەم: دەبێ مامۆستای ئافرەت ڕێزمانی (المبتدأ والخبر) بڵێتەوە، لێرەدا پێویستەو چاك وایە مامۆستای ئافرەت پرسیاری لەبارو گونجاو هەڵ بژێرێت کەببێتە هۆی چاندنی واتاو چەمکەکانی چاکەو خێرو چاکگوزاری لەدڵو دەرونی کچانی قوتابی دا وەك گوتنو هێنانی ئەم ڕستەو دەستەواژانەی خوارەوە

هند کتێبی خوا( قورئان)ی لەبەر کرد، فاطمة لەوانەکانیدا زۆر بەپەرۆشو زیرەکە، زکیة زۆر زیرەك وبلیمەتە .... وە هەروەها.

نمونەی دوەم لەمەیدانی پراکتیکی (العملي): فەرمانبەرێکی کارگێڕی چ لەقوتابخانەیەك لەقوتابخانەکاندا بێتو چ لەهەر شوێنێکی تردا بێت، هەروەها ئافرەتانی کرێکار( کارگەر) لەیەکێ لەدەزگا تەندروستیەکاندا سستەرە یا نوژدار(الطبیبة) ... یاهەر شتێکی تر بێت.

ئەرکو بەرپرسیاریەتیەکانی سەرشانی ئافرەت بریتیە لە:

- دەبێ هەمیشە وا هەست بکاتو وا بزانێت کەئەو کارە پێویستە(واجبة) لەسەریانو ئەسپاردەیەکە کەلەگەردنیانداو لەبەرامبەردا بڕێك لەماڵو پول وەك موچە وەردەگرنو لەسەر ئەم ئەرکە لێیان دەپێچرێتەوە، بۆیە پێویستە لەسەریان کەزۆر لێبڕاوانەو دڵسۆزانە ئەرك و بەرپرسیەتی سەرشانیان ئەنجام بدەنو سستیو تەمەڵیو

خۆ دزینەوەی لێ نەکەن. ئاخر ئەوان کەوتونەتە تەنگەبەرێکەوەو ڕاکردن لەدەستیاندا نیەو ڕێگا چارەو ڕزگار بونیان نیە.

- دەرکەوتنی ئافرەتانی موسڵمان بەدیمەنو سەروسیماو ڕواڵەتی ئیسلامیانەوە وای کـردوە کەببنـە پێـشەنگو پێـشڕەو بـۆ خوشـکانی تریـان لـەهاوڕێو دۆسـتانیانولەقوتابیان ئەگـەر کارگـەرو کارمەنـد بـن لەقوتابخانـەدا، یـا لەنەخۆشخانەکاندا سیستەر یا نوژدار ( طبيبات) یا لەهەر شوێنێکی تـرو لەهـەر پلـەو پایەیەکی تردا بن. وەدەبێ ئەمەش بزانن کەئەوان کاریگـەری باش ( ئـەرێ یـی — الإيجابی) وخراپی ( نەرێ یی ـ السلبی) ی خۆیـان هەیـە بـەگوێرەی هەست کردن و هەست نەکردنی یان بەو دیمەنو بەو ڕواڵەتو سـەرو سیمایەی کەلەبـەر دەمو لەبـەر دیدی خوشکانی ترەوە پێیەوە دیارنو پێ ی دەناسرێنەوە.
- بەهەل زانینو قۆستنەوەی پیشەو فرمانەکەی(الوظيفة) لەخزمەت کردنی خوشکانی تر و ئامۆژگاریو ئاراستە کردنیان بۆ خێرو چاکە کردنو بەها بـەرزە ئیسلامیەکانو دور کەوتنەوە لەکارو کردەوەی خـراپو قێزەونو سەرشـۆڕ کـەرەکان، بەتایبـەتیش ئـەو خوشـکانەی کەلـە نزیکـەوە پەیوەنـدی ڕاسـتەوخۆی بەخەڵکـەوە هەیـە وەك سیستەرەکانو نـوژدارە ئافرەتـەکان و پسپۆڕیە کۆمەڵایەتیـەکان، بـۆ نمونـە ئەگـەر ئافرەتی موسڵمان نوژدار بێت ئەو کات ئەرکو بەرپرسیاریەتیەکەی گەورە تر دەبێتو کارەکەی وای لێ دەکاتو وادەخوازێ کەپتر خزمـەتی خوشـکانی خـۆی بکـات، گـەلێ شتو زۆر واتای بەرزو گەورە لەنەفسی خۆی دا هەڵ دەگرێتو دەبێ لەناو ئافرەتـانی تری موسڵماندا بڵاویان بکاتەوە، لەو خزمەت کردنو کارانە هێدیو هێمن کردنو ئارام کردنـەوەی دەرونـی نەخۆشـەکانو هیممـەتو ورە خـستنە نـاو دڵـی یـانو دڵ خـۆش کردنیان بەوەی کەچاك دەبنەوەو خـوای گـەورە شـیفاتان بـۆ دەنێـرێو بـەم جـۆرە هیواو ئومید وگەش بینی خستنە ناو دڵو دەرونی یانەوەو ڕەواندنەوەی ڕەش بینـیو بـێ ئومیـدیو تـرسو بـیم لـە چـاك نەبونـەوەیان لەبـەردەم نـەخۆش داو ئەگـەر نەخۆشیەکەی ترسناك بو نابێ یەکسەرو ڕاستەوخۆ بەنەخۆشەکە بڵێـت بـەڵکو دەبـێ بڵێ: هیچ نیە ئینشائەڵڵا بەم زوانە چاك دەبیتەوەو نەخۆشیەکەت سوکە ورە بـەرزیو

ئومێـد بخاتـە دڵـی نەخۆشـەکانیەوە. هـەروەها ئامۆژگـاری کردنـی نەخۆشـەکانیو ڕونکردنـەوەو شـرۆڤە کردنـی پـاکو خـاوێنیو دەسـت پـاکیو دەسـت نوێـژو کردنـی نوێژەکانو گشت ئەرکو فەرزەکانی ترو ئەحکامەکانیان گشت پەرستـشیەکانی تـر بـۆ خوشکانی موسڵمانی.

گرنگترین شتێك کەئاراستەی بکاتو لەخوشکانی بگەیەنێت ئەوەیە کەپێویستە هـەمو کەس تەنیا پشت بەخوا ببەستێتو بـەخواوە خـۆ گـریێ بـداتو لـەخوا بـەولاوە هانـاو بـۆ کەسی تر نەبات وداوا لە کەسی ترو لەهیچ شتێکی تر نـەکاتو داوای شـیفاو چـاك بونـەوە تەنیا لەخوای گەورە بکات، چونکە هەرئەو شیفا هێنەرو ڕزگـار کـەر تـەنیا(الله) یـەو بـەس بۆیان ڕون بکاتەوەو ئامۆژگاریان بکات ڕو لە هیچ شـوێنو لـەهیچ کەسـی تـر نەکـەن جگـە لەخوای باڵا دەسـتو کاربـەجێ. وەئـەوەی کەمرۆڤـ لـە دنیـادا دەیکـات وەکـو پاڕانـەوەو دوعاو داوا کردن تەنیا هۆکارێکەو بەس جاری وا هەیە سودی دەبێت ئەویش ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەر بێتو گەلێ جاریش گـەر خـوای گـەورە ویـستی لـە سـەر نـەبێت بـێ سودو بێ بەرهەمە، چونکە ڕزگـار کـەرو شـیفا هێنـەر تـەنیا زاتـی (الله) یـەو بـەس، بـەڵێ ئەوەی نوژدارو دکتۆرەکان لەچارەسەریو تیمار کردندا هەوڵی بۆ دەدەن تەنیا هۆکـارێکی نادیارەو ئەگەر خوای باڵا دەست ویستی لەسەر بێت ئەوا چارەسـەریەکانی ئـەوان سـودی دەبێتو نەخۆشەکە چاك دەبێتەوەو شیفای بۆ دێت. دیارە شـتێکی بەڵگـە نەویستە گـەر خوای گەورە ویستی لەسەر نەبێت ئەو نەخۆشـە تەمـەنی کۆتـایی هاتبێـت ئـەوا نەهـەوڵی دکتۆرونوژدارەکانو نەدوعاو پاڕانەوەو داوای منو تۆ سودی دەبێت چونکی هەمو شـتێكو هەمو کاروبارێکی مرۆڤەکان وا لەدەست خوای باڵا دەست وکاربەجێ دایە، بۆیـە پێویـستە لەسەر ئافرەتانی موسڵمان وبڕوادار کەڕۆڵی خۆی لەناو ئافرەتاندا ببینێـت وئەمانـەو گـەلێ سیفاتی تری جـوان وگـەلێ واتـای بـەرز تـرو ئامۆژگـاری سـود بەخـشانە لـەناو خوشـکانی موسڵماندا بڵاو بکاتەوە. وێنەی نـوژدارو دکتۆرەکـانیش سیستـەرو پـسپۆڕو تایبەتمەندیـە کۆمەڵایەتیەکانن کەهـەمان ئـەرکو بەرپرسـیاریەتیان لەئەسـتۆدایەو نـابێ هـەرگیز درێغـی بکەن لەخزمەت دین وژینی موسڵماناندا.

پێویستە ئەمەژی بزانین کەئەو ئەرکو بەرپرسیاریەتیە گەورە ترو گرنگ تر دەبێت ئەگەر ئەو فەرمانبەرە ئافرەتە بەرپرسـێکی کـارگێڕی بێـت وەك بەڕێوەبـەری قوتابخانـەو

خوێنـدنگا یابەڕێوەبـەری بەشـێك لەبەشـەکانی ژنـان بێـت، یـاخود بەڕێوەبـەری بەشـی ڕێنومـاییو ئارسـتە کـردن بێـت. یالەهـەر شـوێنێکی تـر بێـت، ئـەو کاتـە ئـەرکی پەروەردەییوبانگەوازیورێنومایی وپەروەردەی کۆمەڵایەتی دەکەوێتە ئەستۆی بەهەمان شێوەو وێنەی کەلەبەشی مامۆستای ئافرەتی بەڕێوەبەرو لەڕابردودا باسمان لێوە کرد.

و ـ لەقۆناغی خوێندن دا:

گومـانی تێـدا نیـە کـەژیانی خـەڵکی ئـەمڕۆ زۆر جیـاوازە لـەهی دوێنـێ، لەبابەتـە جیاوازەکـانی ئـەم سـەردەم ولـەژیانی ئـەمڕۆدا خوێنـدنی کـچانە (....) بـەڵکو کـەم وایـە کەلەجیهانـدا قوتابخانەیـەکی کـچان هــەبێت هــاو وێنــەی قوتابخانــەی کــوڕان نــەبێت، وەلەلایەنی خێزانیشەوە کەم وایە کچێك هەبێت نەچوبێتە قوتابخانـەو داوای نـەکرد بێـت، ئالێرەدا پێویستە قوتابی کچ کە هاوبەشی بکات لە هەڵگرتنی ئـەرك و بەرپرسـێتی لـەڕوی کۆمەڵگایەکەیداوئومەتەکـەی دا، بەتایبـەتی قوتابیـانی کـچ لەقۆناغـەکانی خوێنـدنی پێشکەوتودا (واتـە: لـەقوناغی ئامـادەییو ناوەنـدیو دوانـاوەنی زانکۆوپەیمانگاکانـدا ــ وەرگێڕ). لێرەدا بـەکورتی هەنـدێ خـاڵ دەخەمـەڕو کـەقوتابی کچ تیایدا بەرپرسیەتیو ئەرکەکانی خۆیانی تێدا ڕادەپەڕێنن:

- ✓ نیەت پـاکیو نیـاز پـاکی، بـەوەی کـەدەبێ نیـەتی پـاك بێـت بـۆ خـوای گـەورەو بـاڵا دەسـت، لەڕێگـەی خـوادا خوازیـاری زانسـتوزانیاری بێـت، دەبـێ لـەپێناوی ئـەوەدا زانستو زانیاری وەدەست بێنێت بۆ بەهێز کردنو ڕاگیری ئاینو بیرو باوەڕو ئـەخلاق وئاکـارو ڕەوشـتەکانی و دەبـێ لەسـەر بەرچـاو ڕۆشـنیو هۆشـیاریەوە خـوای خـۆی بپەرستێت.
- ✓ دەبـێ قوتـابی کـچ بـەئاکارو ڕەوشـتی خوازیـاری زانـستەوە خـۆی جـوان بکـاتو زۆر بەلێبڕاویو سورو مکوڕ بێتو هەمیشە بـیر کـراوەو بـەدوادا چـونو شـێوازی جوانـەوە بەردەوام بێت. بەتایبەتیش کردن لەگەڵ مامۆستاو هاوڕێکانی دا.
- ✓ دەبێ کۆششو هـەوڵی لێبڕاوانـە بـدات بـۆ بەدەست هێنـانی زانسـت، هەمیـشەو زۆر بەچاکی گوێ بۆ مامۆستاکەی بگرێت لەکاتی وانە گوتنەوەدا بەدڵو بەگوێ گـوێ بـۆ وانەکانی بگرێتو ئاگای لێ بێت کەمامۆستاکەی چی دەڵێت، ئینجاله ماڵەوەش پـێ ی دابچێتەوەو سەعیان تێدا بکاتەوە ولەبەریان بکـاتو بەئەرکـەکانی سـەر شـانی خـۆی هـەڵ بـستێت واتـە وانـەکانی هـەمو ڕۆژێ ئامـادە بکـاتو لەبـەریان بکـات، تەمبـەڵی وسـستی یـان لێ نـەکات بەسـەر خـۆی دا کەڵەکـەیان بکـاتو دوایـی لـەکاتی تـاقی کردنەوەکاندا نەتوانێت بەسەریاندا زاڵ بێت.

✓ دەبـێ ڕێـزی مامۆسـتاکانی بگرێـت بەچـاوێکی ڕێـزەوە سـەیریان بکـات، ومـافی مامۆسـتاکەی لـەو فێرکـرن‌و پـەروەردە کردنەیانـدا بزانێـت، بـێ سـفەت نـەبێت بەرامبەریان‌و دەبێ ڕێزی ئەوە بزانێت کەمامۆستاکانی بەئەرك‌و کارێکی زۆر گەورە هەڵ دەستن واتە گەلێ بەئەوەوە ماندو دەبن دەبێ ئەویش چاکەیان بداتەوە. چونکە مامۆستاکەی لەجێگەی دایکەیا لەجێگەی باوکە لەپەروەردە کردن وفێرکردن‌و ئاگا لێ بونیاندا، هەروەها مامۆستا پێشەنگە بۆ قوتابیەکانی‌و هەرچی کاری خێرو چاکەو باش‌و کاری خراپ‌و خراپی هەبێت قوتابی‌و خوێندکارەکانیشی لێ ی وەردەگرن و ئەوە هەڵ دەگرنەوە (واتە مامۆستاکە چ هەڵس‌و کەوتێکی هەبێت قوتابیەکانیشی ئەو هەڵس‌و کەوت‌و ڕەوشت‌و ئاکارە فێر دەبن، چونکە مامۆستا پێشەنگ‌ونمونەی قوتابیانە، مامۆستاکەیان چون بێت ئەوانیش هەمان شت دەردەچن، کورد گوتەنی جام چی تێدا بێت ئەوەی لێ دەڕژێتە حوار.وەرگێر).

✓ دەبێ قوتابی کچ لەگەڵ برادەرەکانی دا ڕەفتارو هەڵس وکەوتی باش‌و جوان‌وڕێك وپێکی هەبێت، ڕق‌و کینەو ئیرەیی نەبێت‌و لەبەرامبەریاندا خۆ بەزل نەزانێت‌و نابێ قسەو وشەی ناشیرین‌و دەم شڕو دەم پیس نەبێت لەگەڵیانداو وشەی ڕەق ڕوشێنەر وبریندارکەر لەڕویاندا نەکات، چونکە ئەو لەهەمان کاتدا هەم خوشك‌و هەم برادەرو دۆست‌و ڕفیقە لەگەڵیاندا.

✓ دەبێ گشت یاساو ڕێساو زانیاریەکانی قوتابخانەو خوێندنگاکەی جێ بەجێ بکات بەتایبەتیش ئەوانەی کەپەیوەستن بەئاکارو ڕەفتارو هەڵس‌وکەوتی جوان‌و پۆشاك‌و جل‌و بەرگی شەرعی و دیمەن‌وڕواڵەت‌و شێوەوە، ئائەمانە لەیاساو ڕێساو زانیاریەکانی ئیسلامن پێش ئەوەی یاساوڕیساو زانیاری قوتابخانەو خوێندنگاکان بن، بۆیە جێ بەجێ کردن‌ولەبەرچاو گرتنیان لەڕوی ئاین‌و ڕەوشت‌و ئەخلاقەوەیە.

پێویستە لەو چالاکیەدا بەشداری بکات کەپێ ی دەگوترێت چالاکی ناپرۆگرامی (اللامنهجیة) ([1]).

✓ بۆ ئەوەی فێری ئەو بابەت وئەو شتانە ببێت کەلە هۆڵ یا لەژوری پۆلدا فێری نەبوەو وەری نەگرتون فێریان ببێت‌و شارەزایان ببێت. دەبێ هاوبەشیەکی باش‌وبەرچاوونەرێ یی(الإیجابی) ی بەسودی هەبێت لەوچالاکیانەداو هەمیشە وشەو

---

(٧٣) واتە: خوێندنەوەی دەرەوەو هو پێ گوتنەوەی ڕۆشنبیری‌و زانیاریەکانی دەرەوەی بازنەی خوێندن‌و ناو چوار چێوەی پرۆگرامی خوێندنی بڕیار لەسەر دراو.(وەرگێر).

وتـاری بـاش بخوێنێتـەوە یـا قورئـانی تێـدا بخوێنێـت، یـا فـەرمودە لەبـەر بکـات، یالەهەندێ کـارو چـالاکی بـاش وسـود بـەخش بەشداریوهاوبەشـی بکـات وەك بـەرگ درویی (الخیاطة)، یاچێشت لێنان وئامادە کردنی خواردن وخواردن ئامادە کـردن .. و گەلێ کـارو چـالاکی تـری لـەم جۆرانـە.چـالاکی نـاپرۆگرامی (اللامنهجیـة) گـەلێ سـودو بەکەلکی هـەن کـەناتوانرێن لـەژوری پـۆل و هـۆڵی وانـە خوێندنـدا دەسـتی بکـەوێتو فێریان ببێت وەگیریان بێنێت.

✓ دەبێ لەسەر ئامۆژگاری کردنو ئاراسـتە کردنـی هاورێکـانی مەشـقو ڕاهێنـان بکـاتو بەتـەواوی ڕاهـاتو بێـتو بەشـێوەیەکی گـشتی دەبـێ بـرادەرو هاورێکـانی ئامۆژگـاری بکاتو ڕێنماییان بکات بۆ چاکە کردنو ڕەوشـتی جـوان ئـەویش بەقـسەکردنو وتـار خوێندنەوە لەپۆل دا بۆ هاورێکانی، یاخود ئامۆژگاری کردنـی ڕاسـتەوخۆ هـەر کاتێـك بینی ئەو ئامۆژگاری کردنە پێویستەولەکاتی خۆی دایە وەك بینینـی کـارێکی خـراپو نابــەجێ لەیــەکێ لــەهاورێکانی یــا لەهــەمویان بەگــشتیو ئامۆژگــاری کردنیــان گەرماوگەرم.

✓ دەبێ پێشەنگێکی باش بێت بۆ برادەرەکانی لەبواری لەبەرکردنو پارێزگـاری کـردنو یادەوەرەکانیو لەتێگەیشتنو فێر بونو فێر کردن دا، نـەك هـەر ئەمـە بـەڵکو لـەجلو بەرگو پۆشاكو لەشێوەو ڕواڵەت دا، لەقسەکردنو گفـتوگۆو وشـەکانی داو لەمامەڵـە کردنوهەڵسو کەوت کردنو ڕەفتاری دا لەگەڵ کەسانی تردا.

ئەمانە تەنیا کۆمەڵـە کـارو چـالاکیەك بـون کەلەسـەر شـانی ئـافرەتی موسـڵمان بـون کەباسمان کردن و هێنامانەوەو برێك بون لەئەركو بەرپرسـیاریەتی شەرشـانی ئافرەتـان، ئەو ئەرکو بەرپرسیاریەتیەش کە باسمـان نـەکردونو نـەمان توانیـوە بیـان نوسـین لەبـەر درێژ بونـەوەی بـاسو بابەتەکـە لەسـەر ئەمانـە پێوانـە دەکرێن کـەلێرەدا ئامـاژەمـان پـێ کردون.

## چوارچێوەی چوارەم: ئەرك وبەرپرسیاریەتی ئافرەتی موسڵمان لەبەرامبەر فێڵ وتەڵەکەبازی دوژمنانی ئیسلامدا:

هەر لەو کاتەوەی کە محمدﷺ رەوانە کراوە بۆ سەر تەواوی جیهانیان دوژمنانی ئیسلام لەجولەکەو فەلەکان(النصارى) و باقی کافرەکان بەهەمو شێوەوڕواڵەتەکانیانەوە کەوتنە فرۆفێڵ وتەڵەکە نانەوە بۆ ئیسلام وموسڵمانان، وەبۆ ئەم مەبەستە ئەو پەڕو تەواوی هێزو تواناو فرۆفێڵ و حیلەبازی خۆیان خستۆتە گەڕو بەکاری دەهێنن، هیچ هەوڵێکیان نەماوە کەبەکاری نەهێنن، هیچ رێگایەك نەماوە کەنەی گرنە بەر، پێشەواو پێشەنگانی ئەم تەڵەکەبازی ودوژمنایەتیەش بریتین لەشەیتانەکانی مرۆڤ وجنۆکە بۆ ئەم مەبەستەش چەندان تەوەرەو چەندان رێگەیان گرتۆتە بەر، هەندێ جار بەهێرش و داگیرکاری سەربازی و هەندێ جاریش بەداگیرکاری فیکری و رۆشنبیری و بڵاو کردنەوەو چاندنی تۆوی گومانەکان (الشبهات) لەناو ئایینی پیرۆزی ئیسلام، هەندێ جاری تریش بەخراپ کردن و بۆگەن کردنی ناوچە کاریگەریەکان لەناو ئوممەتی ئیسلامدا لەسەر منداڵان و لەسەر ژنان، بەقۆستنەوەو بەکار هینان ودەست بەسەر داگرتنی راگەیاندن وهۆکارەکانی راگەیاندن وپەروەردەو فێر کردن و بوارەکانی رۆشنبیری و گەلێ شتی تر بۆ لادان وتێك دان و بۆ گەن کردنی بیرو زادەو هۆشی چین وتوێژەکانی موسڵمانان وهەڵدێران ولادانیان( الإفساد والإنحراف) لەئایینی پیرۆزی ئیسلام.

وەلەم چەرخ وسەردەمەداو لەسەرەتای دەست پێ کردنی سەدەی رابردو بەچڕبونەوەیەکی زۆر نائاسایی تیشکی خۆیان خستۆتە سەر ئافرەتی موسڵمان وتێ ی دا چڕبونەتەوە، بەڵێ لادان و هەڵاوێردنی ئافرەتی موسڵمان لەئایینی ئیسلام ولەموسڵمانان بۆگەن کردن وخراپ کردن وروت کردنەوەی ئافرەتی موسڵمانیان زۆر بەجدییانە گرتۆتە بەر بەناوی ئازادی و ئازاد کردنی ئافرەتان وپێچانەوە لەمافی ژنان و یەکسانی لەگەڵ پیاواندا، وفرمێسکی درۆین بۆ مافی خوراوی ئافرەتان دەرێژن خۆیان گۆتەنی.

دەکرێ کورتەی نەخشەوپلانەکانیان دژی ئافرەتانی موسڵمان لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا بگوشین:

١) **گرتنە بەری کۆمەڵێك ڕێڕەو پەنجەرەو تەوەرە** بۆ دزە کردن‌و پێدا ڕەت بون‌و چونە ژورەوە بۆ خراپ کردن‌و گەندەڵ کردن‌و بۆگەن کردن‌ولادانی ئافرەتی موسڵمان ئەم ڕێڕەوتەورانەش بریتن لە:

أ- **ئافرەت بکرێت بەخاڵی دەست پێ کردنی کێشەکەو بۆ مناقەشەو مل ملانێ‌و ڕکەبەرایەتیەکە:** ئیدی بەم کارەیان ئافرەت دەبێتە پشتیوانێك بۆ ئەوان، ئەویش بەوەی کەئافرەت ستەم لێکراوەو مافی خوراوە، یاخود کۆمەڵگا تەنیا بەیەك لا سی هەناسە نادات، ئافرەت مافەکانی داگیر کراوەو خوراوەو هەرس کراوە، یا ئێمە لەپاشماوەی پاشماوەی کۆنەکان دا دەژین، و جڵەوی حوکممان بەدەست خوو نەریتێکی کۆنی بەسەرچوو کات بەسەرچوەوەیە لەمێژودا ڕەش کراوەتەوەو بونی نەماوە، ئا ئەو دوژمنانەی ئیسلام وموسڵمانان بەم جۆرە دروشمە بریقەدارانە پڕ بەدەم هاوار دەکەن، لەڕۆژنامەکان‌وگۆڤارەکانیاندا دەینوسن‌و بڵاوی دەکەنەوە، لەزنجیرە تەلەفزیۆنی‌و کەناڵە ئاسمانیەکان نواندن‌وشانۆگەری بۆ ساز دەدەن‌و پەخش‌و بڵاوی دەکەنەوە[1]. ئەوەی جێگەی سەرنج‌وسەرسوڕمانە ئەوەیە کەکات‌و سات‌ومێژوی دیاری کراو و تایبەتی خۆیان هەیە کەتیایدا زۆر چالاکانە بەدەر دەکەون‌و کاری خۆیان دەکەن‌و زۆر چالاکانە برەوی پێ دەدەن بەتایبەتیش ئەو کاتانەی کەئوممەتی ئیسلام بەتەنگو چەڵەمەو تەنگژەکانیەوە سەرقاڵ دەبێت‌و ئالەو کاتانەدا هەل دەقۆزنەوەو دزە دەکەن‌و پیایدا تێ دەپەڕن، یالەکاتێك دا کەقسەیەك یاگۆتەیەك لەیەکێ لەبەرپرسێك دەبیستن‌و دەیقۆزنەوەو خێرا وەری دەگرن‌و دەیدەنە بەر زەڕە بین‌و گەورەی دەکەن‌و دەی جونەوەو دەی هێنن‌و دەیبەن‌و سەدەها بگرە هەزاران ڕەخنەو پلارو توانج دەگرن‌و بیانویان دەکەوێتە دەست بۆوروژاندن‌و چالاك کردنی کێشەو تەنگژەکان‌و وەك بڵێی بەنزین دەکەن بەسەر ئاگرداو ئاگرەکە خۆشتر دەکەن. ئیدی ئەمە گومان‌و دو دڵی دەخاتە دڵ‌ودەرون‌و

(١) ئەمڕۆ نەك ناوە ناوە بەڵکو بەلێشاو کتێب‌وچاپکراو ورۆژنامەو گۆڤاری تایبەتی، وێڕای گشتی یەکان لەسەر برەو پێدان و تەشەنەو تەنینەوەی ئەم باس‌وخواسانەو قوڵ کردنەوەو فراوان کردنی ڕکەبەرایەتیەکەو گەندەڵ کردنی چینی ئافرەتانی موسڵمان‌و بۆگەن کردن‌و گەندەڵ کردنی کۆمەڵگەی موسڵمانان بەگشتی بەلێشاو وهێرشێکی بەربڵاو لەئارادایە.(وەرگێڕ).

مێشکی خەڵکەوە بەتایبەتیش ئافرەت کەزو دەوروژێ‌و زو کار تێ دەکرێت وا هەست دەکات کەکێشەیەکی دڕکاوی‌و ئاڵۆزی هەیە کەپێویستی بەچارەسەر کردن هەیەو دەبێ مشوری لێ بخوات‌و چارەسەرو گرێ کوێرەکەی بۆ بکاتەوە.

**بڵاو کردنەوەی خراپەکاری‌و فەسادی‌و فیکری لادەرانە لەناو خەڵکی داو بەگشتی لەناو کۆمەڵگەی موسڵماناندا:** ئەویش لەڕێگەی ڕاگەیاندنی بینراوو بیستراوو خوێندراوەوە. شتێکی ئاشکراو زانراو وحاشا هەڵ نەگرە کەکۆمەڵگەو تاکی کۆمەڵیش کەیەکەم جارو لەسەرەتادا کەئەم خراپەکاری‌و فەسادیە دەبینێ یا دەیبیستێ یادەی خوێنێتەوە پێ ی خۆش نیەو لێ ی دەسڵەمێتەوە، بەڵام ئەم پێ ناخۆش بون سڵمینەوە وردە وردە کاڵ‌و سوك دەبێت‌و کەم دەبێتەوە تاوای لێ دێت دەبێتە شتێکی ئاسایی‌و دەستەمۆو شتێکی باوی سەردەم. بۆ نمونە لە بواری ڕاگەیاندندا: بڵاو کردنەوەی وێنەی ڕوت‌و ناسك‌و شۆخ‌و شەنگی وای حەرام، ئەمە سەرباری شکاندن‌و زڕاندنی حورمەتی پۆشاکی شەرعی‌و گاڵتە پێ کردنی. ئەم دیمەنانە لەهەمو کەناڵەکانی ڕاگەیاندندا دو بارەو چەندان بارە دەکەنەوەو پەخش‌و بڵاویان دەکەنەوە کەهەر بۆ ئەم مەبەستە تەرخان کراون هەتا وای لێ هاتوە لەکۆمەڵگەی موسڵماناندا لایان بۆتە شتێکی ئاسایی‌و باو وڕەت نەکەرەوە، ئابەم شێوە سەرشۆڕی‌و سوکایەتی بڵاو بوەوەو پەرەی سەند بۆ خراپترین‌و دزێو ترین وێنە. بەهەمان شێوە لەڕۆژنامەکاندا، کەم وایە گۆڤارو ڕۆژنامە هەبێت لەسەر بەرگ‌و ڕوپەڕەکانی دا وێنەی گەورە کراوو ڕوت‌و ڕازاوەو ماکیاج کراوی تێدا بڵاو نەکرابێتەوەو تێدا بڵاو نەکرێتەوە. وەهەروەها هۆکارەکانی تری تازە کەبەهۆی ئەو هۆکارانەی ڕاگەیاندنەوە کەهاوردراون بۆ ئێمەو بەجیهاندا خول دەخۆن‌و هەمو کون‌و کەلەبەرو قوژبنێکی ئەم جیهانە پان‌و پۆڕە دەگەڕنەوە وەك کەناڵە هەوایی یەکان‌و تۆڕەکانی ئینتەرنێت.( کەسایتی زۆر بێ ئەخلاق‌و وێنەی ڕوتی ئافرەتیان تێدا پەخش دەکرێت‌و کاری سێکسیان تێدا ئەنجام دەدرێت کەهۆکارێکی زۆر خراپ‌و خێران بۆ فەساد کردن‌و بێ ڕەوشت کردنی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی‌و موسڵمانان بەتایبەتی‌و بەتایبەتی تریش کچان‌و کوڕانی گەنج‌و لاوو هەرزەکارەکان. لەڕێکلامە جۆربەجۆرەکان هەر ئافرەتی ڕوت‌و قوتەو لەباقی بەرنامەکا جۆر بە جۆرەکانیاندا هەر ئافرەتی لەش ڕوت‌و ڕازاوە. هیچ کون‌و قوژبنێکیان نەهێشتۆتەوە، لەهەر شوێنێك‌و لەهەمو شتێکدا وێنەی ئافرەتی ڕوتیان تێ خزاندوە. ئاخر من پێویستم بەوێنەی گوڵ‌و گوڵزارو وێنە

سروشتیەکانو زەخرەفەکان بو، ڕۆژێك داوام لەدۆستان کرد کەشریتی سیدیەکەم بدەنێ کەئەم جۆرە وێنانەی تێدا بێت، بەڵێ وەرم گرت، ئەو وێنانەی کەمەبەستم بو تێ ی دا بون. بەکارم هێنان. ڕۆژێك ئەو فایلەی هەرگیز ئەم کردبونەوە بەتقدیری خوا کردمەوە گوتم بزانم ئەمەیان چی تێدایە، کەدەیکەمەوە هەموی وێنەی پیاوو ئافرەتی ڕوتو قوتو بێ شەرمانە، منیش یەکسەر ئەو فایلانەی کەسود بەخش بونو پێویستم بون دەرم هێنانو شریتە سیدیەکەم وردو خاش کرد. ئائەمەیە پەیمانی شەیتان کەپەیمانی مانەوەی لەخوای گەورە وەر گرت کەدواین ئەفس بمرێت، خوای گەورە مۆڵەتی داو ئەو ئەفرین لێکراوە بەخوای گەورە سوێندی خوارد کەلەهەمو کونو قوژبنو لەهەمو شوێنێك بۆ ئادەمیزادەکان دابنیشێتو تابۆی بکرێت لەخشتەیان بەرێتو لەگەڵ خۆی دا ڕەپێچەکی ناو ئاگری دۆزەخیان بکات. بەڵێ ئائەمەیە هەوڵەکانیو زۆرینەی خەڵکی لەم جیهانەدا سەرگەردان کردوەو کردونی بەسەربازی ئەفرین لێکراوی خۆی خوای پەروەردگار پەنامان بدات - وەرگێڕ) هەروەها فیکریش هەمان هۆکاری لەپێناودا بەکار هێنراون، لەمیانەی ستونەکانی ڕۆژنامەکان یا وتارەکانو قسەو گفتو گۆو میزگردو کۆڕو دانیشتنەکانیان لەدەزگاکانی ببینین دا. جێگەی داخە کەزۆرێك لەکوڕان وکچانی موسڵمان کەبەزمان حاڵی ئەوان قسە دەکەنوئەم فیکرە بۆگەنە لەناو چین وتوێژەکانی موسڵماناندا پەخشو بڵاو دەکەنەوەو بەتەواوی لایان داوە، نەك هەر ئەمە بەڵکو زۆریش بەجۆشو خرۆشەوە بەپیریەوە چونو دەچن. ئەوەی کەگرتویانەتە بەر بڵاو کردنەوەی ئەو هەموبڕو بیانوو گومانە بێ بەهایانەیە کەپەیوەستن بە ئافرەتانی موسڵمانەوە لەمیدیاکانی ڕاگەیاندنە بینراوەکان( واتە کەناڵە هەواییەکانو تەلەفزیۆنەکان - وەرگێڕ) وەك:

- خوێنی ژن نیوەی خوێنی پیاوە.
- میراتی مێینە نیوەی میراتی نێرینەیە.
- دو ژن بەشاهیدێك حساب دەکرێن لەبەرامبەر پیاواندا.
- ژن نابنە والی ونەدەبنە قازی.
- فرە ژنی.
- ڕێزو توانای پیاو بەسەر ژن دا
- پۆشاك وجل وبەرگی شەرعی و باڵا پۆشی.

**ج ـ جاڕدان و ئاشکرا کردنی داوایەك بەدو بانگەشەو مەبەستی بنەڕەتی:**

– بانگەشە کردن و داوا کردنی ( ئازادی ئافرەت) مەبەستیان لەمە ئەوەیە کە دەبێ ئافرەت لەبەندایەتی کردن بۆ خوای گەورە(الله) ئازاد بکرێت و بەرەوبەندایەتی کردنی گیانی خۆی وەرچەرخێنریت یا بۆ بەندایەتی کردنی دروست کراوەکانی خوای گەورە وەرچەرخێنرێتەوە، چونکە ئەوان بەشەریعەتی خوا ڕازی نین، ئەو خوایەی کەهەر ئەو بەرژەوەندی مرۆڤەکان بەژن و بەپیاوەوە دەزانێت .. چۆن خوایەك کەبۆ خۆی دروستی کردون و هەمو شتێکی لەجێگەی خۆی دا بۆ داناون، هەر خۆی دەزانێت کەمرۆڤ چی لەتوانادا هەیەو بەرژەوەندی ژن یاپیاو لەچی دایەو چی شایەنیەتی. ئاخر ئەوانە دەیانەوێ ئافرەت لەزانیاریەکانی شەریعەتی خوا داببڕێت، واتە لەبالاْ پۆشی و جل وبەرگی شەرعی ولەڕوسوریەتی و حەیاو حەشمەت دور بخرێنەوەو ڕوت و قوتیان بکەنەوەو بیان کەن بەکالاْیەکی هەرزان و بێ بەهاوهەمو خراپەکارێك بتوانێت مرخی خۆی لێ ببینێ.

ئەم زاراوەیەی ( ئازادی ژنان) لەدەرگای: یاری کردن و دەم وەردان لەزاراوەکانەوە بەکار هێناوە، بەلاْم لەدوای ئەم پەردەوەش مەبەستیان بلاْو کردنەوەی ئەو فیکرە بۆگەنەیە کەخۆیان مەبەستیانە، دیارە ئەم زاراوەیەش زاراوەیەکی جولەکەیەو لەپرۆتۆکۆلی یەکەمی سەرانی زایۆنیزمی دا هاتوە کەدەلْێ: (ئێمە یەکەمین کەسێك بوین لەرابردوەوە کەبانگەشەو بانگەوازو هاواری ئازادی و یەکسانی و برایەتیمان لەناو گەلدا کردوە ئەو وشانەو زاراوەو ئەو شتانەی کەپشت گوێ خرابون لەهەمو کون و قوژبنێکی ئەم جیهانەدا، نەفامەکان دەی لێین ودەیلێینەوە بێ ئەوەی بیری لێ بکەنەوەو بڕێ هۆشیارییان هەبێت. هاوارو بانگەشەی ئێمە بۆ ئازادی و یەکسانی و برایەتی خەلْکی لەهەمو لایەکی ئەم جیهانە بۆ خۆی ڕاکێشاوە، هاواری ئێمەو لایەنگرانمان کۆمەلْ و تیمێکی تەواوی وا بەباش دەزانێت و وای دەوێت کەهیچ سستی یەك نەنوێنێ ئەوە بو زۆری نەبرد بەوپەڕی سۆزو حەماسەت وغیرەتەوە ئالاْو بەیداخی ئێمەیان هەلْگرت).

**د ـ داواکردنی یەکسانی بونی ژن وپیاو(المساواة مع الرجل):** ئەمەش هەروەك فرو فێلْەکانی تریان دەیانەوێ مل ملانێ لەگەلْ فیترەتی خوای گەورەدا بکەن، ئەو فیترەتەی کەخەلْك و هەمو بونەوەری لە سەر دروست کردوە. خوای گەورە خۆی نێرو مێ ی بەدو سروشتی جیاواز دروست کردون. نکۆلْی لەوە ناکرێت کەئەمانە دەیانەوێ پەردەی تاریك و لیخن بەسەر دلْ و چاوی ئافرەتی موسلْماندا بدەن و فیترەتی خوایان لەسەرسۆمای چاوان و

ناو دڵان بسرِنەوە، گوایە دەیانەوێ کە ژن‌و پیاو لەهەمو شتێکدا یەکسان بن، بەڵێ، نکوڵی لەمەش ناکرێت کەیەکسانی لەهەندێ لەبنەڕەتە(أصول)ە گشتی یەکاندا هەیە. وەك یەکسانی لەبنەڕەتی ئەرك خستنە سەر شان (التكليف)، لەوەرگرتنەوەی پاداشت‌و سزادان ولە خاوەندارێتی، ولەهەڵبژاردنی هاوسەری ژیانی(شريك الحياة).

بەڵام یەکەمین شتێك‌و یەکەمین هەنگاو وکارێکیان ئەوەیە کەئەو فیترەتەی کە خوای گەورە خەڵکی لەسەر دروست کردوە ڕەت بکەنەوە، ئەمەو سەرباری ڕەت کرنەوەی حیکمەت‌و شەریعەتی خوای باڵا دەست‌و کاربەجێ، بەڵام ئەوان ئەم هەمو دروشمە بریقەدارانە بەرز دەکەنەوە بۆ ئەوەی ساویلکەو نەزانەکان‌و هاو وێنەکانیانی پێ هەڵ بخەڵەتێنن، کەتوانیویانە برێ لەو جۆرانە بۆ خۆیان دابرِن.

ئێمە لێرەدا مەبەستمان دەمەقاڵێ‌وبەیەکدا چون نیە لەسەر ئەو پرو پاگەندانەو وێنەکانیان بەقەد ئەوەی کەمەبەستمان وریاو زرنگ وهۆشیار کردنەوەیە، هەروەها مەبەستمان ئەوەیە کەبزانین پلان گەلێکی تەڵەکەبازی مەترسیدار لەئارادایە بۆ ئافرەتان‌و بۆ کۆمەڵگەی موسڵمانان.

## هـ ــ وێنا کردنی کاری بنەڕەتی ئافرەت لەناو ماڵدا کەگوایە کارێکی لاوەکی‌و پەراوێزیە:

ئەم پلانە ترسناکەیان بەکار هێنا بۆ ئەوەی لەجیهانی ڕاستەقینەی خۆی دا دەری بهێنن، کەبریتیە لەناو ماڵ‌و لەناو خێزان‌و لەئەرکی سەرەکی خۆی کەپەروەردە کردنی منداڵەکان‌و گرنگی دان بەژیانی خۆی‌ومێردەکەیەتی. ئەو ئەرك‌و ئەو شوێنەی کەخوای گەورە بۆی داناوە لای دەن‌و دەیانەوێ بیخەنە گێژەنی کارو کاسپی قورس‌و هاوشانی خۆیان واتە پیاوان‌و دەستی بکێشن بۆ کارو پیشەیەکی قورس و جەنجاڵ‌و شان بەشانی پیاوانی بێگانەو نامۆ بەئافرەت‌و هەمو دەم وەك بوکە شوشە لەبەر چاوی پیسی چڵێسی بێت‌و بیخەنە گێژەنی مل ملانێ ی پیاوانەوە، هاریکاری‌و هاوبەشی پیاو بێت لەکارگەکانداو

لەشوێنە بازرگانیەکانداو لەوەزیفەی تایبەت بەپیاو ولەگەڵ پیاودا تێکەڵ بن هەم ئەرك‌و ئیشەکانی سەرشانی پیاوی پێ سوك بکەن‌و هەم چاوچنۆکیەتی شەهەوانی‌وکاری سیکسی خۆیانی لێ ببینن.

**و ـ وێنا کردنوگەورە کردنی سەرپەرشتیارێتی پیاو بەسەر ئافرەتدا کەگوایە بریتیە لەدەسەلاتێکی وەحشی گەرانە:**

ئەوەی لەبڕگەی(د) دا گوتمان هەمان قسەو گفتارو مەبەستە لەتێك دانی هاوکێشەکانی ڕەوشتو ئاکارو بەها بەرزەکانو تێك دانی ئەو شەرعیەتەی کەخوای گەورە خەڵکی لەسەر دروست کردوە واتە ئەو فیترەتەی کەخوای گەورە بونەوەری لەسەر دروست کردوە.

**ز ـ شوێن کەوتنی یابەکار هێنانی سیاسەتی دەسەلاتی باوی سە پاو:**

ئەویش بەگرتنەبەری چەند ڕێگاو چەندان کارو بارو چالاکیەکی نادیارو ناڕون بێ ئەوەی مەبەستەکانیان لە ئەنجامدانو گرتنە بەری ئەو کاروبارانە بدرکێنن بەئاشکراو ڕاشکاوی بەکۆمەلانی خەڵك بڵێنو بنچینەوبنەڕەتی مەبەستیان ڕون بکەنەوەو بڵێن ئێمە لەم کارانەماندا مەبەستمان گەیشتنە بەو ئاواتو ئامانجانە. هەندێ جار ئەگەر مەبەستیش بڵێن بەدرۆ وا دەڵێن تەنیا چەواشە کردنی خەڵکەو بەس، بەڵکو مەبەستیان شتێکی ترە کەبەرژوەندی ژێر بەژێری خۆیانی تێدایەو بەس [1]. بەڵکو لەم پێناوەدا نەفەسێکی دورو

---

( ١) وەك ئەوانەی کەلەکوردستانی خۆماندا بینیمانن لەساڵەکانی دوای ڕاپەڕینی ساڵی ١٩٩١ بەقۆستنەوەی باری پشێوی وگرانی و ئاڵۆزی باری ئابوری وڵاتی ئێمە دەستیان کرد بەهێنانو دابەش کردنی هەندێ خۆراكو دەست گیرۆیی خەڵکی کوردستانو ڕشتنی بەزەیی درۆینەی خۆیان بۆ خەڵکی کوردستان بەتایبەتیو خەڵکی عێراق بەگشتیو پیتاك بەشینەوە وەك هەنگوینێکی ژەهراوی و ئەمجار ڕشتنی ژەهری ڕاستەقینەی خۆیان کەبریتی بو لەبۆگەن کردنی کۆمەڵگای موسڵمانان بەتایبەتی ئافرەتانو منداڵان وبانگەشە کردن بۆ کردن بەفەلەو لادانی گەنجانو چینو توێژەکانی تری موسڵمانان لەئایینی پیرۆزی ئیسلامو هەڵگێڕانەوەیان بۆ گاورایەتی لادراووهەڵوەشاوە، ئەوەبو گەنجێکی زۆریان بەپارەو پول هەڵگێڕایەوە، وفرمێسکی درۆیینیان بۆ بێ مافی ئافرەتان هەڵ ڕشت و دەستیان کرد بەبڵاو کردنەوەی بێ ڕەوشتیو بێ ئەخلاقیو بەرەڵاییەکی تەواو دور خستنەوەی موسڵمانان لەدینەکەی خۆیانو هەڵوەشاندنەوەی حوکمو حاکمیەتی شەریعەتی خوای بالا دەستوکاریەجێ بۆ یاسای بەرەڵاییو بەناو بەجیهانی کردنو بەمەدەنیەت کردنو مافی مرۆڤـوسەدانو هەزاران برو بیانوی تری دژی خواو یاساو ڕێسای شەریعەتی ئیسلامو بەرنامەی پەروەردگاری جیهانیانو گەلێ شتی تر. لەژێر سەدان ناوی سەیر سەمەرەو پەردەی بریقەداری وەك ڕێکخراوی مرۆڤـ دۆستو مرۆڤایەتیو

درێژیان هەیە هەتا دەگەنە بەدەست هێنانی مەبەستەکانی خۆیان کەزۆر لەمێژە نەخشەو پلانی بۆ دادەڕێژن، وەئەگەر خوا نەخواستە جارێك لەجاران شتێکی باشیشیان لەدەست هەڵوەری بێت ئەوا شتێکی قەدەغەو قاچاغی دەخەنە پاڵو ئافرەتی پێ ناچار دەکەن کەنەتوانێت لەداوەکانیان لابداتو بەداواکانیانەوە پابەند بێت بۆنمونە:

١. کردنەوەی چەند بەشێکی تایبەت بەئافرەتان( وەك: کۆلێژو پەیمانگای بەناو هونەرە جوانەکان کەتیایدا فێری گۆرانیو مۆسیقا ژەنینو سەماو سوڕدانو شانۆگەریو جرتو چەقەنەو نواندنو ئەکتەریو وێنەسازیو کاری هەڵکۆڵینو پەیکەر تاشیو بت دروست کردنیان دەکەنو پلەی پسپۆڕیو بڕوا نامەی تایبەتمەندێتی تێدا وەردەگرن کەهەمو کارەکانو پسپۆڕێتیەکانیان حەرامنو دەبنە هۆی تورە کردنی خوای پەروەردگارو سەرپێچیو یاخی بون لەخوای گەورە خوای پەنامان بدات - وەرگێڕ)، کەلەڕاستی دا هیچ پێویست ناکات بەکردنەوەی ئەم جۆرە بەشانە وەك کردنەوەی بەشەکانی شانۆگەریوشێوەکانی، دیارە ئەگەر خوێندکاری کچ لەو جۆرە بەشانە دەرچون دەبێ خێراو بەپەلە بەدوای فرمانی( الوظیفة)یەك دا بگەڕێت کەلەگەڵ خۆی وتایبەتمەندیەکەی دا بگونجێت تازە تەواو کۆتو زنجیری خۆیان بەبیانوی پسۆڕی تایبەتمەندێتیەوە خستە ملو گەردن. بەوە ئەو قوتابیە، ئەو تایبەتمەندە کچە کەوتە داوی ئەوانەوەو دەکەوێتە کارو پیشەیەکی حەرامەوە توشی ئەنگی ڕەزالەت بوو لەسنوری شەریعەتی خوادا دەچێتە دەر.

٢. کردنەوەی پەیمانگاو خولی ڕاهێنان بۆ ئافرەتان بۆ خزمەت کردن وپیشوازی کەرانی میوانان و کرێکارانو کارمەندان لەمیوانخانەکان کەتایبەتە بەئافرەتانەوەولەسەر ئەم خاڵە زۆر سورو مکوڕ بونو زۆریان پێ لەسەر دادەگرتو تەنیا ئەمەیان داوا دەکرد بۆ ئەوەی لەسەرەتادا ڕوبەڕوی بەرهەڵستکاری نەبنەوە،

---

بەجیهانی کردنو دنیاگەریو چی وچی، نەخێر ئەوانە نێردەی مزگێنی دەرن (البعثات التبشیریة)ن لەژێر ئەم پەردەی مرۆڤایەتی دا خەڵکی موسڵمان گومڕا دەکەن لەڕێگەی خوا پەرستی هەڵیان دەگێڕنەوە بۆ بەندایەتی کردنی خۆیانو لەهەمو ڕویەوە چاو لەدەستی ئەوان بیتو بەم بێنەوەوە هەرچی سەروسامانو دارایی وڵاتان بۆ خۆیان بدرنوهەرچی خەڵکی سەر ڕوی ئەم زەویە هەیە کۆیلەو پیاو وخزمەتکاری ئەوان بێت مەبەستم لە جولەکەی زایۆنیزمی جیهانیو جیهانی گاورایەتیە(وەرگێڕ).

جانەگەر ئەو ئافرەتانە لەو پەیمانگاو خولانە دەرچونو بڕوانامەیان لەم بوارەدا بەدەست هێنا، گومانی تێدا نیە کەخۆیان بەئارەزوی خۆیان ناچار دەبن داوای کار(الوظیفة) بکەن لەبواری ئەو پسپۆڕیەی کەبەدستیان هێناوە لەخولەکانیاندا تازە ژەمرەکەیان دەرخوارد دان، ئابەم شێوەیە هەر وەك خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ الأنفال:٣٠. (واتا: ئەوان مەکرو فێڵی خۆیان دەکەنوخوای گەورەش فێڵی خۆی دەخاتە گەڕو باش بزانن کە باشترینو باڵا دەس ترینو بەدەسەڵات ترین کەسێکیش خوای گەورە (الله) یەوکەس ناتوانێت خۆی لەقەرە بداتو بەسەر هەمو کەسو بەسەر هەمو شتێك دا زاڵە. بۆ کوێ دەچن ئەی لەخوا نەترسانو ئەی ستەمکارانو ملهوڕان.(وەرگێڕ).ئەوان بەم شێوازو بەم فڕوفێڵانەیان دەوڵەتی موسڵمانانو کۆمەڵگەو سەرپەرشتیارانو جڵەو بەدەستانو دەم ڕاستانی موسڵمانانو هەتا خودی ئافرەتان خۆشیان بێزارو هەراسان دەکەن.

**ح ـ پەروەردە و فێرکردن، ئەم نەیارو دوژمنانەو هەڵ خەڵەتاوان بونەتە ئەڵقە لەگوێ خوێندن و پەروەردە کردنیان کردوە بەهۆکارێكودەلاقەی پێدا چونە ژورەوە:**

کردویانەتە دار دەستێك وهۆکارێك بۆ بڵاو کردنەوەی فیکرو بۆچونەکانی خۆیان لەگەندەڵ کردنو لادانی ئافرەتی موسڵمان، لەوانە دەڵێن هیچ پرۆگرامێکی خوێندنوفێر کردنو پەروەردە کردن لەئیسلامدا نیە کەگرنگی بدات بەئافرەتو ڕۆڵی ئافرەتان وەك مافێکی خۆیان، ڕونکردنەوەی کاری دایکایەتی لەناوماڵو لەڕوی منداڵەکانی دا، وڕێگای پەروەردە کردنیان، وهۆکارەکانی ئەنجامدانو هەستان بەئەرکو فرمانەکانی خۆی، هەروەها ئەو بەرنامەی کەهاریکارن لەکارو فرمانەکەی خۆی دا(وظیفتها).

هەروەها هەوڵی یان داوەوهەمیشە هەوڵ دەدەن بۆ داگیر کردنو دەست بەسەردا گرتنی پەروەردەو فێرکردن لەگەڵ بواردا، وەك بانگەشە کردن بۆ تێکەڵاو کردنی کوڕو کچ لەپۆلە سەرەتاییەکانەوەو کردنەوەی هەندێ بەشی زانکۆکان بۆ ئافرەتان، کەئافرەت هیچ پێویستیەکی پێ نیە، هەروەها تێکەڵی پیاو وئافرەت لەکارگەکانی کار تێدا کردن داو لەخوێندنی نوژداریوغەیری نوژداریش، هەروەها داوا کردنو کردنەوەی بەشی وەرزشی بۆ قوتابخانەکانو گەلێ ڕێگەی تر بۆ ئەم مەبەستەیان کە گرتویانەتە بەر.

**ك ـ تێخزاندنی ئافرەت لەكارو فرمانەكانی پیاواندا:**

ئـەم بـوارە لـەگرنگ تـرین بوارەكانـە كەهێناویانەتـە نـاو مەیـدانو گـەلێ پلانوهۆكارێكیـان بـەكار هێنـاوە بـۆ پـەل كـێش كـردنو تێخزانـدنی ژنـان لـەو بوارانـەدا، هەوڵیان داوەو داوای دەستكێش كردنی ئافرەت دەكەن لەهەمو گۆرەپانەكانی كـار كردنـی كاری پیاوان بێ هەلاوێردن، هەروەها دەست كێش كردنیان بۆ كار كردن لەمیوانخانـەكانو فرۆكەخانەكانوشوێنە بازرگانیەكانوژورەكانی بازرگانیوكۆمپانیـەكانو گـەلێ شـوێنی تـر. ئەوەی جێگەی پێ كەنینی گریاناویە ئـەو بانگـەوازیو داواكاریانەیـە بـۆ پـەلكێش كردنـی ئافرەتـان بـۆ نـاو پیـشەوەریەكانی وەك كارەبـاییو دارتاشـیو دارشـتەی كانزایی(السباكة)وهەروەها پەلكێش كردنیان بۆ ناوڕیزەكانی سەربازیوپۆلیسیو سەربازی كـردنو بـون بەپۆلیـسی هـاتو چۆو[1] گـەلێ كـارو پیـشەی تـری لـەم جۆرانـە كەتایبـەتن بەپیاوانەوەو ژنانیان تێ خزاندون. پاكو بێگەردی بۆ خوای گەورە كەئەمە بوختانێكی زۆر گەورەیە[2](سبحانك ربنا هذا بهتان عظيم).

**٢ ـ بەرپرسیەتی ئافرەتی موسڵمان بەرامبەر بەو هەمو هێرشە چڕو پڕانە:**

گومانی تێدا كەئـەركو بەرپرسـیاریەتی لـەڕوی ئـەو هـەمو فیكـرو پلانـە گڵاوانـەدا لـەدژی ئـافرەتی موسـڵمان، ئـەركو بەرپرسـیەتێكی هاوبەشودەسـتەجەمعیە لـەنێوان كاربەدەستانو ڕیش سپیانو زانایان وخوێندكارانوقوتابیانو فێرخوازانو بانگەشە كارانو

---

(١) لەساڵەكانی ٢٠٠٥ ـ ٢٠٠٦ وڵاتدا ئافرەتیان بەپۆلیسی هاتو چۆو پۆلیسی فەرمانگەكانی تردا دامەزراندنودەست بەكار بون لەسەر جادەو ڕێگا گشتی یەكانولەفەرمانگاكانی تردا. دوای ماوەیەك دەست بەكار بونوكار كردن ڕۆژێ لەگەڵ پۆلیسە پیاوەكاندا دەچنە سەفەرە بۆ سەیرانگاكانولەوێ هەردولا مەست دەبنو دوایی پۆلیسە ئافرەتەكان فەساد دەكەنو بێ ڕەوشتیان لەگەڵ دا دەكەنوئاشكرا دەبنو دوا تر هەر بەپۆلیسی دەیان گوازنەوە بۆ فەرمانگەیەكی ترو ئێستا درێژە بەكاری خۆیان دەدەن.(وەرگێڕ).

( ٢) ئەم ڕستەیە بریتیە لەو پلانانە كەبۆ پەل كێش كردنی ئافرەتانو لەماڵ دەرهێنانیان دایان ڕشتوە. بۆ پتر زانیاری سەیری كتێبی (عودة الحجاب) بكە كەتیایدا باسی غەزو كردنی ئافرەتی موسڵمانی لەكۆمەڵگای موسڵمانانو وڵاتە عەرەبیەكاندا كردوە. كەدكتۆر بكر أبو زيد لە (حراسة الفضيلة) دا كورتو پوختەی كردوە. خوای گەورە هەموان سەركەوتو سەرفراز بكات.آمین.

سەرپەرشتیارانی ژنانو ژنان خۆشیان لەو ئەرك و بەرپرسیاریەتیە نیوەی ئەرکیان دەکەوێتەسەر شانودەبێ زیرەكو بەتوانا بن لەو ئەركو بەرپرسیاریەتیە گرانو قورسەدا. ئێمە لێرەدا پتر پێ لەسەر بەرپرسیەتی ئافرەتی موسڵمان دادەگرینو چڕ دەبینەوە لەگەڵ ئەمەش دا ئەمە وا ناگەیەنێ کەبەرپرسیاریەتی ئەوانی تریش واتە پیاوان پشت گوێ بخەین.

ئەركو بەرپرسیاریەتیەکانی سەر شانی ئافرەتی موسڵمان لەم بوارەدا دەکرێ لەم ڕیز بەندیانەی خوارەوەدا ڕیزیان بکەین:

أ- شورا کردنی نەفسی خۆی بەزانستو زانیاریو فیکریو پراکتیزە کردنی(العملي): لەبڕیارو مەشخەڵەکانی ئەم شورا کردنە ئەوە بو لەبەرپرسیاریەتی نەفسی ئافرەت دا ئاماژەمان پێ کرد، بۆیە لێرەدا پتر پێ لەسەر کێشەی فێر بونو خوێندنەوەو نوسینوخۆ ڕۆشنبیر کردن (المطالعة والتثقیف النفسي) ی ئیسلامی وگشتی وفێر بون وناسینی هەمو نهێنی وخاڵە شاراوەکانی شەریعەت دادەگرین، پاڵ پشت وپشت ئەستور بەهێزو توانای پتەویەتی ئیمان و بڕوا بون بەخوای پاك وبێگەرد، چونکە خوای گەورە هیچ کارو یاساو ڕێسایەکی بەبێ ژیریوحیکمەت دانەڕشتوەو هیچ داواکاری وتەکلیفێکی نەکردوە کەبەرژەوەندی دروست کراوەکانی خۆی تێدا نەبوبێت.

ب- لێ حاڵی بونو دەرك کردنی ئەو ڕاستیەی کەدوژمنان هەمیشە وان لەبۆسەدا بۆی: ئەو دوژمنانە کێن؟ بێ گومان بریتین لەجولەکەی دڵ ڕەشوفەلەکان (النصاری) ودوڕوەکان (المنافقین) وموڵحیدانو عەلمانیەکان، زۆر جاری وایە ئەوانە لەپێستو گۆشتو زمانی خۆشمانن و لە قوتابخانەکانماندا خوێندویانەو لەهەمو شوێنێك لەگەڵماندان، کەچی ئەوانە لەبری سەربەرزیوپوسوریو داوای هیدایەت گومڕاییو سەر لێشێواویان هەڵبژاردو ئەوجار پاش قولمان دەدەنو دوژمنایەتیمان دەکەنو بونەتە کەوا سوری بەر لەشکرو دەستکێشی دوژمنان دەکەن بۆ ناو خانەو لانەی موسڵمانان، بۆیە ئەوانە سەریان لێ شێواوەو سەریش لەخەڵکی دەشێوێنن. مرۆڤیش پێش هەمو شتێك لەئەمیندارو ڕازگرەکانی سڵ دەکاتەوەو گومان پەیدا دەکات دەبێ هەمیشەو ریاو ئاگادار بێت لێ یان ، بۆ ئەوەی لەوانەوە نەگەزترێتوپێوە نەدرێت هەروەکو گوتراوە: ( خۆ پارێزی لەئەمیندارو ڕاز گرەکان لەهەمو کەس لەپێش ترە یالەپێش هەمو کەسێکەوەیە). بەڵێ، ئەوانە بەڕواڵەتێکی ریفۆرمیانەی درۆینەی فرمێسك ڕێژو بەتەنگەوە هاتنی مافی

ئافرەت بەرژەوەندیەكانیەوە خۆ نیشان دەدەن‌و دێنە پێش، بەڵام لەژێر ئەم پۆشاك‌و پەردە زاق‌و بریق‌و ساختەیەدا كەمتیارێكی فێڵبازو دڵ ڕەش‌ن‌و دەیانەوێ سوكایەتی بەو بەستەزمانە بكەن‌و بیخەنە ناو گەروی حەزیای لەناو چون‌وهەلوەشانەوە بێ ئەوەی هەست بكات‌و بزانێت كەئەوانە درۆ دەكەن‌و فێڵبازو تەڵەكەبازن‌و ماف پارێزی ئەویان ناوێت‌و ئەوان دۆستی ڕاستەقینەی نەك هەر ئافرەت بەڵكو مرۆڤایەتیش بەگشتی نین، بەڵكو دۆست‌و لایەنگری بەرژەوەندیەكانی خۆیانن‌وبەس‌و تەنیا دەیانەوێ گیرفان‌و داوێن پڕ بكەن، وا دەزانێت بەڕاستی‌و سوراو سور بەرگری لەبەرژەوەندیەكانی ئەو دەكەن[1]، دەك خوا لەناویان بەرێت چۆن ئەو فێڵ‌و تەڵەكەبازی‌و بوختانەیان كردو چون هەمیشە دەی كەن‌و وەك ڕێوی فێڵباز چاویان ناكەوێت.

ت- دوابەدوای ئەمانە ناسین‌وحاڵی بون لەهۆكارەكان‌و پلانەكان‌و داواكارو مەبەست‌و ئامانجەكانی ئەو دوژمنانە دێت:

عرفت الشر لا للشر ولـــــكن لتوقيــــــــه

شەڕو خراپەكاریم ناسی نەك بۆ ئەوەی پەرەی پێ بدەم‌ومل بەخراپەكاری‌و كاری شەڕەوە بنێم، نەخێر بەڵكو بۆ ئەوەم ناسی‌و بەدوای دا گەڕام تاباش بیناسم‌و خۆمی لێ بپارێزم‌و لێ ی دور بكەومەو ەو خەڵكی تریشی لێ بگێڕمەوەو دەستیان بگرم بەرەو چاكەو چاكەكاری.(وەرگێڕ).

بریتیە لەناسینی دوژمنانی ئافرەتی موسڵمان چاوكراوەیی‌ووریایی‌وشارەزایی ئافرەتانی موسڵمان. بێ گومان ناسین‌وحاڵی بون لەو هۆكارانەی كەدوژمنانی ئیسلام‌و بەتایبەتیش ئافرەتی موسڵمان بەكاریان دێنن بۆ هێنانە دی ئامانجە گڵاوەكانی یارمەتی

---

( ١ ) ئافرەتی هەژار وسادەو ساكار وادەزانێ ئەو هاوارە ساختەو درۆینەیان لەپێناو بەرژەوەندی ئەو دایە نازانێت ئەو شینەی ئەوان بۆ هەریسەكەیە واتە بۆ تێر كردنی غەریزە بۆگەنەكەی خۆیانە، ئەو بەستەزمانە زۆر فەقیر حاڵانە بڕوایان پێ دەكەن و دوایان دەكەون وخۆیان بەدەستەوە دەدەن وتەسلیمیان دەبن هەروەكو چۆن مەڕی گورگ لێدراو دوای گورگ دەكەوێت لەگورگەكانیش خێرا تر لەپێشیانەوە دەبەزن بۆ شوێنی ئارام وئەو شوێنەی كەبێ ترس دەم لەلاشەیان دەنێن زۆر بەئارامی ولەسەرخۆ دەیان خۆن. ! ! ! سەد مەخابن و هەزاران داخ.(وەرگێڕ).

دەرێکە بۆ پتەو بونی شوراو ئامادە باشیءو وریا بونەوەو خۆ پەنا دانو داوێن پاکیءو ڕو سوریەتی ئافرەتی موسڵمان.

ث- ڕو بەڕو بونەوەی ئەم هێرشە بەربلاوە بەهەمو هۆکارێکی لەتونادا بو وبەوپەڕی تواناوە: وەدەبیێ بەگوێرەی بارو دۆخی ئافرەت خۆی بێت، دەبینی خوازیارو خوێندکاری زانستی ئەرکو بەرپرسیەتیەکەی گەورە ترو قورس ترە لەئافرەتانی تر، هەروەها مامۆستا بەهەمان شێوە پەروەردیاری زارۆکان بەهەمان شێوەو..وتد. هەوڵو ڕێگاکانی ئەم بابەتە بەردەوامونەپساوەن، چونکە ئەم بابەتە، ئەم تەوەرەیە لەهەمو بابەتو تەوەرەکانی تر ترسناك ترو بەهێزترو بایەخدار ترە. باشە چی دەڵێن ئەگەر دوژمنان توانیان هەمو مەبەستو داخوازیەکانی خۆیان هێنایە دی کە ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لێ ی:

ــ ئافرەتی موسڵمان وەڵامی ئەو گورگە برسیانەیان دانەوەو پەردەو باڵا پۆشی شەرعی لەڕوی خۆی داماڵی، وقژەکانی ڕوتو قوتوبەرەڵاو ئازاد کردو هەرگوێشی پێ نەدا[1].

ــ تەواوی لەشیان یاهەندێ لەلەشیان ڕوت کردەوە(سفرت) جلو پۆشاکێکی ناشیرینونادروستو قێزەوەنونامۆ بەئیسلامو بەدەر لەبەرنامەو شەریعەتی خوای گەورەی پۆشیءو شەرمی لەخواو لەپێغەمبەری خواﷺ نەکرد.

---

( ١) هەروەکو لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا دەی بینین کچانو ژنانی ئێمەی خۆ بەموسڵمان زان بەتەواوی خۆیان ئاوەڕوت کردۆتەوە هیچیان لەبەر خۆدا نەهێشتوەو بەتەواوی جلو بەرگو پۆشاکی شەرعیان لەخۆ داماڵیوەو وەکو تەیرەکەی مەلای مەزبورەیان لەخۆ کردوەو قاچو دەنوك کراو و ئێستا لەتەیر چویان لەخۆ کردوە .بەدەگمەن نەبێت کەس نەماوە دوای هاوارو چریکەی کافران وبێ باوەڕانو لادەرانو دوروانی ناوەخۆ نەکەوتبنو وەك بوکە شوشە خۆیان بۆ ڕوتو ئاوەڕوت نەکردبن. زۆر بەداخەوە ئافرەتانی مەلاکانو بەناو بنەماڵەی ئایین پەروەرەکان لەگەڵ ڕێزمان بۆیان پێشەنگی ئەم بەدوا کەوتنی ئەو هاوارەی بێ ئابڕۆو سوکەڵەکان بونو قاوغیان شکاندو ئافرەتانی خانەوادەو خێزانەکانی تریشمان شوێنیان کەوتنو چاویان لەوان کردو تابەو دەردە گەیشتون کەئێستا دەی بینین. لەهەموشی ناخۆشترو جێ ی داختر ئەوەیە خۆیان بەپێشکەوتو دەزاننو ئەوانی تریش بەدوا کەوتوو نەزان و نەفام.بەڵام نەخێر خۆیان نەزانو نەفامنو بەسەر پاشواندا گەڕانەوە بۆ دوای دواوەو بۆ سەردەمی قەومی لوطو سیفەتیان(وەرگێڕ).

ـ زۆر بێ باكانەو بەبێ شەرمیەوە لەهەمو شوێنێك دا تێكەڵاوی پیاوان بون( خالطت الرجال في كلّ مكان).

ـ بێ باكانەو بەتەنیاو بەلەشی ڕوتو قوتەوە ئوتومبیل دەئاژوێ (لێ دەخوڕێ).

ـ وازی لەپەروەردە كردنی منداڵەكانی هێناو دانیە دەست خزمەتكارەكەی یا خود پەروەردیاری بێگانەی بۆ گرتن بێ ئەمین وئەمانەت لەماڵدا.( ئێستا دایەنگای فەرمیان بۆ كردنەوەو دەیابەنە ئەوێ ـ وەرگێڕ).

ـ هاوڕێیەتی پیاوی بێگانە دەكاتو شەوانە شەونخونیان لەگەڵ دا دەكاتو لەگەڵیاندا دەمێنێتەوە ڕۆژگارو شەوگار بەسەر دەبات.

ـ چوە دەرەوەو لەگەڵ پیاواندا هاوبەشی كارەكانیان بوو خۆی بەدوكەڵوتەپو تۆزی كارگەو كۆمپانیاكان پیسو پۆخڵ كردوماندو وشەكەت بو ئیدی نەی توانی منداڵەكانی پەروەردەو گۆش كردوی موسڵمانانەیان بكات.

ـ خۆی بۆ كەسانی تر ڕازاندەوەو ڕوخساری لەدڕو دەرماندا شەلاڵ كردو مێردەكەشی بەرەلا كردو گوێشی پێ نەداو منداڵەكانی واز لێ هێنان[١].

---

( ١) بەڵێ، هەمیشە خۆ بۆ پیاوانو كوڕانی بێگانە دەڕازێنێتەوەو خۆ لەدڕو دەرمانو ماكیاجە جۆریەجۆرەكانی كۆمپانیا مۆنەپۆڵەكانی ئەواندا شەلاڵ دەكاتو جانتا چەرمینە بچكۆلەكەی بەلاشاندا لار دەكاتەوە زۆر بەدەعیەو ناز وخۆ بەزل زانیەوە دەڕواتە دەر بۆ بازاڕەكانو بۆ سەیرانگاو شوێنە قەرەباڵغو ئاپۆرەكانداو قژی لێ بەشانەو ڕەنگاو ڕەنگو جەلاویو بۆن خۆش دەكات و خۆ بادەداتو ماڵو منداڵ بەجێ دێڵێو خۆ ئەوەی هەر بەخەیاڵیشی دا نەیاتو هەر بیریشی لێ ناكاتەوە مێردەكەیەتی. ئەگەر هاتیشەوە جوانو پوخت خۆی دەشواتەوەو و جلە جوانەكانی فڕێ دەداتو بۆنەخۆشەكەش لەخو دەكانەوەو بۆر وجرقن دەچێتە بەردەم مێردەكەی. لەم ساڵانەدا گوتیان لەیەكێ لەكەناڵە عەلمانیە ناوخۆییەكان لەناو بازارەكاندا ڕاپرسیەكیان لەگەڵ خەڵكی دا كرد: چی دەڵێ ی لەبەرامبەر ماكیاجو خۆڕزاندنەوەی ئافرەتانمان؟ پیاوێك لەوەلامدا دەڵێ: وڵلاهی هەتا بڵێ ی شتێكی خراپو قێزەونە، چونكە ژن خۆ بۆ پیاوەكەی ناڕازێنێتەوە، بەڵكو بۆ خەڵكە. ئێستا من خێزانەكەم هەمو ڕۆژێ كەدەچێتە دەرەوە بۆ بەرو بازاڕەكان وا خۆ دەڕازێنێتەوەو خۆی شەلاڵ دەكات دەبرسكێتەوە، بەلام كەهاتەوە ماڵو هاتە بەردەمی من دەڵێ ی مەیمونە، هەرچی ماكیاجو ڕازاوەكەیەتی لەخۆی دادەڕنێو بۆن ئارەق نەبێ لێ ی نایە. كەواتە هیچ واتای تێدا نیە سەرەڕای

ـــ ئەمانــەو گــەلێ داخــوازیو داواکــاریو پلانــی تــر کەهەمیــشە کۆتاییــان پــێ نایەت.جالەسەر ئافرەتی موسڵمانی سەرکەوتوو سەرفرازو خوازیاری ڕەزامەندی خوای باڵا دەست و کار بـەجێ پێویستە کەبەهـەمو توانایەکیـەوە لێبڕاوانـە لەگـەڵ کـچانی هاوڕەگەزی خۆی دا بوێرانەو خۆڕاگرانەو پـێ دامەزراوانـە ڕو بـەڕوی ئـەم هێرشـە بـەر بڵاوانە بوەستنەوەو وەك شاخ لەبەر دەمیاندا قوت ببنەوەو بەرپەرچیان بدەنەوە.

ت ـــ هـەروەها لـەو شـتانەی گـەئافرەتی موسـڵمان سـودی لێ دەبینێـت: شـارەزا بونوحاڵی بونە لە حاڵوکاروبارو ژیانی ئافرەتانی کافرانو ئـەوەی کەدوچـاریان بـوە، وەبێ لەو هەمو نـاکۆکیوگێرەو قەرقەشـەو هاتوهاوارانـە، ئـەو بـارو دۆخـە نـاخۆشو دودڵیونەخۆشـیە دەرونیانــەو ئــەو هــەمو ڕاڕایــیو دڵــەڕاوكێو خــەمۆکیو نائــارمی دەرونیەی کەتیایدا دەژین. ئاخر ئافرەتی ئەوان سوكو ڕیسوا بـوەو دەمـرێو سـەگو پشیلەکەی هەر لەباوەشدایە، لەکاتی جوانیو گـەنجی دا خراپـەکاران توشـی خراپـەی دەکەن، وەك دەسترۆکە یاوەك کلینیکس وایە خۆی پێ دەسـڕنەوەو فـڕێ ی دەدەنـە ناو زبڵدان، وەك گەرماو وایە لەسەر چەقی ڕێگاو هەرچی هات میـزی خـۆی لێ دەکـات وخـۆی تێـدا دەشـواتو دەڕوات، جائەگـەر ئـافرەتی موسـڵمان ئـەم هـەمو ڕاسـتیانە بزانێتو خوانەخواستە ئەم ڕێگـەو ڕێـڕەوە هـەڵ ببـژێرێتو بیگرێتـە بـەرو بـەرەو ئـەو حاڵەتە بڕوات، ئەویش توشی ئەو حاڵەتە دەبێت، خۆ دور دەگرێـت، وەئەگـەر بزانێـت ئەگەر دەست بەپەتی بەخوای خۆیەوە بگرێتو خـۆی بپارێزێـت بـۆ ئـەوەی نەکەوێتـە ئەو قوڕاو وزەلکاوە بۆگەنەوە، خوای گەورە دەی پارێزێت سەرکەوتوسەرفراز دەبێت لە دنیاو لەقیامەت داوژیانێکی خۆشو بەختەوەر دەباتە سەر لەهەردو دنیادا.

و ـ **هەستانی ئافرەتی موسڵمان بەڕۆڵی چاکسازی و چاکگوزاری(دورها الإصلاحي):**

ئەمــەش لــەڕابردودا ڕونمــان کــردەوە، پێویــستە ئــافرەتی موســڵمان ســەرەتا لەخۆیەوە دەست بکات بەخۆ چاك کردنوڕۆڵـی چـاکگوزاری ببیـێ، هـەروەها لەماڵـەوەداو لەگەڵ خەڵکی داو لەناو کۆمەڵگەدا. ئەگەر بەم شێوەیە ڕەفتار بکـات ئـەوا ئـەو کـات ئـەو ئافرەتە ڕۆڵی بەرچاو ودیاری دەبێت لـەناو کۆمـەڵگادا وکاریگـەر دەبێـت نـەك کـارلێکراو،

---

ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا لەخۆی تورە دەکاتو دڵی منیش لەخۆی دەڕەنجێنێ، بەڕاسـتی شـتێکی خراپە، دیارە خراپەش هەر خراپەی لەدوایە.(وەرگێڕ).

ودەبێتە چاکگوزار نەك خراپەکار، دەبێتە ئەندامێکی کاراو چالاك نەك پەککەوتەو هیچ لەدستان شین نەبوەوەو دەستوپێ سپیلکە، دەبێتە ئەندامێکی بەکەڵكوبەسود شوێنی دەکەون نەك شوێن کەوتو بێت، بێ گومان پاداشتی خوای گەورە وەردەگرێتەوەو بەچونە بەهەشتو ڕەزامەندی خوای پاكو بێگەردو باڵا دەست کۆتایی دێت.

## چەند هەڵوێستێکی خێراو سەرپێ یی لەگەڵ ئەرك وبەرپرسیەتی ئافرەتی موسڵماندا:

دوای گەشتێکی خێرا لەگەڵ ئەركو بەرپرسیەتی ئافرەت لەنەفسی خۆیو ماڵو منداڵوکۆمەڵگەو لە چاکگوزاریوئاراستە کردنو ڕێنومایی کۆمەڵایەتیو ڕونکردنەوەی بەرپرسیەتی لەکۆمەڵگاداو لەناو چین وتوێژەکانی ئوممەتدا، پێویستە لەسەرمان کەپێشبینی کۆمەڵێك کارو چالاکی بکەین کەکۆتایی توێژینەوەو لێکۆڵینەوەکەمانی پێ بێنین، کەبەڕاستی گرنگیو بایەخێکی گەورەی هەیەو لەچەند هەڵوێستەیەکی خێراو سەر پێ یی دا دەیان خەینە ڕو، کەوەکو پاڵنەرێكو هۆکارێکی یارمەتی دەر وان بۆ سەرکەوتنی ئەم کارەو ئەرکە گەورەیەی کەئافرەتی موسڵمان پێ ی هەڵ دەستێت:

**هەڵوێستەی یەکەم: خۆ ئامادە کردنی ئافرەت بۆ ئەم کارو چالاکیە گرنگە:**

گومانی تێدا نیە کەئەمە ئەرکوکارێکی زۆر قورس وگەورەیە، کارێکی بەرزە، کەچی هەر بیریشی لێ ناکەنەوە تەنیا ئەو ئافرەتە سەرکەوتوانە نەبێت کەچونەتە ناو چوارچێوەی کار کردن وپێشبڕکێوە بۆ گەیشتن بەدۆندە بەرزەکانی چیا بەرزەکان. ئەم ئەرکە قورس وگەورەیە پێویستی بەخۆ ئامادە کردنێکی لەپێشینەیە هەیە. دەتوانین داواکاری وبڕیارەکانی ئەم خۆ ئامادە کردنە لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا بگوشین:

❖ **خۆئامادە کردنی زانستیانە:** مەبەستمان لەزانست زانستە شەرعیەکانە کەلەفێر بونوشارەزایی بونی دا سودێکی زۆر هەیە بۆ فێر بونو شارەزا بونو ڕێنومایی کارو بارە ئاینیەکانی وەك عەقیدەو بیرو باوەڕو بەندایەتیو پەرستشیو(العقیدة والعبادة)و ڕەفتارو مامەڵە کردن (المعاملة)، وئاکارو ڕەوشتی مرۆڤی بالغ (المکلف)[1].جالەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیە پێویستە مرۆڤی باوەڕدار پشکێکی زۆری

---

(١) پێشتر قسەمان لەسەر بەرپرسیەتی زانستی ئافرەت کردو شتێکمان لێ ڕون کردەوە کەپەیوەندی بەم بارەوە هەیە.

لەزانستەکانی وەك بیرو باوەڕو پەرستشی و(العقیدة والعبادة)، ڕەفتارو مامەڵە کردن (المعاملة)، ئەخلاق وئاکارو ڕەوشت وپەروەردەو ئابڕو ڕەفتار، سیرەت وژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، ژیاننامەی پێشینەی پیاو چاك لەسەحابەکانوشوێن کەوتانوشوێن کەوتەی شوێن کەوتانو دوای ئەوانیش.

❖ **خۆ ئامادە کردنی کۆمەڵایەتی:** وەك ئەوەی کەکۆمەڵگەیەکی بچوك کراوە بۆ خۆی دروست بکات کەبتوانێت تیایدا بەئەنجامدانو ڕاپەڕاندنی بانگەشە کردنو بانگەوازی هەڵبستێت بەباشترین شێوە، وەلەگرنگترین شتێك کە لەسەر ئەم کارە گرنگە بێتە ڕێگەی ئەوەیە کەنابێ شو بکات بەکەسێك کەپیاو چاكو پابەند نەبێت بەشەریعەتی خواوە واتە بەقورئان سوننەتەوە بەپێ ی تێگەیشتنی پێشینەی پیاوچاك. بۆ ئەوەی کەشو هەوایەکی لەبارو گونجاوی بۆ بڕەخسێنێت بۆ ئەنجامدانی ئەم ئەرکو کارە گرنگو گەورەیەی سەر شانی، هەروەها دەبێ خۆی وا ڕابهێنێت کەتەنیا لەبوارە چاكو باشەکاندا هاریکاری بکات وەك مەشق کردنو خۆ ڕاهێنان لەسەرئامۆژگاریو ئاراستە کردنوڕێنومایی کردنو وتار خوێندنەوەو دادانی محازەرات. باشتریش وایە هەر لەمنداڵیەوە خۆ لەسەر ئەم حاڵەتە ڕابهێنێت، هەر لەو کاتەوەی کەقوتابیە بۆ ئەوەی بتوانێت کارو ئەرکەکانی سەرشانی خۆی بەتەواوی وبەشێوەیەکی باشتر ڕابپەڕێنێت. وەلەسەر کەش وهەوایەکی کۆمەڵایەتی وکۆمەڵگای ژنانە(المجتمع النسوي) ڕابهێنێت.

❖ **پەروەردەو ئامادەکردنی نەفسی خۆ:** مەبەست لەمە پەروەردە کردنو خۆئامادە کردنی نەفسی خۆ بەشێوەیەکی وا کەتواناو ئامادەییەکی وای هەبێت کەبەبڕوا بەخۆ بونێکی تەواوەوە بتوانێت بچێتە ناو ئەو گۆڕە پانەوە، بەم هەمو متمانەو پێ دامەزراویو نیەتی پۆڵایینونیاز پاکیو عەزمێکی بەرزو بێ کۆتاییودەست پێشخەریو بێ دودڵی ولاوازیوتێشکان، ئامادە بێت ڕو بەڕوی هەمو کەندو کۆسپەو تەنگژە دەرونیەکانو سوکایەتی پێ کردنوگاڵتە پێ کردنو تەشقەڵەیەك ببێتەوە، کەلەکەسێکی تری فاسق یالەدژە فیکری خۆیەوە. یالەدژی ئایینەکەی قسە دەکەن یا هەندێ جار لەدەوروبەرەکەی خۆیەوە دەبیستێو ڕو بەڕوی دەبێتەوەو دوچاری ئازارو تەنگ پێ هەڵ چنین دەبنەوەو پلارو توانجی گاڵتەجاڕی تێ دەگرن. دەبێ ئافرەتی موسڵمان لێرەدا زۆر خۆڕاگرو مەندو سینگ فراوانونەڕوخاو بێت. ئەوەی

لێرەدا یارمەتی دەرو پاڵ پشتی بێت هێزێکی شاراوەی بەهێزو فاکتەرێکی مەعنەوی بەهێزە، هێزی بڕوایە( الإیمان) بەخوای باڵا دەستو کاربەجێ، ونیاز پاکیو دڵ پوختەیی بۆ خوای گەورە لەئەنجامدانی ئەم کارو ئەرکە گرنگە، داوا نەکردنو نەخواستنی هیچ شتێك لەدنیادا بۆ ناوبانگیو لەپێناو ڕوپامایی یا بۆ زاڵ بونو باڵا دەستیو شۆرەت لەبوارێك لەبوارەکانی دنیادا. دەبێ هەمیشە هاوڕێو هاودەمی نیاز پاکیو هێزی سەربەرزیو ورە بەرزیو شانازی کردن بەم ئایینەوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ ﴾ المنافقون:٨.(واتا: عیزەتو ڕێزو زاڵیو دەسەڵاتداریو سەرفرازی تەنیا بۆ خواو بۆ پێغەمبەرەکەیو بۆ تەواوی گرۆهی بڕوادارانە وبەس، بەڵام دوڕو دەغەڵە ملهوڕەکان ئەمە نازانن‌و ئاگایان لێ نیە، بۆ؟ چونکە ئاخر خۆ ئەوان لەم نازونیعمەتەی خوا بێ بەشن‌و نەیان چەشتوە، دەی ئەوە بۆیە وایە چونکە ئەوان پەیوەندیان بەسەرچاوەی ئەم نازو نیعمەتەوە نیە کەخوای باڵا دەست وکاربەجێ یەو بڕوایان پێ نیەو بڕواشیان نەبەپێغەمبەرەکەشی هەیەو نەبەبەرنامەکەشی، خوای گەورە پەنامان بدات.آمین.(وەرگێڕ). دەبێ ئافرەتی موسڵمان هەمیشەو بوێرو چاو نەترس‌و بێت لەئاست هەق دا هەرگیز سازش نەکات، هرگیز دودڵ وڕا ڕا نەبێت، لەبەندایەتی کردن بۆ خوای گەورەو لەکاری بانگەوازی دا خاو خلیچك‌و سست‌وتەمبەڵ نەبێت‌و شتە خەیاڵیو ئەفسانەو ئەندێشە پوچەڵەکان لەمێشکی خۆی دا کۆ نەکاتەوە تابێ ورەوبێ هێزو بێ توانا دەر نەچێت. لەوە نەترسێ کە بەندایەتی کردنی بۆ خواو کاری بانگەوازی و چاکگوزاریەکانی قبوڵ نابێت، گوێ بەوەسوەسەکان‌و ڕازاندنەوەکانی شەیتان نەدات‌و خۆڕاگر بێت لەبەرامبەری دا، دەبێ زۆر بوێرانە بێت وسور بێت لەبەرگری کردن لەو هەقەی وا لەدەستی دایە و گرتویەتیە بەر کەبریتیە لەپەیڕەو وپرۆگرامی خوای گەورە. وەدەبێ باش بزانێت کەلەبڕینی ئەو ڕێگەیەی کەگرتویەتیە بەر چەندان کێشەو تەنگژەو وکەندو کۆسپی دێنە ڕێ، دیارە شتێکی بەڵگە نەویستە کەپێشەنگی ئافرەتی موسڵمان پێغەمبەرەوﷺ هەمومان دەزانین ئەوەی بەسەری هات بەسەری هات لەو هەمو ئازارو ئەشکەنجەو وکوێرەوەریو ماندو بون‌و شەکەتیەی لەئەنجامی ڕەت کردنەوەو بەرهەڵستیو بەگژدا چونەوەی

تاوانباران‌و ملهوڕانی بێ باوەڕان‌و مولحیدان‌و دوڕوەکان بەسەری هاتن، ئەو هەمو سزادان‌و ئازارو ئەشکەنجەیەی خۆی‌و هاوەڵە بەڕێزە خۆڕاگرەکانی کەلە سەر دەستی ئەو کافرە خوانەناسانە توشیان هات‌و چەشتیان لەگەڵ ئەوەشدا نوچیان نەداو بوێرانە وەك چیاکان‌و دۆندە بەرزەکانی مەوککەو مەدینەوقەندیل وئیڤەرێست لەبەر دەمیاندا وەستان وچۆکیان دانەداو لەسەر بانگەشەو بانگەوازی خۆیان بۆ لای خوای گەورە بەردەوام بون وساتێ نەسرەوتن وگوێ یان نەدایە ئازارو ئەشکەنجەو گرتن‌و پێدادان‌و دارکاری کردن‌و لەمەنجەڵی ئاوی گەرمدا کوڵاندن‌و شەهید بون .و..وتد تائەنجام خوای گەورە پشتی گرتن‌و سەری خستن‌و پۆل پۆل خەڵکانی سەر ڕوی زەوی دەهاتنە ناو ئەم ئایینە پاك‌و پیرۆزەی ئیسلام‌و دەهاتنە ڕیزی موسڵمانانەوە تا ئایینی ئیسلام گەیشتە سەرتاپای جیهان‌وخوای گەورە لەئەنجامی ئەو خۆڕاگری‌و ددان بەخۆدا گرتنەیان‌ولەبەر ئەو پێ دامەزراوی‌و بەردەوامیەیان (الإستقامة) نازو نیعمەتی خۆی لەدنیاو لەقیامەت دا پێ بەخشین.

### ❖ خۆ ئامادە کردنی پلانی‌ونەخشەڕێژی‌و زانستی بۆ ئامانجەکانی بانگەوازی‌وشێوازەکانی:

بانگەشەو بانگەوازی ئیسلامی بانگەشەو بانگەوازێکی زانستی پراکتیکی جیهانیە ئەنجامدان‌و جێ بەجێ کردنی پێویستی بەوە هەیە کەدەبێ بەتەواوی لەچیەتی‌و چۆنیەتی‌وناوەڕۆك‌و ئامانج‌و مەبەستەکانی بزانیت‌و شارەزا بیت، جائەنجامدان‌وهەستان بەو بانگەشەو بانگەوازیە لەلایەن ئافرەتەوە پێویستە لەسەری کەدەبێ بەگوێرەی پلانێکی ڕون‌و ئاشکراو بێ پێچ‌و پەناو بێ گرێ‌و گۆڵی نەخشە بۆ دارێژراو بڕوات بەڕێوە، بۆخۆی ڕەنگی بۆ بڕێژێت یاخود لەگەڵ هەر کەسێکی تردا هاوکاری بکات کەلەگەڵی دا هاوبەشە لەو کاروئەرکە گرنگەدا. دەبێ زۆر بەوەردی بیری لێ بکاتەوە چی دەوێ لەم بانگەشەو بانگەوازیەداو دەبێ چی بکات‌و چی نەکات؟ ئامانج‌و مەبەستە دورو نزیکەکانی چین؟ ئایا شێوازو هۆکارە سەرەکی‌و بەراییەکان‌وسەرکەوتوەکانی چین بۆ گەیشتن بەبەو ئامانج‌ومەبەستان؟ هەمو ئەمانەو شێوەکانی تری دەبێ ئافرەتی موسڵمان پێش ئەوەی بچێتە ناو گۆڕەپانی کار کردنەوە ئامادەو گەڵاڵەیان بکات‌وخۆی کۆك‌وئامادەو تەیار بکات، تالەکارەکەی دا سەرکەوتو بێت‌وتێ نەشکێت‌و شوێنەواری خراپی لێ نەکەوێتەوەوخوانەخواستە سەرکەوتن بەدەست نەهێنێت‌ونەتوانێت ئەو کارەی گرتویەتیە

بەر بگەیەنێتە شوێنی مەبەست‌وبەناچاری پالی لێ بداتەوە. بەگوێرەی ئەم تاو وتوێ‌وبیروبۆچونانە لەم کاروئەرکە گرنگو بەهادارەی دا ئافرەتی موسڵمان پێویستی بەم هەنگاوانەی خوارەوە هەیەودەبێت:

- دارشتنی پیلان‌و نەخشەڕێژی بۆ ڕەوتی کاروانی بانگەشەو بانگەوازەکەی بەوێنەو نەخشە ڕێژی بۆ ئامانج‌و مەبەستە دوورو نزیکەکانی.

- هەروەها دەبێ بڕوانێتە ئەو هۆکارانەی کەلەدەستی دان بۆ بەکارهێنانیان وەك ئافرەتێك، چونکە ئەوەی بەپیاو دەکرێت هەرگیز بەئافرەت ناکرێت ئەمە شتێکی بەڵگە نەویست‌وحاشا هەڵ نەگرەو هەروەها بەپێچەوانەوەشەوە([1]).

- دەبێ شێوازەکانی ئەنجامدان‌و ڕاپەڕاندنی ئەم کارە گرنگە بزانێت‌وباش شارەزایان بێت‌و لەبەر دەمی دا ڕون ئاشکرا بن کەدەبنە ئەگەری ئەنجامدان‌و ڕاپەڕاندنی بانگەشەو بانگەوازەکەی‌و ڕاگەیاندنیان لەناوچین وتوێژەکانی کۆمەڵانی خەڵکی دا.

- دەبێ پێشبینی ئەو هەمو کێشەو تەنگژەو تەنگو چەڵەمەو ناکۆکیانە بکات کەلەوانەیە بێنە سەر ڕێگەی لەئەنجامدانی ئەم ئەرکە گرنگەی دا، بۆ ئەوەی بەئاسانی بتوانێت بەسەریاندا باز بدات‌وخۆیان لێ لابدات‌و بەسەریاندا زاڵ بێت‌و بەردەوام بێت لەبانگەشە کردن‌و بانگەوازەکەی دا تا دەگاتە شوێنی مەبەست وسەرکەوتن.

## هەڵوێستەی دووەم: سیفاتەکانی ئافرەتی بانگەشەکاری سەرکەوتو:

**یەکەم: نیاز پاکی‌و دڵسۆزی بۆ خوای گەورەوبالا دەست‌وکاربەجێ:** گومانی تێدا نیە کەبەبێ ئەم نیاز پاکی ودڵسۆزیە دەرئەنجامی کارەکانی هەمو دەبنە تەپو تۆزو بەهەوادا هەڵ دەچن‌وپەرش‌وبڵاو دەبن، ئەمەگرنگترین شتێکە کەدەبێ ئافرەتی موسڵمانی بانگەشەکار خۆی بۆ ئامادە بکات‌وخۆی پێ چارە سەر بکات‌وپێ برازێنێتەوەو بەهەندی هەڵبگرێت.

**دووەم: ئارام گرتن‌و خۆڕاگری،** بانگەشە کردن‌و بانگەوازی کارێکی هەروا سوك‌وئاسان‌و سادەو سانا نیەو گەلێ قورسەو کەندو کۆسپەکانی گەلێك زۆرن، بۆیە پێویستی حەتمی بەم ئارام گرتن‌و خۆڕاگریە هەیە، ئەوەندەی بەسە کەلەقورئانی پیرۆزدا

---

[1] ) واتە: لەهەندێ کارو باردا ئەوەی بەئافرەتان دەکرێت بەپیاوان ناکرێت ، وەبەپێچەوانەوەش.(وەرگێڕ).

پـتر لەنـەوەد شـوێن دا دوبـارەو چـەند بـارە بوەتـەوەو نـاوی هـاتوە، کەڕاسـتەوخۆ داوا لەپێغەمبەرﷺکراوە.

**سـێ یەم: زانستی وزانیاری تەواو(١).**

**چـوارەم: کرداری چاك وڕەوشت وئاکاری باش وبەرزو بەردەوامی لەسەر ڕەوشت جوانی:** دیارە شتێکی بەڵگە نەویست وئاشکرایە لەگرنگترین هەڵوەشێنەرەوەکانی بانگەشەوبانگەوازی کردن و پوچەڵ بونەوەی کارەکان ونەگەیەشتنی خاوەنەکەیەتی بەدەرئەنجامێکی باشو ئەرێیی (الإیجابیة) بریتیە لەدژ یەکی قسەو کردارەکان :﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٢ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُواْ مَا لَا تَفۡعَلُونَ ۝٣﴾ (الصف:٢،٣))(واتا: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان بەخواو بەپێغەمبەری خوا هێناوە بۆچی ئەوەی بەزمان دەیڵێن بەکردەوە نایکەن؟ ئەدی نازانن خوای گەورە ڕقی لەو کەسە هەڵ دەستێت کەبەقسە بڵێ ئەوا دەکەم وئەواناکەم ، یان بەخەڵکی دەڵێ ئەوا بکەن وئەوامەکەن وئامۆژگاری خەڵکی بکات وڕێنوماییان بکات کەچی لەلایەکی ترەوە بۆ خۆی ئەو کردەوانە نەکات ولەخراپەکاری ڕانەوەستێت.(وەرگێڕ).یا دەفەرموێ:﴿ أَتَأۡمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلۡبِرِّ وَتَنسَوۡنَ أَنفُسَكُمۡ ﴾ (البقرة:٤٤). (واتا: ئایا ئێوە ئامۆژگاری: خەڵکی دەکەن بۆ کاری چاکە کردنو خەڵکی لەخراپە دەگێڕنەوە کەچی خۆتان لەبیر دەچێتو ملتان بەخراپەو خراپەکاریەوە ناوە. ئەمەو لەم بوارەداگەلێ دەقەکان گەلێك زۆرن .

**پێنجەم: نەرم ونیانیو هێدی وهێمنی ولەسەخۆیی وپەلەنەکردن وهەڵەشە نەبوونو سینگ فراوانی:**

بەڵێ، شتێکی شاراوە نیە کەگەورەترین وگرنگترین شتێك لەژیانی مرۆڤدا بریتیە لەمەندی وهێدی وهێمنی ولەسەرخۆیی وسینگ فراوانی وپەلە نەکردن وهەڵەشە نەبون، ئاخر ڕێگای ئەم ژیانە دورە ، ئەوە نیە هەر کەسێك خانو دروست دەکات ، کەدروستی

---

(١) لەڕابردودا ئاماژەمان پێکرد.

کرد یەکێکی تر تیایدا دادەنیشێت وتیایدا دەحەسێتەوە، دەبێ لەم ژیانەدا زانست وزانیاری فێر بیت ووکەسانی تریش فێر بکەیت و ئەو زانست وزانیاریە بەکەسانی تر بدەیت ، ماڵێك پەیدا بکەیت دەبێ کەسانی تریش سود وکەڵکی لێ وەر بگرن ([1]). بۆ ئەوەی ئافرەتی بانگەشەکار بگات بەمەبەست وئاواتەکانی خۆی لەکاری بانگەوازیەکەی داو لەگرتنەبەری ئەم ڕێگەیەدا پێ دامەزراو بەردەوام بێت دبێ نە سفەتە جوانو بەرزوگەوریە خۆی برازێنێتەوە، پێغەمبەری خواﷺ بە أشج عبدالقیسي فەرمو:{إنَّ فيك خصلتين يحبهما الله، الحلم والأناة}([2])هەرکەسێك نەرمو نیانوسینگ فراوانولەسەرخۆ نەبێت با ئەو سیفەتە لەخۆی دا بێنێتە دی، زانستو زانیاری بەفێر بونوهەوڵ دان دێتە دیوتێکۆشانی دەوێت، هێدیوهێمنیوسنگ فراوانیش بەخۆ جوان کردن بەو سیفەتە بەدەست دەکەوێت.

**شەشەم: ڕاستگۆیی بەهەمو جۆرەکانیەوە:** ڕاستگۆیی لەگەڵ خوای گەورە لەپەرستشیو بەندایەتی بۆ کردنی دا، لەگەڵ خەڵکی دا، ڕاستگۆیی لەنوسینو لەکردەوەو گفتاردا، هەرگیز نابێ درۆ لەگەڵ خوادا یالەگەڵ پێغەمبەرداﷺ بکات، ئەمەیان گەورە ترین وترسناکترین درۆیە، نابێ درۆ لەگەڵ خەڵکی دا بکات هەتاکو لەگەڵ منداڵان و لەگەڵ گیاندارەکانیش دا بکات، بەڵکو دەبێ نمونەی ڕاستگۆیی بێت.

**حەوتەم: ناسین ودەرك کردنی ئەو واقیعەی کەئافرەتی موسڵمان تیایدا دەژیات:** نابێ قسە بکات بەوە ئەبێ کەتێ ی گەیشتوەوهۆشیارە واتە بەشێوەیەکی ڕۆشنبیرانە وزانستیانەولەواقیع گەیشتوە ئەگەر ئافرەتی موسڵمان بەشێوەیەکی تایبەتی لەواقیعەتی خەڵكو دەورو بەرەکەی خۆیو واقعیەتی ئافرەت گەیشت ئەوا دەتوانێت بخزێتە ناو دڵیانەوەو چارەسەری کێشەو ئاستەنگ وتەنگژەکانیان بکات، وقسەو گفت وگۆ لەسەر ئەو کێشەو تەنگژانە بکەن کەبەلایانەوە گرنگ وچارەسەر خوازن.

**هەشتەم: پێویستە بەڕەوشتو ئاکارە جوانەکانی شەرعی خۆی برازێنێتەوە:** بەتایبەتیش ئەوانەی کەواجبن لەسەری وەك: باڵا پۆشیوپۆشاکی شەرعیانە، تێکەڵ نەبون لەگەڵ

---

( ١) کورد دەڵێ : هەرچی گا بیکات تەنیا گا نای خوات.(وەرگێڕ).

( ٢) لەڕابردودا ئاماژەمان پێ کرد.

پیاواندا، نەرمیوسازش نەنواندن لەڕەفتار کردن لەگەڵ پیاواندا، دەبێ شێوەو پۆشاکو جلو بەرگی شەرعیانە بن.

**نۆیەم: دەبێ بەرژەوەندی شەرعی سەروی بەرژەوەندی خودی ونەفسی خۆ بێت**، بۆیە دەبێ هیواو ئاواتو مەبەستی ئافرەتی موسڵمان ڕێنوماییو دەستگیرۆیی ئافرەتانی تر بێت، وئاکارو ڕەفتاری یان بەشێوەیەکی دروستو ڕاستو ڕەوان بێتو ڕزگار کردنوبەپیرەوە چونی ئەو ئافرەتانەی وا کەوتونەت زەلکاوی سەرلێشێواوانو کەوتونەتە داو وتەڵەزگەی دوژمنانەوە، هەروەها نابێ هیواو ئاواتی ناوبانگیو شۆرەت وباس کردن بێت وداوای شتی دنیایی و پاداشتی دنیایی و ئەو جۆرە شتانە بکات.

**دەیەم: شوێن کەوتن وچاودێری بانگەشەی سەرکەوتو**([1] ): دەی کەواتە پێویستە ئافرەتی موسڵمان بەهەمو ئەو سیفاتانە خۆی برازێنێتەوەو بەو سیفتە جوانانە باس بکرێت نەک بەپێچەوانەوە، بەو سیفەتانەی کەلەچوارچێوەی شەریعەتی خوا دا گرد بونەتەوە، ولەهەمو ئەو سیفەتانەش دور بکەوێتەوە کەلەشەریعەتی خوادا نینو جێگەیان نابێتەوەو شەریعەتی ئیسلام هێڵی سوری بەسەردا هێناون.

**هەڵوێستەی سێیەم: ڕاگرەکانی( ضوابط ) بانگەشەو بانگەوازی ئافرەتی موسڵمان**:هەستانی ئافرەتی موسڵمان بەبانگەشە کردنوبانگەواز بۆ لای خوای بالآ دەستوکاربەجێ دەبێ لەچوارچێوەی فیترەتو مێینەی خۆی دەرنەچێت، لێرەداو لەم بەشەدا هەندێ ڕاگری گرنگ(ضوابط مهمة) هەن یا زۆر پێویستن ڕەچاو بکرێن کەدەتوانین لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان هەڵێنین:

١ـ بنەڕەتو بنچینەی مانەوەو ئۆقرە گرتنی ئافرەتی موسڵمان لەماڵەوەیە: ئەمەتە خوای پاکو بێگەرد لەم بارەوە دەفەرموێ:﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾ الأحزاب: (٣٣).(واتا: خوای گەورە بەئافرەتان دەفەرموێ : لەناو ماڵی خۆتاندا بمێننەوەو دەرمەچون ، کاروباری ناو ماڵ وخزمەت کردنی مێردو ماڵ

---

( ١) بەیارمەتی خوا لەهەڵوێستەی سێ یەمدا ڕونی دەکەینەوە.

ومنداڵەکان وپەروەردەی منداڵەکانتان باشترە، خۆت ڕوت مەکەوەو وەك ئافرەتانی سەردەمی نەفامی خۆت مەڕازێنەوە .(وەرگێڕ).هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{المرأة عورة، فإذا خرجت من بيتها استشرفها الشيطان حتى ترجع}(١) (واتا: ئافرەت هەمو لەشی عەورەتە هەرکە لەماڵ چوە دەر شەیتان پێشوازی لێ دەکاتو وەری دەگرێتو دەی گرێتە خۆی تا ئەو کاتەی کەدەگەڕێتەوە بۆ ماڵ). وەگێر

٢ــ ئافرەت حوکمی تایبەتی خۆی هەیە، گومانی تێدا نیە کەدەبێ چاودێری ئەو حوکمانە بکرێن لەکاتی ئەنجامدانی هەرکارێکی بانگەشەیی دا ئەم حوکم وچاودێریانەش بریتین لەم خاڵانەی خوارەوە:

أ- پابەند بون بەپۆشاکی شەرعی بەهەمو مەرجەکانیەوە لەگەڵ داپۆشینی دەم وچاو وهەردو لەپی دەست، چونکە دەمو چاو وڕوی ئافرەت مەڵبەندو شاشەی جوانیەکەیەتی ولەهەمو شوێنێکی تری سەرنج ڕاکێش ترەو جوانی وشۆخ وشەنگیەکەی لەدەم وچاویەوە دەردەکەوێت شوێنی زانیاریو بەڵگە لەسەر داپۆشینی دەم وچاو گەلێك زۆرن.

ب ـ دروست نەبونی سەفەر کردنی ئافرەت بەبێ مەحرەمی (محرم): بەڵێ شەریعەتی پیرۆزی ئیسلام حەرامی کردوە کەئافرەت سەفەر بکات مەگەر لەگەڵ مەحرەمی خۆی دا بێت. ئەمەتە پێغەمبەری خواﷺفەرمویەتی: {لاتسافر المرأة إلاّ مع ذي محرم}(٢) (واتا: نابێ ئافرەت سەفەر بکات مەگەر لەگەل کەسی خۆی دا نەبێت کەلێ ی حەرامەواتە مەحرەمی (محرم) بێت.(وەرگێڕ).

ج ــ حەرامە وبەهیچ شێوەیەك نابێ لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا بمێنێتەوە(خلوة) ئەوەتە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{لا يخلون رجل بامرأة إلاّ مع ذي محرم}(٣) (واتا: نابێ ئافرەت

---

(١) رواه الترمذي في الرضاع ،باب ماجاء في كراهية الدخول على المغيبات (١١٧١).

(٢ )رواه البخاري في الحج، باب حج النساء(١٨٦٢)، ومسلم في الحج، باب سفر المرأة مع المحرم إلى حج وغيره(١٣٣٨).

(٣) رواه البخاري في النكاح، باب لايخلون رجل بامرأة إلا ذو محرم(٥٢٣٣)، ومسلم في الحج، باب سفر المرأة مع محرم إلى حج وغيره(١٣٤١).

لەگــــەڵ پیـــــاوی بێگانــــەدا بمێنێتـــــەوە مەگـــــەر لەگـــــەڵ مـــــەحرەمی خــــۆی دا بێت.(وەرگێڕ).وەلەڕیوایەتێکی تردا فەرمویەتی: {إلاَّ كان الشيطان ثالثهما}(١). (واتا: لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە کەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: هەر کاتێك پیاوێك و ژنێك بەیەکەوە مانەوە یا بەیەکەوە وەستان، ئەوە شەیتان سێ یەم کەسیانە، گومانی تێدا نیە کەشەیتان وەسوەسەیان دەدات و توشی خراپەکاریان دەکات جا بەهەر شێوەیەك بێت، هەر لەتەماشا کردن و بینینەوە بگرە هەتا کۆتایی.(وەرگێڕ).

د ـ بەهیچ شێوەیەك دروست نیەو حەرامە کەئافرەت لەگەل پیاوانی بێگانەدا تێکەڵ ببێت، ئەمەتە پێغەمبەرﷺبەئافرەتانی فەرموە: {إستأخرن، فإنَّهُ ليس لكنَّ أن تحققن الطريق، عليكن بحافات الطريق)، فكانت المرأة تلتصق بالجدار، حتى أن ثوبها ليتعلق بالجدار من لصوقها به}(٢) (واتا: لەسەرخۆ بڕۆن جارێ بوەستن وخۆتان دوا بخەن ئەوا بۆتان نیە پانایی ڕێگاکە بگرن، بەڵکو بەلێواری ڕێگاکاندا بڕۆن. جا کاتێ پێغەمبەرﷺ ئەمەی پێ فەرمون ئافرەتان دەست بەجێ خۆیان بەدیوارەکانەوە نوساند و ئەوەندەیان خۆ بەدیوارەکانەوە دەنوساند تاجلەکانیانی دەگرت و شوێنی جلەکانیان یاپارچەی جلەکانیان بەدیوارەکانەوە بەجێ دەما.(وەرگێڕ).

هـ ـ دروست نیە بەبێ مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی یا مێردەکەی لەماڵ بچێتە دەرەوە. ئەمەو گەلێ ڕاگر(الضوابط) ی تر کەنابێ هەرگیز بشێوێندرێن وپشت گوێ بخرێن .

٣ـ دوژمنانی ئیسلام لەسەر ئەم ژێ یە هەستیارە دەدەن: بەڵێ، دوژمنان ئەم حوکمانە دەکەنە بیانویەكو دەروازەیەك بۆ پیادا هاتنە ژورەوەودەست تێوەردانێكوسەرەتای بانگەوازەکەیان بەوەی کەدەڵێن ئەوەنیە ئیسلام سوکایەتی بەئافرەت کردوەو مافی پێ شێل کردون دەبینین ئەم پڕو پاگەندانەی ئەوانو ئەو هاتوهاوارە درۆینەی کەهێناویانەتە پێش کاری کردۆتە سەر هەندێ لە بانگەشەکارانی ئسلامو بوەتە هۆی پاش گەز بونەوەیان لەم کاروچالاکیە گرنگەو وازیان لەبانگەوازی ئسیلامی هێناوەو پاڵی یان لێ

(١) رواه الترمذي في الرضاع ،باب ماجاء في كراهية الدخول على المغيبات (١١٧١)

(٢) رواه أبوداود في الأدب ، باب مشى النساء مع الرجال في الطريق (٥٢٧٢).

داوەتەوە (١). دەبێ ئەو ڕاستیە باش بزانین کەشەریعەتی ئیسلام جەخت لەسەر مافو ڕاستیەتی بانگەشەکارانی ئەهلی سوننە دەکاتوخوازیاری ئەوەیە کەحەتمەن دەبێ چەندان تەوەرەو ڕاگروکۆڵەکەی پتەووفاکتەری ڕێکخەرو ڕاگیری(ثبات) لەم ئاستەدا هەبن، کەبەهیچ شێوەیەك نابێ بکەویتە ژێر کاریگەری دەرەکی وناحەزی و گوێ بەهەواو ئارەزوەکانی ناو کۆمەڵگاو ئارەزوەکانیان بدرێت.

٤ ـ بنەڕەت لەبانگەشە کردنوچونە دەرەوەدا بۆ گۆڕەپانەکانی بانگەشەو بانگەوازی ئەرکی سەر شانی پیاوانە: هەروەکو چۆن لەسەردەمی پێغەمبەرﷺو سەحابە بەڕێوەکان دا هەبو، وێڕای ئەو هەمو نمونە زێڕینانەی ژنان کەمێژو بۆمانی دەگێڕێتەوە هیچی وای جیاواز نیە لەگەڵ ئەو نمونانەی کەدەربارەی پیاوان گێڕدراونەوە، ئەمەش ڕاستیەتی فەرمودەکەی پێغەمبەرەﷺ کەفەرمویەتی:{كمل من الرجل كثير، ولايكمل من النساء إلا: آسيةُ امرأة فرعون، ومريم بنت عمران، وإن فضل عائشة على النساء كفضل الثريد على سائر الطعام}(٢)(واتا: زۆرێك لەپیاوان گەیشتنە دۆندی پڕاو پڕی و تەواوی، بەڵام ژنان نەگەیشتنە ئەم پلەیە تەنیا ئاسیای کچی مەزاحم خێزانی فیرعەونو مەریەمی کچی عمران نەبێت، وە پلەو پایەو بەرزی عائشە بەسەر ژنانی تری جیهاندا وەك بەرزیو جیاوازیو بەتامیو پلەو پایەی تێکوشە (الثريد) وایە بەسەر باقی خۆراكو خواردنەکانی تردا.(وەرگێڕ).

٥ ـ ئەم قسەو بۆچونەشمان ئەوە ناگەیەنێت کەڕۆڵی ئافرەت پشتگوێ بخرێت وبخرێتە پەراوێزو لای لێ نەکرێتەوە: بەڵکو ناتوانرێت نکۆڵی لەڕۆڵی ئافرەتان بکرێت لەگۆڕەپانی ژیان وخەباتو تێکۆشانی بانگەوازیو پەروەردەی ئیسلامی دا بەڵکو بگرە لەڕۆڵی پیاوان پتر بوە لەم بوارەدا واتە لەبواری پەروەردەییو بانگەوازی دا، هەرگیز پشتگوێ ناخرێت

---

(١) دیارە ئەوانە پێ دامەزراو وباش لەپرنسیپەکانی ئیسلام حاڵی نەبونو بڕوا دامەزراو نەبونو فشۆڵ بون دەنا چۆن بەهاتو هاواری درۆینەی بێ باوەڕانوکافرانو دوڕو دەغەڵەکان بڕوا دەکەنو دەست بەرداری ئاینو شەریعەتی خواو بانگەوازی ئیسلامی دەبن؟!!!(وەرگێڕ).

(٢) رواه البخاري في الأنبياء ، باب قول الله تعالى (وضرب الله مثلاً للذين آمنوا...)(٣٤١١) ومسلم في فضائل الصحابة، باب فضائل أم المؤمنين خديجة رضي الله عنها(٢٤٣١).

لەبیرو ناچێتەوە بەپێچەوانەوە گرنگیو بایەخی تەواوی خۆی هەیە لەمێژوی پڕ سەروەری ئیسلامدا، ئەم قسەو خواسو توێژینەوەیەمان تەنیا بۆ ڕون کردنەوەی ئەم ڕۆڵە گرنگە بو، بەڵام بەپابەند بون بەپرنسیپو ڕاگرو کۆڵەکەکانی تری ڕابردو کەباس کران شتێکی حەتمی وزەروریەتە.

٦ـ لەڕاستیو لەبنەڕەتدا دەبێ ئافرەت لەناو کچان وژنانی هاوڕەگەزی خۆی دا بانگەشەو بانگەواز بکات: دەبێ ئافرەتی موسڵمان لەکاری بانگەوازی دا هەموشێواز وهۆکاروفاکتەرە شەرعیە گرنگەکان بگرێتە بەرو بەتەواوی بەکاریان بێنێتو لێبڕاوانە هەوڵ بدات نابێ لەم فاکتەرو هۆکارو ڕاگرو بنەمایانە لابدات مەگەر بەبنەماو فاکتەرو کۆڵکە شەرعیەکان نەبێت.

## هەڵوێستەی چوارەم: هۆکارو شێوازە سەرکەوتوەکان لەبانگەشەو بانگەوازی دا:

لەگرنگترین ئەو شتانەی کەئافرەتی بانگەشەکار پێویستە ئاگاداری بێت ولای لێ بکاتەوە بۆ ئەوەی کاروچالاکیەکانی لەناو ماڵ ولەناو کۆمەڵگاو ئوممەتەکەی دا بەرهەم دار بێت بریتیە لە شێوازوهۆکارو فاکتەرە سەرکەوتوەکان لەکاری بانگەوازی وبانگەشەیی دا کەلەدوای خوای باڵا دەست وکاربەجێ یارمەتی دەرو پاڵ پشتیەتی لەڕاپەڕاندنی پرۆسەی بانگەوازی وگەیشتن بەدەرئەنجامەکانی مەبەست وداخوازیە نەخشە بۆ داڕێژراوەکانی خۆی.

ئەو هۆکارو فاکتەرە سەرکەوتو گرنگانەش بریتین لەوانەی کەخوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا بۆی ڕونکردوینەوەو دەفەرموێ:﴿ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ﴾ النحل:١٢٥. (واتا: بانگەوازی بۆ لای پەروەردگارت بکە بەهێدیو هێمنیو لەسەرخۆییو زۆر ژیرانەو پڕ حیکمەتانەو بەئامۆژگاریو پەند دادان وبەشێوازێکی ژیرانەولەسەرخۆییو باشتر لەقسەو گفتارەکانی بەرامبەرو ژیرانەتر لەوانو نەرمو نیانی بۆ ئەوەی بتوانیت بەو شێوازە جوانو نەرمە حەلیمانە کاری تێ بکەیتو هیدایەت وەر بگرێتو بگەڕێتەوە بۆلای خوای پەروەردگاری هەمو جیهانیان.(وەگێڕ).ئالەم ئایەتە پیرۆزەدا تێکڕای شێوازو هۆکارە سەرکەوتوەکان لەخۆ دەگرێت کەبریتین لە:

◆ دانایی وژیری (الحكمة):مەبەست لەم زاراوەیە دانانی هەمو شتێك لەشوێنی خۆی داو گرتنی جڵەوی نەفسی خۆت وزاڵ بون بەسەری دا، و هێدی وهێمنی ولەسەرخۆیی وپشو درێژی ورەفتار كردن بەشێوەیەكی عەقلانی ولۆژیكی وژیرانە، وبەژیری ودانایی بانگەشە كردن كەبریتین لەمانەی خوارەوە:

ـ هەڵبژاردنی كاتێكی گونجاو بۆ بانگەشەو بانگەوازی كردن.

ـــ هەڵبژاردنی شوێن وزەمینەیەكی گونجاو ولەبار بۆ بانگەوازی تێدا كردن، كەكاریگەریەكی تەواوی لەسەر قبوڵ كردن وڕازی بون هەیە بۆ ئامادە بونی بانگهێشت كراوان .

ـ هەڵبژاردنی بابەتی گونجاو لەبار، چەندە بابەتەكە گرنگ وگونجاو بێت ولەواقعیەتی قسە كردن وگفت وگۆ لەگەڵ كردن وباس كردن لەگەڵ ئافرەتاندا نزیك تر بێت ئەوا ئەو بابەتەو ئەو بانگەوازیە لەپێشترو باشتر لەوەرگرتن وئامادە بونیان ولەتێگەیشتنی ئامادە بوان نزیكترو سادەو سانا ترە.

ـ گرتنەبەری یاساو ڕێسایەك: گرتنەبەرو ڕۆیشتن بەڕێكو پێكی لەسەر یاساو ڕێساو بنەما شەرعیەكانو دامەزراو لەسەر بەڵگەو ڕێنومایيەكانی شەریعەتی خوای گەورەوشوێن كەوتنی ئەو بەڵگانەی لەسەرچاوە زوڵاڵەكەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە پێمان گەیشتونو وەرمان گرتون واتە هەڵێنجانو وەرگرتن لەسەرچاوە بنەڕەتیەكانی شەریعەتی خوای گەورە كەبریتین لەقورئان سوننەت .وئاسانكاری بكرێت نەك قورس وگران كردن هەروەكو پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{یسروا ولاتعسروا، وبشروا ولاتنفروا}(١). (واتا: هەمیشە ئاسانكاری بكەن بۆ خەڵكی وشتەكان لەخەڵكی قورس وگران مەكەن نەبادا خەڵكی لەئاینی پیرۆزی ئیسلام برەونەوەو دور بكەونەوەو لەدین بێزار ببن، هەروەها مزگێنی خۆشی وخۆش گوزەرانی بەخەڵكی بدەن وخەڵكی دور مەخەنەوە لەبەرنامەكەی خوا.(وەرگێڕ).

---

(١ ) رواه البخاري في العلم، باب ماكان النبيﷺيتخولهم بالموعظة والعلم كي لاينفروا، ومسلم برقم(١٧٣٢) في الجهاد، باب في الأمر بالتيسير وترك التنفير.

ـ پله پلهیی وقۆناغیهتی لهبانگهشـه كـردن وڕاگهیانـدن: نهفـسهكان ههمیـشه پێویـستیان بهمهشق كردنو ڕاهێنانه، لهسوكهوه بـۆ گرانولهكهمـهو بـۆ زۆر، ئـهوجار بـهره بـهره پـتر كردنی، دیاره گهر وا بڕۆیت ئهوه شـوێن كـهوتنی ئـهو زانیـاریو ڕێنوماییوئامۆژگاریانـهن كهله فهرمودهكهی (معاذ)هوه هاتوه كهكاتی خۆی پێغهمبهرﷺ بـۆ یهمـهنی نـارد پـێ ی فهرمو: {ادعهم إلى شهادة أن لا إله إلاّ الله وأنِي رسول الله ، فإن أطاعوا لذلك فـأعلمهم أنَّ الله افترض عليهم خمس صلوات في كل يوم وليلة، فإن هم أطاعوا لذلك فـأعلمهم أن الله افـترض عليهم صدقة في أموالهم تؤخذ من أغنياءهم وترد على فقرائهم}(١). (واتا: بانگیـان بكـه بـۆ شـایهتمانی (ان لاإلـه إلاّ الله وأن محمـد رسـول الله) ئهگـهر بـۆ ئهمـه گویّ ڕایـهڵیان كـردی وموسڵمان بون. ئهوجار فێریان بكهو پیّ یان بڵیّ كهخوای گهوره لهشـهو ورۆژێـك دا پیـنج فهرزهی نوێژی لهسهر واجب كردون ودهبیّ ئـهنجامیان بـدهن ،وهئهگـهر ئهمهشـیان كـردو گـویّ ڕایـهڵیان كـرد پـیّ یـان بڵـیّ: كـهخوای گـهوره زهكـاتی لهسـهر واجـب كـردون ، لهدهوڵهمهندهكانیان وهردهگیرێت ودهدرێـت بههـهژارهكانیان. (وهرگێـڕ) . پێغهمبـهرﷺ فهرمانی پیّ كرد لهبانگهوازو بانگهشه كردن دا پله پلهیی وقۆناغی بێت ، ئیدی بهم جۆره بانگهشهكاری سهركهوتو چ پیاو چ ژن پێویسته پله پلهیی بێتوقۆناغ قۆناغ هـهنگاو هـهڵ بنێتو چاودێری شته بهراییهكان واتـه قۆناغـهكان لـه لهگرنگـهوه بـۆ گـرنگتر دهسـت پـیّ بكاتو پله پله بیان بڕێتوئهنجامیان بدات.(٢)

ـــ تێبینـــی كردنوچـــاودێری كردنـــی بهرژهوهنـــدیوخراپی (المـــصلحة والمفـــسدة) ژیریوحیكمهتیـه، لادانو نههێـشتنی خراپـهكاری لـهپێش چـاكههێنان وتێكۆشـانه بـۆ چـاكهكاری. جاهـهر كاتێـك دو بهرژهوهنـدی تێـك گـیران دهبـیّ گـرنگترو بـهرز ترهكـهیان بگیرێتـه بـهر وهلـهكاتی تـیّ گیرانـی دو خراپـهو فیتنـه وئاشـوب دهبـیّ لهگهورهكـهیان

---

(١) رواه البخاري برقم (١٣٩٥) في الزكاة، باب وجوب الزكاة، ومسلم برقم (١٩) في الإيمان، باب الدعاء إلى الشهادتين و شرائع الإسلام.

(٢) دهربارهی فهرمودهكهی (معاذ) بڕوانه ئـهوهی كهلـه(الرسـالة المـستقلة) دا نوسـیومهوكهبهدرێژی واتاكهیم ئاماژه پیّ كردوه( نوسهر).

زۆرینەکەیان خۆ لا بدرێت، ئیدی بەم شێوەیە، کەواتە: ئافرەتی بانگەشە کاری سەرکەوتو دەبێ بەو کێش‌و پێوانەیە کێش بکرێت.

◆ ئامۆژگاری چاك: مەبەست لەمە قسەوگفت‌و لفتی خۆش‌و شیرین کردن بۆ ئەو کەسانەی کەبانگ دەکرێن بۆ لای بەرنامەکەی خوای گەورە بەنەرم‌و نیان ترین شێوەوزۆر بەژیرانەو هێدی وهێمنی‌و حەلیمانەو بەڕویەکی گەش‌و پاراو شەوق‌و زەوق‌و چالاکانەو خۆشەویستانە لەڕویانداو هەڵبژاردن‌و گوتنی وشەو زاراوەو دەربڕینی لەبارو گونجاو لەگەڵ ئەو دەستەی کەقسەیان بۆ دەکرێت کەبە ئاسانی تێ ی بگەن‌و فەلسەفە نەکردن‌و خۆ دەرخستن نەبێت لەڕویانداولەقەسەکان بێزار بن‌و گوێ ی بۆ نەگرن‌و لەم گوێ یەیان بچێتە ژورو لەو گوێ یەیان بێتەوە دەر. واتەبەگوێرەی ئاستی تێگەیشتن‌و ئاستی زانست‌و زانیاری‌و ڕۆشنبیری‌وتێگەیشتنی بانکراوان‌وقسە بۆ کەران قسەیان بۆ بکات‌و بابەتیان بۆ هەڵبژێرێت کەلەئاستی ئەواندا بێت، نەك بابەتێك شرۆڤە بکات کەتەقەی سەریان بێت‌و وابزانن گوێزانیان بۆ دەبژێرێت‌و دەبێ قسەو بابەتەکان سود بەخش بن، نەك دور خستنەوەیان.

هەروەها بەستنەوەی قسەو بابەتەکان بەبەڵگەو نمونە هێنانەوە بۆ ترساندن وهەڵنان (الترغیب والترهیب) بەشێکە لەئامۆژگاری کردن بۆ چاکەو چاکەکاری. هەروەها هێنانەوەی چیرۆك‌و بە سەرهات‌و سەرگوزشتەی پیاوچاك‌وژن چاکان بەشێکی ترە لەئامۆژگاری کردن بۆ چاکەوچاکەکاری. وەك ئەم جۆرە چیرۆك‌و بەسەرهات‌و سەرگوزشتانە لەقورئانی پیرۆزو سوننەت دا زۆر دوبارە بونەوە لەبەر گرنگی‌و بایەخی ڕۆڵی ئەم سەرگوزشتانە بۆ مرۆڤەکانی سەر ڕوی زەوی‌و پڕن لەپەندو ئامۆژگاری‌ولێ وردبونەوە دەرس‌وپەندلێ وەرگرتن بۆئێمەی مرۆڤ. ئەوەی کەبەهەڵەدا بچێت‌و پێ ی بخلیسکێتە ناو جوغزی لادان‌و دوچاری تۆڵەو سزا ببێت بەهۆی شوێن کەوتنی بەسەرهات‌و سەرگوزشتەکانەوە ئەوە هۆی ئەوەیە کە ئەو کەسە شوێن بەسەرهات‌و سەرگوزشتەو حکایاتە ئەفسانەیی‌وناڕاستەکان کەوتوەو شوێن قورئان وئەو بەسەرهات‌و شەرگوزشتەو ژیاننامانە نەکەوتوە کەلەقورئان‌و سوننەتەوە هاتون بەکورتی لادان لەبەنامەو شەریعەتی خوای گەورە. هەروەها قسە کردن بەوشەو زاراوەی خۆش لەگەڵ

خەڵکی‌و لەگەڵ بەرامبەردا بەو وشەو زاراوە جوانانەی کەبەرامبەر پێ ی خۆشەودڵیان پێ خۆش دەبێت وەك ئەوەی کەئافرەتی بانگەشەکار بەئافرەتانی تر بڵێت: ئەی هۆ دایکی فلانە کەس، ئەی خوشکی خۆم، ئەی بڕواداری ڕاستگۆ. وەئەگەر کۆمەڵێکیش بون پێ یان بڵێت: ئەی خۆشکانی خۆشەویست‌وبەڕێزم، ئەی خۆشکانی بڕوادار بەخوای گەورە، وەهەروەها.

هەروەها بەکار هێنانی هەندێ شێوازو دەستوری قسەکردنی نەرم کەر(ڕازی کەر- المقنعه) وەك دڵنیایی کردنێك وڕەواندنەوەی تەمی گومان ودودڵی جابەسوێند خواردن بێت یا دوبارە کردنەوەی وشەو قسەکان لەکاتی پێویستی دا.

◆ دەمەتەقێ ودایەلۆك بەباشترین وچاکترین شێوازو چاکتر لەهی بەرامبەر: مشت‌ومڕو دەمەقاڵێ یا دایەلۆك بریتیە لەلێدن‌و وەلا نانی بەڵگە بەبەڵگە (الحجة بالحجة)، یاخود بریتیە لەدژ یەکی‌وبەبەر یەکداچون لەڕون کردنەوەومل ملانێ ی قەسەکردن بۆ بەزاندن وقەناعەت پێ کردنی بەرامبەر،وەهەروەها. دەکرێ دایەلۆك‌وبەبەر یەکداچون لەگەلێك بواردا ڕو بدەن لەوانە:

ـ لەگەڵ بیرو ڕای پێەوانەدا: وبەگوێرەی ئەو جیاوازیە، ئەگەر هات وئەو دەمەتەقێ یەلەگەڵ کەسێکدا بو بڕوای بەخوای گەورە هەبون ئەوە ئەو کات بەو بەڵگانە لەگەڵی دا دەدوێیت کەلەسەرچاوەی ئیمانەوە سەرچاوە دەگرن، وەئەگەر ئەو کەسە عەقلانی بو ئەوا بەبەڵگەی عەقلانی لەگەڵی دا دەدوێیت.

ـ دەمەتەقێ لەگەڵ خەڵکی دا بەو شێوەیە یابەو شێوازە لەگەڵیاندا دەدوێیت کەتێ ی دەگەن ولێ ی حاڵی دەبن، وەك ئەوەی بەم شێوە قسەیان لەگەڵ دا بکەیت وبڵێ ی: ئەگەر قسەکەرێك ئاوای بگوتایە، ئەوە ئەوا دەگوترا.

ـ دایەلۆك ودەمەتەقێ لەگەڵ قوتابیانی کچ دا بۆ ئەوەی فێری دەمەتەقێ‌و دایەلۆك‌و ڕوبەڕو بونەوە بن‌و ڕابێن لەسەری لێرەدا پێویستە چاوەدێری ئەم ئاکارو ڕەوشتانەی خوارەوە بکرێت لەکاتی دایەلۆك ودەمەتەقێ دا:

- بەستنەوەی دەمەتەقێکە بەبەڵگەوە واتە هێنانەوەی بەڵگە.
- هێرش‌وشاڵاو نەبردنە سەر کەسی بەرامبەر( دەمەتەقێکەر) نەبەقسەو نەبەکردەوە.

- قسە لەدڵ نەگرتن وغەرەز هەڵ نەگرتن کەپێویست بەو غەرەزە ناکات.
- درۆ نەکردن لەکاتی دەمەتەقێ داو ڕاستگۆیی وهەق بێژی.
- هێدیو هێمنی ولەسەرخۆییو حەوسەلە بون لەدەمەتەقێو دایەلۆك دا.
- سەلماندنی هەق یا وەرگرتنی هەق بەسینگێکی فراوانەوە.
- دەرنەچون لەبابەتی دەمەتەقێکە .
- گومان بەچاکە بردن واتە گومانی باشت هەبێت بەرامبەر بەو کەسەی ڕوبەڕوی دەبیەوە.
- هەمیشە سور بون وچاودێری کردنی خۆ لەخوا پارێزی، بەوەی کە گومانی تێدانیە دڵنیا بێت کەبەندە لەسەر قسەو کردەوەکانی لێ ی دەپێچرێتەوە ، ئەگەر قسەی باش بکات ئەوە پاداشتی چاکە وەردەگرێتەوە، ئەگەریش هی خراپ بکات ئەوە سزای خراپەکاریەکەی خۆی وەردەگرێتەوە.

## هەڵوێستەی پێنجەم: لەبوارەکانی بانگەشەو بانگەوازی ئافرەت دا :

ئەوەی کەدێت بریتیە لەپەخش کردنی هەندێ لەبوارەکانی بانگەشەو بانگەوازی کردنی پێشنیار کراو کەئافرەتی موسڵمان دەیەوێت بانگەوازەکانی تێدا پەخش وپێشکەش بکات کەگرنگەکانیان لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گرد دەبنەوە:

١. قوتابخانەو خوێندنگاکانی کچانی حکومی وئەهلی.
٢. دەستەو دامەزراوەکانی فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردن لەخراپە
٣. قوتابخانەکانو خانەکانی ژنان بۆ لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز.
٤. دامەزراوە تەندروستیە حکومیەکان وئەهلیەکان .
٥. وەبەرهێنانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەکان (خوێندراوەو بیستراو) ئەوانەی کەلەگەڵ ئافرەت دا دەگونجێن بەهەموبنەماو ڕاگرە شەرعیەکانیەوە.
٦. لەماڵەوە.
٧. لەمزگەوتدا.
٨. لەکۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی ئافرەتاندا.
٩. لەکاروانەکانی حەجو گەلێ شوێنی تری لەم جۆرانە.

بەڵام چالاکیە پێشنیار کراوەکان‌وپەخش کردنیان بەچەند خاڵێکی دیارو کورت دا تێ دەپەڕن‌و قابلیەتی گۆڕین‌و چاك کردنیان هەیە بەوشێوەیەی کەلەگەڵ بوارەکان‌و سروشتی کارکردن لەهەمو بوارەکانداو شێوازی گونجاو بۆ هەمو کات‌و زەمینەیەك:

**١ـ قوتا بخانەو خوێندنگاکانی کچانی حکومی‌و ئەهلی:**

لەگەڵ ئەو چالاکیانەی کەلەبەرپرسیەتی مامۆستای ئافرەتدا باسمان کردن، دەکرێ دیارترین چالاکیەکان‌و ئەو شتانەی کەدەتوانرێت پێشکەش بەئافرەتان بکرێت لەمیانەی قوتابخانەو خوێندنگاکانی کچاندا بریتین لەمانەی خوارەوە:

أ- دابەش کردنی هەندێ کاسێت‌و نامیلکەی هەڵبژاردە لەڕێگەی پێشنیار کردنیانەوەو لەلایەن لیژنەی سەرپەرشتیارەوە یان بەهۆی یەکێ لەمامۆستاکانەوە.

ب- هاندانی هەندێ لەمامۆستایانی ئافرەت بۆ خستنەڕوی شێوەی پێشبڕکێکانی وەك لەبەر کردنی قورئان، یاپێشبڕکێ ی ڕۆشنبیری، یا نوسینی توێژینەوە، یاپوختە کردن‌و کورت کردنەوەی هەندێ کتێب..تد.ئەمەو ڕپای دەرکردنی هەندێ بڵاوکراوەی ئاراستەیی‌وپێچراوە وەرزیەکان(مطويات الموسمية).

ت- ڕێکخستنی ئەوەی کەپێ ی دەگوترێت بازارە خێریەکان(الأسواق الخيرية)، کەدەتوانرێت لەم میانەیەدا هەندێ کاسێت یاکتێب پەخش بکرێن‌وبخرێنەڕو، هاریکاری‌وئامادە بونی مێزگردو محازەرەی یەکێ لەمامۆستاکان یائەوانەی وتە پێشکەش دەکەن.

ث- هاندانی هەندێ لەمامۆستایانی ئافرەتی چالاك بۆ دانانی وانەیەکی نەگۆڕوبەردەوام بۆ قوتابی‌و خوێنداکارانی کچان لەنوێژگەی قوتابخانەو خوێندنگاو زانکوو پەیمانگاکان.

ج-هاندانی یەکێ لەمامۆستاکان بۆ ئامادە کردن‌و دروست کردنی کۆمەڵێکی وا کەپێ ی دەگوترێت گروپ‌و کۆمەڵی نوێژگا بۆ چالاك کردن‌و هەڵسوڕاندن‌و بەگەڕ خستنی لایەنەکانی ئاراستەو ڕێنومایی لەقوتابخانەو خوێندنگادا.

ح-بەرپا کردنی بەیەك گەیشتن‌و چاوپێکەوتن(اللقاء) لەنێوان مامۆستایاندا بۆ توێژینەوەو لێکۆڵینەوەی چۆنیەتی دانان‌و نەخشەڕێژی بۆ بەرنامەو پرۆگرامی بانگەشەو بانگەوازی لەقوتابخانەو خوێندنگاکەدا.

خ-دانانی شوێنێك لەخوێندنگاوقوتابخانەو کۆلێژو پەیمانگاکان بۆ فرۆشتنی کاسێتو کتێبو نامیلکەو چاپکراوەبەسودەکان .

د- سود وەرگرتن لەخوێندکارانی کچ لەزانکۆ وپەیمانگا لەکاتی ماوەی مەشق کردنو ڕاهێنانی مەیدانی لەڕێکخستنو نەخشەڕێژی هەندێ لەکاروچالاکی بانگەشەوبانگەوازی چالاك وئاراستەیی گرنگوسودبەخش زـ هەماهەنگی وگونجاندن لەگەڵ دەستەو دامەزراوە ئیسلامیەکان، بۆ ڕێکخستن ونەخشەڕێژی وکردنەوەی هەندێ پیشانگاو ئاهەنگە بەیەکتری ناساندنەکان (المهرجانات التعریفیة) بەکێشەو تەنگژەو ناکۆکیەکانی جیهانی ئیسلامی([1])، وەسود وپەند وەرگرتن لێ یان لەزیندو کردنەوەوهۆشیار بونەوەی هەستی ئیسلامی لای ئافرەتان لەگەڵ کۆکردنەوەی پیتاکەکان.

ذ- پێشنیار کردن لەخاوەنی قوتابخانەو خوێندنگا ئەهلیەکان بۆ کردنەوەودانانو تەرخان کردنی چەند وانەیەکی زیادە بۆقورئان خوێندنو لەبەر کردن بۆ زمانی عەرەبیو هەروەکو لەهەندی لەقوتابخانەکاندا هەیە([2]).

---

(١٣٩) واتە: کردنەوەی هەندێ کۆڕو کۆبونەوە بۆ شرۆڤە کردن وڕونکردنەوەی کێشەو تەنگژەوناکۆکیەکانی باو وسەردەم لەجیهانی ئسلامی لەناو ولاتان وچین وتوێژە ئیسلامی یەکانداو هاندانوهەڵنانی موسڵمانان لەهەر کوێ یەك هەبن وگەڕانەوە بۆ شەریعەتی خوا کەبریتیە لەقورئانو سوننەت بەپێ ی تێگەیشتنی پێشینەی پیاو چاکانمان وەك ڕێگە چارەیەك وتاکە چارەیەك بۆ بن بڕ کردنی ئەو هەمو کێشەو ئالۆزی نەهامەتیانەی کەتوشی موسڵمانان دێت لەم جیهانە جەنجاڵ وپڕ لەسەرکێشیەدا.(وەرگێڕ)

(٢ ) ئەوەی نوسەر لێرەدا نوسیویەتی مەبەستی ولاتی سعودیەیە. بەڵام لەولاتی ئێمەدا زۆر بەداخەوە وخوا بمان پارێزێ نەك لەقوتابخانەکاندا ئەم جۆرە چالاکیانە نیە بەڵکو ئێستا ئەو بڕە وانە ئایینیەی کەهەش بو نەماو وردە وردە وا خەریکە بەر پاڵە پەستۆیانیان داوە بەرەو کەندەلان خلۆری دەکەنەوە کەلەسەردەمی ڕژێمی بەعسەوە دەستی پێ کرد وسەرەتا بۆ تاقی کردنەوە وەزاریەکان داخل نەبو، ئێستا وا ئەم پرۆژەیە خەریکە تەواو دەکرێت بەیەکجاری وانەی ئایین ناهێڵرێت وبەرگێکی ئەوتۆیان بەبەردا کردوە ئەسڵەن نەسیما ونەبۆنی ئایینی هەر لێ نایات ،ئەگەر هەش بو هەر لەسەردەمی ڕژێمی لەناوچو وئێستا خراپتر دەیان دایە دەست مامۆستایەکی ئەوتۆ کەئەسڵەن بڕوای بەئایین وبەخواش

ر-سود وەرگرتن لەئیستگەی ناوخۆییەکان لەو بوارانەی کەسود بەخشن چ لەکاتی بەیانیانداو چ لەبەشەکانی (حصص)ی هەندێ چالاکی ناو قوتابخانەو خوێندنگاکاندا بێت.

ز-چاودێری کردنو دەست نیشان کردنی دیاردە خراپەکان، وسەرپێچیە شەرعیەکانی کەلەنێوان خوێندکارانوئامادەکەرانی بڵاوکراوەکان هەنو ڕودەدەن. هەروەها دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك بۆ ئەو دیاردانە، ڕەنگە دیار ترینیشیان کەپێ ی لەسەر دابگیرێتو جەختی لەسەر بکرێتەوە: (بەپێچەوانە واتە بەخراپ بەکار هێنانی تەلەفۆنەکان، پەیوەندیە نائاساییو شازو ڕیز پەڕەکان ونەفامیەکان، لەخۆ بایی بونو بەخۆ نازین، وئاسانکاری وشلی نواندنوکەمتەرخەمی لەپۆشاکی شەرعی دا).

س-هاندانو هەڵنانی خوێندکارانومامۆستایان بۆ هاوبەشی کردنی ساڵانە لەگۆڤارە ئیسلامیەکان دا وەك: گۆڤاری (الدعوة) گۆڤاری (الأسرة) وگۆڤاری(الشقائق)([1]).

ش- بەرپاکردن وکردنەوەی پیشانگای کتێب وکاسێتی ئیسلامی بەشێوەیەکی ساڵانە.

ص- کردنەوەو پاشە کەوت کردنی (جانتایەکی چاوەڕوانی یاپاشە کەوت کردن ـ حقیبة الإنتظار أو التوفیر) لەقوتابخانەو خوێندنگاکاندا بۆ ئەوەی مامۆستایانی ئافرەت سود لەبەشەکانی پاشە کەوتی وەربگرێت. ئەم جانتایە نامیلکەی چیرۆکی وکتێبی پێشبڕکێی بەژمارەی قوتابی و خوێندکاران تێدان. مامۆستا داوا لەقوتابیانو خوێندکاران دەکات کە ئەو نامیلکەو کتێبانە بخوێننەوە یاخود پێشبڕکێ لەنێوان قوتابیاندا ئامادەو سازدەکات، ناوە ناوەش ئەو نامیلکەو کتێبانە یان بۆ دەگۆڕێت.

---

نەبو پەنا بەخوا یا دەیان دایە مامۆستایەکی ئافرەتی سفور کەهیچ لەئایین هەر نازانێت ، دەی ئەگەر لەئایین وحوکمەکانی شەریعەتی خوا شارەزا بایە جاریێ لەپێش هەمو شتێك خۆی ڕوت وسفورو شەڵڵی دڕو دەرمان نەدەکرد. ئەی کەواتە ئەم جۆرە چالاکیە ئایینیانە چۆن دەبن ؟!!!(وەرگێڕ).

(١ ) لەکوردستانی خۆشماندا دەتوانریێ هاوبەشی لەگۆڤاری (ڕێگای ڕاست) وگۆڤارە ئیسلامیەکانی تری کە ئێستا لەکوردستان دەردەچن بکرێت کەبەڕاستی بەپێ ی قورئان وسوننەت وبەتێگەیشتنی سەلەفی صالح دەردەچن بکرێت. ئەمە وێڕای ئەو گۆڤارانەی کەلەسەرەوە نوسەر ئامـاژەی پێ کردون.(وەرگێڕ.

ض- دانانی ڕێبەرێکی کردەکی( پراکتیکی ـ عملي)نوسراوە کەهەندێ لەو چالاکیانەی تێدا تۆمار دەکرێن کەدەکرێ بەشە بەسودەکانی پێ پڕ بکرێتەوە، یا هەماهەنگی کردنو گونجاندن لەگەڵ هەندێ لەبانگەشەکارو بانگەوازکارانی ئافرەت کەلەمیانەی ئەو بەشە پێشبڕکێ یەدا کەلە قوتابخانەکەدا ئامادە دەبن.

ط- پۆشتە کردنی چورەکانی مامۆستایان بەهەندێ لەگۆڤاری ئیسلامی گونجاو وەك: گۆڤاری (الأسرة، الشقائق، الدعوة) سەرباری هەندێ نامیلکەی لەبارو گونجاو وبەسود.

## ٢ـ فرمان کردن بەچاکەوقەدەغە کردن لەخراپە :

فرمان کردن بەچاکە وقەدەغەکردن لەخراپە ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لەڕێنومایی کردن وئاراستە کردنی ئافرەت ودژایەتی کردنی خراپەکان کەپەیوەستن پێ یەوە ، کەدەکرێ لەم خاڵانەی خوارەوەدا بیان گوشین:

١. ئاراستە کردن وڕێنومایی کردنی ئافرەتی موسڵمان بەو شتانەی کەسود بەخشن لەکاروباری ئاینیەکەیداو بۆ بەرچاو ڕۆشنی وهۆشیاری کەلەژیانی دا ولەکاروبارەکانی خێزانی کۆمەڵایەتی دا سود بەخشن بۆی.

٢. ڕونکردنەوەو شی کردنەوەی مەترسیەکانی سەفەر کردنوگەشتو گوزار کردن بۆ دەرەوەوئەو

هەمو خراپەکاریو گوناحو بێ شەرعیانەی کەلێ دەکەونەوە.

٣. هاندانی سەرپەرشتیاران کەنەهێڵن ژنەکانیانو کچەکانیان بەبێ مەحرەم سەفەر بکەن.

٤. ڕونکردنەوەی مەترسیەکانی هەندێ لەهۆکارەکانی کەناڵە ئاسمانیەکان(الدش)ن ڤیدیۆو تەلەفزیۆنوگۆڤارو ڕۆژنامەخراپەکان.

٥. ڕاگەیاندنو ڕونکردنەوەی ئەو گوناحوزیان وخراپانەی لەو شوێنانەدا ڕو دەدەن کەئافرەتانی تێدا کۆدەبنەوە وەك(قوتابخانەکان، بازاڕەکان، باخچە گشتی یەکان، شوێنەکانی تێدا ڕابواردن (الملاهي)وسەیرانگاکان.

٦. ڕاگەیاندن وڕونکردنەوەی ئەوەی کەلەخەستەخانەکان ونەخۆشخانەکاندا ڕو دەدەن لەو هەمو سەرپێچی وبێ فەرمانیانەی خوای گەورە.

## ٣ـ قوتابخانەکان وخانەکانی لەبەر کردنی قورئان بۆ ژنان:

زۆرێك لەقوتابخانەکان وخانەکانی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز لەناوچە جۆربەجۆرەکانی ئەم ولاتە پیرۆزەو ولاتانی تری ئیسلامی دا بلاو بونەتەوەو گەلێك لەئافرەتان بەهەمو تەمەنە جیاجیاکان وئاستە زانستی وڕۆشنبیریەکان ڕوی تێ دەکەن وبەشداری تێدا دەکەن، دەکرێ ئێمە لێرەدا هەندێ لەبوارەکانی بانگەشەکردن وپالّ پشتی کردن لەمیانەی ئەم چەند خالآنەی خوارەوەدا بخەینەڕو:

١. هاندانی ئەهلی خێرو چاکەکاران بۆ پالّپشتی کردنی بازنەکانی(حلقات) لەبەر کردنی ژنان وکارکردن بۆ کۆکردنەوەو فەراهەم هێنانی مالّێك (أوقاف ـ Fund) بۆ پالّپشتی کردنی ئەوبازنانەی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆزوسوننەت.

٢. هاوبەشی کردن وهاریکاری کردن لەئەنجومەنەکانی سەرپەرشتیاری لەسەر ئەو قوتابخانانە، یاهاریکاری کردن لەکارگێڕی وبەڕێوەبردنی دا، یاخود سەرپەرشتیاری کردنی هەندێ لەو بازنانەی لەبەر کردن.

٣. ئامادە کردنی پەیڕەو پرۆگرامێك بۆ خولەکانی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز ودانانی بەرنامەو پلانەکانی بەڕێوەچونی ئەو بازنانە.

٤. بەرپا کردنی کەنالّەکانی پەیوەندیو هەماهەنگی کردن لەنێوان ئەو قوتابخانانە لەگەڕەك دا یالەشارو ئاواییو شارۆچکەکان دا.

٥. هاوبەشی قوتابیانوخوێندکارانی زاستی کچ لەهەمو گەڕەکێك لەمحازەرەکاندا لەگەلّ سود

وەرگرتن لەهەندێ لەئارستەکەرو ڕێنومایی کەرانی سود بەخش وگونجاوەکان لەسەرۆکایەتی دا.

٦. فەرمان کردن وداوا لەمالّەوەو لەخوشکان بۆ ئامادە بون لەوانەو محازەرە گوتنەوەو هاوبەشی وبەشداری کردن لەقوتابخانەکانی لەبەر کردنی قورئان.

٧. خولـەکانی بانگەشـە کـردن بـۆ دەرچـون وئامـادە کردنوڕاهێنـانی بانگەشـەکارانو بانگەوازکارانی قورئان.

٨. ئامادە کردنو گەلاڵە کردنی خولەکانی چالاك کردنو ڕاهێنان وئامادە کردنی شەرعیو پەروەردەیی بۆ مامۆستایان وکارگێڕان وکارگەرانی ئافرەت بۆ ئەوقوتابخانانە.

**٤ ـ وەبەرهێنانی هۆکارەکانی ڕاگەیاندنی خوێندراوەو بیستراو( المقروءة والمسموعة ):**

باشتریت بی سود تـرین هۆکارەکـانی ڕاگەیانـدنی خوێنـدراوە کەبخرێنـە ڕو وکـار پـێ بکرێن چاك وایە بەگوێرەی ئەم خالآنەی خوارەوە بێت:

- خـستنەڕوی کێـشەسەرەکیەکانی وەك کێـشەی هاوسـەریەتی وکۆمەڵایەتیـەکان کەدەبنەهۆی ڕیشە کەنی کێشەلقیەکانی تر.
- ڕیشە کردنو بن بڕکردنی هەندێ لەکێشەکان کەشەریعەتی ئیسلام بڕیونیەوە وەك کێشەی دەرچونی ئافرەت وکارکردنی لەدەرەوەی ماڵ دا.
- گومانی تێدا نیە کەدەبێ ئەو خستنە ڕوانە بەردەوامو ڕیشەداکوتاو بـن هـیچ کـار دانەوەیکیان نەبێت.
- بـەرز کردنـەوەی دەرئەنجامـەکانی بزوتنـەوەکانی ئـازادکردنی ئـافرەت لەوڵاتـە ئیـسلامیەکانو عەرەبیـەکان داو هـەروەها خـستنەڕوی شـوێنەوارو کاریگەریـە خراپەکانیان.
- جیاکردنـــەوەی نێـــوان حوکمـــە شـــەرعیەکان و خـــو ورەوشـــت وعادەتـــە کۆمەڵایەتیەکان.
- بەرز کردنەوە وباس کردنی ڕۆڵی باشـی ئافرەتـانی چـاکەکار لـەکاتی دامەزرانـدنی ئـەم وڵاتانـە لـەکاتی دامەزراندنیانولەهـەمان کـاتو لـەدوای دامەزراندنیانـدا وەك هەڵوێـستی خێزانـی پێـشەوا محمـد کـوڕی سـعود کـەهانی مێردەکـەی دەدا بـۆ پشتگیری کردنوهاریکاری کردنی پێشەوا محمدی کوڕی عبدالوهاب ڕەحمەتی خوا لەهەموان لێ بێت.

## ٥ ـ دام ودەزگاو دامەزراوە تەندروستییەکانی حکومی وئەهلی:

ئافرەتـان ڕۆڵێکـی تایبـەتی وگـەورەیان هەیـە لەهـەمو دام ودەزگـاو دامـەزراوە تەندروستیەکاندا. هـەروەها دو سـازدانی ژینگەیـەکی گونجـاو ولـەبار بـۆ ئافرەتـان هەیـە ئەوەیـە کەکۆمـەڵگای موسـڵمانی خۆپـارێز دەی ڕوانێتـیّ. بـەڵام گـرنگترین بوارەکـانی کارکردنی بانگەشەیی لەدەست دابو وئـەوەی لـەتوانادا بێـت دەکـرێ لـەم چـەند خاڵانـەی خوارەوەدا کورتیان هەڵێنین:

- ❖ کار کردن بۆ هێنانە دی نوسینگەکانی ئاراسـتە کردن‌و ڕێنومـاییو بانگـەوازی کـردن لەنەخۆشـخانە گەورەکانـدا بـۆ ئـەوەی خزمـەتی نـەخۆش ومیوانـان، ومرافقـی نەخۆشـەکان بکـەن، وەدەکـرێ لـەم بـوارەدا سـود لەنوسـینەکانی ڕاژە کۆمەڵایەتیـەکان(الخدمـة الإجتماعیـة) کەئێـستا هـەن لەهەنـدێ لەنەخۆشـخانەکاندا وەربگیرێت.
- ❖ پۆشـتە کردنـی نەخۆشـخانەکان‌و مەڵبەنـدەکانی تەندروسـتی بەنامیلکـەو وبڵاوکـراوە هەڵواسراو ولکێنراوەکان(الملـصقات) ی بەسـود لەگـەڵ کـار کـردن بـۆ هێنـان‌و پەیـدا کردنی کۆمەڵێك کتێبی زانستیو ژێدەر(المـصادر) ی گرنگـو بەسـود بـۆ کتێبخانـەی نەخۆشخانە بەهەماهەنگی لەگەڵ لایەنەپەیوەدیدارەکان.
- ❖ بەدواد چونی بەردەوامی هەمو ئەو شتانەی کەلە هۆکارەکانی ڕاگەیاندنەوە دەردەچن کـە پەیوەنـدن بەنەخۆشـخانەکان‌و نوسـین لەسـەر ئـەو بـڵاو کراوانـەوەو بـەر پـەرچ دانەوەیان.

## ٦ـ کاری بانگەشەو بانگەوازی ئافرەت لەماڵەوە:

ماڵ بریتیە لە گۆڕەپان‌و کاریگەرترین‌وگەورە ترین هۆکارێك کەکاریگـەری تـەواوی هەبێت لەسەر پـەروەردە کردن‌و ئامـادە کردنـی مرۆڤـ بـەنێرو بـەمێوە، گومـانی تێدا نیـە کـەخوای گـەورە هـەر یـەکێ لـەژن و مێـردی کـردوە بەشـوان‌و سەرپـەرشـتیار لەماڵەکـەی خۆیانـدا، و دواڕۆژیـش خـوای گـەورە دەربـارەی مـاڵ و منداڵ‌وخێزانەکـەی لێ یـان دەپێچێتەوە، فرمانی پێ کردون ماڵو منداڵو خێزانەکەی خۆیان لەئاگری دۆزەخ بپارێزن، هەر کـەم وکوڕیـەك ڕوبـدات لەئـەهلی بەرپرسـانی بانگەشـە کـردن لەمیانـەی هۆکارەکـانی

ترەوە دەبێتە هۆی قورستر کردن وپتر کردنی بەرپرسیاریەتی دایك وباوك، دەبێ ئەمەژی بزانین کەدایك پشکی گەورەوکاریگەری گەورە ترو پتری لەو بەرپرسیەتیە بەر دەکەوێت، هەروەها ئەو ئەرك‌و بەرپرسیاریەتیانەی کەپیاو تیایدا بەشدارە گەلێك زۆرن کەگرنگەکانیان ئەمانەن (بەرپرسیەتی وئەرکی پەروەردە کردنی بروایی ·(الإيمانية)، زانستی،ئەخلاقی، پاراستن لەشی (الجسمية)، دەرونی (النفسية)، کۆمەلآیەتی، ڕەگەزی(الجنسية)، فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردن لەخراپە، بانگ کردن بۆ لای خوای گەورە.

ماڵ لەباقی هۆکارەکانی تر بەکۆکردنەوەو لەباوەش گرتنی ئەندامانی خێزان بۆ چەندان دەم ژمێری دورو درێژ و بۆ ماوەی زۆر دورو درێژ جیادەکرێتەوە، گونجاندن وکۆك بونی دەرونی‌و کۆمەلآیەتی لەنێوانیادا.

کەبەم هۆیەوە دەتوانرێت پێشەنگی چاکخواز بخرێتەڕو، وەگونجاندن‌و لەیەك نزیك بونەوەی دەرونی‌و کۆمەلآیەتی لەنێوانیاندا، بخرێتەڕو وبناسێنرێت‌و لەگەڵ کاریگەری بونی لەمیانەی ئاراستەو ڕێنومایی پەخشەری ڕاستەخۆوە، هەروەها تێبینی وچاودێری بەردەوام ونەبڕاوە،وسود وەرگرتن لەهەمو هەل‌و مەرج وحاڵەتەکان، وکاریگەریەتی پاداشت(ئاڕاستە کردن - ( التوجيه) وسزادان دور لەخەڵکی واتە لەبەر چاوی خەڵك سزا نەدرێت([1]).

## ٧- لەکۆمەڵگادا :

ئەمەش لەمیانەی چاکە کردن لەگەڵ خزمان‌و دراوسێکان ولەگەڵ هەژاران‌و دەستکورتاندا هەروەها بانگ کردنیان بۆلای بەرنامەکەی خواو ڕێنومایی کردن دەستگیرۆییان. بێ گومانە کەئەم کارانە دەبنە هۆی لەیەك نزیك بونەوەو بەیەکەوە گرێدان‌و یەکتری خۆش ویستنی ئەندامانی ئوممەت‌وکۆمەڵگە وەك ئەوەی کەیەك لەش بن. هەروەها داڕشتنی چەندان پرۆژەی بانگەوازی‌و بانگەشەیی وەك:

- ناوەندی ڕاوێژکاری خێزانی.

---

([1]) أ - لەڕابردودا بەدرێژی باسی ئەمان کردوە.

ب - واتەلەپێش چاوی خەڵکان سزا نەدرێت.(وەرگێڕ).

ـــ ناوەنـدێکی چـاك کـردن وپێـك هێنـانی پەیوەندیـەکانی نێـوان ئەنـدامانی یـەك خێزان‌وهەروەها نێوان ئەندامانی کۆمەڵگە(١).

ـ سەرپەرشتی‌و چاودێری کردنی خێزانی بەند کراو وگیراوەکان.

**٨ ـ کاری بانگەوازی لەمزگەوت دا:**

دروسـتە بـۆ ئافرەتـان کەلەمزگەوتـدا بـۆ ئـەم کـارە ئامـادە بـن بـەڵام بەمۆڵـەتی سەرپەرشـتیارەکانیان لـەو کاتـەدا نـابێ ئـەو سەرپەرشـتیارە قەدەغـەی بکـات ومۆڵـەتی نەداتێ کاتێ داوای مۆڵەتی لێ دەکات بۆ ئەوەی سود لەو وانەو بابەت و وتارانە وەربگرێـت کەلەمزگەوت داو لەلایەن ئافرەتێکی پێشەنگی چاکو باشەوە پێـشکەش دەکـرێن، چـونکە مزگەوت هەمیشە کەسـان‌و دەسـتەیەکی باش‌وپوختەوپاڵاوتـەو نمونـەیی لێ کـۆ دەبنـەوە، جێگایەکی گونجاویشە بۆ چالاکیە ئایینیـە بەسـودەکانی ژنـان لەبازنـەکانی لەبـەر کردنـی قورئان‌و فێرکردنی زانستە شەرعیەکان‌وگەلێ زانستی تری بەسـود. لـەو چـالاکیە پێـشنیار کراوانەش ئەمانەی خوارەوەن:

- بەرپا کردنی محازەراتی تایبەت بەژنان لەمزگەوتدا کەهـەلێکی بـاش برەخـسێنێت بـۆ کۆبونەوەو ئامادە بونی زۆر ترین‌و گەورەترین ژمارە لەژنان.
- میوانداری کردنی ئافرەتانی بانگەشەکار کەلەنوێژگاکانی ژناندا وتە یا وتار پێـشکەش بکەن دوای نوێژی تەراویح لەرەمەزاناندا.
- چالاك کردنی خانەی وتار بێژان لەو وتەو وتار خوێندنەوە لەنێوان هەفتەو هەفتەیەکی تر یان لەرۆژانی هەینی دا دەربارەی ئەو کارو بارانەی کەتایبەتن بە ئافرەت وخێـزان‌و پەروەردەو..تد.
- دامەزراندنی پێشبڕکێ خێزانیەکان لەرەمەزان‌و لەهاوین‌و لەبۆنەکاندا.
- چالاك کردنی خانەپەروەردەیی‌و بانگەشەییەکان لەمزگەوتدا.

---

(١ ) واتە: ئاشت کردنەوەی خەڵك وچاك کردنەوەی نێوانیان لەکاتێك دا لەیەکتری تورەو عاجز بون.(وەرگێڕ).

## ٩ـ کارکردنی بانگەوازی لەناو کۆمەڵەو ڕێکخراوەکانی ژناندا :

هەندێ هەوڵوکۆششی بەهێزو بەپێزو بەرەکەت هەیە کەلەلایەن ئەو کۆمەڵەو ڕێکخراوانە لەگەڵ هەندێ لەخێزانە هەژارو دەست کورتەکان، وخێزانی گیراو وبەندیەکاندا ئەنجام دەدرێن، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا سنور دارن و وەك پێویست نین ئەگەر پێوانە بکرێن لەگەڵ ئەو هەمو توانا ماددیو مرۆییەی کەلەبەر دەستیاندایە، بۆیە پێویستە ئەم جۆرە کۆمەڵەو ڕێکخراوانە چالاك تر بکرێن لەم بوارانەی کەباس کران و لەگەڵ بواری تریشدا کەئاماژە پێ نەکران.

## ١٠ ـ کارکردنی بانگەوازی وبانگەشە کردن لەهەڵمەتەکانی حەج دا :

داڕشتن وبەرپا کردنی بەرنامەو پەیڕەو پرۆگرامە بانگەوازیو بانگەشەییەکان لەکاتی هەڵمەتەکانی حەج کردندا ـ لەبەشی ژناندا دەتوانین ئەو چالاکیو بەرنامانەپێشنیار بکرێن کەلەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گردیان بکەینەوە:

١. ماندانی بانگەشە کارانی سەرکەوتوی ئافرەت بۆ هاوبەشی کردن لەو هەڵمەتانەدا بۆ ڕون کردنەوەی ئەحکامە شەرعیەکانی حەج کردن وڕێنومایی وئاراستە کردنی ئافرەتان بەوەی کەسودیان لێ وەردەگرن واتە بەو حوکم وزانیاریانەی کەلەو سەفەرەی حەجەدا سودی لێ وەردەگرن.

٢. ئامادە کردنی بەرنامە بانگەشە جۆربەجۆرو جیاجیاکان کەڕێنومایی وئاراستەی ئافرەتان بکات وەك پێشبڕکێکانی کەلەگەڵ ئافرەتاندا بگونجێت، واتە پێشکەش کردن، کاسێتەکان، نامیلکەکان، ونوسراوە پێچراوەییەکان (مطویات) وئەوجار دابەش کردن بەسەر خاوەنی هەڵمەت و حەملەدارەکانو کاروانەکانی حەجوحاجیەکان بەگشتیو ماندانیان کەدابەشیان بکەنو ئەم ئەرکە پیرۆزە پڕپاداشتە لەلای خوای گەورەو جێ بەجێ ی بکەن.

## هەڵوێستەی شەشەم : بابەتەکانی بانگەشەو پەروەردەیی

شتێکی بەڵگە نەویستو بێ گومانە کەئایین بەهەمو ڕوەکانیەوە بابەتێکی تەواو وتێرو تەسەلەکەبانگەشەی بۆ دەکرێت وقسەی لەسەر دەکرێت. بەڵام ئێمە لێرەدا پەنجە بۆ کۆمەڵە بابەتێکی تایبەت بەئافرەتانی بانگەشەکار ڕادەکێشین بۆ ئەوەی دەرگاکانی

لەبەر دەمەدا بکرێنەوەو بتوانێت بەئاسانیو بێ گرفت بچێتە ناو بەرنامەکانوهاوبەشیوهاوکاری بکات لەبانگەوازو بانگەشە کردنی چالاکانە. دەکرێ ئەم کۆمەڵە بابەتە تایبەتیانە بۆ ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە دابەش بکەین:

**بەشی یەکەم: بابەتەکانی دروست کردنو دامەزراندن. ئەم بەشەش ئەمانەی خوارەوە دەگرێتەوە:**

* بابەتەکانی بیرو باوەڕ(العقیدة) کەبریتین لە:

- پایەکانی باوەڕ (الإیمان) و ئەو لقانەی کەپەیوەندن بەئیمانو عەقیدەوە لەبابەتو لە توێژینەوەکانو کێشەو سەرباسەکان.
- تێڕوانینو تێڕامانولێ ورد بونەوەی موسڵمان لەبونەوەرولەژیانو لەمرۆڤ .
- هەڵوەشێنەوەرەکانی بڕوا( الإیمان) ویەکتاپەرستی (التوحید) وەك هاوبەشی پەیدا کردن بۆ خوای گەورەو دوڕوییو گاڵتە کردنوسوکایەتی کردن بەدروشمە ئایینەکانو جادو وجادو گەری وگەلێ شتی تری لەم جۆرانە.
- پێداویستیو داخوازیەکانی باوەڕ(الإیمان)ویەکخوا پەرستی الله (التوحید) وەك خۆشەویستیو داوا لێ کردن (الرجاء)وترس واتە لێ ترسانو ئارام گرتن (الصبر)و نیاز پاکیو دڵسۆزیو خۆش ویستنو ڕق لێ بونەوەو ئەستۆپاکی (الولاء والبراء) و گەلێ بابەتی تری لەم جۆرانە.

* بابەتەکانی پەرستشی (العبادة): وەك پاكو خاوێنیو دەست نوێژ شوشتنو ئەو لقانەی کەپەیوەندن پێیەوە، نوێژ کردنو بابەتە پەیوەندیدارەکانی، زەکاتوڕۆژو، حەجوعەمرە کردن، نوێژە سوننەتەکانی ڕاتبەکانو ویترو باقی سوننەتە خۆبەخشیەکانی تر( التطوع) لەباقی بەندایەتیوپەرستشی یەکانی تردا، هەروەها حوکمەکانی پاك بونە لەبێ نوێژی (الحیض) وپاك بونەوەوخاوێنی ئەوانەی کەپەیوەندن بەم بابەتەوە.

* بابەتەکانی خێزانی (الأسرة): ئەو بابەتانەی کەپەیوەستن بەم بوارەوە: کۆڵکەو بنەماکانی پێك هاتنی خێزانێکی باشوڕێكو پێكو بنەماڵە، مافەکانی دایك، باوك. منداڵەکان، مێرد، ژن (خێزان - الزوجة)، خزمەتکاران، بنەماو کۆڵکەکانی لێ دروست

کردن‌و پێك هێنانی خێزان، هەڵس‌و کەوت‌و ڕەفتارو ڕێز گرتن وخۆش ویستنی یەکتری لەنێوان ژن‌و مێرد دا.

* بابەتەکانی ئاکارو ڕەوشت: بابەتەکانی ئاکارو ڕەوشت بریتین لە:ڕەفتاری چاك ، ڕەوشتی جوان، بەزەیی وڕێزو حورمەت گرتن، ڕاستگۆیی، وەفاداری، ڕوخۆشی ولێو بەبزەیی‌و بەخەندەیی، ڕەوشت وئاکارەکانی ناو ماڵ، ئاکارەکانی قسە کردن و لەگەڵ یەکتری دانیشتن وئا خاوتن، ڕەوشتەکانی خواردن وخواردنەوەو ویردەکانی، ڕەوشت‌و ئاکارەکانی نوستن‌و ویردەکانی([1])، هەروەها دان‌و جێ بەجێ کردنی مافەکانی موسڵمانێتی، مافەکانی دراوسێتی، مافەکانی ناموسڵمانەکان (غیر المسلمین)، مافەکانی ڕێگاو بان.

* بابەتەکانی بەرنامەوپرۆگرامیە بانگەشەییەکان: لەوانە حوکمی بانگەشە کردن‌وئەرکەکانی وهۆکارەکان وشێوازەکان‌و بایەخەکانی، ڕواڵەتەکانی بانگەشەی تەندروستی، ڕوڵەتەکانی بانگەشەی ناتەندروستی، زانست‌و بەرنامە ڕاست‌و دروستەکانی فێرخوازانی زانست (طالبات العلم)، لەنەخۆشی یەکانی بانگەشەکارانی ئافرەت، کۆڵکەو بنەما نەگۆڕەکانی بانگەشەکارانی ئافرەت.

## بەشی دوەم: بابەتە تایبەتیەکانی ئافرەت:

وەکو: ئامادە بون بۆ نوێژەکان ومحازەرەکان، ژنان وئاهەنگەکانی ژنان، ژن‌و شوێنەکانی بەسەر بردن(المرأة والملهيات)، ژن‌و بازاڕەکان، پۆشاك، ژن‌و وەرزش، پەروەردەی ئافرەت بۆمنداڵەکان، فیلم‌و تەلەکەو داوی دوژمنانی ئیسلام سەبارەت بەژنان، ئافرەت لەڕۆژئاواو لەڕۆژهەڵات، ڕۆڵی چاکسازی ئافرەت، حوکم‌وڕەفتارەکانی لەو کاری چاکسازیەدا، بەشداری کردن‌وهاریکاری کردنی ئافرەت لە کۆڕەپانەکانی ڕۆشنبیری دا، ئافرەت‌و دروست کردنی نەفسی خۆی بەشێوەیەکی شەرعیانەو زانستیانەو بانگەشی

---

(١) واتە: خوێندنی ویردو زیکرەکانی کاتی نوستن وخواردن وخواردنەوەولەماڵ دەرچون وچونەوە ماڵەوەو چونە سەر ئاو و هاتنە دەرەوە وچونە بازاڕو گشت ویردەکانی تری ڕۆژانەی ژیانی مرۆڤ بەبەردەوامی.(وەرگێڕ).

کارانە، کۆڵەکەو بنەماکانی پێ دامەزراوی ئافرەت وبەردەوامی وخۆڕاگری لەسەر ئایین وبەرنامەکەی خواو گەلێ بواری تر.

## بەشی سێیەم: بابەتەکانی بیرو بۆچون وچەمکە هەڵەکان

وەك: کەم تێرامانو کەم بیر کردنەوەو لێ ورد نەبونەوەی ئیسلامیانەو پشتگوێ خستنیانوهەوڵ نەدانو نەخوێندنەوەو خۆ خەریك نەکردن بۆ پتر شارەزا بون لەحوکمەکانی دینەکەیان، نەزانی و نەشارەزایی ئافرەتی موسڵمان بەحوکمەکانی ئایینەکەی، لاوازیو پابەند نەبون بەحوکمەکانی ئایین دوری لەدینو کۆشش نەکردن بۆشارەزا بونو دۆزینەوەی کۆڵکەو بنەماکانی ئەو بێ هێزیولاوازیەو چارەسەریەکانی، بێ ئاگایی لەشەیتانو تەڵەو فڕو فێڵەکانی، تێ نەگەیشتن لەچەمکە هەڵەکانو لەبێ شەرعی چونە دەرەوەو دەرچونی ئافرەت لەماڵ، هەروەها لەگشت کارەکانی دا، داگیر کردن وزەوت کردنی فیکریوئەخلاقی لەلایەن دوژمنانوئەڵقە لەگوێ کانیان لەدوڕوانولادەرانوخوانەناسان ، هێرشی دڕندانە کردنە سەر ئافرەتی موسڵمان خراپ کردنو بێ باوەڕ کردنیان .

## بەشی چوارەم: بابەتە زانستیە پسپۆڕیەکان ( تایبەتمەندیەکان ـ التخصصية ):

ئەم بەشە تایبەتە بەخوێندکاران وفێرخوازانی بەشی زانست وەك: بەرنامەی تایبەتی بەتەفسیر، یاخود خولی تایبەت کە تیایدا زانستەکانی قورئان یا فەرمودە وزانستەکانی دەخوێندرێت، یاخود لەفیقهدا یالەعەقیدەو دژو هەڵوەشێنەرەوەکانی دا، یاخود لەبنەڕەتی (في أصول) ئەم زانستانەدا، هەروەها لەژیاننامەوسەرگوزشتەوسونەت(السيرة)، یالە بابەتەکانی نەحو ووێژەو ومێژو دا، یالە ڕۆشنبیری گشتی دا.

وەلە کۆتایی دا دەڵێم: ئەوەی لەسەر شانی ئافرەتی بانگەشەکاری لێبڕاو ودڵسۆز ئەوەیە کەپێویستە لەسەری بەرنامەو پرۆگرامێك هەڵ ببژێرێت لەگەڵ ئەم بابەتانەو باقی بابەتەکانی تردا بێتەوەو گونجاو ولەبار بێت، هەروەها گونجاو بێت لەگەڵ ئەو کەسانەی کەبانگیان دەکات ولەگەڵیاندا دەدوێت وڕێنوماییان دەکات بۆ لای خوای گەورە. ئەمە تەنیا بریتین لە چەند نمونەیەك دەنا بابەتەکە گەلێك لەمە فراوان ترو گەورە ترە.

**هەڵوێستەی حەوتەم: هۆکارە دیاری کراوەکان و یارمەتی دەرەکان بۆ ئەنجامدان وڕا پەڕاندنی بەرپرسیارێتی وئەرکەکانی سەرشان:**

لەکۆتایی دا لەم توێژینەوە کزۆڵەی خۆماندا خێراو بەسەرپێ یی ڕستەیەك لەو هۆکارانە دەخەینە ڕو کەهانی ئافرەتی موسڵمان دەدەن بۆ هەستان وڕاپەڕاندنی ئەرکی سەرشانی خۆی وهەست کردن بەبەرپرسیاریەتی لەڕوی شەرعی وشیاو وگونجاو بەئافرەت کەبریتین لەمانەی خوارەوە:

١. **نیازپاکی کارکردن( إخلاص العمل)** بۆ پاك وبێگەردوبەرزوبێ هاوتاوهەمیشە نوژەن کردنەوەی ئەو نیاز پاکیە، لەخوا پاڕانەوەو دوعا کردنوداوا کردن لەخوای بێگەرد پاكو تاكوتەنیا کەڕاگری وپێ دامەزراویت پێ ببەخشێت، کەپێ دامەزراوی وبەردەوامی سەری هەمو کارێکی سەرکەوتووەو پێشەنگی هەمو سەرکەوتنێکە، وسەرچاوەی ڕاستەقینەی کارەکانە، وبنەماو بناغەی وەرگرتنەوەی پاداشتە لای خوای باڵا دەستو کاربەجێ، کەلەڕابردودا شتێکمان لێ خستە ڕو.

دوعاونزاو پاڕانەوەی بەردەوام لەبەردەم خوای پاك وبێگەرد کەئەو ئافرەتە سەرکەوت وسەر بەرزو سەرفراز بکات لەسەر ئەو ڕێگەیەی کەگرتویەتیە بەرو بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵ بستێت بەبەرامبەر نەفسی لەناومالو لەناو کۆمەڵگاکەیو لەبەرامبەر ئوممەتەکەی دا، و وریا بن ئەم دوعایەتان هەرگیز لەبیر نەچێتولێ ی بێ ئاگا نەبنو بەڵکو دەبێ بەردەوام مکوڕو بن لەسەری، چونکە هەردوعایەك بەندە لەپەروەردگاری بەرزو بێ

هاوتای بکات قبول دەبێت‌وخوای گەورە سەرت دەخات‌وهیچ دوعایەك ڕەت ناکاتەوە. بەڵگەو دەقەکانیش لەم بەشەدا ئەوەندە زۆرن کەناتوانرێت بهێنرێنەوەوبخرێنە ژێر دەست([1]).

٢. **دانانی بەرنامەیەکی پەرستشی ڕاستەوخۆ** کەپەیوەندیەکانی مرۆڤ لەگەڵ خوای گەورەو پاكو بێگەرد بەهێز دەکات. وەك ئەوەی کەبڕێکی باش‌و زۆر لەنوێژە سوننەت‌و ڕێگەپێدراوەکان (المستحبات) بکات‌و وەك بەرنامەیەك بۆ خۆی دابنێت([2]). هەروەها ڕۆژو حەج کردن‌و بەخشینی ماڵ([3])، قورئان خوێندن‌و ویردەکان، چاکە

---

([1]) بڕوانە کتێبی (الترغیب في الدعاء) لەنوسینی حافظ عبدالغني المقدسي لەتوێژینەوەی خۆم، کەبڕێکی باشی لەدوعاکان تێدان کەخوای گەورە ویستی لەسەر بێت.

(٢) واتە: دانانی بەرنامەیەکی ڕێك وپێك لەئەوەندە ژیانەی کەماوتە لەنوێژەکانی سوننەتی ڕۆژانەو شەوانە.لەڕۆژدا سوننەتە ڕاتبەکان پێش وپاش نوێژە فەرزەکان کە(١٢) دوانزە ڕکاتن دو ڕکات پێش نوێژی بەیانیان ، چوار ڕکات پێش نوێژی نیوەڕۆو دو ڕکات دوای نوێژی نیوەڕۆ و دوڕکات پێش نوێژی عەسرو دوای عەسریش هیچ سوننەت نیە، دو ڕکات دوای نوێژی شێوان(المغرب) ودو ڕکات پێش نوێژی خەوتنان ودوڕکاتیش لەدواوەی. هەروەها سوننەتەکانی چێشتەنگاو کەلە دوای ڕۆژ هەڵاتن بەقەد ڕم هاوێژێکەوە دەست پێ دەکات تا ڕۆژ دەگاتە ناوەڕاستی ئاسمان وخەریکە نوێژی نیوەڕۆ دەبێت. وە دو ڕکات سوننەتی دەست نوێژ هەڵ گرتن و دو ڕکات سوننەتی سەلام کردنی مزگەوت (تحية المسجد) هەرکاتێك چویتە ناو مزگەوتەوە کەئەمە لەڕۆژو لەشەودا هاوبەشە وە سوننەتی دوای نوێژی هەینی و پێش هەینیش سوننەت نیە ئەوەی بکرێ بیدعەیە. سوننەتی گەڕانەوە لەسەفەر و سوننەتی جەژنەکان و سوننەتی باران بارین وپێداویستی(الحاجة) ودو ڕکات سوننەتی(الإستخارة) ودو ڕکات سوننەتی تەوبە هەروەها دو ڕکات سوننەتی خۆشوشوتن( الإستحمام) هەر کاتێك کەخۆت شوشت.

وەسوننەتەکانی شەو نوێژ: هەشت ڕکات شەو نوێژو سێ ڕکات ویتر هەمو شەوێك بەردەوام دەبێ بیان کەیت بۆ ئەوەی پەیوەندیت بەخوای گەورەوە نەپچڕێت.(وەرگێڕ).

(٣) ڕۆژوی سوننەت گرتن بەردەوام شەش ڕۆژوی شەشەکان لەمانگی شەوالدا، هەمو دوشەممەو پێنج شەممەیەك بەردەوام هاوین وزستان چوار وەرزە بەتایبەتیش لەهاویناندا ولەڕۆژە گەرم ودرێژەکاندا

کردن‌و گوێ ڕایەڵی دایك‌و باوك، گەیاندنی سیلەی ڕەحم‌و گەلێکی تر، دیارە ئەمە زادو زەخیرەیەکی گەورەیە کەئافرەتی بانگەشەکاری سەرکەوتولەڕێگەی ژیانی دا هەڵی دەگرێت‌و دەی گرێتە بەر.

٣. هەمیشە سور بێت لەسەر ئەوەی کەکارێکی تایبەت بەخۆی هەبێت کەلەخوای گەورە بەولاوە کەسی تر پێ ی نەزانێت هەتا نزیك ترین کەسەکانیشی وەك مێردو باوك ودایك ومنداڵەکانیشی بۆ ئەوەی لەوپەڕی نیاز پاکی دا بێت بۆ خوای گەورەوساف‌تر‌و بێگەرد تر بێت بۆ دڵی، پتەوترین‌و بەهێزترین پەیوەندی بێت لەگەڵ خوای گەورەدا واتە بەندایەتی کردن‌وچاکەکانی تا بۆی دەکرێت بانهێنی بن ولای خەڵك زۆر باسیان نەکات، چونکە باس کردنیان دەبێتە هۆی کاڵ بونەوەی دەنگ‌و ڕەنگ‌و پاداشتی بەندایەتی‌و کارو چاکەکان.

٤. هەمیشە سور بێت لەسەر گەشە پێدان‌و پاك کردنەوەی نەفسی خۆی، نەك هەر لەئاست‌و سنورێکدا بمێنێتەوەوبڵێ ئیدی بەسەو کارەکەم تەواو، نەخێر دەبێ تالەژیان دا ماوە بەردەوام بێت‌و ئەم دەرگایە گەلێك فراوان‌و والآیە شەیتان زۆر بەئاسانی پیایدا تێپەڕدەبێت‌و کارەکانت لێ پیس دەکات‌ونیازەکەت دەشێوێنێ‌و دڵت دەمرێنێ واتە بەردەوامی‌و پێ دامەزراوی‌و ساردنەبونەوە تامردن.

٥. دانانی بەرنامەیەکی کردەکی(پرۆسەیی ــ عملي)ودابەش کردنی بەسەر کارەکان‌و کاتەکانداو پابەند بون پێ یەوە، ئەگەر بەتەواویش نەتوانێت بیان خاتە ژێر دەستی خۆیەوەوئەنجامیان بدات زاڵ بێت دەبێ هەر بەردەوام بێت‌و کۆڵ نەدات باهەندێکیش

---

پاداشتێکی گەلێك گەورەی هەیە مەگەر هەر خوای گەورە خۆی بزانێت، یا سێ ڕۆژە سپی یەکان(أيام البيض) کەدەکەنە(١٥،١٤،١٣) هەمو مانگێك ،ڕۆژی نۆیەم ودەیەمی وعاشوراو ، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموی ئەگەر ساڵی داهاتو بژیەم ڕۆژی نۆیەمیش دەگرم بەلاّم نەگەیشت، بۆیە دەبێ ئێمە تیایدا بەڕۆژو ببین وفەرمودەی پێغەمبەرەکەمان بێنینە دی هەروەها نۆ ڕۆژی حاجیان (ذی الحجة) بەتایبەتی ڕۆژی نۆیەم کەڕۆژی عەرەفیە.(وەرگێڕ).

ئەنجام بدات لەهیچ باشترەو هەوڵ بدات وردە وردە باشتر ببێت، بەلام ئەوەی هەموی نەزانیٚ یاهەموشی پیٚ ئەنجام نەدرێت ولەتوانای نەبێت نابیٚ سارد ببێتەوەو واز لەکەمەکەش بهێنێت(مالا یدرك کله لایترك جله) کەمیش لەکەمدا یالەناو کەمدا زۆرە وەك ئەوەی کاتێك لەدوای بەیانیان دابنێیت بۆ قورئان خوێندنو ویردەکان، چێشتەنگاویش ئەگەر ئیش دەکات ئەوە بۆ کارەکەی دەبێت بەرپرسیاریەتیو ئەرکەکەی دەخاتە ناو ئەو کاتی کارکردنی چێشتەنگاوان. وەئەگەر ئیشیشی نەدەکردئەوە دەیخاتە گەڵ ئیشەکانی ناومالیو دیارە خوێندنەوەش زاتستێکە لە زانستەکان. دوای نیوەڕۆش بۆ کارو ئیشە سوکەکانی وەك نوسینیو تارو نوسینەکان یاخود بۆ تەلەفۆن کردن و بۆ دایك وباوك یاخود بۆمندالەکانی ئەمانەو دەبیٚ کاتێکیش بۆ پشو دان وئسراحەت کردن دابنێت. دوای عەسریش بۆ پێداچونەوەو ئامادە کردنوبەسەر کردنەوە. دوای شێوانیش : بۆ ڕاپەڕاندنی هەندیٚ لەکارو ئیشەکانی وەك پێشکەش کردنی محازەرەو یاکۆبونەوە لەگەڵ مندالەکانی داو کارکردنی هەندیٚ بەرنامە لەگەڵیاندا یاخود بەدوادا چونی خوێندنو وانەکانیان سەعی پیٚ کردنیان. دوای خەوتنانیش: بەدوادا چونی ئەو ئیشو کارانەی کەماونوئەنجام نەدراونو خۆئامادە کردن بۆ خەوتن...تد.هەمویان بەگوێرەی خۆیو بەپیٚ ی بارودۆخو سروشتی خۆی نەخشەیان بۆ بکێشێت.

٦. دانیشتنو ئامادە بونو کۆبونەوە لەگەڵ ئافرەتانی باشوخواناس بۆ ئەوەی تائەوەی کەلەبیری چوەوە بەبیری بێنیەوەوئەوەشی کەنازانیٚ فێری بکەیت. دەبیٚ تەنیا گویٚ بۆ قسەوڕاوێژە چاك و باشەکانیان بگرێتو ڕاوێژەکانو چیرۆکە بەسودەکات یا زانستە سود بەخشەکانیان لیٚ وەر بگرێتو لەخراپەکان گویٚ ڕایەڵیان نەکاتو لیٚ یان وەرنەگرێت، دیارە هاوڕیٚو هاومەجلسیش کاریگەری تەواوی یان بەسەر یەکتریەوە هەیە.

٧. لەنەفسی خۆ پێچانەوەوسەرکۆنە کردنی نەفسی خۆی هەر کاتە ناکاتێك یا ناوەناوە بەخۆی دا بچێتەوە، چ هەفتانە بێتو چ مانگانەیا خولیانەبێت.

٨. چونە پاڵ خانەی ژنان یا لەگەڵ ئەو ژنانەی کەخاوەن ڕێنومایی وئاراستەی باش‌و بێ فـرۆفێڵن، دەی هاریکـاری‌و کۆمـەکی یـەکتری کـردن هاندەرەوشـەیتان دەرکـەرە، بەیارمـەتی خـوا یارمـەتی دەرە لەسـەر هێنانـە دی‌و بەدەسـت هێنـانی دەرئـەنجام بەرهەمی زۆر ترو باشتر، نابێ هەمیشە کارەکان تاك ڕەوی بن، چونکە بەتەنیا بێـزارو ماندو و شەکەت‌و سەر نەکەوتو دەبیت. بەیارمەتی‌و هاوکاری کردنی خەڵکان دەگەنـە خێرو پیت‌و بەرەکەت بەیارمەتی خوای گەورە.

٩. پێویـستە ئـافرەت هـەمو وزەو توانـاو بـەهرەکانی لـەبواری بانگەشـە کردنـدا بـەکار بهێنێت، چونکە کۆمەڵگا چاوی لەتواناکان وهونەرەکانیەتی، و دەبێتە هۆکارێك‌و پـێ ی دەگاتـە کۆمـەڵگای نزیـك و دور. لـەو کارانـەش: نوسـین بەهـەمو پۆلەکانیـەوە، پێشکەش کردنی محازەرەکان، هەڵسوڕاندنی مێزگردەکان(لێدوانەکان ـ پەیڤینـەکان)، هەڵسوڕاندنی کۆمەڵـە خەیریـەکانی ژنـان، هەڵسوڕاندنی قوتابخانـەکان، ڕێکخـستنی بەرنامەبانگەشەییەکان، ڕێکخستنی چالاکیەکانی ژنان ,.. ,...تد.

## هەڵوێستەی هەشتەم: بەستەرو ڕێكخەرەكانی كاری ئافرەتانی موسڵمان:

بنـەڕەت لـەکار کردنـی ئافرەتـدا شـەرعی ودروسـتە، بەڵگـەش ئەوەیـە کەهەنـدێ لـەئافرەتانی سـەرەتای ئیـسلام کاریـان کـردوەو هـەوڵی ژیانیـان داوە، ڕاسـتە کەدروست‌وشەرعیە بەڵام بەمەرجی چەند ڕاگرو بەستەرو بنەمایەك، ئەگەر ئـەو مەرجانـە هەبون وتیایدا بون ئەو کاتە ئەو کـار کردنـە دروسـتەو دەبێتـە کـارێکی شـەرعی قەدەغـە نەکراو.

پوختەی ئەو مەرج‌و ڕاگرو بنەمایانەش دەکرێ لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا بیان گوشین:

١. هەست کردن بەچاودێری‌وئاگا لێ بونی خوای باڵا دەستو کار بەجێ لەدڵی ئافرەت، بەڵێ دەبێ هەمیشە مرۆڤ بەپیاو وبەژنەوە وا هەست بکات کەخوای گەورە ئاگای لێ یەتی‌و دەزانێ چی لەدڵ دایەو چی دەکاتو چی ناکاتو هەمو شتەکانی بۆ هەژمار(حساب) دەکاتو دوارِۆژ دەیخاتەوە بەردەم خاوەنەکەی.﴿ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝ ﴾ الزلزلة:٧،٨.(١)

٢. پابەند بونی بەپۆشاکی شەرعی فەرز کراو لەسەری بەداپۆشینی دەمو چاویشیەوە، ئێمە لێرەدا نامانەوێ دەلیلەکان لەسەر واجب بونی پۆشاکی شەرعی بهێنینەوە، چونکەلەسەر ئەم بابەتە گەلێك کتێبو چاپکراو نوسراون کەتایبەتن بەپۆشاکی شەرعی، بەڵام تەنیا ئاماژە بەوە دەکەین کەیەکێکە لەمەرجوراگرەکانی دەرچونی ئافرەت بۆ کارکردن، ئەمەتە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَٰبِيبِهِنَّ ۚ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يُعْرَفْنَ فَلَا يُؤْذَيْنَ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ۝ ﴾ الأحزاب:٥٩(٢).

---

(١) واتە: دڵنیا بن کە هەرکەسێك بەقەدەر گەردیلەیەك کاری خێرو چاکە بکات ئەوە لەدوا رِۆژدا دەیبینێتەوەو خوای گەورە هەموی بۆ هەژماردەکات ، هەروەها هەرکەسێك بەقەدەر گەردیلەیەك کارو کردەوەی خراپ بکان هەم د یسان دەیبینێتەوەو لەرِۆژی قیامەتدا دەخرێتەوە بەردەمی وسزاو پاداشتی خۆی وەردەگرێتەوەو خوای گەورە هیچی لێ ون نابێت وئاگای لەدڵەکان هەیە. هەتاکو یەك خەیاڵ ویەك خەتەرە بەدڵی بەندەکانی دابێت ئاگای لێ یەتی.(وەرگێر).

(٢) واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ بەخێزانەکانت وبەکچەکانتو بەژنانی بروادارا‌ن بڵێ کە جلەکانیان بەخۆدا شور بکەنەوە کەبریتیە لەو پۆشاکە کەهەمو لەشی ئافرەت دادەپۆشی کەمن پێم وایە ئەم عەبایە بێت کەژنانی بروادار بەخۆیانی دادەنو بەتەواوی لەشیان دادەپۆشیێو هەروەها پەچەکانیشیان بەسەر دەمو چاویاندا شۆر بکەنەوە. کەجاران لەکوردستانی خۆماندا تەواوی ئافرەتان ئەو پەچەیان دادەدایەوە کەدەچونە دەرەوە ئەوە باشترە بۆ ئەوان واتە بۆ ئافرەتانی موسڵمان وبروادارو پابەند

٣. دەبێ ئافرەتی موسڵمان لەتێکەڵ بون لەگەڵ پیاواندا دور بکەوێتەوە هەتا ئەگەر لەخزمو نزیکەکانیش بێت، مادام (محرم) نەبێت. بەڵگەو دەقەکانیش لەم بوارەدا گەلێك زۆرن.

٤. بەهیچ شێوەیەك نابێ ئەم کار کردنەی کار بکاتە سەر ئەرکو بەرپرسیەتە سەرەکیەکەی کەبریتیە لەکارو بارەکانی ناو ماڵیو کارو داخوازیەکانی مێردەکەیوهەروەها منداڵەکانیشی، ئەگەر هات وکاری کردە سەر ئەم ئەرکە بنەڕەتیەی ئەوا لەسنوری ڕێگە پێدانەوە دەردەچێت ودەچێتە سنوری حەرامەوە، شەرعیەتیش وایە واجب لەپێش سوننەتەوەیە([1])

٥. دەبێ ئەو کارە لەگەڵ سروشتو سایکۆلۆژیەتی ئافرەتدا بگونجێت، ولەگەڵ سروشتی ئافرەتدا بێتەوە کەخوای گەورە لەسەری دروستی کردوە، نابێ کارێك بکات کەبریتی بێت لەهەڵگرتنی شتی قورس، چونکە ئەمە لەگەڵ سروشتی لەشی ئافرەتدا ناگونجێت، نابێ ئافرەت لەکارگەو کاری پیشەسازیەکاندا کار بکات نەلەناو کارگەی پڕ تەپو تۆزاویو دوکەڵاویەکان دا هەروەها نابێ لەپۆستی پۆلیسی دا کار بکات، یاخود هەر کارێك لەکارەکانی پاك کردنەوەی شەقامو ڕێگاکاندا کار بکات. یاخود شت فرۆشیو بازرگانیو مامڵەت لەگەڵ پیاواندا بکات، یالەهەر کارێکی تری کەدەبێتە هۆی خراپەو فیتنەکاریو ئاشوب لێ کەوتنەوەو گەلێ کاری تری لەم جۆرانە. وەلەو جۆرە کارانەی کەئافرەت تێ ی دەکەوێت کەلەڕابردوداو لەپرۆسەی چاکسازی

---

لەئافرەتانی بێ باوەڕو ناموسڵمان وناپابەند لەڕۆژگاری ئەمڕۆماندا وجیاکردنەوەی ئافرەتانی ئازاد لەسەردەمی پێغەمبەرو سەحابەکاندا لەگەڵ ئافرەتانی کەنیزە.وەهەروەها بۆ ئەوەی ئافرەتانی بڕواداروئازاد ئازار نەچێژن بەهۆی ئەوەی کەپۆشاکەکانیان نەپۆشن ولەشیان یادەم وچاویان دیار بێت پیاوان تەماشایان بکەن وبەدوایان بکەون زیانیان پێ بگات لەئەنجامی ئەم کەمتەرخەمیەی خۆیان .خوای گەورە لێ بوردەو بەبەزەییە.(وەرگێڕ).

(١ ) کوردیش دەڵێ: تاماڵ پێ ی بوێ لەمزگەوت حەرامە.(وەرگێڕ).

کۆمەڵایەتی دا ئاماژەمان پێ کردکەبریتین لە: وانە گوتنەوە ـ بانگەشە کردنی ئافرەتان بۆ لای خوای گەورە ـ نوژداری کردن وتیمار کردنی ئافرەتان ـ هەر کارو هەر شتێك کەپەیوەند بێت بەئافرەتانەوە ـ کاری خێریو گەلێکی تری لەم جۆرانە لەگەڵ حاڵو سروشتی ئافرەتاندا بێتەوە.

٦. ڕوخسەتومۆڵەت وەر گرتن لەسەرپەرشتیارەکەی چ مێردی بێتو چ باوکی، ئەگەر مۆڵەت وەرگرتن بۆ ئەنجام دانی هەندێ بەندایەتیو پەرستشیە سوننەتەکان لەئافرەت داوا کراو بێت ئەوا ڕوخسەتو مۆڵەت وەرگرتن بۆ کارکردنو چونە دەرەوە لەپێشترو پێویست ترە.

## ئامۆژگـاریـەکان( التوصیات ):

دوای ئـەوەی ئـەم گەشـتە خێرایـیەو سـەرپێ یـە پێمـان باشـە کـەپێ لەسـەر هەنـدێ ئامۆژگاری دا بگرین کە هیوا دارین سود بەخش بێت بەیارمەتیو بەویستی خوای گەورە:

١. بەبەردەوامی گرنگیو بایـەخ دان لەلایـەن ئـەهلی زانسـتوبانگەشەوە بـەو لایەنانـەی کەپەیوەندن بەئافرەتی موسڵمانەوە لەگشت بابەتولەهەمو ڕویەکەوە، بەشێوەیەکی دروست کردنانەو بەرگری کردنوگەلێ لایەنی تر، مل ملانێوزۆرانبازیەکـە بەردەوامـە، دوژمنانی ئیسلامیش هیچ هـەوڵو کۆششـێکیان نـەماوە نەیخەنـە گـەڕ لەبـەردەوامی ونەسـرەوتن بـۆ گەیانـدنی پـەیامی بۆگـەنی خۆیـانو بـڵاو کردنـەوەی نەخـشەو پلانەکانیان، وهەرگیز بێزارو ماندو وەرز نەبونو نابنو سورن لەسـەر پلانـی خۆیـان، بۆیە پێویستە لەسەر زانایانو بانگەشەکاران کەبەردەوام بنو سور بن موناقەشـەومل ملانێودایەلۆك بکەن، وریا بـن وهـەرگیز بـێ ئاگـا نـەبنو بریـان نەچـێت بەرگریـەکی لێبڕاوانەو بوێرانە بکەن، وخۆ گێـل نەکـەن، چـونکە کارەکـە زۆر ترسـناك ومەترسـی دارە، خوای گەورە بمان پارێزێت لەخراپەوخراپەکاران وگوناح وگوناحکاران.

٢. بەرپرسیارانوسەرپەرشـتیاران دەبـێ گرنگیـەکی تـەواو ولێبڕاوانـە بـدەن بـەئافرەت بەتایبـەتیش بەرسـیارانو سـەر پەرشـتیارانی نزیكوتایبـەت بـەئافرەتان لـەڕوی پەروەردەو فێرکردن وئامادە کردن وڕاهێنانی ئافرەتان لەهـەمو کـارو بـارێکی ژیـانی ئافرەت بەم شێوەو شێوازەی خوارەوە:

ـــ وریـا کردنوئاگـادار کردنـەوەی ئافرەتـان خۆیـان لەفڕوفێڵوتەڵەکـەو نەخـشەو پلانـە گڵاوەکانی دوژمنانی ئیسلامو ئافرەتان بەهیچ شێوەیەك نابێ بەرپرسان بهـێڵن ئـەم وڵاتـە پیرۆزە بەرەو ئەوە ڕابکێشرێت کەهەندێ لەوڵاتانی تری جیهانی ئیسلامی بـۆ ڕاکێـشراونو توشی بەلاو نەگبەتیەکەیان کردون(١).

---

(١ ) مەبەستی لە وڵاتی سعودیەوبەتایبەتیش مەککەی پیرۆز(وەرگێڕ).

ـ پێدا چونەوە بەپرۆگرامەکانی فێر کردنو پەروەردەکردنی ئافرەتانو پێدا گرتن لەسەر ئەو لایەنانەی کەتایبەتن بەئافرەتەوە بەشێوەو شێوازێکی وا کەئافرەت وا ئامادە بکرێت کەبتوانێت کارە بنەڕەتیەکانی ناو شانشینەکەی خۆی ئەنجام بدات وبەگوێ وبەهاش وهوش وقرەقڕی دوژمنان نەکات لەشانشینەکەی خۆی بچێتە دەرەوەو دەست لەدەستی پیاوان بنێ‌و شان بەشان وتەك بەتەك کار بکاتو ناو ماڵو دیوانی شانشینیەکەی خۆشی وێرانە ماڵو پشتگوێ بخات.

ـ ڕوانین وتێڕامان تێبینی لێبڕاوانە(النظر بجدیة) لەتەمەنی خانەنشینی ئافرەتان بۆ هەوڵ دانی ڕێکخستنو سەر خستنی نێوان ئەرکوبەرپرسیەتیە جۆربەجۆرەکانی ئافرەت.

ـ دامەزراندنی ئافرەت لەبنکەو بارەگاکانی کەتیایدا دەژیات، نابێ پەنا ببرێتە بەر دور خستنەوەی ئافرەت بۆ شوێنە دورەکان کەلەمەترسیەکانی ژیانی پتر دەکات([1]).

ـ گشتاندنی هۆکارەکانی گواستنەوە ( هات وچۆ) ی بەکۆمەڵ لەلایەن دەوڵەتەوە، پەنا نەبردنە بەر شۆفێرە بێگانەکان کانو وێنەی ئەوان وەك ئوتومبیلی کرێ، لەبەر ئەوەی کەزۆر لەخراپەو خراپەکاری ڕونو ئاشکرای لێ دەکەونەوە([2]).

---

(١ ) واتە دور خستنەوەی ئافرەت لەماڵ ولەبنکەو بارەگای ئیش وکاری بنەڕەتی فیتری خۆی کەخوای گەورە بۆی دەست نیشان کردوەو بۆی تەرخان کردوە وفەرمانی پێ کردوە کەلەچوارچێوەی ئەو سنورە نەچێتە دەر.خوای گەورە دروست کەرەکەی خۆی پەروەردگاری جیهانیان فرمانی پێ کردوە وئەو جێگەوریگە شیاو گونجاو ولەبارەی بۆ داناوە نەك مرۆڤ یان پیاو ماف خۆری ئافرەت وەك چاو چلێس ودڵ ڕەشەکان خۆیان گوتەنی.(وەرگێر).

(٢ ) واتە: هەمیشە کە دەگوازرێنەوە واتە هات وچۆیان پێ دەکرێت وەك ئەوەی لەماڵەوە بۆ شوێنی کارەکەیان ولەوشوێنی کارەکەشیانەوە بۆ ماڵەوە پێویستە بەکۆمەڵ بن نەك بەتەنیا وبەشۆفێری بێگانە نەگوازرێنەوە ، گەر بشگوازرێنەوە با ئافرەتێك یا دو سێ یەك بەتەنیا نەبن بەڵکو تا ژمارەیان پتر بێت باشترە ، چونکە لەوانەیە شەیتان زەفەریان پێ بەرێت وخوا نەخواستە توشی هەڵە بن وبکەونە داوی شەیتانەوە خوای گەورە پەنامان بدات.هەروەها لەکار کردن دا تێکەڵ بەپیاوان نەبن. بەڵکو بنکەو مەڵبەندی کار کردنی تایبەت بەژنان بکرێنەوەو ئامادە بکرێن بۆیان وەك قوتابخانەو

ـ دانەمەزراندنی ئافرەت لەشوێنە تێکەڵیەکان بەپیاوان لەهەر بارودۆخ وکارو بارێك دابێت.
ـ کەم کردنەوەی دەم ژمێرەکانی کار کردنی ڕۆژانە بۆ ئافرەتان، بۆ ئەوەی پتر دەست بەتاڵ بێت بۆ کاروبارەکانی ماڵ ومنداڵ ومێردەکەی وبۆ ئەوەی بتوانێت بەباشترین شێوە ئەنجامیان بدات، وەك ئەوەی ڕۆژانە تەنیا سێ دەم ژمێر کاری پێ بسپێردرێت، یاخود سێ ڕۆژ لەهەفتەدا.
ـ سور بون لەسەر داوای سەربەخۆیی خوێندنی زانکۆیی (خوێندنی باڵا) بەکردنەوەی زانکۆکانی سەربەخۆ وتایبەت بەکچان([1]).

خوێندنگای تایبەت بەکچان و هەروەها خەستەخانەو نەخۆشخانەی تایبەت بەئافرەتان دروست بکرێن وەهەروەها لەهەمو بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتیدا ئەمە کارێکی زۆر شەرعیەو خوای گەورە پێ ی خۆشە.(وەرگێڕ).

(١ ) واتە: کردنەوەی قوتابخانەو خوێندنگاو زانکۆو کۆلێژەکانی تایبەت بەکچان نەك تێکەڵ لەگەڵ کوڕان هەر چون ئێستا لەوڵاتانی عەلمانی بەنا وئیسلامی هەمو قۆناغەکانی خوێندن وفێرکردن وپەروەردەیان تێکەڵ کردون، بەڵێ زۆر بەداخەوە بەوەشەوە نەوەستان و نەك هەر تێکەڵ کردنی کوڕو کچ لەقۆناغەکانی خوێندن بەڵکو هەنوکە وا خەریکن وبەئیجباری کوڕو کچێك لەسەر یەك کورسی وتەك بەتەك بەیەکەوە شەتەکیان دەدەن .بەوە دڵیان ئاوی نەخواردۆتەوە کەلەقوتابخانە یالەخوێندنگادا تێکەڵیان کردون چونکە بابای موسڵمانی بڕوادار فیترەتی خوای گەورە وایە پەراوێز هەردەبێت دەسڵەمێتەوە ، بۆیە کچان لەگەڵ کوڕاندا لەناو پۆلەکاندا کەنار گیرو دور دەبون لەکوڕان وتێکەڵی تەواو وەکو ئەوان دەیانەوێ وا نەبون وئەو ڕەفتارو کارە قێزەونانەی کەئەوان دەیانەویست ڕوی نەدەدا بۆیە دەوونیان ڕەحەت نەبو ودڵی یان بەمە ئاوی نەخواردەوە هەستاون ئەم پلانە گڵاوە تازەیان دارشتوە کەدەبێ هەر لەقۆناغی سەرەتایی ولەیەکەمین ساڵی پێ تێ هاویشتنی کوڕان وکچان لەقوتابخانەکاندا دەبێ لەسەر یەك کورسی ولەتەنیشت یەکەوەو بەیەکەوە شەتەکیان بدەن ولەکۆڵی یەکتریان بکەن. دەی بۆچی بەبورغی وبزمار وەك دارو تەختەو پلێت بەیەکەوەیان گرێ نادەن یان وەك دارو تەختە بەهێلم وگیرە(فخة) بەیەکەوە کەبسیان ناکەن.(وەرگێڕ).

٣ ـ دەبێ وەزارەتـى كاروبـارى ئيـسلامى بەڕێوەبـەرێتى گشتى بۆ بانگەشـەى ژنـان لەبڕگەكانى ولە كاروچالاكى داولەئامانجەكانى ڕێكخستنى بەرنامـەو پرۆگرامـى تايبـەت بەئافرەتانى هەبێت، شتێكى ڕون وئاشكرايە كەهەستانو ئەنجامدانى ئەم چالاكيەوئەو ڕۆڵە گرنگەبەرهەمى چەند هێنـدەى لێ دەكەوێتـەوە. ئـاخر ئافرەتـان نيـوەى كۆمـەڵن وبـەڵكو پتريـشيەتى، ئـافرەت هـەم دايكـى پيـاوەو هـەم پەروەرديارپـشيەتى واتـە پەروەردەكەريەتى، دەى كەواتـە كـاتى ئـەوە هاتوەكەبەرنامـەو پرۆگرامـى بانگەشـەو بانگەوازى تايبەتيان بەهەمو هۆكارو بنەماو كۆڵكەكانيەوە بۆ تەرخان بكرێت، خانەى ئافرەتـــان ــــ پيـــشانگاكان ، بەرنامەوپرۆگرامـــەكان لەقوتابخانـــەكانو خوێندنگاكانوزانكۆكاندا ـ خانە كۆمەڵايەتيەكانوگەلێ شتى ترى لەم جۆرانە([1]).

٤ــ پێويـستە خانـەكانى زانـست وزانيـارى كـارى لێبڕاوانـە بكـەن بـۆ دەركـردن وبڵاوكردنـەوەى ژمـارەى پـتر لـەگۆڤارو ڕۆژنامەهۆشـيارييەكانى تايبـەت بـەئافرەتان لەگەڵ كتێبوناميلكە گونجاوە جۆربەجۆرەكان بۆ ئافرەتـان، ئەمـە وێـڕاى هاوبەشـى كردن لـەكارەكانى ڕاگەيانـدن لـەهۆكارەگونجاو و لـەبارە جۆربـەجۆرەكانى ڕاگەيانـدن سەبارەت بەئافرەتان لەوانەش تايبەت كردنى شـوێنەكانى ئينتـەرنێت واتـە هاوبەشـى كردن وكار كردن لەتۆڕى ئينتەرنێت دا.

٥ ـ پێويستە هەمو ئافرەتێك لەبەرنامەو پرۆگرامەكانى بانگەشەو پەروەردەيى يەكاندا كار بكات لەو بەرنامەو پرۆگرامانەى كەلەگەڵ خودى ئافرەت خـۆى ولەگـەڵ سروشـتى خێزانەكـەى دا دەگونجێنوشـياو لـەبارنو لەگـەڵ سروشـتى ئافرەتانـدا دێنـەوە، بـۆ ئەوەى ژيان بێ سودو بێ هودە نەڕوات.

وآخر دعوانا أن الله رب العالمين وصلى الله على محمد وعلى آله وأصحابه

ومن والاه إلى يوم الدين

---

(١ ) بۆيە دەڵێين لەنيوەش پتر ن چونكە خواى گەورە ڕێژەى ئافرەتانى لەپياوان پتر دروست كردون .(وەرگێڕ).

# بانگەوازێك بۆ براو خوشكانی پەروەردیار

نوسینی

محمد بن جميل زينو

# پێشەکی وەرگێڕ

مرۆڤ لای خوای گەورە زۆر گەورەو بەڕێزو خۆشەویستە بۆیە گرنگی یەکی تەواو بەپەروەردە کردنی مرۆڤ دەدات ئەوەتە لەئایینی پیرۆزی ئیسلامدا گرنگی تەواو دەدات بەپەروەردە کردنی منداڵان هەتا لەپیش لەدایك بونیەوە ئامۆژگاری باوکان دەکاتو فرمانیان پێ دەکات کەچاودێری لێبڕاوانەی منداڵەکانی بکاتو بەجوانترینو بەباشتر ین شێوە دەریان بهێنێتو پەروەردەیەکی موسڵمانانەی ڕاستەقینەیان بکات لەسەر بیروباوەڕی ڕاستو دروستی ئیسلامو لەسەر قورئانو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بەتێگەیشتنی پێشینەی پیاو چاك هەر لەسەری شلکیەوە پەروەردەی دروستیات بکاتو درەختێکی ڕاستوڕێکیان لی دەربهێنێتو دارو کشتوکاڵێکی بەرداری باشیان لی پەیدا بکات بەویستو بەیارمەتی خوای پەروەردگار هەروەکو خوای پاکو بێگەرد لەقورئانە پیرۆزەکەی خۆی دا دەفەرموێت:﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ ﴾ الأعراف:٥٨. واتا: ئەو زەویەی کەبەپیتو بەرەکەتەو زەویەکی باشە بەویستی خوا دارو درەختو سەوزەو شینایی‌و میوەهاتی زۆری لێ شین دەبێتو دەڕوێتو بەرهەمو ڕۆزیەکی زۆر بۆ خاوەنەکەی بەرهەم دێنێت، بەڵام زەوی خراپو ڕەقەنو بێ پیتو بەرەکەت هیچی لێ ناڕوێت چەندە بارانی لێ ببارێتو ئاوی بەسەردا بکرێت هیچی لێ شین نابێتو هیچ بەرهەمێك نادات بەدەستەوە، دەی مرۆڤی دڵ ڕەقو پوچەڵو خوا نەناسیش بەهەمان شێوە چەندە ئایاتو ئامۆژگاری خوایی‌و فەرمودەی بەسەردا بخوێنیتەوە ناچێتە دڵیەوەو لەم گوێ ی دەچێتە ژورو لەوی تریان دێتەوە دەر، بەڵام مرۆڤی ژیرو دڵ پاکو خواناس بەئایەتو فەرمودەو ئامۆژگاریەکان گۆش دەبێتو ڕێگەی ڕاست دەگرێتە بەر(١). لەپێناو ئەم مەبەستە پیرۆزەشدا خوای

---

(١) بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب١ل٣٨٧لەنوسینی:نظام الدين عبدالحميد.

گەورە فرمان بەباوکان(پیاوان) دەکات کەسەرەتای ژن هێنانو پێکەوەنانی خێزانو شان دانە بەر بەرپرسیاریەتێکی گەورە لەژیانی مرۆڤایەتیدا کەئافرەتانێکی چاکو موسڵمانو لەخوا ترسو بڕوادارێکی تەواوو کامڵ بۆ خۆیان هەڵ ببژێرین کەلەداهاتودا بەویستی خوای گەورە دەبنە دایکی منداڵەکانیان. ئەم بەرپرسیاریەتیە گەلێك قورسو گرانو لەهەمان کاتیشدا زۆر پیرۆزە چونکە بناغەو بنەمای کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەشێوەیەکی گشتیو کۆمەڵگەی موسوڵمانانی بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر دادەمەزرێنرێت بۆیە فرمانمان پێ دەکات کەلایەنی ئاینو بڕواداری بەخوای گەورەو بەپێغەمبەرەکەی ڕەچاو بکەین لەکاتی هەڵبژاردنی دایکی منداڵەکان، هەروەکو پێویستە لەسەر ئافرەتانیش بەهەمان شێوە باوکێکی بڕوادارو لەخوا ترسو ڕێكو پێكو بەکەسایەتی بۆ منداڵەکانیان هەڵ بژێرن. ئەوەتە لەهەردو فەرمودە ڕاستەکانداو لەأبو هريرة وە ﷺهاتوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{تنكح المرأة لأربع : لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها فاظفر بذات الدين تربت يداك}واتا: ئافرەت بۆ چوار شت دەخوازرێت یامارە دەکرێت: بەهۆیماڵەکەی کەماڵێکی زۆری هەبێت، بەهۆی بنەماڵەو خانەدانیو کەسایەتی ئەو ئافرەتە، وەلەبەر خاتری جوانیەکەو وەلەبەر ئایینەکەی واتا لەبەر دینو ئەخلاقەکەی، دەی تۆ ئەی برای موسڵمانی بڕوادار لایەنی دینو ڕەوشتو ئاکارە جوانەکەی هەڵ ببژێرە چونکە بەرەکەت لەمیان دایە ئەوانی تر هەمویان بۆ دنیان بەڵام ئەمەیان بۆ دنیاو بۆ قیامەتیشتە، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە ژن هێنانو مێرد کردن پایەیەکی زۆر گەورەو گرنگە لەپایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤدا بۆ هێشتنەوەو بەرپا کردنی چەشن یاتوخمی مرۆڤ بەجوانترینو بەباشترین شێوەو بەتەواو ترین سیستەمو هۆکاری شەریفانە بۆ پێکهێنانو دامەزراندنی بناغەی خێزان(الأسرة) کەیەکەمین خانەو شانەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیە کەخوای گەورە زەوی پێ ئاوەدان کردەوە. دەی ئەگەر ژنخوازیو مێرد کردن واتە هاوسەرگیرێتی نەبایە ئاوەکان تێکەڵو پێکەڵ دەبونو ڕەگەزو توخمەکان تێك دەچونو نەدەناسرانەوەو کەس وەچەو جگەر گۆشەی خۆی نەدەدۆزیەوەو نەیدەناسیەوەو منداڵەکان لەدەست دەچونو

کەس منداڵی خۆی نەدەناسیەوە، ئەو کات ڕەحمو سۆزو بەزەیش نەدەبوو مرۆڤیش وەك دڕندەکانی لێ دەهات.

بۆیە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هانی مرۆڤەکان دەدات بۆ هەڵبژاردنو بەستنی هاوسەرگیریەتی لەسەر بنچینەو بنەمای ئاینو بڕوداری چونکە ئەگەر ئافرەت واتە ژنە دایکی منداڵەکان بڕوای بێهێزبێتو بێ دین بێت ئەوا گیانی خۆی ناپارێزێتو داوێنی خۆی لەکارە حەرامەکان ناگێڕێتەوەو ناپارێزێتو خیانەت لەمێردەکەی دەکاتو ڕوی منداڵەکانیشی ڕەش دەکاتو سەرشۆڕیو سوکایەتیان پی دەکاتو کەسایەتیەکی بێ هێزیان لەناو کۆمەڵگەدا لێ دەردەچێتو لەسەر ژیانێکی بەرزو باشو پتەو دروست نابن لەناو ئەو کۆمەڵگەیەی کەتیادا دەژین، بۆیەو لەپێناو ئەمەدا خوای گەورە لەقورئاندا فرمانمان پی دەکات کەگرنگیەکی تەواو بدەین بەدایکی منداڵەکان لەکاتی هەڵبژاردنی ئەو ئافرەتەی کەژیانی لەگەڵدا دەباتە سەرو خێزان یەکەمین خانەو شانەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی پێك دێنیتو دەبێتە دایکی دوارۆژی منداڵەکان هەروەکو دەفەموێت:﴿ وَأَنكِحُوا۟ ٱلْأَيَـٰمَىٰ مِنكُمْ وَٱلصَّـٰلِحِينَ مِنْ عِبَادِكُمْ وَإِمَآئِكُمْ ۚ إِن يَكُونُوا۟ فُقَرَآءَ يُغْنِهِمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٣٢﴾ ﴾ النور:(٣٢). واتا: ئەی موسڵمانینە ئافرەتانی بێ مێرد بدەن بەشو، هەروەها ژن بۆ پیاوانی بێ ژن بهێنن، هەروەها ژن بێنن بۆ بەندە چاكو خواناسەکانو کەنیزە چاكو خوا ناسەکان بدەن بەشو کەهەردو لەلاتان کۆیلەن، جائەگەر هەژارو نەدارو دەست کورت بن ئەوە خوای گەورە بەڕەحمەتو بەرەکەتی خۆی لایان لێ دەکاتەوەو یارمەتیان دەداتو پێداویستی یەکانیان بۆ ئامادەو جێ بەجێ دەکات، بەخشندەییو کەرەمی خواش زۆرزۆر فراوانەو هەمیشە زانایە بەدەستکورتیو هەژاریو نەداریتان(١). هەروەها بەهەمان شێوە خوای گەورە ئافرەتان

---

(١) نظام الدين عبدالحميد، تەفسیری گوڵشەن ب٢ل٩٠١.

هان دەدات بۆ هەڵبژاردنی پیاوێکی بڕوادارو بەدین‌و پیاوێکی چاك كەبەیانی دەبێتە باوكی منداڵەكانی هەروەكو لەسەرەوە ئاماژەمان پێ كرد. بۆ ئەوەی سبەینێ لەناو كۆمەڵگەدا بەسەر بەرزی‌و بەدڵێكی پڕ سۆزو ئاسودەوە ژیان بەرێتە سەرو دڵ پڕ لەئومێدو هیواو ئاوات بێت بۆ ژیانی دنیاو بۆ قیامەتی ئەوەتە لەالترمذي ڕیوایەت كراوە كەپێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {إذا خطب اليكم من ترضون دينه وخلقه فزوجوه ، إلا تفعلوا تكن فتنة في الأرض وفساد كبير}واتا: ئەگەر یەكێك هات بۆ داخوازیتان‌و لەدین‌و لەئەخلاقەكەی ڕازی بون ئەوە شوی پی بكەنن یاخود بیدەنێ‌و لێ ی ڕامەوەستن، دەی ئەگەر وا نەكەن ئەوە خراپەو خراپەكاریەكی زۆر گەورە لەسەر ڕوی زەوی دا ڕو دەدات. دەبا موسڵمانی ژێر بڕوانێت كچە بەڕێزەكە یان خوشكە بەشەرەفەكەی دەخاتە كوێوەو لەكوێ ی دادەنێت. دەی ئەگەر كچەكەی بداتە فاسقێك یابێ دینێك‌و بێ ڕەوشت‌و ئاكار خراپێك ئەوە ئەو كاتە خیانەتی بەو كچەیابەخوشكەكەی كردوەو غەدری لێ كردوەو خراپەیەكی گەورەی لەگەڵ دا كردوەو خۆشی توشی توڕە بونی خوای گەورە كردوە ەبەوەی كەمافی سیلەی ڕەحمی لەگەڵ دا بڕیوەو خراپترین چارەنوسێكی بۆ كچەكەی هەڵبژاردوە چ لە پێناو پارەو پول‌و چ لەپێناو هەر بەرژەوەندیەكی تردا بوبێت. پیاوێك بە حسنی گوت: چەند كەسانێك داوای كچەكەمیان كردوە بەكامیانی بدەم باشە؟ گوتی: (من يتق الله فانه أن أحبها أكرمها وأن ابغضها لم يظلمها)واتا: بیدە بەو كەسەی كەخۆی لەخوای گەورە دەپارێزێت‌و لەخوا دەترسێت. ئەوە ئەو كەسە ئەگەر خۆشی ویست ئەوە ڕێزی باشی لێ دەگرێت‌و لەگەڵی دا زۆر باش دەبێت، خۆ ئەگەر خۆشیشی نەوێت‌و ڕقی لێ ببێتەوە دڵنیابە هەرگیز لەترسی خوا ستەمی لێ ناكات‌و مافەكانی نافەوتێنێت. ئەی براو خوشكی موسڵمانم ئائەمەیە گرنگی دان‌و چاودێری كردنی ئیسلام بۆ منداڵەكان لەئامادە كردنی زەویەك كەلەداهاتودا تۆوی ئەو منداڵانەی تێدا دەوەشێنرێت‌و دەبێتە دەفرێك بۆ ڕسكان‌و تێدا دروست بون‌و گەشە كردنی ئەو منداڵانە واتە دایكێكی بڕواداری صالح. ئەمەیە چاك پەروەردە كردن‌و ڕاهێنانی(تأديب) باوك‌و دایكان بۆ چاوەدێری كردنی

منداڵەکانیان. دوای ئەوەی کەهاوسەرگیریەتیان دروست کردو خوای گەورە منداڵی پی بەخشین ئەمجاریش فرمان بەباوکو دایکان دەکات کەبە جوانترینو بەچاکترین شێوە منداڵەکانیان پەروەردە بکەنو کەسێکی بڕوادارو خاوەن بیروباوەڕێکی موسڵمانانەی ڕاستەقینەیان لێ بەرپا بکەنو کەسێکی بەهێزو خاوەن هیممەتو ئومێدو ورە بەرزیان لێ بەرهەم بێنن نەك بی باوەڕو سوكو چروكو بێهێزو فشەڵۆكو بی توانا هەروەکو خوای گەورە دەفەموێن:﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَأَهۡلِيكُمۡ نَارٗا وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلۡحِجَارَةُ عَلَيۡهَا مَلَٰٓئِكَةٌ غِلَاظٞ شِدَادٞ لَّا يَعۡصُونَ ٱللَّهَ مَآ أَمَرَهُمۡ وَيَفۡعَلُونَ مَا يُؤۡمَرُونَ ٦﴾ التحريم:(٦) وە ابن عباس‌ﷺگوتویەتی:( اعملوا بطاعة الله واتقوا معاصی الله ومروا أولادكم بامتثال الأوامر واجتناب النواهي فذلك وقاية لكم ولهم من النار) واتا: بەگوێڕایەڵی خوای گەورە کاربکەنو خۆتان لەسەرپێچی یەکانی خوای گەورە بپارێزنو فرمان بە منداڵەکانتان بکەن کەفرمانەکانی خوا جی بەجی بکەنو لەسەر تاعەتو خوا پەرستیو دور کەوتنەوە لەبێ فرمانیەکانی خوا پەروەردەیان بکەنو ڕایان بێننن دەی ئەگەر وا بکەن ئەوە پارێزگاری کردنە لە خۆتانو لەمنداڵەکانتانو دور کەوتنەوەیە لەئاگری دۆزەخ. وەئیمامی علی(وقال علي كرم الله وجهه) گوتویەتی:( علموا أنفسكم وأهليكم الخير وأدبوهم ) واتا: خۆتانو ماڵو منداڵتان فێری چاکەو چاکگوزاری بکەنو بەجوانترینو باشترین ڕەوشتو ئاکار ڕایان بهێننو پەروەردەیەکی موسڵمانانەی بڕواداریان بکەن، خوای گەورە لەم ئایەتە پیرۆزەدا داوامان لێ دەکات کەمنداڵەکانمان بەهەمو ئاکارە جوانو بەها بەرزەکان پەروەردە بکەیتو دڵو دەرونێکی پاکو خاوێنیان لێ دروست بکەین، چونکە مرۆڤ لەسەرەتای ژیانیەوەو لەسەردەمی منداڵیەتیەوە لەسەر فیترەتی ساغو پاکو دڵو دەرون پاکو پوختەو کاری چاكو خێر کاری تێ دەکات، هەروەها خراپیش کاری تێ دەکاتو وەك هەویرێکی خاو وایە چیت بوێت لێ ی دروست

دەكەیت، ئەخلاق و ڕەوشتی بەرزی لەسەر دروست دەكرێت و هەروەها هی خراپیش. ئالەو كاتە ناسكەدا كەپاك و بێگەردەو هەروەكو گوتمان هەویرێكی خاوە ئەگەر یەكێكی نەبێت سەرپەرشتی بكات و پەروەردەیەكی باش و بەسودی بكات و بەجوانی دەری بهێنێت و ڕێگەی بەردەوامی ڕاستی نیشان بدرێت و لەسەر بەرنامەو شەریعەتی خوا گۆش بكرێت و دەست گرتو بێت بەڕێگەی هیدایەتی خواو بەرچاو ڕۆشنی ئەوا كەسێكی ڕاست و دروست و چالاك و كارای لێ دەردەچێت و ئەنجام بۆ خودی خۆشی و بۆ كەس وكاری و بۆ وڵات و گەل و نیشتمانەكەی سود بەخش و مرۆڤێكی خزمەتگوزارو كارا دەبێت و كەسێكی بەختەوەرو سەربەرزو سەرفراز دەبێت، بەڵام ئەگەر كەسێكی نەبێت دەستی بگرێت و پەروەردەیەكی ڕاست و دروستی بكات و پشت گوێ بخرێت و بەرەڵا بكرێتە كۆڵان و سەر شەقامەكان لەگەڵ جۆرەها منداڵی بەدبەخت و شەقاوەو بەرەڵا و ئەوا لەپەروەردەو ئەخلاقی بەرز بێ بەش دەبێت و ئەویش وەك بەرەڵاكانی كۆڵان دەردەچێت كەكەسێكی وایان نیە پەروەردەیان بكات و خوارو خێچ و لارو لەوێر دەردەچن. ئاخر ئەو جۆرە منداڵانە دایك و باوكەكانیشیان بەناشكوری نەبێت خودی خۆشیان كاتی خۆی پەروەردەیەكی دروست نەكراون دەبێ چاوەڕوانی چی لەمنداڵەكانیان بكرێت. ئەوا ئەو كات ئەو منداڵانە بێ ڕەوشت و سەرسەری و بەدبەخت و نەفس پیس و بێ هیواو بێ ئومێدو ڕوخاوو بێ كەسیەتی دەردەچن نەژیانی خۆیان ژیانەو نەسودیان بۆ ماڵەوە هەیە نەبۆ گەل و وڵاتەكەی و هەمیشە بارێكی قورسە بەسەر شانانەوە. ئەو كات باوك و دایك بەپلەی یەكەم بەرپرسیارن لەبەر دەم خوای گەورەداو منداڵەكانیشی ڕۆژی قیامەت یەخەیان دەگرن كەبۆ پەروەردەیەكی ڕاست و دروستت نەكردوین لەدنیادا تائەمڕۆ بەم دەردە نەگەیشتباین. ئەوەتە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ أن الله تعالى سائل كل راع عنما استرعاه، أحفظ ذلك أم ضيعه؟ حتى ليسأل الرجل عن أهل بيته}((حسن رواه النسائي عن انس)). واتا: لەڕۆژی قیامەتدا هەمو شوانێك، هەمو سەرپەرشتیارێك سەبارەت بەو كەسانەی كەلەژێر دەستی دابون و لێ یان بەرپرس بون دەپێچرێتەوە، هەتاكو سەرەك

خێزان دایکە، باوکە برایە، هەر کەسێکە دەربارەی خاوو خێزانو ماڵو منداڵەکانی لێ ی دەپێچرێتەوە چونی ڕاهێناونو چۆنی پەروەردەو گۆش کردون بۆ ڕێگەی ڕاستی خوایی یان بەرەڵای کردون، یان بەرەو ڕێگەی چەوتو شەیتانی بردونی؟!!

دەی کەواتە ئەی باوکان، ئەی دایکان: پەروەردە کردنی منداڵو زارۆکان هەر لەبچوکیانەوە لەسەر چەمکەکانی ئایینی پیرۆزی خوای پەروەردگار گۆشیان بکەن، ڕاهێنانیان لەسەر ڕەوشتو ئاکارو بەها بەرزەکان لەگرنگترینو بەرز ترین ئەو پرسانە دەژمێردرێن کەپێویستە لەسەر باوکو دایکان گرنگی تەواوی پێ بدەنو لای لێ بکەنەوەو زۆر وریا بن، هەروەها لەسەر پەروەردیارانو چاکخوازان پێویستە کەگرنگی پێ بدەنو کاری لێبڕاوانەی لەسەر بکەن، چونکە ژیانو چارەنوسی گەلو نیشتمانی پێوە بەندەو ژیانی گەلی لەدوا ڕۆژدا لەسەر دەخولێتەوەو پێشکەوتنو گەشە کردنو خولگەی سەربەرزیو سەرفرازیو تەواوەتی گەلی لەناو گەلانی جیهاندا پێوە بەندە کەئەویش ڕەوشتو ئاکارو ئەخلاقی بەرزە ئەوەش نایەتە دی تەنیا بەپەروەردەیەکی باشو ڕاستو دروستو موسڵمانانە نەبێت.

ئەگەر بەوردی لەهەمو ئەو ئێشو ئازارو دەردەسەریو ناخۆشیانە کەئەمڕۆ ئێمە هەمومان هاوارمانە بەدەستیانەوە لەو هەمو کاری گەندەڵیو نادادپەروەریو نابەرامبەریەیو کار نەکردن بەبەرنامەکەی خوای گەورەو یان هەر بڕوا نەبون بەقورئانو بەسونەتو بەد ڕەوشتیو بڵاو بونی ئەو هەمو خراپەو خراپەکاریو سوکایەتی کردنو شکاندنی قەدەغە کراوەکان(المحرمات)و ئەو هەمو خڵتو خاشو زەلو زوری لادانەی وا کەوتۆتە سەر ڕوی پاکی بیروباوەڕەکەمان(العقائد)و ڕوی ڕۆشنو تیشکداری لیخن کردوە، لەو هەمو سستیو تەمبەڵیو پشتگوێ خستنە لەئەنجامدانو ڕاپەڕاندنی فرمانەکانی ئایینەکەمانو پەرتەوازە بونو گروپ گروپیو لێک دابڕنو پشت تێک کردنو لەولاشەوە دەرچونی ئافرەتان لەحەرەمی ماڵەوەیان بۆ دەرەوە بۆ بازاڕەکانو بۆ سەر ڕێگاکانو بۆ گشت شوێنە گشتی یەکانو ئاپۆرەکانو قەرەباڵغەکانی بێ هیچ هۆیەکو بێ ئەوەی

پێویستو زەرور بێت، دەی ئەگەر بەژیرانە تێڕا بمێنن دەبینن کەئەمە هەموی بەهۆی نەبونی پەروەردەی ئاینیانەو ڕانەهێنان لەسەر بەرنامەو شەریعەتی خوای پەروەردگارو پشتگوێ خستنی پەروەردەی ڕەوشتو ئاکارو بەها بەرزەکانی ئایینی ئیسلامی پیرۆزە لەکاتی خۆی دا واتە لەسەرەتادا منداڵەکان پەروەردە نەکراون لە سەر ئەم ئایینە پیرۆزەو لەسەر ڕەوشتو ئاکارەکانی ئیسلامو پشتگوێ خراون تائەوا بەم جۆرە خوارو خێچ دەرچون، چونکە منداڵ پارچەیەکە لەباوکو دایکو سپاردەو ئەمانەتێکە لەگەردنی باوکو دایك، دەی ئەی گەلۆ خۆتان لەخوای خۆتان بپارێزنو لەخوای پەروەردگارتان بترسن لەبەرهەمو میوەکانی دڵتانو لەجگەر گۆشەکانتانو پشتگوێ یان مەخەنو بەدەستی خۆتان فڕێ یان مەدەنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، ئەو ئاگرەی کەسوتەمەنیو خۆراکەکەی خەڵکو بەردی زل زلن، ئەی گەلۆ لەخوا بترسنو خۆتان لەخوای خۆتان بپارێزن لەکوڕەکانتانو لەکچەکانتانو لەنەوەو لەوەچەکانو لەمنداڵەکانتان کەجڵەوی کاروبارەکانیان لەدەستی ئێوە دایەو چاودێریو هەڵسوڕاندنو پەروەردە کردنو ڕاهێنانیان خراوەتە ئەستۆی ئێوەو چارە نوسیان لەدەستی ئێوە دایە، دەی ڕەزامەندی خوایان پێ بەدەستبێنن بۆ خۆتانو بۆ منداڵو نەوەو وەچەکانتان بۆ ئەوەی خۆتانو نەوو منداڵەکانتان کەسو کارو عەشیرەتو گەلەکەشتان لەدنیاو لەقیامەتدا بەختەوەرو سەر بەرزو سەر فراز بن. ئاخر ئایینی ئیسلام پەروەردەیەکی کامڵانەو تەواوی بۆ گرۆهی بەشەریەت هێناوەو باوکانو دایکانو منداڵەکانیانی لەسەر جوانترینو تەواو ترین شێوە پەروەردە کردوەو جوانترین ڕەوشتو ئاکاری فێر کردون پێش چونە لای خێزانو پەیدا بونی جگەر گۆشەکان وای پەروەردە کردون کەخۆیانو ئەو منداڵەشی کەپێ یان دەبەخشێت لەشەیتانی نەفرەت لێکراو پارێزراو بن ئەویش بەپەنا گرتن بەخوای گەورە لەشەیتان هەروەکو پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ لو أن أحدكم إذا أتى أهله قال بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا فقضي بينهما ولد لم يضره}واتا: ئەگەر یەکێکتان چوە لای خێزانەکەی بۆ ئەنجامدانی کاری شەرعیو ئەم دوعایەی سەرەوەی

خوێندو بڵێ:{ بسم الله اللهم جنبنا الشيطان وجنب الشيطان ما رزقتنا}واتا بەناوی خوای گەورە، ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئێمەش‌و ئەو منداڵەشمان لەشەیتان بپارێزیت کەپێمان دەبەخشیت. ئەگەر ئەم دوعایەت خوێند لەکاتێکدا کەدەستت بەکارەکەت کرد ئەوا شەیتان ناتوانێت زەفەر بەخۆشیان‌و بەو منداڵە بەرێت کەخوای گەورە لەو جوت بونەیان بەو باوك‌و دایکەی دەبەخشێت. هەروەها ئیسلام فێری ئەدەب‌و ڕەوشتی بەرزو هەڵس‌و کەوتی باشی باوك‌و دایکانی کردوە لەگەڵ منداڵەکانیان لەکاتی لەدایك بونیان کەدەبێ لەگوێ ی ڕاستی کۆرپەلە تازە لەدایك بوەکەیان بانگ بدەن‌و لەگوێ ی چەپی قامەت بکەن. بەپێ ی ئەو کارەی پێغەمبەرﷺ بۆ حسینی کوڕی ئیمامی عەلی کرد کاتێ لەدایك بو، هەروەها یەکێکی تر لەئەدەب‌و ڕەوشتی باش لەگەڵ منداڵەکان ناو لێنانێکی خۆش‌و پڕ واتایە بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ کەفەرمویەتی{إنكم تدعون يوم القيامة بأسمائكم فأحسنوا أسمائكم } رواه أبو داود. واتا: ڕۆژی قیامەت ئێوە بەو ناوانەوە بانگ دەکرێن کەلەدنیادا لێتان نراوە، جاهەوڵ بدەن ناوی خۆش‌و پڕ واتا لەخۆتان بنێن‌و لەمنداڵە جگەر گۆشەکانتان بنێن. خوای گەورە سەرخەرو پشتیوان‌و یارمەتیدەرە([1]).

نەك وەك ئەم پەروەردە سەقەتەی کەئەمڕۆ لەولاتی ئێمەدا هەیە کەسەرتاپا دژی ئایینی ئیسلام‌و دژی خوای گەورەیەو هەرچی پەیوەندەیەکی بەئایینەوە هەبێت نایهێڵن لەڕەگ‌و ڕیشەوە دەری دەهێنن، تەنیا یەك وانەی ئایینی هەبو هەر لەزوەوەو لەسەردەمی حیزبی بەعسەوە تاکو بەئێستاش دەگات‌و بەڵکو لەجاران خراپتریش کەوتنە وێزەی ئەو دەرسەو وردو وردە لق‌و چڵ‌و پۆپیان کردو هەڵیان پەرداوت‌و وایان لێ کردوە ئێستا ئەوەی سیماو بۆنی دین‌و ئیسلام هەیە پێیانەوە نەهێشتوە. ئێستا بوەتە دەرسێکی ڕوت‌و قوتی کۆمەڵایەتی‌و بەس. هەرشتێك ئایەت‌و فەرمودەی تێدا هەبێت یەکسەر لای دەبەن‌و چاویان پێ هەڵ نایەت‌و دڵ‌و دەرونیان پێ ناکرێتەوە. پەروەردەیەك دور لە

---

([1]) بۆنوسینی ئەم پێشەکیە سود لە(أدب الأسرة – الأدب مع الاخوة والأخوات) لەنوسینی:(الشيخ / عبد الظاهر عبد الله علي) وەرگیراوە.

ئەخلاقو دور لەڕەوشتی ئیسلامی. ئاخر من خۆم گوێم لەبەڕێوەبەرێکی پەروەردەیەك بوبەیەکێ لەبەڕێوەبەرەکانی ئامادەییەکانی گوت: ئێوە سەیرن، وەرە بەقسەم بکە، کچو کوڕەکان تێکەڵاو بکەو لێ یان بگەڕێ بایەکتری ماچ بکەنو یەکتری بگوشن، هانیان بدە بزانە داخۆ شەویش دێنەوە ماڵ!!!!

یەکێ لەمامۆستاکان لێ ی هاتە وەڵام و گوتی: باشە مامۆستای بەڕێز، ئەدی ڕەوشتو ئەخلاق چی لێ هات؟!!. من لەو پەروەردەیەی کەدەوامی تێدا دەکەم چەند ئایەتو فەرمودەیەکم لەپشت سەری خۆمەوە هەڵواسیی بون کەپەیوەندیان بەزانستو زانیاریو پەروەردەو فێرکردنەوە هەبو، هەروەها برایەکی تریش لەبەشێکی تردا بەهەمان شێوە، کاتێ بەڕێوەبەری پەروەردەکە دێتە بەشەکەی منو ئەو بەشەی ئەو برایەی لێ یەو چاوی بەو ئایەتو فەرمودانە دەکەوێت دەرونی تێك دەچێتو دڵی تێك هەڵ دێتو بەرچاوی تاریك دەبن. فیتنە گێڕەکانیش فتیلەو دەستەچیلەی ئاگری فیتنە فو لێ دەکەنو دایدەگیرسێنن بۆیە ڕۆژێك ئەو بەڕێوەبەرە کارگێڕیەکەی خۆی بانگ دەکاتو پێی دەڵێ:

- ئەوە بۆ وا بێئاگای پەروەردەکەیان داگیر کردوەو ئاگاشمان لەخۆمان نیە!!بڕۆ هەر ئێستا ئەو ئایەتو فەرمودانە لێ بکەوە.

کابرای کارگێڕ دەچێت ئەوانەی ئەو برایە لێ دەکاتەوەو دەڵێ: من هی کاك ئەحمەد لێ ناکەمەوەو دەچم بەخۆی دەڵێم بابۆخۆی لێ یان بکاتەوە. ئەوەبو هات بۆ لامو منیش پێم گوت: من لێ یان ناکەمەوەو کێش دێت لێ یان بکاتەوە بابێت!

ئەنجام جەنابی بەڕێوەبەر گوتبوی: من خۆم دەچم لێ یان دەکەمەوە. منیش وتم بابێت: ئەوە بو نەهات. حەز دەکەم یەکێ لەئایەت فەرمودەکان بنوسم تا خوێنەری بەڕێز بەچاوی خۆی بیان بینێت ئایا ئەم فەرمودەو ئایەتانە چ هەڕەشەیەکی بۆ ئەوانو بۆ بەرژەوندیەکانی ئەوان تێدایە جگە لەئامۆژگاریو هەڵنان بۆ پەروەردو فێر کردنێکی ڕاستو دروستو بەئەخلاقانە تەنیا ئەوە نەبێت دژی ستەمو ستەمکاریو گەندەڵیو

دەست پیسیو داوێن پیسین. ﴿قُلۡ هَلۡ يَسۡتَوِي ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٩﴾ سورة الزمر: (٩).

فەرمودەکەش: {معلم الخير يدعوا له كلٌ شيءِ حتى الحيتان في البحر}وەباقی فەرمودەکانی تریش لەو بازنەیەدا دەخولێنەوە، هەر چەندە هەرچی ئایەتی قورئان هەیەو هەرچی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ هەیە هەمو لەسودو کەڵکی مرۆڤایەتی دایەو فرمان کردنە بەچاکەو قەدەغە کردنە لەخراپەو ئاژاوەگێڕیو لەدەستپاکیو لەداوێنپاکیو دژە گەندەڵیو دزیو بێ ئەخلاقیە. دەی پەروەردەو فێرکردنێك ئاوەها بێت دەبێ چ شایەکت پێ هەبێت.

ئیسلام فێرمان دەکات کەمنداڵەکان وا پەروەردە بکەین کەهەر یەکێ لەبراکانو خوشکەکان ڕێزو ئەدەبیان هەبێت لەقسە کردنو لەهەڵسو کەوتو لەبەیەکەوە ژیان لەنێوان خۆیاندا لەناو خێزاندا، و لەسەریان واجب دەکات کەچاکە لەگەڵ یەکتریدا بکەنو یەکتریان خۆش بوێتو ڕێز لەیەکتری بگرنو ڕێزی باوكو دایكیان بگرنو گەورە بەزەیی بەبچوك دا بێتەوەو بچوکیش ڕێزی گەورەیان بگرێتو دەست بخەنە ناو دەستی یەکتری تائەو خێزانە کەشو هەوایەکی پڕ لەخۆشەویستیو تەبایی‌وڕێکیو هۆگریو یەکگرتنو دڵ پاك لەگەڵ یەکتریو یەك ڕیزو یەك پۆل بن وەك دیواری کۆنکریتی یەکتری ببەستنەوە بۆ ئەوە دوژمنان نەتوانن زەفەریان پێ بەرن(كالبنيان يشد بعضهم بعضاً)بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺکە فەرمویەتی: {بر أمك وأباك وأختك وأخاك ثم أدناك فأدناك} واتا: ڕێز گرتنو چاکە کردنو گوێڕایەڵی باوكو دایكو براو خوشكو ئەمجار خەڵکانی تر پلە بەپلە بەرەو خوار پێویستە لەسەر هەمو کەسێك. هەروەها بەپێ ی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ: {حق كبير الاخوة على صغيرهم كحق الوالد على ولده} واتا: مافی برا گەورە بەسەر برا بچوکەوە وەك مافی باوكو دایك وایە بەسەر منداڵەکانیەوە. برایەتی لەئاییندا لەهەمو برایەتیەکانی دایكو باوکی لەپێشترو واجبترو پلە بەرز ترە. کەبریتیە

لەپەیوەستیەکی کۆمەڵایەتی کەهیچ وێنایەکی نیە لەپەیوەندیەکانی تـرو خـۆی لەقـەرە نادات، بۆیە دەبینین کەلەئیسلامدا باوك جەنگ لەگەڵ کوڕی دا دەکاتو مێرد شەڕ لەگـەڵ ژنەکەی دا دەکاتو برا دوژمنایەتی برا دەکاتو خۆشـی ناوێـت لـەپێناو بەدەسـت هێنـانی ڕەزامەندی خوای گەورەدا نەك لەپێناو بەرژەوەندیە تاکیەکانی دنیاو دنیـا خـۆری. چـەدە بنوسین کۆتایی نایـە، ئیـدی بەمەنـدە کۆتـایی دێـنین بـەم پێشەکیە ئومێـدەوارم سـودی هەبێت.

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين وصلّى الله على محمد وعلى آله وصحبه ومن والاه إلى يوم الدين وسلم تسليماً. وەرگێر

# پێشەکــی نوسەر

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا، من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادى له.وأشهد أن لا إله إلاالله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده ورسوله.

**أما بعـــد:**

ئەرکی پەروەردیار گەلێ گەورەو گران وقورسە، ئەرکی ئەو بەرزترین وگرنگترین کارێکە گەر تیایدا دڵسۆزو کارامەو پسپۆڕ بێت، نیاز پاکی(الإخلاص)ی بۆ خوای باڵآ دەست وکار بەجێ هەبێتومنداڵو قوتابیەکانی بەپەروەردەیەکی ئیسلامیانە پەروەردە بکاتو کەسانێکی بڕوا داری سینگ فراوانی دوا ڕۆژیان لێ دروست بکات.

پەروەردیار چ پیاو بێت وچ ژن، مامۆستای سەرەتایی بێت، یاناوەندی وئامادەیی ودواناوەندی و زانکۆکان بێت وچ دایك وباوك بێت و هەر کەسێك چاودێری وسەرپەرشتی منداڵان بکات ویا بەخودی پەروەردەکەوە هەڵ بستێت تادەگاتە پلەو قۆناغی پێگەیشتن وقۆناغی کۆتایی ومرۆڤێکی باڵغ وکادرێکی بەخۆڕاپەڕمونی لێ دەردەچێت جیاوازیان نیەو هەموان دەگرێتەوە وبەهەموان دەڵێن پەروەردیار.

ئەمانە هەمویان پەروەردیارو پێگەیەنەری بەرەکانی دوا ڕۆژن، چاکی وخراپی بەدینی بێ دینی کۆمەڵ پەیوەستە بەوانەوە. ئەوان چ فیکرو بیرو بۆچون وئایدیۆلۆژیەتێك هەڵ بگرن وچیان لەمێشك دا هەبێت لەمنداڵ وقوتابی وبەرەکانی داهاتودا ڕەنگ دەداتەوە. ئەگەر هاتو بەڕاستی ودروستی بەئەرکی سەر شانی خۆیان هەڵ بستن ودڵسۆزی کارەکەی خۆیان بن وقوتابیان، منداڵەکان لەسەر بەرنامەکەی خوای پەروەردگار پەروەردە بکەن و بەرەو ئایین وئەخلاقی جوان ئاراستەو ڕاهاتویان بکەن، ئەوا هەم مامۆستا خۆیشی و هەم قوتابیان وهەم کۆمەڵگا خۆشیان بەختەوەری دنیاو

قیامەت دەبن. هەروەكو پێغەمبەری خواﷺ بەكوڕە مامەكەی خۆی علی كوڕی أبی طالب ﷺ فەرموەوە: { فوالله لأن یهدي الله بك رجلاً واحداً خیرٌ من حمر النعم}([1]).

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {معلِّمَ الخیر یستغفر لهُ كلُّ شئ حتی الحیتـان البحر}([2]) . بەڵام ئەگەر مامۆستا ئەركی سەرشانی خۆی پشت گوێ خست وئەركی خـۆی جـێ بـەجێ نـەكرد. یـاخود منـداڵ وقوتابیـەكان بـەرەو خراپـەكاری وخوانەناسـی ولادان لەڕێگەی ڕاستی خوایی دەست كێش بكەن وبەرەو داڕوخان وڕەوشتی خراپ وبـەد بـەختی ئاراستە بكەن، پەنا بـەخوا ئـەو كـات هـەم هـەمو قوتابیـان وهـەم مامۆسـتاكان خۆشـیان وكۆمەڵگەكەشـیان بـەد بـەخت وچـارە ڕەش دەردەچـن و ئۆبـاڵی هەموشـیان دەكەوێتـە ئەسـتۆی مامۆسـتاكان لەبـەر دەم خـوای بـەرز وبـێ هاوتـا دا لێپرسـراو دەبـن. هـەروەكو پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { كلكم راعٍ، وكلكم مسئولٌ عـن رعیتـه}([3]). دەی كەواتـە هـەر

---

(١) أ ـ متفق علیه.

ب ـ واتە : سوێندم بەخوا ئەگەر خوای گەورە ڕێنومایی وهیدایەتی كەسێك لەسـەر دەسـتی تـۆ بـدات وموسڵمان ببێت یا بێتەوە سەر ڕێگای ڕاست گەلێك باشترە بۆ تۆ لەمێگەلـە حوشـترو مـەڕو ماڵاتێـك ، كەئێستا ئوتومبیلی دوایین مۆدێل وكۆشكی بەرز بەرز كەسەرەشكێنەی پێ لەگەڵ ئاسمان دەكەن، یـا دەفتەری سەد وەرەقەی دۆلاری دەگرێتەوە.(وەرگێڕ)

(٢) أ ـ صحیح رواه الطبراني وغیره.

ب ـ واتە: مامۆستای چاك وسود بەخش هەمو شتێك داوای لێ خۆش بونی بۆ دەكەن هەتاكو نەهەنگ وماسی یەكانیش لەدەریادا.·وەرگێڕ)

(٣) أ ـ متفق علیه.

ب ـ واتە: ئێوە هەموتان بـەرپرس وچـاودێر وشـوانن، وەهـەموتان بـەرس وچـاودێرو سەرپـەرشـتیارن بەسەر ئەو كەسانەی وان لەبەر دەستتدا لەهـەمو چـین وتوێـژەكانی مـرۆڤ و كۆمـەڵگا . پیـاو بەرپرسـە لەئەندامانی خێزانەكەی ، مامۆستا لەقوتابیەكانی ، دایك لە منداڵ ومێردو ماڵی مێردەكەی ئەمینـدارە، سەركردە وبەرپرس سەروماڵ وگیان وعەرزونامۆسی وڵات و هاو وڵاتیـانی لەئەسـتۆدایە .. وە هـەروەها. (وەرگێڕ).

بۆیــەش مامۆسـتا شـوانە لەقوتابخانەکـەی خـۆی دا وبەرپرسـە بەرامبـەر بەقوتابیـەکانی ودەبـێ بەباشـترین شـێوە پـەروەردەیان بکـات وفێـری زانسـتوزانیاریان بکـاتو فێـری ڕەوشتو ئەخلاقی بەرزو پیرۆزیان بکاتولەخراپە بیان گێڕێتەوە.

کەواتە ئەی پەروەردیارو ئـەی مامۆسـتای بـەڕێز پێویسـتە لەسـەرت پـێش هـەمو شـتێكوپێش هـەمو کەسـێك بـەر لەهـەمو هـەنگاوێكو لەهـەنگاوی یەکەمتـدا خـۆت چـاك بکـەیتوخۆت بەسـیفەتی جـوانو بەئـەخلاقی بـەرز برازێنیتـەوە. دەبـێ لـەپێش چـاوی قوتابیو مندالەکان ڕەفتاری باش بکەیتوجوانترین قـسەوگفتار بەگوێـچکەیاندا بـچرپێنیو باشترین ئاکار بنوێنیو ئەنجام بدەیت، قسەی فشقیاتو حەلەقو مەلەق لەگەڵ قوتابیـانو مندالەکاندا مەکەو کەسایەتی بەرزی خۆت بنوێنە، بـۆ ئـەوەی ئـەو کەسـایەتی وهەیبـەتو ئەخلاقی خـۆت بـەجوانی نیـشان بـدەیتو ڕێـزو خۆشەویستیت لـەدڵو دەرونولەمێـشکی ئەواندا تۆمار بکەیتو وێنەی تۆ لەچاوی قوتابیەکاندا تۆمار ببێتو ڕەنگ بداتەوە، چـونکە هەمیــشە قوتابیــانو زارۆکــەکان لاســایی مامۆســتاو پــەروەردیارو گــەورەکانی خۆیــان دەکەنەوە[1]. گرانیوسەنگینیو ڕەوشت پـاکی پـەروەردیار وەك بـاوكو دایکـان باشـترین پەروەردەو چاو لێ کردنە بۆ قوتابیان ومندالە خنجیلەو چاو گەشەکان[2]

١) کوردیش دەڵێ: گەورە ئاو دەرێژێ وگچکەش پێ ی پێ دەخشێنێ.(وەرگێڕ).

٢) بەڵێ، ڕەوشت ونەخلاق وهەڵس وکەوتی باوك ودایك ومامۆستاوپەروەردیار چۆن بێت وێنەی قوتابی ومندالەکانیش هەمان وێنەی ئەوان دەردەچێتەوە. ئەوان ڕەوشت پاك وخواناس وئیماندار و خۆ داپۆش بن بەپۆشاکی شەرعی پڕ لەحەیاو حەشمەت مندالَ و قوتابیەکانیش وەك ئەوان ئیمانـدارو لـەخوا تـرس وڕەوشت بەرزو بەئەخلاق دەردەچن ، خوا نەخواستە ئەوان بـێ بـاوەڕو شـەقاوەو بـێ ڕەوشـت و ڕوت وسفورو خۆ ڕازاوە بن قوتابیانو مندالەکانیشیان هەر وا دەبن. وەبەپێچەوانە کەشـی ڕاسـتە هـەروەکو لەسەرەوە باسمان کرد. ئەوەتە پێغەمبەری خواﷺ دەفەرموێ: {کلُ مولودٍ یولد علی فطرتـه فـأبواه یهودانه وینصرانه ویمجوسنه...} واتە: هەمو لەدایك بوێك بەموسڵمانێتی لەدایك دەبێت . بـەلام دوایـی دایك وباوکی یان چ بن ئەوانیش دەبن بەو دین وڕێبازو ڕەوشتە، جولەکە بن جولەکەن، فەلە بن فەلەن،

بێ گومان ئـەم ناميلكەيـەم بـۆ خوشـكو بـرا مامۆسـتاكانم نوسـيوە دواى كۆكردنـەوەو نوسـينو مانـدو بـونو ئەزمونوزانياريـەكى زۆر لەكاتوسـاتەكانى پـەروەردەو فێركردنمـدا كەنزيكەى چل ساڵانێكى خاياند. هيوادارم كەسود بەخش بێت لەبوارى پراكتيكى(كردەكى ـــ عملـــى) دا، مامۆســـتايان و پـــەروەردياران و دايكانوباوكـــان كـــەڵكى لێ وەربگـــرن، مامۆستايانى نمونەيى وباشو سەركەوتويان لێ دەربچێت.

لەخواى گەورەم داوايە كەسودو كەڵكى بۆ برايانى موسڵمانم هەبێتو بيكاتە كارێكى پوختەو نياز پاك لەڕوى خواى گەورەو بەرزو بەخشندەدا.

نوسەر

---

ئاگر پەرست بن ئاگر پەرستن، مەگەر ئەوەى خواى گەورە مەبەستى بێت بيهێنێتە سەر ڕێگەى ڕاست هۆكارەكانى بۆ دەگونجێنێ. كورديش دەڵێ : گيا لەسەر پنجى خۆى دەڕوێتەوە.(وەرگێڕ).

## ئەرکی پەروەردیاری سەرکەوتوو

شتێکی بەڵگەنەویست وتەیئوریە کەئاوات وئامانجەکانی پەروەردەو فێرکردن بریتیە لەدروست کردنی کەسیەتیەکی بەرزو نمونەیی لەنێو کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دا، ئەو کەسیەتیە نمونەییەش ئەو کاتە دێتە دی کەپەیوەست بێت بەدروست کارەکەی خۆی، واتە بەپەروەردگاری باڵا دەستو هەرچی سیستەمو کەتەلۆکی ژیانی هەیە لەو خوایە بەرزو بێ هاوتایە وەری بگرێتو ئەمجار کۆمەڵگاکەی خۆی پێ ڕاست بکاتەوەو چەمکەکانی ژیانی کۆمەڵگاکەی لەسەر ئەو بنچینەو بنەما ڕاستەقینە خواییانە دابمەزرێنێت، ئائەمەیە ڕێبازو ئامانجی دروستو ڕاستەقینە لەپەروەردە کردن وفێرکردندا لەدروست کردنی مامۆستاو پەروەردیاردا.

شتێکی ئاشکرایە کەپەروەردەو فێر کردن چەندان بنچینەو بنەمای هەیە کەلەسەری دادەمەزرێت، لەکۆمەڵێکەوە بۆ کۆمەڵێکی ترو بەگوێرەی چەمکو بیرو زیهنی ئەو کۆمەڵگایە دەگۆڕێت. ئەگەر لەکۆمەڵگای کۆمۆنیستی بێت ئەوا بنەماکانی پەروەردە لەسەر بنچینەی مادیەتو ددان نەنان بەبابەتە ڕوحی یەکانو پچڕانی پەیوەندی مرۆڤ بەپەروەردگارەوە دادەمەزرێت. وەلەکۆمەڵگای ڕۆژئاوادا لەسەر بنچینەو بنەمای داگیر کردنو خۆویستیو داهێزران دادەمەزرێت، بەڵام لە کۆمەڵگای ئیسلامی دا پرینسیپەکانی پەروەردەو فێرکردن لەسەر بنچینەیەکی بەهێزو پتەوو و لەسەر بناغەو بنەمای بیروباوەڕێکی (عقیدة) ڕاستو دروستو سۆزە بەرزو بەها بەرزو پۆڵایینەکانو ئاکاروڕەوشتە جوانوبەرزەکان دادەمەزرێت کەپەیوەندی قوتابی یامرۆڤ بەگشتی بەخوای پەروەردگارەوە توندو تۆڵو تۆکمەیە، ئەمە وێڕای پەیوەندی خۆشەویستی لە نێوان مامۆستاو برا قوتابیەکانیو لەنێوان بەڕێوەبەرو مامۆستایانو بەڕێوەبەرایەتی قوتابخانەکەیو دواتریش پەیوەندی خۆشەویستیوڕێز بەخێزانەکەی توندو تۆڵ تر دەکات، ئەمەسەرباری پەیوەندی ڕوحی خوایی لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگاکەی ڕۆژ بەڕۆژ

پتەوترو بەهێز تر دەبێتو ڕەوڕەوەی ژیانی کۆمەڵایەتیو برایەتیو تەباییو یەك ڕیزو یەك دەستی خێراترو خێراتر دەخولێتەوە([1]).

ئەگەر ویستمان ئەم کەسیەتیە لەواقیعی کارکردندا بهێنینە دی ئەوا دەبێ پەروەردیارێکی سەرکەوتو و کارامە لەبواری پەروەردەو فێرکردندا بەم شێوەیەی کەلەسەرەوە باسمان کرد دروست بکەین. دیارە دەبێ ئەم پەروەردیارە چەندان مەرجو ئاکاری جوانی تێدا بێنە دی هەتاکو بتوانێت ببێتە پەروەردیارێکی چاكو مامۆستایەکی بەکەڵكو سەرکەوتوو.

---

١) خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾ واتە: موسڵمانان ، بڕواداران برای یەکترین، دەی باهەمیشە نێوانی یەکتری چاکتر بکەن وئیسلاح لەنێوان خۆیان دا بەرپا بکەن وپەروەردەوفێرکردنو ئامۆژگاری یەکتری بکەنو یەکتری بەرەو چاکەو چاکەکاری هەڵ بنێن تا یەکتریتان خۆش بوێت وبەختەوەرو بەختیار بژینوتاخوای گەورەو سۆزو بەزەیی پێتان دا بێتەوە و لە دنیاو لەقیامەتدا سەربەرزو سەرفرازتان بکات. هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ۚ﴾ واتە: هەمیشە هاریکاری ویارمەتی یەکتری بدەن لەسەر چاکەو چاکەکاری و ئامۆژگاری یەکتری کردن ودەستگیرۆیی نەك لەسەر خراپەو خراپەکاری وملی یەکتری شکاندنو چاڵ بۆ یەکتری هەڵ کەندن ولەبەر یەك بردنی خانەو شانەکانی کۆمەڵگا کەخێزانەومامۆستاو خوێندکاران وقوتابیان پۆلو ژووری بەرێوەبەرو مامۆستا بکەنە شەرگەو وکورسی مێزەکان لەیەکتری بکەن بەسەنگەرو مەتەرێز. بەناوی حیزبایەتی ورێکخراوی مامۆستایانوقوتابیان و خوێندکاران ونازانم چی وچی ..هەروەکو ئەمڕۆ لەواقیعی حاڵی خۆماندا لەعێراق بەگشتی ولەکوردستانی خۆماندا بەزەقی وبەتایبەتی دەبینین (وەرگێڕ).

## مەرجەکانی پەروەردیاری سەرکەوتوو

١. دەبێ لەکارەکەی دا کارامەو پسپۆڕ بێت، هەمیشە لەشێوازە فێرکاریوپەروەردەکاریەکانیدا داهێنەر بێت ویست و ئارەزو خۆشەویستی بۆ کارەکەی هەبێتومندالآنو قوتابیەکانی خۆش بون، هەوڵێکی لێبڕاوانە بدات بۆ پەروەردەو فێرکردنیان بەشێوەیەکی دڵسۆزانەو زۆر چاك ودروست، بەرژەوەندی گەلیان لەچاوی قوتابیەکانەوە سەیر بکەنو زانستوزانیاریو ئامۆژگاری بەکەڵکیان پێ ببەخشن، لەسەر ئەخلاقو ڕەوشتی جوانوبەرز ڕایان بێنن، هەوڵێکی بێ پایان بدات بۆ دور خستنەوەیان لەخو وڕەوشتی ناشیرینوبێزراو، چونکە ئەو لەهەمان کاتدا پەروەردیارو فێرکاریشە. هەم زانستوزانیاری بەسود فێری قوتابیانونەوەی دوارۆژ دەکاتوهەم پەروەردەو ڕاهێنەرو پێك هێنەری مرۆڤێکی ڕاستو دروستە لەسەر ئەو ئامانجەی کەخوای گەورە مرۆڤی لەپێناودا دروست کردوە.

٢. دەبێ پێشەنگێکی باشو بەکەڵك بێت، لەقسەکانیدا، لەکردارەکانی دا، لەخوو ڕەوشتی دا، لەڕاپەڕاندنی کارو ئەرکەکانی سەرشانی دا بەرامبەر بەخوای پەروەردگاری خۆی، هەروەها بەرامبەر بەگەلەکەیو بەرامبەر بە قوتابیەکانیو دەبێ ئەوەی بۆ خۆی وماڵومنداڵەکەی دەی خوازێت بۆ قوتابیەکانیشی بیەوێ، گیانی بەزەییولێ بوردەیی هەبێت ونەرم ونیان بێت لەگەڵیاندا، ئەگەر ناچاری سزادانیان کرد با بەڕەحم وبەزەیی بێت. هەروەکو پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { لایؤمن احدکم حتی یحب لأخیه مایحب لنفسه }(١).

٣. لەمەرجەکانی مامۆستای سەرکەوتو ئەوەیە دەبێ قوتابیەکانی بەگوێرەی بنچینەو بنەماکانی زانستوپەروەردەو ئەخلاقی جوان ڕابهێنێ کەلەسەر چەمكوبنەماکانی ئیسلام

---

(١) أ ـ متفق علیه.

ب ـ واتە: بڕوای نیە هەرکەسێك لەئێوە هەتاکو ئەوەی بۆ خۆی دەیەوێ وپێ ی خۆشە بۆ برا موسڵمانەکەشی بخوازێت وبیەوەێ.(وەرگێڕ).

دامەزراوە. دەبێ زۆریش ئاگادار بێت قسەو كردارەكانی یەك بنولێك جیا نەبن وتێك نەگیرێن. گوێ بگرە بۆ خوای گەورە وبالا دەست چیمان پێ دەفەرموێت:﴿ كَبُرَ مَقْتًا عِندَ ٱللَّهِ أَن تَقُولُوا۟ مَا لَا تَفْعَلُونَ ﴿٣﴾ ﴾ سورة الصف:٣.(١)

دیارە ئەمە بەرپەرچ دانەوەی ئەو كەسانەیە كەهەر قسەیان هەیەو بەس وبەكردەوە هیچیان لەدەست هەڵ ناوەڕێت.هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { اللهم إني أعوذُ بك من علم لاينفع}(٢) . واتە كاری پێ ناكەم و بەخەڵكیشی ڕانەگەیەنم وخەڵكی فێری ئەو زانستە خراپە ناكەم ولای خۆم حەشاری بدەم تا لەگەڵ خۆمدا دەیبەمە ژێر گڵەوەو لەدنیادا ڕەوشت وئەخلاقی خۆمی پێ نەڕازێنمەوە.

هەروەها گۆتەی شاعیر:

يـا أيهــا الرجل المعلـم هَلاَّ لِنَفسِـكَ كــان ذا تعليـم(٣).

٤ . مامۆستا پێویستە بزانێ كەئیشی ئەو وەك ئیشی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) وایە كەخوای گەورە ناردونیە خوار بۆ ڕێنومایی‌و دەست گیرۆیی مرۆڤ وفێركردن‌وپەروەردە كردن وپێ ناساندنی پەروەردگارو دروستكەری خۆیان.. هەروەها مامۆستا لەجێگەی باوك‌ودایكە لەسۆزو خۆشەویستی دا بۆ قوتابیەكانی و بەرپرسە

---

(١)واتە: ئەی ئەو كەسانەی كەبڕواتان بەخواو بەپێغەمبەرﷺ هێناوە بۆچی ئەوەی بەدەم دەی ڵێن بەكردەوە نای كەن، ئەدی نازانن خوای گەورە زۆر ڕقی لەو كەسانە هەڵ دەستێت كە ئەوەی بەدەم دەی ڵێن بەكردەوە ئەنجامی نادەن وتەنیا قسەیان هەیەو بەس ، خوا زۆر زۆر ڕقی لەم جۆرە كەسانەیە.(وەرگێڕ).

(٢) أ ـ واتە: خوایە گیان پەنا دەگرم بەتۆ لەزانستێك كەسود بەخش نەبێت.

ب ـ رواه مسلم.

(٣) ئەی ئەو كەسەی كەمامۆستایت، دەی شتێك لەزانستو ڕۆشنبیری بۆ خۆت كۆ بكەرەوە كەبتوانیت فێرخوازەكانتی پی فێر بكەیتو پەروەردەیەكی پاكو پوختیان بكەیت.(وەرگێڕ).

بەرامبەر بەو قوتابیانە لە ئامادە بونیان، لەگرنگی دان بەوانەکانیان. نەك هەر ئەمەش بەڵکو دەبێ یارمەتیشیان بدات لەحەل کردن وکردنەوەی گرێ کوێرەکانی کێشەو تەنگوچەڵەمەکانیان‌و هەستان بەهەمو کارو فرمانێك کەلەسنوری ئەرك وکارەکانی ئەو دەژمێردرێن. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { کلکم راعٍ، وکلکم مسئولٌ عن رعیته }([1])

با مامۆستایان چاك بزانن کەئەوان لەقوتابیەکانیان بەرپرسن لەبەردەم خوای گەورەدا کەچی فێر کردون‌وچی فێر نەکردون. وەئایا دڵسۆزو جیدی بوە لە بەدوادا چونی کێشەکانیان‌ولەتوێژینەوەو لێکۆڵینەوە لەئاستەنگەکانیان‌و گەڕان بەدواتی ڕێگە چارە ئاسانەکان‌ورێنومایی کردن ودەست گرتن وگێڕنەوەیان لەخراپەکاری وئاراستە کردنیان بەرەو چاکەو چاکخوازی. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ إنَّ الله سائلٌ کل راعٍ عما إسترعاه، أحفِظَ ذلك أم ضیعه؟ حتی یسأل الرجل عن أهل بیت}([2])

هەروەکو پێویستە لەسەر مامۆستا یاپەروەردیار کەبەو شێوە زمان وزاراوە قسەیان لەگەڵ دا بکات کەتێ ی دەگەن وبەگوێرەی پلەی تێگەیشتنیان بیان دوێنێ و وانەکانیان بۆ ڕاڤەو شرۆڤە بکات. علی ﷛ گوتویەتی: ( حدثوا الناس بما یعرفون، أتحبون أن یکذب الله و رسوله؟([3]) .

---

(١) متفق علیه

(٢) أ ـ حسن رواه النسائی عن أنس.

ب ـ واتە: خوای گەورە لەهەمو شوانێك دەپرسێتەوە لەو شتانەی کەشوانەتی بەسەردا کردون، ئایا باشی پاراستون وهەقی خۆی داونێ، یاباشی لەوەڕاندون وخزمەتی کردون یابەپێچەوانەوە ، هەتاکو پیاو دەربارەی ماڵ ومنداڵەکانی خۆشی لێ ی دەپێچرێتەوە، ئایا لەسەر بەرنامەو ڕەوشت ورێساکانی ئیسلام پەروەردەی کردون یابەپێچەوانەوە...تد. (وەرگێڕ).

(٣) أ ـ أخرجه البخاری فی العلم، باب خص قوماً دون قومٍ فی العلم.

ب ـ واتە: بەو زمان وبەو شێوە قسە لەگەڵ خەڵکی بکەن کەتێ ی دەگەن ودەی زانن و بەگوێرەی ئاستی هۆشیاری وزانستی ئەو کەس وکۆڕو کۆمەڵە قسە یان لەگەڵدا بکەن، ئایا حەز دەکەن کەدرۆ لەگەڵ خواو پێغەمبەری ﷺ خوادا بکەن؟(وەرگێڕ)

٥ ـ مامۆستا بەهۆی كارەكەیەوە لەنێو قوتابیانێك دا دەژیا كەپلەی تێگەیشتن وزانیاری وئەخلاق وپەروەردەو زیرەكیان جیاوازە.

بۆیە دەبێ لەگەڵ هەمواندا هەر كەس بەئەخلاقی خۆی هەولیان لەگەڵ دا بدات.چونكە ئەو وەك باوك وایە بۆیان ولەجێگەی باوك دایە ودەبێ بەچاوی باوكایەتی سەیریان بكات بەگوێرەی فەرمودەی پەروەردیاری گەورەمان پێغەمبەر محمدﷺ كەفەرمویەتی: {إنما أنا بمنزلة الوالد أعلمكم}(١)

٦ ـ پێویستە لەسەر مامۆستای سەركەوتو كەهاریكاری ویارمەتی برادەرەكانی بكات، ئامۆژگاریان بكات وڕاوێژیان پێ بكات لەو كاروبارانەی كەپەیوەندی بەكاروبارو بەرژەوەندیەكانی قوتابیەكانیانەوە هەبێت، بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێكی بەكەڵك ودروست بۆ قوتابیەكانی ودەبێ هەمو مامۆستایان شوێن كەوتەی پێغەمبەرﷺ بن وچاو لەو بكەن كاتێ خوای گەورە دەربارەی ئەو پێغەمبەرەﷺ ڕادەگەیەنێ ودەفەرموێ: ﴿لقد كان لكم في رسول الله أُسْوَةٌ حسنة﴾(٢)

٧ .هەر چەندە زانابی خۆت بەكەم بزانە(التواضع العلمي): ددان نان پێ لە بەڕاستی نان سەربەرزی ومایەی ڕەوشت وئەخلاقی بەرزە، گەڕانەوە بۆ ڕاستی وهەق وسەركەشی نەكردن لەسەر هەڵەو تاوان چاكترەو زۆریش چاكترە لەخول خواردنەوەت لە خولگەی تاوان وخراپەوسور بونو پێدا گرتن لەسەر خراپەوخراپەكاری وخوانەناسی.

---

(١) أ ـ صحيح رواه أحمد وأبو داود.

ب ـ واتە: من بۆ ئێوە وەك باوك وام وفێری ئایینی خواو بەرنامەكەی خواتان دەكەم وخوای گەورەتان پێ دەناسێنمو پەروەردەیەكی ئیسلامیانەتان دەكەم.(وەرگێڕ).

(٢) أ ـ الأحزاب :٢.

ب ـ واتە: پێغەمبەرﷺبۆ ئێوە نمونەو پێشەنگێكی باش وچاكە، دەی لەكارو كردەوەكانتاندا چاو لەو بكەن وشوێن پێ ی سوننەتی ئەو هەڵ بگرن ودوای ئەو بكەون وبەمو لێ ی لامەدەن.(وەرگێڕ).

لەسەر مامۆستا پێویستە کەشوێن کەوتەی پێشینەی پیاو چاك (السلف الصالح) بێت لەهەمو هەنگاوەکانی ژیانی داو لەئاست ڕاستی دا و پێ لەهەڵەکانی خۆی بنێت وملکەچ وخۆبەکەم زان بێت، هەر کاتێك ڕاستی بۆ دەرکەوت وزانی ئەو هەڵەیە، دەبێ دەستەوستان پێ لەهەڵەکانی خۆی بنێت جابا ئەو کەسەی بۆی ڕاست دەکاتەوە قوتابیەکی خۆشی بێت. بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە(إبن أبی حاتم) لەکتێبەکەی خۆی دا( مقدمة الجرح والتعدیل) ئاماژەی پێ کردوە کاتێ کەبەسەر هاتەکەی مالك ﷺدەگێڕێتەوە کەفتوای لەسەر شتێك دابو، بەلام لەدوایی دا فەرمودەی لەسەر دیوە کەئەو هەڵە بوە، کەبەم شێوە دە گێڕێتەوە:﴿باب ماذکر من إتباع مالك لآثار النبیﷺونزوعه عن فتواه عندما حُدِّثَ عن النبیﷺخلافه﴾: قال إبن وهب: سمعت مالكاً سُئِلَ عن تخلیل أصابع الرِجْلَیْنِ فی الوضوء فقال: لیس ذلك علی الناس. قال: فترکته حتی خف الناس، فَقُلْتُ له: عندنا فی ذلك سنّة، فقال وماهی؟قُلْتُ: حدثنا اللیث بن سعد وإبن لهیعة، وعمرو بن الحارث عن یزید بن عمرو المعافری عن أبی عبدالرحمن الحبلی عن المستورد بن شداد القرشی:قال رأیت رسول اللهﷺیدلك بخنصره مابین أصابع رِجلیه، فقال: إن هذا الحدیث حسنٌ، وما سمعت به قط إلاّ الساعة، ثمّ سمعته بعد ذلك یُسأل فیأمر بتخلیل الأصابع﴾([1])

---

(١) أ . بڕوانة (مقدمة الجرح والتعدیل ص٣٠)

ب . دوای ئەوەی ئەم فەرمودەیەیان بۆ گێڕایەوە هەروەکو لەسەرەوە نوسیمان: پوختەی فەرمودەکەش ئەوەیە کەپێغەمبەرﷺکاتێ دەست نوێژی هەلگرتوە بەپەنجە توتەی پەنجەی ناوە بەنێوانی پەنجەکانی قاچی دا دوای ئەوەی ئاوی پێدا دەکردن واتە نێوانی پەنجەکانی قاچی بەپەنجە توتەی تەڕدەکرن وپێ دادەهێنان.کەئیمامی مالك ﷺ ئەم فەرمودەیەی پێ دەگات ودەی بیستێ دەڵێ: ئەم فەرمودەیەم نەبیستوە، ئەمە یەکەمجارە بیبیستم وفەرمودەیەکی چاکە(حسن) ەو ئیدی لەوکاتەوە هەر کەسێك پرسیاری لەئیمام مالك بکردایە، دەی گوت: پەنجەتان لەنێوان قامکەکانی پێتان ڕابهێنن وپاکیان بکەنەوە.وەفتوا کۆنەکەی خۆی وەلا ناو ددانی بەڕاستیەکاندا هێنا.(وەگێڕ).

ئەگەر بێت وبەڵگەو نمونەکانی ژیانی پێشینەی پیاو چاك( السلف الصالح) بێنینەوەو بیان خەینەڕو ئەوا لەم چەند لاپەڕەیەدا جیێ یان نابێتەوە. بۆیە لەسەر مامۆستای سەرکەوتو پێویستە کەدەیەویێ لەکارەکانی دا سەرکەوتو بێت دەبیێ بۆ هەق وڕاستی هەمیشە مل کەچ بێت وددان بەڕاستیەکاندا بێنێت و لەکەللە ڕەقی خۆی دابەزێت وپیێ لەهەڵەکانی خۆی بنێت و بەکردەوەش بیسەلمێنیێ ئەگەر هات وبینی وەڵامی قوتابیەك لەوەڵامی ئەو ڕاست تر بو، یاڕاو بیرو بۆچونی کەسێکی تر یاقوتابیەکەی لەهی ئەو ڕاست تر بو، باڕای بگەیەنیێ کەوەڵامی ئەو قوتابیە لەهی ئەو ڕاست ترە وکار بەهی ئەو بکەن وسەرکەشی نەکات لەسەر هەڵەکەی خۆی وپیێ دابگرێت وبڵیێ: نەخێر هەر وەڵامی من ڕاسترە لەکاتێکیش دا ئەو هەڵەیە. وەپێویستە لەسەری ئەم ڕەوشتە بەرزو گەورەیە کەبریتیە لەگەڕانەوە بۆ هەق وڕاستی وددان نان بەهەڵەی خۆداو مل کەچ بون بۆ ڕاستی لەمنداڵان وقوتابیەکانی بگەیەنیێ. دیارە کەوای کرد پتر متمانە وخۆشەویستی قوتابیەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشیێ.

نزیکەی چل ساڵێك دەبیێ لەناو مامۆستایاندا وەك مامۆستایەك و پەروەردیارێك ژیانم بردۆتە سەر، ئەگەر هەمو شتێکم لەبیر بچێتەوە، ئەومامۆستایەم لەبیر ناچێتەوە کەلەخوێندنەوەی فەرمودەیەکدا هەڵەی کرد، هەندیێ لەقوتابیەکانی کاتیێ قوتابیەکان بۆیان ڕاست کردەوە ئەو ددانی پێدا نەدەهێناو لەسەر هەڵەکەی خۆی سور بو ودەم بەدەمەی لەگەڵ دەکردن. ئەمە وای کرد کەئەو مامۆستایە کەکەسیەتی خۆی لەبەر دەم قوتابیەکانی لەدەست بدات ئیدی متمانەیان پیێ نەماو ئەو ڕێزەی جارانی نەماو وەك پێویست گویێ یان بۆ وانەکانی شل نەدەکرد.

ئێستاش هەندیێ لەهەڵوێستی مامۆستا ڕاستگۆکانم لەبیرە کەلەڕای خۆیان دادەبەزین وهەمیشە پیێ یان لەهەڵەی خۆیان دەنا بەرامبەر بەقوتابیەکانیان ولەبەرامبەریشدا خۆشەویستی ومتمانەی قوتابیەکان بۆ ئەو مامۆستایانەپتر دەبو وجێگەی ڕێزو شانازی قوتابیەکانی یان بون.

خۆزگایەکو هەمو مامۆستایان و ئەندامانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەگشتی ڕێگەی ئەوانەیان دەگرت ولەسەر ڕێبازی ئەوان دەڕۆیشتن لەگەڕانەوەیان بۆ هەق وهەقخوازی و بۆ دادپەروەری وڕاستی بگەڕانایەوەو بەپەیڕەو وپرۆگرامی خواو بەقورئانی پیرۆز کەکەتۆلۆکی ژیانی مرۆڤایەتیە لەسەری دەڕۆیشتن ولەسەر ڕوی زەوی حوکمیان دەکردو تەنیا قورئان وسوننەتیان دەکردە سەرمەشقی ژیانی خۆیان نەوەکو بەرنامە دەست کردە بۆگەنەکانی دنیاو دەست بەرداری ڕێگەی شەیتان دەبون.

٨ . **ڕاستگۆیی وپابەند بون بەپەیمانەوە ( الصدق والوفاو بالوعد ):**

پێویستە مامۆستا هەمیشە لەقسەو گفتارەکانی دا بەڕاستیەوە پابەند وڕاستگۆ بێت، چونکە ڕاستگۆیی هەموی هەر خێرو بەرەکەتە، ڕاستیش تەنیا ئەوەیە کەلەگەڵ بەرنامەکەی (الله عزوجل) دا یەك بگرێتەوە، نەك ئەوەی لەگەڵ بەرنامە شەیتانیەکاندا بێتەوە لێت تێك نەچێت. بۆ نمونە: مامۆستایەك هاوڕێکەی جگەرە کێشەو لەو بارەوە لەلایەن قوتابیەکانیەوە پرسیاری لێ دەکرێ، لەبری سەرزەنشتی برادەرەکەی بکات کەچی ئەو بەرگری لێ دەکات ودەڵێ: هۆی جگەرە کێشانی ئامۆژگاری دکتۆرێکە بۆ ئەو. دیارە ئەم ڕەفتارەی قوتابیەکانی دەخاتە گومانەوە بەرامبەر بەو مامۆستایەیان، کاتێ کەلەپۆل دێنە دەرەوە قوتابیەکیان دەڵێ: کوڕینە بینیتان مامۆستا چۆن درۆیەکی زلی لەگەڵدا کردین؟

خۆزگایەکو ئەو مامۆستایە لەوەڵامەکەی دا ڕاستی بکردایەو پاساوی بۆ برادەرەکەی لەبەردەم قوتابیەکانی دا نەهێنابایەوە، لەبری ئەمە بۆ قوتابیەکانی ڕون بکردایەوە کەجگەرەکێشان حەرامەو کارێکی خراپ ونارەوا و نابەجێ یە چونکە زیان بەلەش دەگەیەنێت وئازاری دەرو دراوسێ دەدات.ماڵ لەناو دەبات، ئەگەر ئەمەی بکردایە متمانەی قوتابیەکانی وەدەست دەهێناو خۆشەویستیان بۆی پتر دەبو. ئەو مامۆستایە دەیتوانی بەقوتابیەکانی بڵێ: ئەم مامۆستایە تاکێکە لەمرۆڤ ونیشانەکانی مرۆڤایەتی تێدان، مرۆڤەو هەڵەش دەکات وچاکەش دەکات چونکە مرۆڤ پارێزراو( معصوم) نیە.

دیارە ئەم جگەرە کێشانەش یەکێکە لەهەڵەکانی وهیوادارین وازی لێ بێنێ تۆبە بکات. ئەمەتەپێغەمبەری خواﷺ ئەمەلەفەرمودەیەکی دادەسەلمێنێ کەدەفەرموێ: {کلُّ بنی آدم خطاءٌ وخيرُ الخطائين التوابون} (١)

ئەم مامۆستایە دەیتوانی ئەم پرسیارەی قوتابیەکەی بکاتە سەر مەشقێك بۆ هەمو قوتابیەکانی وڕونکردنەوەی زیان ومەترسیەکانی جگەرە نەك هەر بۆ قوتابیەکانی بەڵکو بۆ هەمو خەڵکی ، لەڕوی شەرعی و فەرمودەکانی پێغەمبەرﷺ ورای زانایان ونوژداران و پسپۆڕانەوە ڕون بکردایەتەوە وهەمو بەڵگەکانیشی بخستایە ڕو. بەمە دەیتوانی سود لەپرسیاری قوتابیەکە وەربگرێت ولەپەروەردەو فێرکردنی دا ڕۆژانە لەپۆل ولەدەرەوەی پۆلیش ئاراستەی هەمو قوتابیەکانی تر وخەڵکانی تری دەرەوەی قوتابخانەکەشی بکردایە. پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی :{ ومايزال الرجل يتصدق ويتحرى عن الصدق حتى يكتب له عندالله صديقاً، ومايزال الرجل يكذب ويتحرى للكذب حتى يكتب له عندالله كذاباً}(٢).

ڕاستگۆیی ڕەوشتێکی بەرزە، پێویستە مامۆستاو پەروەردیار لەدڵی قوتابیەکانی دا تۆوی ڕاستی وڕاستگۆیی بوەشێنێت ولەپێش چاوی قوتابیان شیرینی بکات ولەسەر ڕاستگۆیی ڕایان بهێنێ بۆ ئەمەش دەبێ لەگفتارو قسەو کردەوەکانی خۆیاندا ڕەنگ بداتەوە. نابێ هەرگیزاو هەرگیز درۆ بەزمانیدا بێت بەتایبەتی لەپۆل داو لەبەردەم

---

(١) أ . واتە: هەمو کەسێك قابیلی هەڵە کردنە، بەڵام باشترینی هەڵەکاران تۆبەکارانن.(وەرگێڕ).

ب. صحيح رواه أحمد

(٢) أ. متفق عليه.

ب. واتە: کەسێك ڕاستگۆیە وتەنیا ڕاستی دەڵێت وهەمیشە بەدوای ڕاستی دا دەگەڕێت تا خوای گەورە بەبەندەی ڕاستگۆی دەنوسێت ، وە کەسی تریش هەیە هەر درۆ دەکات وهەمیشە لێرەوە لەوێ تەنیا بەدوای درۆو درۆ کردندا دەگەڕێت تا وای لێ دێت خوای گەورە لای خۆی بەدرۆزن ناو زەدی دەکات ودەی نوسێت.(وەرگێڕ).

قوتابیانی دا. هەتاکو لەگاڵتە کردنیشدا دەبێ ڕاستگۆ بن، وڕاست واقیعیش بێت، دەبێ ئەوە بڵێن چونکە هەروەکو گوتمان قوتابیەکانیش چاو لەوان دەکەن و ڕوی دوەمی ئەوانن، پێغەمبەرﷺ ئەگەر سوحبەتیشی دەکرد شتی ڕاستی دەگوت([1]). جابا مامۆستایان لەدرۆ کردن زۆر وریا بن بەتایبەتیش لەگەڵ قوتابیاندا، ئەگەر سوحبەتیشی کرد دەبێ ڕاستیی بێت واتە ئەوەی باسی دەکات دەبێ ڕوداوی ڕابردو یاداهاتوی ڕاست و واقیع بن نەك درۆو هەڵبەستی زمان وفیکری خۆی بێت. ئەگەر پەیمانی بەقوتابیان ومنداڵەکان دا دەبێ پەیمانەکەی وەك خۆی بێنێتە دی، و وەفا لەگفتارو کردەوەکانی دا بەدی بکرێت هەتاکو بەڕاستگۆی بزانن ومتمانەیان پێ ی هەبێت، چونکە قوتابیەکانی ڕاستی ودروستی بەباشی لێك جیادەکەنەوە باڕوبەڕوش شەرم بکەن ولە ڕوی مامۆستایەکەیان نەدەنەوە هەروەکو لەبەسەر هاتی ئەو مامۆستایە بیستمان کەلەسەرەوە ئاماژەمان پێ کرد کەپاساوی بۆ برادەرە جگەرە کێشەکە هێنایەوە، یەکسەر هەستیان بەدرۆی مامۆستایەکەیان کرد.

**٩. ئارام گرتن وخۆڕاگری:**

پێویستە لەسەر مامۆستا کەدەبێ خۆڕاگرو ئارام گر بێتولەکارەکانیدا پێداگرو ڕاوەستاوی (إستقامة) هەبێت بەتایبەت لەبەردەم کێشەوئاستەنگەکانی قوتابیانو پرۆسەی فێر کردن وپەروەردەداو لەماندو بونو کوێرەوەریەکاندا پشو درێژ بێت. چونکە پشو درێژیو خۆڕاگری باشترینو بەهێزترین هۆکارێکە لەبەر دەم ئەو کارە پیرۆزەی

(١) پێغەمبەرﷺ جارێکیان پیرێژنێکی گریاند، کاتێ پێ ی فەرمو پیرێژن ناچنە بەهەشت پیرێژنەکە کەئەمەی بیست دەستی کردە گریان وگوتی: ئەی قوڕم بەسەری مادام پێغەمبەرﷺ وابفەرموێ تازە تەواو من ناچمە بەهەشت . چونکە پێغەمبەرﷺ دەزانێ، بەڵام پیرێژن نەی دەزانی کەمرۆڤ وجنۆکەکان بەپیری ناچنە بەهەشتەوە. ئەمجار پێغەمبەرﷺ فەرموەی: نەنەگیان مەگری (إنشاء الله) دەچیە بەهەشت تۆ بەگەنجی دەچیە بەهەشت، چونکە هەمو کەس لەڕۆژی قیامەتدا گەنج دەبنەوەو پیری نامێنێ.ئەمجار پیرەژنەکە فەرامۆشی هاتەوە بەرو ژێر بوەوە.(وەرگێڕ).

كەئەو پێ ی هەڵ دەستیٚوسەركەوتن بەسەری دا. خوای باڵا دەست و كاربەجێ دەفەرموێ:﴿ وَٱسْتَعِينُوا۟ بِٱلصَّبْرِ وَٱلصَّلَوٰةِ ۚ وَإِنَّهَا ﴾([1])

هەروەها پێغەمبەرﷺفەرمويەتی:{ المؤمن الذی يخالط الناس ويصبر علی أذاهم خيرٌ من المؤمن الذی لايخالط الناس ولايصبر علی أذاهم}([2])

---

(١) أ. البقرة: ٤٥.

ب. واتە: لەكاتی تەنگ وچەڵەمەو ناخۆشی وماندو بون ومەشەقەت وشەكەتيەكاندا پشت بەخۆڕاگری وئارام گرتن و نوێژ كردن وسوپاس گوزاری ويادی خوا ببەستن.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح رواه أحمد.

ب. واتە: ئەو برِوادارەی كەتێكەڵاوی خەڵكی دەبێت وخۆڕاگرو پشو درێژە لەسەر ئەو هەمو ئازارو ئەشكەنجەو ئێش وئازاردانی دەرونيەی كەلەو خەڵكەوە توشی دەبێت وپێ ی دەگات لەكاتی بانگەشە وبانگ كردنيان بۆ دينی خوا گەلێك باشترەوخێر ترە لەو كەسەی كەتێكەڵ بەخەڵك نابێت ولەترسی ئەو ئازارو ئەشكەنجەيەی ئەنجامی بانگ كردن وگرتنی بەرنامەكەی خوا خۆڕاگر نيەو كەنار گير دەبێت وئەو پاداشتە زۆرەی خوای گەورە لەكيس خۆی دەدات . موسڵمانێك دەيەوێ سوننەتی خواو پێغەمبەر جێ بەجێ بكات ڕيش دێڵێتەوە ، ياخوشكێك پۆشاكی ئيسلامی ولەچك دەپۆشێ لەناو خەڵكی داو لەپێش چاوی ئەو خەڵكە دەبێت بەبەرازو بەچاوێكی نامۆو بەبێگانە وجۆرەها زاراوەی ناشيرينی بۆ دادەتاشن، ئەوە تيرۆريستە، توند ڕەوە. ئەها تيرۆريست وتوند ڕەوەكان هاتن. سەد مەخابن بەدوای پياو خەراپاندا ناگەڕێن ، بێ ئەخلاق بێ، مەی خۆرەوە بێ، دز بێ،زيناكەر بێت هەرچی دەبێ بابێ، تەنيا موسڵمان نەبێت وپۆشاكی شەرعی پۆش نەبێت وڕيش دار نەبێت وبەڕاستی سوننەتی خواو پێغەمبەری نەگرت بێت كێشە نيە، بەڵام ئێستا كارەكە گەيوەتە ئەو ڕادەيەی كەئەگەر موسڵمانان نەك هەر بێگانەكانيان بەڵكو خزم وكەس وكارو براو مام وئامۆزاو پورزاكانيش سەردان وهات وچۆی يەكتريان كردو سيلەی ڕەحميان بەگوێرەی سوننەتی خواو پێغەمبەر جێ بەجێ كرد ئەوا ئەوكەسانە نيشانەی پرسياريان دەكەوێتە سەر ودەبێ بكەونە ژێر چاوەدێری ومووراقەبەوە. هەر كەيەكێكيان لەماڵی خۆی پێ ی هێنايە دەر ئەوە لەژێر ڕەحمەتی دور بين وئامێرەكانی چاوەدێری ئەوان دا دەبێت تادەگەڕێتەوە ماڵی خۆی وهەزاران ڕاپۆرت وقسەو قسەڵۆكی بۆ هەڵ دەبەستن. ئاخر

## ئەرکی مامۆستا

ئەرکی مامۆستا تەنیا ئەوە نیە مێشکی قوتابیەکان بەزانست وزانیاریەکان بئاخنێت وبەس، بەڵکو پەل بۆ پەروەردەیەکی چڕو پڕو گشتی دەهاوێ کەلەسەر پالاوتن وپاك کردنەوەی عەقیدەو خووڕەوشت وئاکارە خراپەکان دەوەستێت. کەدژی ئایینی ڕاستەقینەو بەرنامەی خوای بالادەستن وپێچەوانەی قورئانی پیرۆزن، بۆیە پێویستە لەسەر مامۆستای سەرکەوتو وابکات کەقسەوگفتارو کردەوەو ئاکارەکانی خۆی وقوتابیەکانی لەهیدایەت وڕێنومایی ڕاستەقینەی پێغەمبەری نازدارﷺوەرگیرا بن. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ ﴾(١)

---

بۆچی ئەو موسڵمانە تا ئێستا وا ڕیشی بەر نەدابۆوە ؟ دیارە ئێستا شتێکی لەبن سەردایە، یاهەزارەها گێچەڵ بەخوشکانی موسڵمانی لچك بەسەر وپۆشاك پۆشی شەرعی دەکەن بەتایبەتی لەزانکۆ وپەیمانگاو خوێندنگاو قوتابخانەکان وفەرمانگاکاندا. جۆرەها شەڕی دەرونیان لەگەڵ دا دەکەن. برایەکی موسڵمان لەشارێکە ئەوی تریش لەشارێکی تر مام وبرازان زاواو خەزورن کەسەردانی یەکتری دەکەن. هەر لەو چرکەیەی کەلەماڵی خۆیان دەر دەچن بەنیازی سەردانی یەکتری دەیان خەنە ژێر چاودێری وموراقەبەوە هەر لەبازگەکان ودەزگا حیزبیەکان وئاسایش ودام ودەزگا حکومیەکانەوە تادەگاتە خودی کەسایەتیەکانیانەوە. ئەوانە بۆچی هێندە هات وچۆی یەکتری دەکەن ؟ دیارە پلانێکیان لەبن سەردایە ! ! بەلاش نیە . ئاخر ئەمە شتێکی چاوەڕوان نەکراونیە، چونکە دوژمنانی ئیسلام هەمیشە هەوڵ دەدەن کۆمەڵگای موسڵمانان لەبن وبێخەوە دەربهێنن و ئەو پەیوەندیە توندو تۆڵەی وا لەنێوانیاندا هەیە کەئایینی پیرۆزی ئیسلام لەنیاوانیاندا بەهۆی ئیمانی پتەوەوە دروستی کردوە نەی هێڵن بۆ ئەوەی بتوانن ئەو کۆمەڵگا ئیسلامی وپیوەندیە توندو تۆڵە لەبەر یەك هەڵ بوەشێنن وتۆوی فیتنەو فەسادی تێدا بروێنن. یان ئەو موسڵمانەی کەسەر بەحیزبی دەسەلات نەبێت تەنیا یاریدەدەری بچوکترین بەڕێوەبەریشی پێ ڕەوا نابینن کەبەڕێوەبەری قوتابخانەیە لەدور ترین گوندو لادێ ی دادەنێن... ئەمەو گەلێ کاری دزێوی تری لەم جۆرانە.(وەرگێڕ).

(١) أ. آل عمران: ٣١.

ژیان ورەوشت وسەرگوزشتەی پێغەمبەرﷺ دەی سەلمێنێ کەچ پەروەردیارێکی گەورەو کارامەو ژیربێژو ڕاستگۆو هەقخوازو خۆ ڕاگرو پشو درێژ بوە، چ مامۆستاو ڕێبەرێکی لێهاتو بوە. چ خۆشەویست ودڵسۆزو بەبەزەیی بوە.

جاپێویستە لەسەر مامۆستاو پەروەردیاران کەخۆیان بەو سیفاتانە برازێننەوە بەتایبەتی دڵسۆزیەتی، کەزۆر پێویستە لەکارو ئەرك وئیشەکانیان دا گەلێك دڵسۆزو بەبەزەیی بن وتەنیا لەکارەکانیاندا مەبەستیان خوا بێت، با چاو نەبرنە ماڵی دنیا ئەگەر موچەکەشیان کەم بێت بالەئەرکی سەر شانیان سستی نەکەن وسوپاسگوزاری خوا بن. خۆ ئەگەر هیچیشی پێ نەدرێت با خۆڕاگرو پشو درێژ بێت ودڵنیا بێت کەخوای گەورە ڕۆزی دەدات ولەبرسان نایکوژێت، ولەقیامەتیشدا کرێ وپاداشتی خۆی وەردەگرێتەوە.

---

ب. واتە: ئەی محمد بەموسڵمانان، بەمرۆڤەکان بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن خواتان خۆش دەوێت، ئەوا بەدوای من بکەون واتە شوێن سوننەتی من بکەون خوای گەورە خۆشی دەوێن ولەگوناحەکانتان خۆش دەبێت.(وەرگێڕ).

## لە ئەرکەکانی مامۆستا

### ١. سەلام کردن

لەسەر مامۆستا پێویستە ئەگەر هاتە ژووری پۆل سەلام بکات لەقوتابیەکانی وبڵێ:(السلام علیکم ورحمةُ الله وبرکاته) (١) باهەمو لا چاك بزانن کەئەم ڕەوشت ودروشمە ئیسلامیە بەهێزترین بۆندی خۆشەویستی یەو پتەو ترین پەیوەندی کۆمەڵایەتیە لەناو موسڵماناندا کە هەمیشە خۆشەویستیو برایەتی لەنێوان ئەندامانی کۆمەڵگەدا دەڕوێنێتومتمانە لەنێوان مامۆستاو قوتابیاندا، وەلەنێوان خۆشیاندا خۆشەویستی بەهێز ترو توندو تۆڵتر دەکات. بۆیە مامۆستا ئەرکی سەرشانیەتی کەقوتابیەکانی لەسەر ئەم ڕەوشتو دروشمە بەرزە ئیسلامیە ڕابهێنێت. پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی: {أولا أدلکُم علی شيٍ إذا فعلتُمُوهُ تحاببتُم، أفشوا السلام بینکم}(٢)

---

(١) بەڵام بەداخەوە ئێستا لەناو ئێمەی موسڵماندا کەخۆمان بەموسڵمان دەزانین ولەناسنامەکەماندا نوسراوە(مسلم) واتەموسڵمان. ئەگەر مامۆستایەك ئەم دروشمە زیندو بکاتەوە وبێتە پۆلەوەوسەلام بکات بەکابرایەکی بێگانەو نامۆو دوا کەوتو وشوێن کەوتەی چەرخە سواوەکانی دەزانن هەروەکو خۆیان گۆتەنی . سەدو بیست وپێنج بڕو بێنو وبەهانەی لێ دەدۆزنەوەو. دروشمی (السلام علیکم) لەدژی خۆیان دەژمێرن وبێزەرەکەشی بەبێگانەو خۆفرۆش ونازانم چی وچی حساب دەکەن. بەڵکو لاسایی کردنەوەی کافران ودوژمنانی ئیسلام بەهی خۆیان دەزانن ودروشمەکانی عەلمانیەت بەڕاست دەزانن. ئاخر ئەوان ئەگەر نەڵێیت (بەیانیت باش ، یارۆژ باش) ئەسڵەن بەسەلام کردنیشی نازانن. یان ئەگەر قوتابیەك هاتە پۆلەوەو گوتی:(السلام علیکم) مامۆستاکەی نەك هەر وەڵامی ناداتەوە، بەڵکو لەوانەش دا دەری دەکاتە دەرەوەو لەوانەی ئەو ڕۆژەدا بێ بەش ومحرومی دەکات. سەد مەخابن بێگانە خاوەن ماڵن وخاوەن ماڵیش بێگانە. إنا لله وإنا إلیه راجعون.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: ئایا شتێکتان پێ بڵێم یافێربکەم، ئەگەر لەناو خۆتاندا ئەنجامی بدەن یەکتریتان خۆش دەوێت، هەمیشە سەلام لەیەکتری بکەن.(وەرگێڕ).

نابیّ لەبری سەلام وشەی بەیانیت باش‌و ئێوارە باش بەكار بهێنن. بەڵام دەكریّ لەدوای سەلام وشەی بەیانی باش‌وئێوارە باش بەكار بهێنن وەك بڵێن: خوا بەیانیت بەخێر بكاتەوە، یا خوا بەیانیت باش بكات. چونكە ئەم شێوەیان لەشێوەی نزاو پاڕانەوە دایە. لێرەدا ئاگاداریەك هەیە كەپێویستە مامۆستایانی لیّ ئاگادار بكەینەوە، كەزۆرێك لەمامۆستایان تیّ ی دەكەون ئەوەش ئەوەیە كەدەكەونە ژێر كاریگەری عاداتو ڕەوشتی كۆمەڵگەو كیبرو خۆبەزل زانی دەكەوێتە دڵیانەوەو قوتابیانیان وا ڕاهێناوە و وەك ڕێسایەك دایان ڕشتوە گوایە بۆ ڕێزی مامۆستاكەیانە، كەمامۆستا هاتە ژور دەبیّ بڵێن: هەستن . قوتابیەكانیش بەرزە پیّ هەمو لێكرا لەبەر مامۆستاكەیان هەڵ دەستن. دیارە ئەمە لەشەریعەتی خوادا نیەو لەئاینی ئیسلامدا جیّ ی نابێتەوە، مەگەر لەفەرهەنگو تورەكەی ئەو كەسانەدا هەبێت كەبەربەرەكانی شەریعەتی خوا دەكەن‌و بەرنامەی خوایان قبوڵ نیەو ڕەتی دەكەنەوە.هەروەكو لەئەنەس كوڕی مالك دەگێڕنەوە دەڵیّ: { ماكان لشخصٍ أحب إليهم من رسول اللهﷺ ، وكانوا إذا رأوهُ لم يقوموا له لما يعلمون من كراهيته لذلك.}([1]).

هەروەها پێغەمبەرﷺخەڵكی لەخوی خراپی لەبەر هەڵستان ئاگادار دەكردەوەو دەی فەرمو:{ من أحب أن يتمثل له الناس قياماً، فاليتبوأ مقعده من النار}([2]).

بەڵام دروستە خاوەن ماڵ لەبەر میوانەكەی هەڵ بستێت وبەپێشوازیەوە بچێت. هەروەها كاتێك یەكێك لەسەفەر دێتەوە شان بەشان (المعانقة) ی لەگەڵدا بكەن([1]).

---

(١) أ. صحيح رواه الترمذي.

ب. واتە: سەحابەكان كەسیان لەپێغەمبەرﷺخۆشتر نەدەویست كەچی كەدەهاتە لایان یان بەلایاندا تیّ دەپەڕی لەبەری هەڵ نەدەستان، چونكە ئەوان دەیان زانی كەچەندی پیّ ناخۆشە كەلەبەری هەڵ بستن.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح رواه أحمد.

ب. واتە: هەر كەسێك پیّ ی خۆش بێت كەخەڵكان لەبەری هەڵ بستن باجێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخدا دابنێت یا مسۆگەر بكات.(وەرگێڕ).

چونکە سەحابەکان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێت ئەمەیان کردوە، وەئەمە ئادابێکە لەئادابەکانی ڕێز گرتن وپێشوازی کردن لەمیوان وبەخێر هێنانی کەسێکە کەسەردانت دەکات. قسەی ئەم شاعیرە بێ هودەیە کەدەڵێ:

قُــم للمعلم وفِّــهِ تبجيلاً      كـــاد المعلم أن يكون رسولاً(٢)

بەهۆی پێچەوانەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ کەپێ ی ناخۆش بوە لەبەری هەڵ بستن، وەهەڕەشەشی لەو کەسە کردوە کەپێ ی خۆشە لەبەری هەڵبستن، چونکە ڕێز گرتن بریتی نیە لە لەبەر هەستان، بەڵکو ڕێز گرتن بریتیە لەفەرمانبەری وگوێ ڕایەڵی کردنی بەرنامەی خوا بەسەلام لەیەکتری کردن وتۆقە کردن وڕەوشتە جوانەکانی تر دەبێت.

**٢ـ پشت بەستن تەنیا بەخوا( الإستعانة بالله ):**

پێویستە لەسەر مامۆستا کەقوتابیەکانی وا فێر بکات کەتەنیا هانا بۆ خوا بەرن ولەو بەولاوە داوای یارمەتی وسەرخستن لەکەسی ترو لەهیچ شتێکی تر نەکەن.

---

(١) شان بەشان لەناو ئێمەی کورددا نیە، بەڵکو لەناو عەرەبەکاندا باوە.پێغەمبەرﷺ لەفەرمودەیەکی دا کاتێ لێ یان پرسی: فەرموی نابێ یەکتری ماچ بکەن کاتێ کەتوشی یەکتری دەبن{ عن حنظلة بن عبدالله السدوسي قال ثنا أنس بن مالك قال: فقال رجلٌ يارسول الله احدنا يلقي صديقه أينحني له" قال ﷺ : لا،فليلتزمه ويقبله؟ قال: لا، قال: فيصافحه؟ قال: نعم، ولفظ إبن ماجة نحوه وفيه( لا، ولكن تصافحوا} رواه الترمذي وإبن البيهقي وأحمد ((حسن))،واته:پیاوێك بەپێغەمبەری گوت: ئەی ڕەسولی خوا کاتێك یەکێك لەئێمە لەڕێگا لەهەر شوێنێك بەدۆست وبرادەرو خزمی خۆی دەگات ئایا بۆی بچەمێینەوە؟ فەرموی : نەخێر ئەوجار گوتی: ئەدی باوەشی پێدا بکەین وماچی بکەین ؟ فەرموی: نەخێر، گوتی : ئەدی تۆقەی لەگەڵ دا بکەین؟ فەرموی: بەڵێ. لەڕیوایەتی إبن ماجەدا هاتوە: فەرموی: بەلام تۆقەی لەگەڵ دا بکەن.(وەرگێڕ).

(٢) واتە: لەبەر مامۆستاکەت هەڵ بستە، چونکە ئەمە ڕێزلێنان وبەبەرز زانینی ئەوە، مامۆستا ئەوەندە بەرزە ، خەریکە بڵێم وەك پەیامبەرە.(وەرگێڕ).

وەفەرمودەکەی (إبن عباس) یان بۆ بێنێتەوە کەپێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:﴿ إذا سألت فاسأل الله وإذا إستعنت فاستعن بالله)([1])

**٣ـ هاوبەش پەیدا نەکردن بۆ خوا( الشرك ):**

پێویستە مامۆستایان ئاگاداری قوتابیەکان بکەنەوە کەزۆر وردو وریا بن لەهاوبەش وهاوتا دانان بۆ خوای گەورە. کەبریتیە لەگوێ ڕایەڵی وبەندایەتی کردن بۆ غەیری خوا وەك پاڕانەوە لەپێغەمبەران وپیاو چاکان وگۆڕستانەکان، چونکە ئەمانە کارێکی ترسناك و مەترسی دارن و عەقیدەو بیروباوەڕی لەدڵی موسڵمانان دا دەمرێنێ. بەکار کردن بەو ئامۆژگاریەی کەلقمان بۆ کوڕەکەی دەکرد کەخوای گەورە بۆمانی دەگێڕێتەوە:﴿ يَٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ﴿١٣﴾ ﴾([2])

**٤ـ نــوێژ کردن:**

پێویستە لەسەر مامۆستا کەقوتابیــەکانی لەقوتابخانــەدا فێـری نوێـژ بکـات وبیـان باتە مزگەوت بۆ ئەوەی نوێژی بەکۆمـەڵ(الجماعـة) بکـەن، بـۆ خـۆی چـاودێری یـان بکـات وئادابەکانی مزگەوتیان فێر بکات، بەڕێك وپێکی بێ دەنـگ بـچنە مزگـەوت، دەنگـە دەنـگ وژاوە ژاو نەکەن سەر لەنوێژکەران تێك بدەن. سەرەتا دەست نوێژ شوشـتنیان فێـر بکـات وئەوجار نوێژیان فێر بکات هەر لەتەمەنی حەوت ساڵیەوە چ کچ بن وچ کـوڕ([3]). هـەروەکو

---

(١) أ. رواه الترمذی وقال حسن صحيح.

ب. واتە: ئەگەر داواو هانات برد تەنیا داواو هانا بەرە بەر خوای گەورە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. لقمان: ١٣.

ب. واتە: ئەی کوڕی شیرینم هەرگیزاو هەرگیز هاوبەش وهاوتا بۆ خوا دامـەنێ، چـونکە هاوبـەش پەیدا کردن بۆ خوا ستەمێکی گەلێك گەورەیە.(وەرگێڕ).

(٣) بەڵام بەداخەوە ئێستا لەوڵاتی ئێمەدا مامۆستاکان خۆیان نازانن نوێژو دەست نوێـژ چـی یـەوئایین چی یە؟!! و هەڕێ ی لەفرێ ناکەنەوە، نەك هەر نازانن بەڵکو بڕواشیان پێ ی نیـە پـەنا بـەخوا. ئـەی چۆن قوتابیەکانی فێری نوێژ بکات، بەڵکو فێری مۆسیقاو سەماو سوڕدان وڕەوشتی خراپیـان دەکـات.

پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {علموا أولادكم الصلاة إذا بلغوا سبعاً وأضربوهم عليها إذا بلغوا عشراً، وفرقوا بينهم في المضاجع }(١).

## ٥ـ پشت بەستن بەخوا( التوكل ):

لەسەر پەروەردیارو مامۆستا پێویستە کەمندالآنوقوتابیەکانی وا فێر بکات کەتەنیا پشت بەخوا ببەستنوبەس، پشتو پەناهیان تەنیا بەزاتی( الله) وە بێت. هەروەکو موسا (علیه الصلاة والسلام) بەگەلەکەی گوت:( لو أنّكم توكلون على الله تعالى حقّ توكله لرزقكم كما يرزق الطيرُ تغدو خماساً وتروح بطاناً)(٢)

---

لەمەش رۆژی رەشتر هەر لەسەرەوەرا گرنگی بەوانەی ئاین نادرێت وبەوانەیەکی لاوەکی وبێ سودی دەزانن و ئێستا هەر کتێبو سەرچاوەیەك کەپەیوەندی بەوانەی ئاینەوە هەیە هەمویان خڕ کردونەوەو بردویانن بۆ مزگەوتەکان یان سوتاندویانن، ئەگەر هەر سەکێك لەئێوە چوە مزگەوتەکان باسەیرێکی رەفتەو کتێبخانەی ئەو مزگەوتە بکات ئەم قسەیەکی ئێمەی بۆ رون دەبێتەوە کەراست دەکەین، هەر لەسەردەمی حیزبی بەعسەوە وانەی ئاینیان داوەتە دەستو دەیدەنە مامۆستایەك کەئەسڵەن بەدین نیە، یا سفورو شەلاڵە لەسوراو وسپیاو ونازانن پیتێکیش لەئایەت وفەرمودەکان بخوێننەوە. لەولاوەش وانەی هەرزەکاریان داناوە گرنگیەکی تەواوی پێ دەدەن. باسی کۆمەڵە بابەتێکی وروژێنەری رەگەزی(الجنسي)تێدا دەکەن کەقوتابیان بەرەو لادان دخزێنێ.(وەرگێڕ).

(١) أ. رواه البزار وأنظر صحيح الجامع.

ب. واتە: ئەگەر منداڵەکانتان گەیشتنە تەمەنی حەوت ساڵان فێری نوێژیان بکەن، وەکەگەیشتنە دە ساڵی و نوێژیان نەکرد لێ یان بدەن، جێگایان بۆ جیا بکەنەوە واتە کورو کچان لەیەکتری جیا بکەنەوە لەکاتی خەوتن داو ژوریان بۆ جیا بکەنەوە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح رواه أحمد والترمذي.

ب. واتە: ئەگەر ئێوە تەنیا وبەتەواوی پشت بەخوا ببەستن ئەوا خوای گەورە رۆزیتان دەدات هەروەکو چون ڕیزقی ئەو باڵندەیە دەدات کەبەیانیان بەسکی برسیەوە دەڕواتە دەرو ئێوارانیش بەسکی پڕەوە دەگەڕێتەوە بۆ هێلانەکەی خۆی.(وەرگێڕ).

دەست گرتنیش بەهۆو هۆكارەكان(الأسباب) واجبە هەروەكو پێغەمبەرﷺ بەخاوەنی وشترەكەی فەرمو: {وشترەكەت ببەستەوە ئەوجار پشت بەخوا ببەستە ـ إعقلها وتوكل على الله}.

## ٦ ـ قوربانی دان وتێكۆشان ( الجهاد والتضحية ):

هـەروەها لەسـەر مامۆسـتا (معلـم أو مـدرس) و پـەروەردیار پێویـستە كـەگیانی قوربانیو تێكۆشان لەڕێگەی خوادا لـەدژی دوژمنـانی ئیـسلام جولەكـەو كـافرو گاورەكـان لەدڵودەرونی قوتابیەكانی دا بروێنێوبیرو هـۆشو زیهنـی قوتـابیـەكانی پـێ گـۆش بكـاتو بەلای پێشینەچاكەكان ( السلف الصالح) و غـەزاكانی پێغەمبـەرﷺ بكێشێتوپێ یانـەوە ببەسـتێتەوە، هیـواو ئاواتـەكانیان بەڕەوشـتو ئیمـانی پێغەمبـەرﷺو سـەحابەكان تێـر بكات. لەسەر ڕەوشتی قورئان وسوننەت جۆشیان بكات وبڕوادارێكی پتەولەسەر عەقیدەی پاكی ئیسلامیان لێ دروست بكات.

٧ - هـــەروەكو لەســـەر مامۆســـتایان پێویـــستە كـــەوا لەقوتابیـــەكانی بگەیـــەنێ كەعەرەب(وەهەمو گەلانی موسڵمان ـ وەرگێڕ) گەلێكن كە خوای گەورە(الله) بەئیسلام سـەر بەرزی كردون. هەر كاتێك بیانەوێ بەغەیری ئیسلام سەر بەرزو سەر فراز بن، ئـەوا خـوای گەورە ڕیسواو سەر شۆڕیان دەكات. هەروەكو ئیمامی عمرﷺ فەرموی :( نحن قومٌ أعزنـا الله بالإسلام" وإذا ابتغينا العزة بغير الإسلام آذلنا الله).([1])

---

(١) واتە: ئێمە گەلێكین خوای گەورە بەئیسلام سەر بەرزی كردوین، خۆ ئەگەر بمانەوێ عیززەت وسەر بەرزی لەغەیری ئیسلام وەدەست بێنین ئەوا خوای گەورە سەرشۆڕو ڕەزیلمـان دەكـات. دیـارە لێـرەدا ئیمامی عومەر مەبەستی تەنیا لەگەلی عەرەب نەبوە، بـەڵكو ئـەو مەبەستی لەگـەل وئوممـەتی ئیـسلام بوە بەهەمو زمانە جۆربەجۆرەكانی جیهانیەوە. نەك هەر گەلی عەرەب بەڵكو هەر گەل وكـۆڕو كۆمـەڵێك بیەوێ بەغەیری ئیسلام سەر بەرزو سەر فراز بێت، ئەوا بەپێچەوانەوە نەك هەر سەربەرز نابێت ، بەڵكو سوك وریسواو سەر شۆڕیش دەبێت . چونكە ئیسلام بۆ هەمو گروهی مرۆڤە لەسەر ڕوی ئەم زەمینەدا. ئەوانەی كەئیسلامیان ناوێ هەمیشە سەر شۆڕو بودەڵەو ڕیسوان، هەمیشە مل كەچـی وژێـر دەسـتەیی بەشیانە. جائەگەر نوسەر تەنیا مەبەستی لەگەلی عەرەب بێت ئەوا بەهەڵە داچوە.(وەرگێڕ).

سەرکەوتن بەسەر کافراندا نابێت تەنیا بەگەڕانەوە نەبێت بۆ لای خوا، بۆ حوکم کردن بەکتێبی خوا واتە بەقورئانی پیرۆزو بەسوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ وحوکم پێ کردیان لەهەمو بوارەکانی ژیانماندا ولەهەمو کارو بوارەکانی ژیانی ڕۆژانەماندا، هەروەها بەختەوەری لەهەمو کاروبارەکانی ژیانماندا تەنیا گەڕانەوەیە بۆ لای خوا ، ئەوجار دەست گرتن بەهۆو هۆکارەکان لەئامادە کردنی هێزو چەکی تازەو پێشکەوتو، ئامادە کردنی گەنجی موسڵمانی ڕاهێنراو ومەشق پێ کراو، لەسەر پیاوەتی ونازایەتی و پاڵەوانێتی بەجەرگیو بوێریو ئیمانی پتەوو قاییم پەروەردە کراو، پابەندی پەیڕەو وپرۆگرامی ڕاستی خواییو عەقیدەی ئیسلامی پاك وپوخت.

لەبەر ئەوە دەتوانین بڵێین مامۆستا گەر پابەندی بەرنامەکەی خوا بێتو عەقیدەو بیرو باوەڕی لەسەر عەقیدەی ئیسلام دامەزرابێتو لەکارەکانی دا دڵسۆزو نیاز پاك بێت لەو پەروەردە کردنو فێر کردنەی دا دەتوانێت پاکترینو بەهێز ترینو پتەو ترین وبەئیمان ترین بەرە پێك بهێنێت کەبتوانێت دوژمنانی ئیسلامو داگیر کەرانو دەست درێژیکاران وەدەر بنێنو ڕایان بماڵنو بەیداخی یەکتا پەرستیوخواناسی بەرزو شەکاوە بکاتو شورەو قەڵای پتەوی هەڵ گەڕاوانو کوفرو هاوتا پەیدا کاران بهەژێنێ. مرۆڤایەتی لەو سەرلێشێواویو گومڕایی یە ڕزگار بکاتو بەرەو پەروەردگاری تاكو تەنیا وەریان چەرخێنێو ڕێنومایی یان بکاتوتاکە خوای دروستکاری خۆیان پێ بناسێنێولەو هەمو ستەم و چەوسانەوەیە ڕزگاریان بکات کەتیایدا دەژین. هەر بۆیە خوای گەورە بەپێغەمبەرەکەی دەفەرموێ:﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِ رَبِّهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ۝١ ﴾(١)

---

(١) أ. إبراهيم: ١.

ب. واتە: ئەم قورئانە کتابێکە بۆ تۆمان ناردۆتە خوار بۆ ئەوەی دەستی خەڵکی پێ بگریت ولەشەوەزەنگی نەفامی وتاریکی وستەمکاریەوە بەرەو ڕوناکی یان ڕێگەی ڕاستی هیدایەتی خواییان

وەپێغەمبەریش ﷺ دەربارەی خۆی فەرمویەتی: {إنّما أنا رحمة مهداة}(١) . بۆیە لەسەر مامۆستا پێویستە کەپێغەمبەری خواﷺ بکاتە پێشەنگو سەرمەشقی خۆی بۆ پەروەردە کردنوفێر کردنی منداڵو قوتابیەکانی. ئەو پێغەمبەرەی کەخوای گەورە بۆ هەمو خەڵکی سەر ڕوی زەوی بەگشتی هەڵبژاردوەو بەڕەحمەت بۆ هەمو گروهی مرۆڤ ناردوە هەروەکو خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٧﴾(٢).

## ٨ ـ چەمك وئایدیۆلۆژیە ڕوخێنەرەکان (المبادئ الهدامة):

لەسەر مامۆستا پێویستە کەقوتابیەکانی لەبیرو بۆچونی قرچۆکولابەلاو چەمكو ئایدیۆلۆژیە ڕوخێنەرەکان بپارێزێتو ئاگادارو دوریان بخاتەوە، وەك کۆمۆنیستی لادەرو ماسۆنیەتولیبرالیەتو جولەکەو سۆشیالیستی مارکسیوعەلمانیەتی بێ دینیو داڕنراو لەهەمو بەهاو ڕەوشتێکی ڕەسەن و ئاینیو نەتەوە گەرێتی دور لەدین کەناموسڵمانانی عەرەب خۆ بەسەر موسڵمانانی ناعەرەبدا (المسلم الأعجمی)بەرز تر دەکات. هەرکەسێك ئاینو بەرنامەکەی خوا نەگرێت هەر چیەکی تر بگرێت لێ ی وەرناگیرێت. هەوەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٨٥﴾ سورة آل عمران: (٨٥)(٣)

---

بەریت بەیارمەتی خوای گەورە بۆ ڕاستە شەقامی یەکتا پەرستی وتەنیا یەك خوا پەرستی دەست کێشیان بکەیت.(وەرگێڕ).

(١) أ. صحیح :بڕوانە (صحیح الجامع:٢٢٤٥)

ب. واتە: من ڕەحمەت وڕێنومایی کارم بۆ ئێوە .(وەرگێڕ).

(٢) أ. الأنبیاء: ١٠٧.

ب. واتە: ئێمە تۆمان نەناردوە مەگەر بەڕەحمەت وبەرەکەت وبەزەیی بۆ هەمو خەڵکی سەر ڕوی زەوی.(وەرگێڕ).

(٣) واتە: هەرکەسێك جوێ لە لەئاین وبەرنامەکەی خوا هەر ئاین وبەرنامەیەکی تر بگرێت ئەوا خوای گەورە لێ ی وەر ناگرێت ولەڕۆژی قیامەتدا لەزیان مەندو سەخارەتمەندانە.(وەرگێڕ).

هەروەها دەبێ قوتابیەکانی لەدیکتاتۆریەتو دیموکراسیەت کەبەرنامەی خـوا وەلا دەنێن وبەبەرنامـەی دەسـت کـرد کـار دەکـەن. ئاگـادار بکاتـەوەو هۆشـیاریان بکاتەنـەوە لەمەترسی ئەو تاوانەو دەست گیرۆییان بکاتو نەهێڵێ بکەونە ناو ئەو زەلکـاوە بۆگەنانـە. هەرچی ئەم فیکرە بۆگەنەی چوە سەریەوە سەری بۆگەن دەبێ.

**٩ ـ توڕە کردن وئـازار دانی دایك وبـاوك( عقوق الوالدين ):**

پێویستە لەسەر مامۆستا کەقوتابیەکانی لەئازار دان وتوڕە کردنی دایكو باوکان وریا بکاتەوەو هەڵی یان بنێ لەسەر گوێ ڕایەڵیو فەرمانبەرێتی دایكوباوك لەچوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا. بەڵام کەفەرمانی پێدا سەرپێچی خوا بکات باگوێ ڕایەڵیان نەکاتو بەقسەیان نەکات. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ ﴾ سورة الإسراء: (٢٣،٢٤) (١)

---

(١) واتە: خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات کەلەو بەولاوە بەندایەتی وپەرستـشی بـۆ کەسـی تـرو بـۆ هیچ شتێکی تر نەکەین ولەگەڵ دایك وباوکیشماندا باش بین،ئەگەر یەکێکیان یا هـەردو کیـان پـیر بـون هەرگیز نابێ ئوفەیان لەبەر بکەین ودەریان نەکەین ولێ یان هەرگیز بێزار نەبین و قسەی ڕەقیان لەگـەڵ دا نەکەین ، بەڵکو هەمیشە قسەی نەرم ولەسەرخۆیان لەگەڵ دا بکەین وبـاڵی ملکەچـی خۆمانیـان بـۆ ڕابخەین و لەگەڵیانـدا هێدی وهـێمن وبەبـەزەیی بـین. وەلەبـەر خـوا بۆیـان بپاڕێینـەوە و بڵـێین: ئـەی پەروەردەگاری من ڕەحمیان پێ بکەیت ولەژێر دەریای بەزەیی خۆتدا نقومیان بکەیت و پاداشـتی یـان بدەیتـەوە هـەر وەك چـۆن ئـەوان لەمەلۆتکـەیی وبـچوکیەوە منیـان پـێ گەیانـدوە وگـەورەیان کـردوم وکردیـانم بـەم مرۆڤـە جـوان وبەتوانایـەی ئێـستام.خوایـە بەهەشـتی بـەرین ونـەبڕاوەیان بەنەسـیب بکەیت.... آمین.

## ئامۆژگاریەکانی لوقمان ﷺ بۆ کوڕەکەی

خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:﴿ وَإِذْ قَالَ لُقْمَـٰنُ لِٱبْنِهِۦ وَهُوَ يَعِظُهُۥ﴾(١) سورة لقمان: (١٣) . بەڵێ کاتێ لقمان ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکرد، ئەم ئامۆژگاریانەی بۆ ئێمەی مرۆڤ زۆر بەسودو بەکەڵکن کەخوای گەورە لەسەر زمانی دەگێڕێتەوە:

١. ﴿ يَـٰبُنَىَّ لَا تُشْرِكْ بِٱللَّهِ ۖ إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴾ (٢)سورة لقمان: (١٣). زۆر وریا بە لەهاوبەشی پەیدا کردن لەبەندایەتی کردنوپەرستشی خوای گەورە(الله). وەکو پاڕانەوە لەمردوان و پێغەمبەرانو کەسانی نادیار ئەوەتەﷺ فەرمویەتی:{ الدعاء هو العبادة} (٣) وەلە قورئانی پیرۆزدا هاتوە:﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَلَمْ يَلْبِسُوٓا۟ إِيمَـٰنَهُم بِظُلْمٍ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلْأَمْنُ وَهُم مُّهْتَدُونَ ﴾(٤)

---

(١) واتە:کاتێ لقمان بەکوڕەکەی دەگوت وئامۆژگاری دەکرد.(وەرگێڕ).

(٢) واتە: ئەی کوڕی خۆم وریابە هەرگیز هاوتاو هاوبەش بۆ خوای گەورە دانەنێ ی، وەکو پاڕانەوەو هانا بردن بۆ مردوەکان وکوڕی پێغەمبەران وپیاو چاکان وکەسانی نادیار، چونکە هاوتا پەیدا کردن بۆ خوای گەورە ستەمێکی گەلێك گەورەیە بۆ سەرمافەکانی خوای گەورە لەپەرستن وپەروەردگاریتی ئەوو ناو وسیفەتە پیرۆزەکانی دا..(وەرگێڕ).

(٣) أ. رواه الترمذی حسن صحیح.

ب. واتە دوعاو نزاو پاڕانەوە خۆی بەندایەتی کردنەو بەشێکە لەبەندایەتی کردن.(وەرگێڕ).

(٤) أ. سورة الأنعام: (٨٢)

ب. واتە: ئەو کەسانەی کەئیمانیان هێناوەو بڕواکەیان بەهاوتاوشەریك پەیدا کردن بۆ خواو بەستەم وستەمکاری تێکەڵ نەکردوە ئەوانە سەرفرازو سەرکەوتو دەبن وخوا لێ یان ڕازیە. ابو جعفر دەڵێ: ڕاڤە کەرانو شرۆڤەکەرانی قورئانی پیرۆز لەلێکدانەوەو شی کردنەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا جیاوازن هەندێکیان دەڵێن: ئەم ئایەتە جیاکردنەوەو حوکم کردنە لەنێوان ئیبراهیم خۆشەویستی خوا وهاوبەش پەیداکەرانی کاتی خۆی کەپێ ی گوتن: باشە چۆن من خۆم دەترسم بەهۆی ئەوەی کەئێوە هاوبەش بۆ خوای گەورە پەیدا دەکەن کەلەدنیاو لەقیامەت خوای گەورە سزامان بدات لەدنیا توشی

بێ گومان ئەمە کارێکی قورس بو بۆموسڵمانان، گوتیان جاکێ هەیە کەستەمی لەخۆی نەکردبێت؟ پێغەمبەرﷺ فەرموی :{ لیس ذلك، إنّما هو الشرك ألم تسمعوا قول لقمان لإبنه:﴿ يَـٰبُنَيَّ لَا تُشۡرِكۡ بِٱللَّهِۖ إِنَّ ٱلشِّرۡكَ لَظُلۡمٌ عَظِيمٞ ۝١٣ ﴾(١)

٢ ـ {وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْنًا عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ}(٢)

---

بەلاو نەهامەتی و قات وقڕیمان بکات ولەقیامەتیش بەئاگری دۆزەخ سزامان بدات کەچی ئێوە هەر گوێشتان لێ نیەو ناترسن، باشە کام گروپمان شایەنی پاراستن وپەنادانە لەلای خوای گەورە؟ جا خوای گەورە بەم ئایەتە حوکمی لەنێوان هەردولا دا کردو لێکی جیا کردنەوەو فەرموی: ئەو کەسانە شایەنی پاراستن وبەزەیی خوان کەبەدڵسۆزی بەندایەتی وپەرستشی بۆ خوا دەکەن ولەگەڵ خوادا کەسی تر ، هیچ بەرنامەیەکی دەستکردی تر ناپەرستن وئیخلاسیەتیان تەنیا بۆ خوای گەورەیە و هاوبەش بۆ خوا پەیدا ناکەن وستەم وستەمکاری ناکەن. بەڵام ئەوانەی لەگەڵ خوای گەورەدا هاوبەش پەیدا دەکەن وئیخلاسیەتیان بۆ خوا نیە شتی پروپوچی تری تێکەڵ دەکەن ئەوان بالەسزای خوا ئەمین نەبن چ لەدنیاو چ لەقیامەتدا خوای گەورە سزای سەختیان دەدا خوای گەورە پەنامان بدات.(وەرگێڕ).

(١) أ. متفق عليه.

ب. مەبەست لەوە نیە، بەڵکو مەبەستی لەهاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوای گەورە، ئەدی گوێتان لەلقمان نی یە بەکوڕەکەی دەڵێ : ئەی کوڕی خۆم هاوبەش بۆ خواپەیدا مەکە، چونکە هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوای گەورە ستەمێکی گەورەیە لەمافەکانی (الله) گیان دەکرێت. واتای ئایەتەکەشمان پێشتر نوسی (وەرگێڕ).

(٢) أ. سورة لقمان: (١٤).

ب. واتە: ئامۆژگاری مرۆڤمان کرد کەڕێزی باوك ودایك بگرن و تورەیان نەکەن، بەڵکو سوپاسیان بکەن وچاکەیان لەگەڵدا بکەن وچاکەیان بدەنەوە چونکە ئەوان بەتایبەتیش دایك ماوەیەکی زۆر لەناو سکی خۆی دا هەڵی گرتویت وئازارو ئەشکەنجەو ناخۆشی یەکی زۆی پێوە چێشتون ولاوازی بەسەر لاوازی دا لەئەنجامی ئەو هەڵ گرتنەی دا بەپێستی سکی بینیویەتی، دوای ئەوەی داشی ناویت لەماوەی دو ساڵ شیردان و پەروەردە کردن وبەخێو کردن وشەونخونی وپاك کرنەوەو خاوێن کردنەوەو خاوێن ڕاگرتنی و خۆراك پێدانت ودیسانەوە ماندو بونێکی زۆری پێوە چەشتویت بێ ئەوەی منەتت بەسەردا بکات و هەست بەهیچ بکات وئاسودەو بونی منداڵەکەی ئاسودە بونی گیان ودەرونی خۆیەتی.جابۆیە پێویستە لەسەر منداڵ سپڵە نەبێت ولەکاتێ کەگەورە بو و دایك وباوکیشی پیر بون

إبن کثیر گوتویەتی: کاتێ کەلقمان کوڕەکەی ئامۆژگاری دەکرد ئامۆژگاریەکەی بەگوێ ڕایەڵی دایك وباوکی بەستەوە بەگوێ ڕایەڵی وبەندایەتی کردن بۆ خوای گەورەو هاوبەشی پەیدا نەکردن بۆ خوای گەورە.بۆچی؟ هەموی لەبەر گەورەیی وقورسایی ڕێزی باوك ودایك، چونکە باوك ودایك زۆر بەمنداڵەکانیانەوەماندو دەبن هەر لەکاتی کەوتنە سکی دایکیەوەو هەتا دەگاتە کاتی پێ گەیشتنی ئەو منداڵە . دەبینی دایکی هەژار ئەو کۆڵی منداڵە بەچ ناخۆشی وئازارو ئەشکەنجەیەکەوە بەسکی خۆی هەڵ دەگرێت.باوکیش بەم لاو بەو لادا بەگەرماو بەسەرما ڕادەکات کە ڕزق وڕۆزی بۆ ماڵ ومنداڵەکەی پەیدا بکات هەزاران تاڵ وسوێری دەچێژێ لەپێناو پێگەیاندنی منداڵەکانی دا دەی کەواتە مافی ئەوەیان هەیە کەمنداڵەکانیان سوپاس گوزار بن بۆ یان وگوێ ڕایەڵیان بکەن

٣ ـ ﴿ وَإِن جَٰهَدَاكَ عَلَىٰٓ أَن تُشْرِكَ بِى مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِى ٱلدُّنْيَا مَعْرُوفًا وَٱتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَىَّ ثُمَّ إِلَىَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾ ﴾(١)

---

چاکەیان بداتەوە هەر چەندە ئەگەر شەوو ڕۆژ لەکۆڵی یان بکەیت بەتایبەت دایك ئێستاش بەقەد ژانێك نابێت کەئەو دایکە بەتۆیەوە بینیوە، یابە شەونخونیەك نابێت. کەخەڵکی هەمو خەوتون وئەویش بەزاقە زاقی منداڵەکەی خەوی لەچاوان دەزڕێ وهەڵ دەستێ و دەست لەپیسایی منداڵەکەی دەنێ وپوخت وخاوێن دەی شواتەوە وئەمجار مەمکیشی دەداتێ.پاك وبێ گەردی بۆ خوا ئەم هەمو سۆزو بەزەیی ولەخۆ بوردیەی داوەتە ئەو دایکە تائەم مرۆڤە سپڵەیە پێ بگات کەچی سەرکەشی دەکات وهاوبەش بۆ خوا دادەنێ، خوای گەورە هەڕەشەمان لێ دەکات ئەگەر هاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەین ولەگەڵ دایك وباوکیشمان چاك نەبێن ودواڕۆژ هەر بۆلای من دەگەڕێنەوەو بۆ خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەم.(وەرگێڕ)

(١) أ. سورة لقمان: (١٥).

ب. واتە: ئەگەر باوك ودایکت هانیان دایت کەهاوبەش بۆ خوا پەیدا بکەیت، یاهەر بێ فەرمانیەکی خوات پێ بکەن کەتۆ لێ ی بێ ئاگای وزانیاریت نیە کەخراپە یان نا لەوکاتەدا تۆ گوێ ڕایەڵیان مەکەو

إبن كثير گوتویەتی: واتە زۆر بەوریایی یەوە شوێن ئـاینی وڕەوشـتی باوكودایكـت بكەوەو زۆریش وریا بیت لەئایینی خوا لانەدەن، هەر كاتێك لایـان دا لێ یـان قبـوڵ مەكـە. وەئەگەر فرمانیان پێ دایت بە خراپە كردنو سەرپێچی خوا ئەوا ئـەو كـات تـۆ بەقـسەیان مەكـەو لـەدنیاش دا هاریكـاریو دۆسـتایەتیان بكـە بەچـاكو ڕێزیـان بگـرە واتـە ڕێـزی دایكوباوكایەتیو شوێن بڕواداران وموسڵمانان بكەوە كەلای خوایان گرتـوە. چـونكە خـوای گەورە گـوێ ڕایـەڵی دایكوبـاوكی بەسـتۆتەوەو بەبەندایـەتیو پەرسـتـشی خۆیـەوە، ئیـدی فەرمان كردنی باوك ودایك بەڕۆڵەكانی ڕێگر نیە لەبەردەم ئەوەی كەتۆ چاكەیان لەگـەڵ دا بكەیت لـەدنیادا، دەی دەبـێ تـۆ ڕێگـەی بـڕواداران بگریـت وشـوێن كەوتـەی ئـەوان بیـت. دەڵێم: ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرﷺ ئەم ڕایە دەسەلمێنێ كەفەرمویەتی: { لاطاعة لاحدٍ في معصية الله، إنَّما طاعة في المعروف}(١)

٤ ـ ﴿ يَـٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَطِيفٌ خَبِيرٞ ١٦ ﴾(٢)

---

بەقسەیان مەكە لەگەڵ ئەوەشدا تـۆ لـەدنیادا هـاوڕێ یـەتی و هاریكـاری وڕێزیـان بگـرە بەچاكە كـردن لەگەڵیاندا ودوای ئـەو كەسـانە بكـەوە كـە بـۆ لای خـوا گەڕاونـەوەو خواپەرسـتی دەكـەن. ئاگـادار بـن گەڕانەوەتان هەر بۆ لای منەو هیچ پەنای تـر نیـە ومنـیش نامـەی كردەوەكانتـان دەخەمـە پـێش چـاو وهەرچی لەدنیادا كردوتانە هەواڵی هەموتان پێ دەدەم وبەچاوی خۆتان هەمو دەخوێننەوە(وەرگێڕ).

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: لەسەرپێچی كردنی(الله) دا گوێ ڕایەڵی كەس مەكەن، چونكە گوێ ڕایەڵی تـەنیا لـەكاری چاكەو خوا پەرستی دایەو دروستە.لەڕیوایەتێكی تردا( لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق) (وەرگێڕ)

(٢) أ. سورة لقمان: (١٦).

ب. ئەی كوڕی شیرینم، هەر كارو كردەوەو قسەیەكت كرد بێت لەهەر شوێنێك دا بێت لە نـاو شـاخ وداروبەرد و ئاسمانەكان دابێت ئەگەر بەقەد گەردیلە ئەتۆمێك یـا بەقـەد دەنكـە خەرتەڵەیـەكیش بێـت

إبـن كـثير دەڵـێ: واتـە سـتەم یـا گونـاح كـردن هـەر چـەندە بەقـەد گەردیلـە خـەردەلێكیش بـچوك بێـت خـوای گـەورە لـەڕۆژی قیامەتـدا دەی هێنێتـەوە بـەردەمتو نیـشانتی دەداتـەوە لەكاتێكـدا كەتـەرازوی دادوەری و دادگـایی خـوا دادەنرێـتو بـەڕێوە دەچێـت. جائەگـەر خێـر بێـت یـان شـەڕ دەخرێتـەوە بـەردەمتو بەچـاوی خـۆت هـەموان دەبینیەوە.

٥ ـ ﴿يَٰبُنَيَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە: نوێژەكانت بەهەمو پلەو پایەو واجباتەكانیو سوننەتەكانیەوە بەئاگایی وترسومل كەچیو ئامادە بونی گیانو لەشەوە ئەنجامیان بدەوهەرگیز نوێژت مەچوێنە.

٦ ـ ﴿وَأۡمُرۡ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱنۡهَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾واتە: فرمان بەچاكە بكەو خراپەش قەدەغە بكە زۆر بەنەرمی ولەسەر خۆیی وژیرانە ودور لەهەڵچون وتوندو تیژی.

٧ ـ ﴿وَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ﴾ شتێكی بەڵگە نەویستە هەر كەسێك فرمان بەچاكە بكاتوقەدەغە لەخراپە بكات توشی ئازارو ئەشكەنجەو قوربانی دان بەگیانو بەخوێنیش دەبێت([1]) . بۆیە فرمانی پێ دەكات كە خوڕاگرو بەئارامو پشو درێژ بێت.پێغەمبەرﷺ

---

خوای گەورە دەی هێنێتەوە بەردەمتو گوم نابێتو بەفیڕۆ ناڕوات، چونكە خوای گەورە زاناو دانایەكی زۆر بەڕەحم ونەرم وبەبەزەیی و داناو پسپۆڕە.(وەگێڕ).

(١) بەڵگەی ڕاستی ئەم ڕایەشمان هەزاران هەزار شەهیدی ئەم مەیدانەیە هـەر لەسـەرەتای ئیـسلامەوە تائەمڕۆ كەبەچاوی خۆمان دەبینین لەجیهاندا موسڵمانانی بانگـەواز خـوازو دەسـگیرۆكەران بـۆ ڕێگـای خوا چۆن خوێنیان بەناهەق دەڕێژرێت هەر لەبەر ئەوەی بانگەواز بـۆ دینەكـەی خـوا دەكـەن ودەسـتی خەڵكی بۆ لای بەرنامەكەی خوا دەگـرن ولـەبێ فـەرمانی خـوا هوشـیارو ئاگاداریـان دەكەنـەوە دوایـین نمونەشمان شـەهید كردنـی مامۆسـتا عبـدالله قەسرێ وهاوڕێكـانی بـو كەلەبازگـەی تاسـڵوجە لـەڕۆژی ٢٠٠٣/٣/٤ ـ ١/محرم/١٤٢٤ شەهید كران.

فەرمویەتی: {المؤمن الذی یخالط الناس ویصبر علی أذاهم، أفضل من المؤمن الذی لایخالط الناس ولایصبر علی أذاهم}(١) ﴿إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ۝١٧﴾واتە: ئەم ئارامگری وپشو درێژیە یەکێکە لەهەرە کارە گرنگ وبەنرخەکان.

٨ ـ﴿وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ﴾ واتە: ڕوت لەخەڵکی وەرمەگێڕە . إبن کثیر دەڵێ: واتە ڕوت لەخەڵکی وەرمەگێڕەولێو لەخەڵکی بامەدەوبەسوکی سەیری خەڵکی مەکەو خۆت بەزل مەزانە لەکاتی قسەکردن لەگەڵ خەڵکی خۆت بەسەر ئەواندا ڕامەدەو ڕێز بۆ ڕاو قسەکانی یان دابنێ وبەنەرم وشلی وبەڕویەکی خۆشەوە قسەیان لەگەڵ دا بکەو بیان دوێنە. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {تبسمك فی وجه أخیك صدقة}(٢)

٩ ـ ﴿وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا﴾واتە: بەفیزو دەمارو کەشخەو خۆ بەزل زانیەوە بەسەر زەوی دا مەڕۆ . چونکە خوای گەورەلەخۆت توڕە دەکەیتو خۆشی ناوێیت ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ۝١٨﴾واتە: خوای گەورە خۆ بەزل زانانی خۆش ناوێ‌وسزای بەسفت‌وسێ ی بۆ ئامادە کردون لەڕۆژی قیامەتدا(٣)

---

(١) أ. صحیح رواه أحمد وغیره.

ب. واتەئەو بڕوادارەی کەتێکەڵی خەڵکی دەبێت وسوننەتەکانی پێغەمبەرﷺ ی پێوە دیارن بانگەشە بۆ دینەکەی خوا دەکات لەسەر خەم وئازارو ئەشکەنجەی لەشی ودەرونی یەکانیان خۆڕاگرو بەئارام وپشو درێژە باشترە لەو بڕوادارەی کەتێکەڵی خەڵکی نابێت و لەترسی ئازارو ئەزیەتی دەستی خەڵکی وخۆڕاگرو بەئارام نیە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحیح رواه الترمذی وغیره.

ب. واتە: زەردەخەنەت لەڕوی برا موسڵمانەکانتدا بە خێرو چاکە بۆ دەنوسرێت.(وەرگێڕ).

(٣) لەإبن کثیر وەرگیراوە.

١٠ ـ﴿وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ﴾ واتە: لەسەرخۆو هێدی وهێمنی برۆ بەرێوە، رۆیشتنێکی مام ناوەندی نەزۆر خێراو نەزۆرلەسەرخۆوبەلەنجەو لار(١)

١١ ـ ﴿وَٱغۡضُضۡ مِن صَوۡتِكَ﴾واتە: دەنگت زۆر بەرز مەکەوەو لەسەر خۆ قسان بکەو زۆر بڵێ مەبە بەسەر خەڵکیش دا مەشیرێنەو ئازاری خەڵکی مەدە. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ ١٩﴾(٢) . مجاهد دەڵێ: ناخۆشترین‌و بێزراو ترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە، دیارە ئەم پێ چواندنەش بەدەنگی گوێ درێژ نیشانەی خراپی‌و حەرام بون‌و ئەو پەڕی ناشیرینی‌و بێ شەرمی‌وسوکایەتیە، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ لیس منّا مَثَلُ السوءِ، العائدُ فی هیبتهِ کالکلب یعود فی قیئه}(٣) هەروەها دەفەرموێ:{إذَا سَمعتُم أصوات الدیکة فسلوا اللهَ من فضله، فإنّها رأت ملکاً، وإذا سمعتُم نهیق الحمار فتعوذوا باللهِ من الشیطان، فإنّها رأت شیطاناً}(٤).

---

(١) إبن کثیر.

(٢)واتە: ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە. جانەوانەی دەنگ بەرز دەکەنەوە لەقسە کردنیاندا و بەسەر خەڵکی دا دەشیرێنن وخۆیان بەزل دەزانن وخۆ بەسەر خەڵکی دا ڕادەدەن. دەنگیان وەك زەڕەی گوێ درێژ ناخۆشە.

(٣) أ. رواه البـخـاری.

ب. واتە: لەئێمە نیە کەسێکی واخراپ کەشتێك ببەخشێت، دیاریەك بدات بەکەسێك دوایش کۆڵێك منەتی بەسەردا بکات وچاوی لەوەلامدانەوەی بێت، هەروەکو چۆن سەگ دەگەڕێتەوە سەر ڕشوەکەی خۆی و لێ ی دەخواتەوە. دیارە ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کەهەر کەسێك ببەخشێ یا دیاری لەماڵی خۆی بدات بەکەسێك دروست نیە بۆی کەمنەتی بەسەردا بکات ولەشوێنان باسی بکات . بەو سەگەی چواندوە کەڕشایەوە ودواتر دەگەڕێتەوە سەری لێ ی دەخواتەوە. ئەمە هەڕەشەیەکی گەورەیە بۆ ئێمەی موسڵمان.(وەرگێڕ).

(٤) أ. متفق علیه، أنظر تفسیر إبن کثیرج٣/٤٤٦.

## لەڕێنومایی وسودەکانی ئەم ئایەتانە

- دروست بونی ئامۆژگاری کردنی باوکودایك بۆ کورەکەی بەشتێك کەلەدنیاو لەقیامەت دا سودی پێ بگەیەنێ وخواش لێ ی ڕازی بێت.
- سەرەتا فەرمان کردن بەیەکتاپەرستی خواو وریا کردنەوە لەهاوتاو هاوبەش پەیدا کردن بۆ خوا، چونکە ستەمێکە هەمو کردەوە باشەکانی مرۆڤ دەسڕێتەوە.
- پێویستی سوپاس گوزاری وگوێ ڕایەڵی وفەرمانبەرداری بۆ(الله) گیان، دوای ئەویش بۆ باوك و دایكو پێویستی چاکە کردن لەگەڵیانداو گەیاندنی سیلەی ڕەحم لەگەڵیاندا.
- گوێ ڕایەڵی نیەبۆ دروست کراوەکان(المخلوقات) لەسەرپێچی کردنی دروستکەرەکەی(الخالق) ی خۆیان، بەڵکو گوێ ڕایەڵی تەنیا لەکردەوەی چاك وسەرپێچی نەکردن لەفرمانەکانی خوادا دەبێت.
- پێویستە شوێن کەوتەی بڕواداارنی یەکتاپەرست بین ودوای داهێنەران (المبدعین) نەکەوین، چونکە شوێن کەوتن وگوێ ڕایەڵی یان حەرام وسەرپێچی یە لەفرمانەکانی خوا.
- باباش بزانین کەخوای گەورە بەنهێنی وبەئاشکرا چاودێرە بەسەرمانەوەو ئاگای لێمانە، باچاکەو خراپە بەکەم نەزانین هەر چەندە بچوك وکەمیش دیار بن، هیچ لای خوا ون نابێت.

پێویستە لەسەرمان فەرمان بەچاکەوقەدەغە لەخراپە بکەین بەو پەڕی نەرمی ولەسەر خۆیی وژیرییەوە ئەوەندەی بۆمان بکرێت. ئەوەتە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:

---

ب. واتە: ئەگەر گوێتان لەدەنگی کەڵەشێر بو، ئەوا سوپاسی خوا(الحمدلله) بکەن وداوای بەخشینی خوا بکەن چونکە ئەوە فریشتەی دیون بەڵام ئەگەر گوێتان لەدەنگی زەڕەی گوێ درێژ بو بڵێن (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) چونکە ئەوە شەیتانی دیوە.(وەرگێڕ).

{من رأى منكم منكراً فليغيرهُ بيدهِ فإن لم يستطع فبلسانهِ وإن لم يستطع فبقلبهِ وذلك أضعف الإيمان}([1])

- پێویستە نوێژەکانمان بەهەمو پلەو پایەو سوننەتەکانیەوە بەترس لەخواو مل کەچی بۆ خوا(الخشوع والخضوع) ئەنجام بدەین.
- ئارامگری‌وخوڕاگری وپشو درێژی لەبەرامبەر ئەو هەمو ئێش‌وئازارو کوێرەوەریانەی کەلە ئەنجامی فرمان کردن بەچاکەو نەهی کردن لەخراپە لەلایەن خەڵکانێکی نەفام‌و نەزان ستەمکارو لەدین دورولەدین حاڵی نەبوەوە توشت دەبێت، چونکە ئەم کارە قورسترین کارێکە کەمرۆڤی بڕوادار ئەنجامی دەدات، لەهەمان کاتدا باشترین‌و بەفەڕترین‌و پیرۆزترین کارو ئەرکێکە کەبابای بڕوادار پێ ی هەڵ بستێت بۆیە ئارامی‌و خۆڕاگری‌و لەخۆ بوردویی دەوێت. هەروەکو قوربانی دان‌و ددان بەخۆ داگرتن‌و لێ بوردەیی دەوێت.
- حەرامی خۆ بەزل زانی ولەخۆبایی بون‌و بەدەماری‌و کەشخە لێدان لەکاتی ڕۆیشتن دا.
- مام ناوەندی‌و لەسەرخۆیی لەڕۆیشتن دا، نەزۆر بەپەلە بڕۆی‌و نەزۆریش هێواش.
- دەنگ بەرز نەکردنەوە لەڕادەی پێویست لەکاتی قسە کردن دا، چونکە ئەمە پیشەو سیفەتی گوێ درێژە ﴿إِنَّ أَنكَرَ ٱلۡأَصۡوَٰتِ لَصَوۡتُ ٱلۡحَمِيرِ (١٩)﴾.

---

(١) أ.رواه مسلم.

ب. واتە: ئەگەر یەکێکت بینی خراپەیەك، گوناحێك دەکات بابەدەست بیگێڕێتەوە ونەهێڵێ ئەو کارە خراپە بکات، کەبەدەست نەیتوانی بابەزمان پێ ی بڵێ : ئەمە بێ شەرعیە وگوناحە وازی لێ بێنەخۆ ئەگەر ترسا بەزمانیش پێ ی بڵێ، باهەر نەبێ با بەدڵ پێ ی ناخۆش بێت دیارە ئەمەش بێ هێز ترین ئیمانە وتەنیا تروسکاییەك ئیمانی هەیە وبێ هێزترین پلەیە. دەنا ئەگەر موسڵمان بڕوای پتەوی هەبێت نابێ بترسێ وڕاستیەکان وەك خۆی بڵێ.(وەگێڕ).

## ئامۆژگاریە گرنگەکانی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان

لەسەر پەروەردیار پێویستە چ پیاو بێت وچ ژن مامۆستا بێت یا باوكو دایك کەمنداڵەکانیان یاقوتابیەکانیان فێری ئامۆژگاریە بەسود وبەکەڵکەکانی پێغەمبەرﷺ بکەن ولەسەریان گوش وجوش بکاتو لەسەر پارچە تەختەیەك یالەسەر تەختە رەشەبۆیان بنوسێت، بۆ ئەوەی ئەوانیش لە دەفتەرەکانیاندا بیان نوسنەوەو دوایش لەبەریان بکەن و رەچاوی ئامۆژگاریەکان بکەن ولەژیانی رۆژانەی خۆیاندا وەك پێویست بەکار بهێنرێن، کەلەفەرمودە ڕاست ودروستەکانی پێغەمبەرەوەﷺ وەرگیراوەکەئەمەش دەقەکەیەتی: { عن إبن عباس رضي الله عنه قال:كنت خلف رسول الله يوماً فقال لى: ياغلام إنِّى أعلمك كلمات}[١]:

١. { إحفظ الله يحفظك} واتە : خوا بپارێزە ئەویش دەت پارێزێ . ئەویش بەوەلام دانەوەو جێ بەجێ کردنی فرمانەکانی خوا دەبێت. هەروەها بەدور کەوتنەوە لەوکارو کردەوە خراپانەی کەخوای گەورە لێ ی قەدەغە کردویت. ئەگەر تۆ بەئەرکی سەرشانی خۆت هەستایت بێ گومان خوای گەورە لەدنیا ولەقیامەت دەت پارێزێ وسەربەرز وسەرفرازت دەکات. ئەگەر تۆ بەرۆیشتن بۆ لای ئەو بچیت ئەو بەراکردن بەروەو لات دێت.(سبحان الله).

٢. {إحفظ اللهَ تجده تجاهك}.مافەکانی خوا بپارێزە دەبینی بەرەو ڕوت دێت. سنورەکانی خوا مەشکێنە وچاودێری مافەکانی خوا بکە، خوای گەورەش هاریکاریت دەکات لەژیانی دنیاو قیامەت سەرکەوتو وسەرفرازت دەکات.

٣. {إذا سألت فاسأل الله، وإذا إستعنت فاستعن بالله}.واتە: ئەگەر داوای دەستگیرۆیی ویارمەتیت کرد لەکارێك لەکاروبارەکانی دنیا وقیامەت دا تەنیا داوا لەخوای گەورە بکەو بەس گەر هانات برد تەنیا هانا بۆ لای خوا بەرە بەتایبەتی

---

(١) واتە: ئەی گەنج من دەمەوێ چەند وشەیەك وچەند ئامۆژگاریەکت فێر بکەم.(وەرگێر).

لەو کارو کاتانەی کەلەخوای گەورە بەولاوە کەس دەسەلاتو توانای بەسەردا نەشکێت وەکو چاك بونەوەی (شفاء) ی نەخۆش، وداوای ڕزق وڕۆزی ...تد. ئەوانەی کەپەیوەندن بە(الله) ی تاك وتەنیاو بالا دەست وبەخشندەو میهرەبان.([1])

٤. {واعلم أنَّ الأمة لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيءٍ لم ينفعوك إلاّ بشيءٍ قد كتبه الله لك، وأن إجتمعوا على أن يضروك بشيءٍ لم يضروك إلاّ قد كتبه الله عليك، رُفعت الأقلام وجفت الصحف}([2]) لەسەر موسڵمان پێویستە بڕوای تەواوی بەقەزاو قەدەری خوا هەبێت خێرو شەڕی.

## لەسودەکانی ئەم فەرمودەیە

١. خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان وسوار کردنی کوڕی عباس(إبن عباس) لەدوای خۆی وبانگ کردنی بەئەی غلام واتە ئەی گەنج ئەی لاو.

٢. فرمان کردن بەمنداڵان کەتەنیا بەندایەتی بۆ خوا بکەن وگوێ ڕایەڵی خوا بن ولەسەرپێچی و بێ فرمانەکانی خوا دور بکەونەوە بۆ ئەوەی لەدنیا وقیامەتدا بەختەوەر بن.

٣. خوای گەورە بڕواداران لەکاتی تەنگانەدا دەپارێزێ، ئەگەر بێتو لەفرمانەکانی خوا دەر نەچن وماف وسنورەکانی خوا نەشکێنن، مافی خەڵکانیش پێ شێل نەکەن لەکاتی خۆشی و تەندروستی ودەوڵەمەندی وهەژاریدا.

---

(١) بڕوانە شەرحی فەرمودەکە کەلە((الأربعينية النووية)) ی نەوەوی.

(٢) أ. رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح.

ب. واتە: ئەگەر هەمو خەڵکی سەر زەوی کۆببنەوە بیانەوێ زیانێکت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر ئەوە نەبێ کەخوای گەورە بۆی نوسیوی ، وەئەگەر هەمو کۆ ببنەوە وبیانەوێ سودێکت پێ بگەیەنن ناتوانن مەگەر خوای گەورە بۆی نوسیبی.بۆیە دەبێ مرۆڤی موسڵمان وبڕوادار بڕوای بەقەزاو قەدەری خوا هەبێت چ خێرو چ شەڕی. (وەرگێڕ).

٤. چاندن ووەشاندنی تۆوی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی(الله) لەدڵ ودەرونی منداڵاندا وعەقیدەو بیروباوەڕی ئیسلامی لەمێشك ودڵ ودەرونیاندا بچەسپێنن. فێریان بکەن کەنزاو پاڕانەوەو داوا کردنیان تەنیا لەڕوی خوا بێت و تەنیا لەو بپاڕێنەوە.

٥. جۆش دان وچەسپاندنی عەقیدە لەدڵی منداڵاندا، بەبڕوا بون بەقەزاو قەدەری بەخێرو بەشەڕیەوە کەیەکێکە لەبنچینەو بنەماکانی ئیمان.

٦. پەروەردە کردنی منداڵان لەسەر گەشبینی وهیوا بون (التفاؤل) ، بۆ ئەوەی پێشوازی لەژیان بکات بەگیانێکی پڕ لەهیواو ئازایەتی وبازویەکی توندو تۆڵ وپتەوەوە، تا ئەنجام ببێتە ئەندام وتاکێکی بەسودو بەکەڵك وکارامە لەئوممەتی ئیسلامدا.

# لەڕەوشتەکانی ئـیـســـــلام - من آداب الإسلامية

تـێ بگـە ئـەی بـرای موسـڵمانم خـوای گـەورە ڕێنومـایی تـۆش وئێمـەش بکـات ــ کـەئایینی پـیرۆزی ئیـسلام بەکۆمـەڵێك ئـاداب وڕەوشـتی جوانـەوە هاتۆتـە مەیـدان کەدەستەبەری تاکی موسڵمان وکۆمەڵگەی ئیسلامی دەکات ولەدنیاو لەقیامەتدا بەختەوەر وسەربەرزو سەرفرازمان دەکـات ئەگـەر ئێمـە دەست بەبەرنامـەی خـواو ئـاداب وڕەوشـتە ئیسلامیەکانەوە بگرین ولەچوار چێوەو سنوری ئیسلام دەر نەچین. ئەمـەش ئـەو ئـاداب وڕەوشتە بەرزانەن کەلەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان هەڵ دێنین:

١. **پاك وخاوێنی (النظافة)**: برای موسڵمان ئەی برای پەروەردیار پاك وخاوێن بە لەماڵەکەتدا، لەجێگەی کارو فرمانتدا، لەجل وبەرگ وپۆشاکتدا، لەلەشدا بەتایبەتیش کەدەچیتە مزگەوت بۆ بەندایەتی ونوێژ کردن. بەتایبەتی لەکاتی نوێژی هەینی دا خۆت بشۆ وباشترین وپاکترین جلت لەبەر بکەو بۆنی خۆش لەخۆت بدە، بەجل وبەرگی پیس وبۆنی ناخۆش وبەگۆرەوی و قاچی پیسەوە مەچۆ بۆ مزگەوت و بەپێ ی پیسەوە پێ لەبەرەو ڕایەخەکانی مزگەوت مەنێ، چونکە پیس وبۆگەنی ناخۆش بەڕایەخەکانەوە بەجێ دێڵی وموسڵمانانیش لەکاتی کڕنۆش (سجدة) بردن دا نێوچاوانی خۆیانی لەسەر دادەنێن وپێ ی قەڵس دەبن وبەهۆی تۆوە ئازاریان پێ دەگات ولەوانەیە هەر بەم هۆیەوەچەندان کەس لەمزگەوت بتۆرێن و واز لەمزگەوت ونوێژ کردن بەکۆمەڵ بێنن وتۆش گوناحێکی گەورەت دەگاتێ. هەروەکو پێویستە سیواك بەکار بهێنی، بەتایبەتیش لەکاتی دەست نوێژ شوشتن ونوێژ کردندا چونکەپێغەمبەرﷺئوممەتەکەی لەزۆر لە فەرمودە کانی دا هان داوە بۆ بەکار هێنانی سیواك لەوانە: { السواك مطهرةٌ للفم، مرضاةٌ للرب}(١) ئاگادار بە پێش ئەوەی

(١) أ. صحيح رواه أحمد.

ب. واتە: سیواك کردن ناو دەم پاك دەکاتەوە وخواشت لێ ڕازی دەبێ.(وەرگێڕ).

کەبچیتە مزگەوت سیرو پیاز نەخۆی بۆ ئەوەی نوێژکەران وئەوانەی وا لەتەنیشتتەوەن بەبۆنەکەیان هەراسان وئازار نەدەیت پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە فەرمویەتی(من أكل ثوماً أو بصلاً فليعتزل مسجدنا، وليقعد في بيته)(١) . بۆ زانینتان ئەو بۆن خڵتەو بۆن دوکەڵەی جگەرە کەلەهەندێ لەنوێژکەرانەوە دێت گەلێك لەبۆنی سیرو پیاز ناخۆشترو قێزەوەن ترە. بۆیە زاناکان جگەرەیان حەرام کردوە لەبەر ئەو هەمو زیان ومەترسیانەی کەبۆ لەشی مرۆڤ ومال ودراوسێ وهاوڕیزەکانی هەیەتی. جگەرە لەو شتە پیسانەی کەخوای گەورە لێ ی حەرام کردوین ولێ ی ئاگادار کردوینەوەو دەفەرموێ:﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ ﴾(٢) و پێغەمبەرﷺ

٢. فەرمویەتی: {لاضرر ولاضرار}صحيح رواه أحمد.واتە نەزیان بەخەڵکی بگەیەنەو نەخەڵکیش زیان بەتۆ بگەیەنێت. دیارە جگەرە کێشان هەم زیان بەلەشی جگەرەکێش دەگەیەنێت وهەم بەهۆی جگەرەکێشانەکەیەوە زیان بەخەڵکانی تری نزیك لەخۆی ودەوروبەری دەگەیەنێت. ماڵ بەفیڕۆ دەدات، بۆیە ئاگادار بە ئەی برای موسڵمان هەرگیز نەکەیت جگەرە بخۆیت چونکە گوناحەو لەگوناحە گەورەکانە.

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: هەر کەسێك سیر یاپیازی خوارد بالێمان نزیك نەبێتەوەو بانەش یەتە مزگەوت ولەماڵەوە دابنیشێت ونوێژی خۆی لەماڵ بکات، چونکە بۆنی سیرو پیازی لێ دێت ونوێژ خوێنان و فریشتەکان هەراسان د دەکات.(وەرگێڕ).

(٢) أ. الأعراف:١٥٧.

ب. واتە: هەموشتێکی پاك وخاوێنیان لێ حەڵاڵەو هەمو شتێکی پیسیشیان لێ حرامەو نابێ بیخۆن.(وەرگێڕ).

### ٣. مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکی دا (المعاملة مع الناس):

أ ـ چت بۆخۆت دەوێت دەبێ ئەوەشت بۆ برا موسڵمانەکەشت بوێ، پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ لايُؤمن أحدكم حتى يحب لأخيه مايحب لنفسه}((متفق عليه))([1]) .

ب - لەکڕین وفرۆشتن دا لێ بوردەو بەویژدان ولەسەرەخۆ بە: پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ رحِم الله عبداً سمحاً إذا اشترى، سمحاً إذا قضى، سمحاً إذا اقتضى}([2]).

ج ـ تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکی دا بکەو ئامۆژگاریان بکە: خۆڕاگرو پشو درێژ بە بەرامبەر بەئێش وئازارەکانت کەلەدەستی هەندێ لەنەفام وناحاڵی لەئایین توشی دەبیت، هەتاکو لەو کەسانە بیت کەپێغەمبەرﷺلەبارەیانەوە فەرمویەتی:{ المسلم الذي يخالط الناس ويصبر على أذاهم، أفضل من المسلم الذي لايخالط الناس ولايصبر على أذاهم}(( رواه الترمذي وإسناده صحيح))

### ٤. بونی ویژدان وقبوڵ کردنی هەق: (الإنصاف وقبول الحق):

ڕاستی لەڕاستبێژەوە وەر بگرە، هەر چەندە لەخۆشت بچوك تر بێت جا بادوژمنیشت بێت. وریابە هەرگیز هەق بە سەرچاوی خەڵك دامەدەوەو بەسوکی سەیری مەکە واتە هەق لەخەڵك وەربگرەو بەوپەڕی سینگ فراوانیەوە، پێغەمبەری خواﷺ ئێمەی لەم کارە خراپە ئاگادار کردۆتەوە وفەرمویەتی:{ لايدخل الجنّة من كان في قلبه مثقال ذرةٍ من كبر، قيل: إن الرجل أن يكون ثوبه حسناً، ونعله حسنة،

---

(١) واتە: ئیمانی نیە ئەوەی کەبۆخۆی دەیەوێت بۆ برا موسڵمانەکەشی نەی خوازێ.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه البخاري.

ب. واتە: ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت کەلێ بوردەیە و بەویژدانە لەکڕین وفرۆشتن دا، نەرم ولەسەرخۆو بەویژدانە لەکاتی بەرپرسێتی دا لەکاتی داوەری کردن وفرمان کردن ولەکاتێك دا کەفەرمانی بەسەردا دەکرێت.(وەگێڕ).

قال: إنَّ اللهَ جميلٌ يحبُ الجمال، الكبر بطرُ الحق، وغمط الناس}([1]) ( بطرالحق: ئەسەلماندنی هەق، غمط الناس: خەڵك بەسوك سەیر کردن وخەڵك بەکەم زانین).

٥. **ددان نان بەهەڵەدا (الإعتراف بالخطأ)**: ئەگەر هەڵەت کردن ددان بەهەڵەکانی خۆتدا بێنە وداوای لێ بوردن بکەو کەللە ڕەق مەبە، ددان بەهەڵە دانان گەلێك لەوە باشترە کەلەزۆلکاوی ناڕاستی و ناهەق دا گیژاو بخۆیتو مەلە بکەیت، چونکە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {كلُّ بنى آدم خطاءٌ وخيرُ الخطائين التوابون}([2])

٦. **دادپەروەری وهەقبێژی( العدل وقول الحق )**:

(أ) دادپەروەر بە باڵەناو دوژمنەکانیشت دابێت، ناحەزی ودوژمنایەتیت لەگەڵ کەسانێك دا وات لێ نەکات کەغەدریان لێ بکەیت. خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْۚ ٱعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾ ([3]).

---

(١) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: هەر کەسێك بەقەد گەردیلەیەکی ئەتۆمی خۆ بەزل زانی ولەخۆ ڕازی بون وبوح زلی(الکبر) لەدڵ دا بێت ناچێتە بەهەشتەوەو لێ ی حەرامە. سەحابەکان گوتیان: باشە ئەی ڕەسولی خوا ئەدی پیاو حەز دەکات گرنگی بەخۆی وبەپۆشتەو پەرداخ وجوانی جل وبەرگ ولەشی خۆی بدات وحەز دەکات جوان بن، هەوڵ دەدات پێڵاوەکانی جوان بن ئەدی چی بکەین کەحەرام بێت ونەچینە بەهەشت؟ فەرموی: ئەمە ئەوە ناگەیەنێ چونکە خوای گەورە جوانەو جوانیشی خۆش دەوێت، پاك وبێگەردەو پاکیشی خۆش دەوێت، بەڵکو خۆ بەزل زانی وکەللە ڕەقی وکەللە پوتی ئەوەیە کەهەق ئەسەلمێنێ وبەچاوی سوکەوە سەیری خەڵکی بکات. وخۆی بەسەر خەڵکی دا بابدات خۆی پێ باشتر و زیرەك ترو موسڵمانتر وگوێندەتر بێت وکەچی واش نەبێت.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه الترمذي وحسنه محقق الجامع الأصول.

ب. واتە: هەمو کەسێك قابیلی هەڵە کردنە بەڵام باشترینی هەڵەکاران تۆبەکارانن.، کەپێ لەهەڵەکانی خۆیان دەنێن.(وەرگێڕ).

(٣) أ. سورة المائدة: (٨)

(ب) ڕاستی بڵێ هەر چەندە لەسەر خۆشت بێ، یابا لەسەر خزم وکەس وکارەکانی خۆشت بێت هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ ۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ ﴾(١).

**٧. وەرگرتنی فرمانەکانی ئایین( الإستسلام لأوامر الدين ):**

مل کەچی فەرمان‌وحوکمەکانی ئایینی خوا بە: وشەی ئیسلام لەئاشتی‌وخۆبەدەستەوەدان بۆ فرمان‌و حوکمەکانی خوا لەسەر زەوی دا داڕێژراوە، حوکمەکانی ئایین وبەعەقڵ‌و بەزیری خۆت مەپێوە چونکە ئایین بەبەڵگەیە نەک بەعەقڵ‌ورای تاک‌وکۆمەڵ، چونکە عەقڵ سنورێکی دیاری کراو ودەست نیشان کراوی هەیەو کۆتایی دێت، زۆر جاران هەن کەعەقڵ هەڵە دەکات‌و لەزۆر کێشە و ئاستەنگ دا دەستە وستانە، وناتوانێ کارو کێشەئایینیەکان لێك بداتەوەو شی یان بکاتەوە ئەوەتە ئیمامی علی (کرم الله وجهه)گوتویەتی:( لوكان الدين بالرأي لكان المسح على أسفل الخُفِ أولى من المسح على أعلاه)(٢) .

---

ب. واتە: ناحەزی وناتەبایی لەگەڵ کەسانێك واتان لێ نەکات کەنادادپەروەر بن ، ڕاست و دادپەروەر بن ، چونکە ئەمە نزیکترە لەتەقواو خواپەرستی، لەخوا بترسن چونکە خوای گەورە ئاگای لەهەمو کارو کردەوەیەکتان هەیە.

(١) أ. سورة النساء: (١٣٥)

ب. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان بەخواو بەبەرنامەکەی خوا هێناوە دادپەروەر بن وبەردەوام بن لەسەر دادگۆیی وڕاستی وداد بڵێن، شایەتی ڕاستی و دادوەری بەرگری لێ بکەن جابا لەگەڵ نەفسی خۆیان وباوك ودایك وخزم وکەس وکارو هەژارو دەوڵەمەندانیش دابێت، خوا لەپێشترە لەوانەی کەباسمان کردن، دوای هەواو ئارەزوەکان مەکەون ودادپەروەر بن ئەگەر پشت هەڵ بکەن دادپەروەرو ڕاست بێژ نەبن خوای گەورە زاناو داناو ئاگادارە  بە کردەوەکانتان.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه أبو داود، صححه محقق جامع الأصول.

موسڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە کەهەمو فرمانەکانی شەریعەتی خوا ئەنجام بدات بێ ئەوەی لەهۆو هۆکارەکانی بکۆڵێتەوە ، وەکو سەربازێك وایە کەفەرمانی ئەفسەرەکەی خۆی جێ بەجێ دەکات بێ ئەوەی بڵێ بۆچی؟ چونکە دەزانێ ئەفسەرەکەی لەو زانا ترە. کاتێ کەئیسلام گۆشتی بەراز حەرام دەکات موسڵمانان یەکسەر بێ لێکۆڵینەوە لەهۆیەکەی گوێ ڕایەڵی فەرمانی خوا دەکەن و هیچ پرسیارێکیان نەکرد هەتاکو لەدوای (١٤) سەدە نوژداری نوێ زیانەکانی گۆشتی بەرازی دۆزیەوەو زانیمان کەکاتی خۆی خوای گەورە لەبەر ئەو زیانانە بوە لەموسڵمانانی حەرام کردوە.

٨. **داد پەروەری لەوەسیەتدا( العدل في الوصية ):**

هیچ کامێك لەوەرسەکان لەبەشە میراتی خۆی بێ بەش مەکە، بەو حوکمە ڕازی ببە کەخوای گەورە بۆی داناوی ن بەو شێوە دابەش کردنەی کەدای ناوە، بەهەواو ئارەزوی خۆت نابێت، بەوە نابێت کەمەیل وخۆشەویستیت بۆ یەکێکیان پتر بێت بەشی بۆ دابنێ ی یاخود ئەوانی تر بێ بەش بکەیت. ئەم ڕەفتارو کارە نابەجێ یە بەهیچ شێوەیەك لەشەریعەتی خوادا نیەو دروست نیە بکرێت. لەنعمانی کوڕی بەشیرەوە دەگێڕنەوە کەگوتویەتی:{ تصدّقَ عليَّ أبي ببعض ماله، فقالت أمي﴿ عمرة بنت رواحة﴾ لاأرضي حتى تشهد رسول اللهﷺ، فانطلق أبي إلى النبيّ ليشهد على صدقتي، فقال: أفعلت هذا بولدك كلِّهم؟ قال: لا، قال: إتقوا الله وأعدلوا بين أولادكم}([1]) لەڕیوایەتێکی تردا

---

ب. واتە: ئەگەر ئاینی بەڕاو بیرو بۆچونی مرۆڤ بوایە، دەبوایە بنی گۆرەویەکان (مسح) بکرایەن نەك پشتی گۆرەوی یەکان .(وەرگێڕ).

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: باوکم پێش مردنی هەندێ ماڵی خۆی بەمن بەخشی واتە وەسیەتی کرد، بەلام دایکم کەناوی(عمرە کچی رواحە) بوبەمە ڕازی نەبو گوتی: ڕازی نابم هەتا ئەمە بەپێغەمبەری خواﷺ ڕانەگەیەنیت. بۆیە باوکم چوە لای پێغەمبەرﷺو ئەمەی پێ ڕاگەیاند وئەویشﷺ فەرموی: ئەمەت بۆ هەمو منداڵەکانت داناوە؟ گوتی: نەخێر. فەرموی: لەخوا بترسن ولەنێوان منداڵەکانتاندا دادپەروەر بن

ﷺفەرمویەتی: {فلا تُشهدني إذن، فإنّي لاأشهد على جورٍ} أخرجه مسلم والنسائي.
چەندان لەو کەسانەی وەسیەت دەکەن وماڵەکەیان بۆ هەندێك لەوەرەسەکانیان دەدەنێن وهەندێکیشیان بێ بەش دەکەن وتۆوی دوبەرەکی ورق وکینەو حەسودی لەدڵی وەرەسەکانیان دا دەوەشێنن. ئەنجام بۆ ستاندنەوەی مافی خۆیان پەنایان بردۆتە بەر دادگاو دادگایی کردن وماڵێکی زۆریشیان لەپێناو گرتنی پارێزەرو هات وچۆو خەرجی کردن بەفیرۆ داوە.ئەم هەمو هەڵە ناشیرین ناشەرعیانە بەهۆی نەفامی و حاڵی نەبون لەدینەکەمان ڕو دەدەن . جا پێویستە لەسەر پەروەردیاران چ پیاو وچ ژن ، چ مامۆستایان وچ باوك ودایکان ئەم هەمو ڕێنومایی ئەرك وکارە گرنگ وبەبایەخانە لەمندالاّن وقوتابیەکانیان بگەیەنن وپەروەردەیەکی دروست وڕاستیی شەرعیانەیان بکەن.

## ٨ ـ مافی دراوسێتی (( حقوق الجار )):

بـرای موسـڵمان زۆر وریابـە لـەئازاردانی دراوسـێکانت چ بەقـسەو چ بـەکردەوە. چونکە پێغەمبەری خواﷺزۆر بەتوندی لەئازار دان ودڵ هێشاندنی دراوسێ ئاگادارمان دەکاتەوەو دەفەرموێ: {واللهِ لايؤمن، واللهِ لايؤمن، واللهِ لايؤمن من لايؤمن جاره بوائقه}(١) هەروەها پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {من كان يؤمن باللهِ واليوم الآخرِ فلا يؤذي جاره}(٢). پاشماوەی پیسی وبەرماوەکانی خۆتان فڕێ مەدەنە سەر ڕێگەی خەڵکی بەتایبەتیش دراوسێکانتان وەك: توێکڵە مۆزو پەلکە کالەك وشتی تر کەدەبێتە هۆی ئازاردانی

---

و وەك یەك سەیریان بکەن. لەڕیوایەتێکی تردا فەرموێ: کەواتە مەم کەن بەشاهید وپێم ڕامەگەیەنن، چونکە من شاهیدی لەستەم وخراپی نادەم وڕێگەی کاری بێ شەرعی نادەم.(وەرگێڕ).

(١) أ. رواه البخاري.

ب. واتە: پێغەمبەرﷺ سێ جار سوێندی بەخوا خوارد کەئەو کەسەی دراوسێکەی لەدەست وزمان وداوێنی پارێزراو نەبێت ئیمانی نیەو ناچێتە بەهەشت.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه البخاري.

ب. واتە: هەر کەسێك بڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێت با دراوسێکانی ئازار نەدات.(وەرگێڕ).

ڕێڕەوان. جارێکیان پیاوێك بەهۆی توێکڵە مۆزێکەوە قاچی شکاو شەش دانە مانگ لەسەر پشت لەجێگەدا بۆی کەوت. هەمیشە هەوڵ بدە شت وچڵپ وچاڵ لەسەر ڕێگەی خەڵکی لابدەیت بەتایبەتی ڕێگەی دراوسێکانت، چونکە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {وتميط الأذى عن طريق صدقة}(١)

ئەگەر دراوسێکەت نەخۆش بو هاریکاری بکەو ئەگەر توشی بەڵاو تەنگ وچەڵەمەو کێشەیەك بو چاودێری هەست ونەستی بکە، سەردانی بکەو دڵی بدەوەو لەغەم وپەژارەی کەم بکەوە.

هەندێ کارو هەڵس وکەوتی وانەکەیت کەهەستی برینـدار بکەیت وەك بەرز کردنەوەی دەنگی ڕادیۆو تەلەفزیۆن. ڕێگە بەماڵو منداڵومیوانەکانت مەدە دەنگە دەنگ وژاوە ژاوی بەرز بکەن لەدڵی ئەوان کاریگەر بکات وهەراسانیان بکات بەتایبەتیش لەبەرئەوانەی نەخۆشیان هەیە.

**٩- وەفا کردن بە پەیمان( الوفاء بالوعـد ):**

کەپەیمانت بەهەر کەسێك دا با منداڵیش بێت ولەکات وساتی خۆی دا وەفا بەپەیمانەکەی خۆت بکە.هەمو کڕین وفرۆشتنێك بەرێك کەوتن وپەیمانێك دادەمەزرێ، پێویست بەهیچ پێشەکی و ئاسان کاریەك ناکات واتە بڕێك پارە وەك بارمتە بۆ مسۆگەری ودڵنیایی دابنرێت بۆ پابەند بون بەکڕین وفرۆشتنەکەوە. تەنیا بەپەیمان دان وگرێ بەستی یەك هەمو شتێك دادەمەزرێ. مرۆڤی بڕوادار هەر شتێکی گوت وبڕیاری لەسەر دا پابەند وڕاستگۆ دەبێت و وەفا بەپەیمانەکەی خۆیەوە دەکات. هەر کەسێك پێچەوانەی پەیمانەکەی خۆی بوەستێتەوە ئەوا یان ئیمانی نیە یان ئیمانەکەی بێ هێزەو بەدو

---

(١) أ. متفق علیە.

ب. واتە: هەمیشە ڕێگەی موسڵمانان پاك بکەرەوە، ئەگەر چقڵێك ، شتێك لەسەر ڕێگەی موسڵمانان کەوتبو ئەگەر لای بدەیت بەخێرو چاکە واتە سەدەقە بۆت دەنوسرێت ولەقیامەتدا پاداشتەکەت وەر دەگریتەوە.(وەرگێڕ).

ڕو(المنافق) دادەنرێت.پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ آيةُ المنافق : إذا حدَّثَ كذَّ بَ، وإذا وعد أخلف، وإذا أتُمِنَ خان}(١)

**١٠ـ دەستورەكانی سەردانی نەخۆش (آداب عيـــادة المريــض):**

ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام موسـڵمانان زۆر هـان دەدات بـۆ سـەر دانـی نـەخۆش بەتایبـەتیش ئەگـەر نـەخۆش لـەخزم وخـوەیش ونزیـك وكـەس وكـارو دراوسـێكان بێـت، پێغەمبەری خواﷺ گرنگی یەكی زۆری بەم بابەتە داوەو فەرمویەتی: إنَّ اللهَ عزَّ وجلَّ يقو يوم القيامة: ياإبن آدم مرضتُ فلم تعدني، قـال: يـاربُّ كيـف أعـودك وأنـت رب العـالمين؟ قال:أما علمت أن عبدى فلاناً مرض فلم تعده، أما علمت أنك لو عدته لوجدتني عنده}(٢)

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: نیشانەكانی دو ڕویی سیانن: ئەگەر قسەی كردن درۆیانی تێدا دەكـات وەئەگـەر وەعـد وپەیمانی دا وەفای پێوە ناكـات وپێـچەوانەی پەیمانەكـەی دەوەسـتێتەوە، وەئەگـەر ئەمانـەتێكی پـێ سپێردرا بەجێ ی ناگەیەنێ وخیانەتی تێدا دەكات.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه مسلم.

ب. واتە:خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا بەبەندەی خۆی دەفەرموێ: ئەی كـوڕی ئـادەم مـن نـەخۆش بوم سەردانت نەكردم بەندەكەش دەڵێ: ئەی پەروەردگاری من تۆ چـون نـەخۆش دەبیـت وچۆن بێمـە لات وسەردانت بكەم لەكاتێكدا تۆ پەروەردگاری جیهانیانی؟ خوای گەورەش دەفەرموێ: ئەدی نەتزانی كەفلان كەس نەخۆش بو ونەچویتە سەردانی و، ئەدی نەتزانی ئەگەر بچوبایتە لای منت لـەوێ دەبینـی .یا لەوێ منت دەدیت.(وەرگێڕ).

## لەڕەوشتەکانی سەردانی نەخۆش

- دەبێ سەردانی نەخۆش کورت بێت وزۆر دانەنیشیت بۆ ئەوەی نەخۆش بێزار نەبێت، چونکە لەوانیە پێویستی بەحەسانەوە وخەوتن وچونە سەر ئاو هەبێت لەکاتێك دا بەدیار تۆوە دانیشتوەو لەبەر تۆ پیّ ی عەیب بێت هەڵ بسنێت.
- پێویستە لەگەڵ نەخۆشدا زۆر قسە نەکرێت، داوای گێڕانەوەی نەخۆشیەکەی لیّ نەکەیت چۆن بو یان چۆن نەبو؟
- دڵخۆشی نەخۆش وکەس وکارەکەی بدەوە وبەختەوەری و هیواو خۆڕاگری بخەرە بەر دڵی نەخۆشەکەوەو هیوای چاك بونەوەی بۆ بخوازەو دڵی خۆش بکە بەوەی کەپیّ ی بڵیّ ی : (إنشاءالله) زو چاك دەبیتەوە، سوپاس بۆ خوا بەرەو باشی ڕۆیشتوی وهیچ نیەو چاك دەبیتەوە.﴿(لابأس طهوراً ، شفاك الله) پیّ ی بڵیّ ی کەفارەتی گوناحانە( إنشاء الله) ، خوا ئەجرو پاداشتت بداتەوە و لەم جۆرە قسە دڵخۆش کەرانە.وەرگێڕ﴾
- نەخۆشیەکەت چ نیە بەویستی خوا بەم زوانە چاك دەبیتەوە، کەفارەتی گوناحانە و خوا پاداشتت بداتەوە. ئیدی لەم جۆرە قسانە کەنەخۆش دڵی پیّ یان خۆش دەبێت و ئارام دەبێتەوە. وەپێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ من عاد مريضاً لم يحضر أجله، فقال سبع مرات أسأل الله العظيم رب العرش العظيم أن يشفيك. إلاّ عافاه الله} ([1]).

### ١١ ـ ڕەوشتەکانی سەیر کردن ( آداب النظـــر ):

ئەگەر ژنێکی ڕوت وسافرەت دیت ڕوی لیّ وەر بگێڕەو سەیری مەکە، چونکە چاویش زینا دەکات وزینای چاو سەیر کردن وتەماشا کردنە، سەیر کردن وتەماشا کردنی

---

(١) أ. صححه الحاكم ووافقه الذهبي .

ب. واتە: هەر کەسێك سەردانی نەخۆشی کرد ئەجەلی نەهاتبێت و حەوت جاران ئەم دوعایەی بۆ بخوێنێت کەلە سەرەوە نوسیمان . ئەوا خوای گەورە شیفای بۆ دەنێریّ وزو چاك دەبێتەوە.(وەرگێڕ).

ئەو شتانەی خوای گەورە قەدەغەی کردون . پێغەمبەرﷺبەئیمامی علی فەرمو: {یا علی لاتتبع النظرة النظرة، فإنَّ الأولى لك، وليست لك الثانية}(١).

ئەم سەیر کردنە لەژانی دەرونی وئازارو ئەشکەنجەو حەسرەت وپەشیمانی بەولاوە هیچی ترت پێ نابەخشێ، چونکە شتێك دەبینی وبۆت نایەتەدی وئەو خۆراکە جنسیەت دەست ناکەوێت بۆیە توشی ژانی دەرونی دەبیت وچیدی نا. خۆ ئەگەر ژنیشت هەبو، ژنێکی جوان ترت لەهی خۆت بینی ئەوا نەفست دەکەوێتە دڵە ڕاوکێ ودڵت تێك دەدات ودڵت لەسەر ژنەکەی خۆت نامێنێ وئەنجام توشی دڵ تەنگیوناخۆشیت لەگەڵ ژنەکەتدا دەکاتو وردەوردە کێشەو تەنگژەکان سەر هەڵ دەدەنوساردی دەکەوێتە نێوانتانەوەو لای یەکتر ناشیرین دەبن وناخۆشی دەکەوێتە نێوانتان ، کەپێش ئەو تێکەڵاوی وسەیر کردن وتەماشا کردنی ژنانی بێگانە تەباو ڕەبا بون وهیچ ناخۆشیەك وساردیەکتان لەنێواندا نەبو ویەکتریشتان زۆر خۆش دەویستو بەیەکتری ڕازی بون. زۆر جار ئەمە بوەتە هۆی لەیەکتری جیا بونەوە .

وەئەگەر ژنیشت نەهێنا بێت ئەوا ئەم تێکەڵی وسەیر کردنەت دەبێتە هۆی وروژاندنی ئارەزوەکانت ولەوانەیە شەیتان ئەمە بقۆزێتەوەو بەرەو ئەنجامدانی کاری خراپەو بێ شەرعی وزینا کردن پاڵت پێوە بنێتو توشی بێ ئەخلاقیت بکاتو خواشت لێ بڕەنجێت. بۆیە خوای گەورە فرمان بەبڕواداران دەکات ودەفەرموێ:﴿ قُل لِّلْمُؤْمِنِينَ

---

(١) أ. رواه أحمد وغيره، وحسنه الألباني في صحيح الجامع.

ب. واتە: ئەی علی تەماشای ئافرەتان نەکەیت ، یەکەم جار گەر بەرچاوت کەوت بەدەست خۆت نەبو، ڕوی لێ وەر بگێڕەو جاری دوەم وەردی مەدەوەو بگەڕێیتەوە سەری ومرخی خۆتی لێ ببینی ، چونکە پێغەمبەرﷺبەئیمامی علی فەرمو : سەیر کردن وتەماشا کردنی یەکەم بۆ تۆیە واتە گوناحت ناگاتێ وهیچت لەسەر نیە، بەڵام تەماشا کردنی دوەم بۆ تۆ نیەو لەسەرت دەنوسرێت و چاوت زینا دەکات . بۆیە دەبێ جاری دوەم نەگەڕێیتەوە سەری وتەماشای بکەیت.(وەرگێڕ).

يَغُضُّواْ مِنْ أَبْصَـٰرِهِمْ وَيَحْفَظُواْ فُرُوجَهُمْ ذَٰلِكَ أَزْكَىٰ لَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا يَصْنَعُونَ ﴿٣٠﴾ (١).

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ ماتركتُ فتنة من بعدي أضرَّ على الرجال من النساء}(٢)

**١٢ ـ ڕەوشت وشێوازەكانی ئامۆژگاری كردن:ـ**

پێغەمبەرﷺ ڕێنومایيمان دەكات بۆ ئامۆژگاری كردنی خەڵك وڕێنومایی كردنیان بۆ لای خوای گەورە و دەفەرموێ:{ الدين النصيحة : قيل لمن يارسول الله ؟ قال: لله ولكتابه ولرسوله، ولأئمة المسلمين وعامتهم} (٣)

بەڵام ئامۆژگاری كردن دەستورو یاساو ڕێساو شێوازی خۆی هەیە دەبێ چاودێری بكرێن و لەپەروەردیاری گەورەو سەروەرمان محمد ﷺ وەریان بگرین و شوێن

---

(١) أ. سورة النـور: (٣٠)

ب. واتە: ئەی محمدﷺبەبڕواداران بڵێ باچاویان لەئاست ئافرەتان دانەوێنن وتەماشایان نەكەن واتە هەرچی خوای گەورە لێ ی حەرام كردون وسەیر كردن وتەماشا كردنیانی لێ حەرام كردون چاوی خۆیانیان لەئاست دانەوێنن وسەیریان نەكەن ودامێنی خۆیان بپارێزن، چونكە ئەمە بۆ ئەوان باشترو پاكترە، خوای گەورە زانایە بەو كارو كردەوانەی كەبەئاشكراو بەنهێنی دەیكەن.تفسیر الطبري،(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: هیچ فیتنەیەكم لەژنان بەولاوە لەدوای خۆم بەجێ نەهێشتوە كەزیان بەخشتر بێت بۆ پیاوان.(وەرگێڕ).

(٣) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: ئایین ئامۆژگاریە: گوتیان بۆ كێ ئەی ڕەسولی خوا؟ فەرموی : بۆ خوای گەورە وبۆ پێغەمبەرەكەی وبۆ هەمو پێشەوایانی ئوممەتی ئیسلامی و بۆ سەرجەمی موسڵمانان واتە عامەكەیان.(وەرگێڕ).

کەوتەی ئەو بین نەك بچین لەم لاو لەو لاو لەجولەکەو فەلە وخوانەناس وکۆمۆنیستەکان و عەولەمەو نازانم چی و چی وەر بگرین وچاو لەبێگانەو غەیرە دینەکان بکەین . ئێمە موسڵمانین وبەرنامەی تایبەتی خۆمان هەیە وپەروەردگاری و دروستکەری هەمو بونەوەر بۆی دارشتوین.

أ- فعن أنس بن مالك ﷺ قال: ( بينما نحن في المسجد مع رسول الله ﷺ إذ جاء أعرابي، فقام يبول في المسجد، فقال أصحاب رسول الله ﷺ مه مه ﴿ لاتفعل﴾ قال: قال رسول الله ﷺ لاتزرموه﴿ لاتضروه﴾ دعوه، فتركوه حتى بال ثمَّ إنَّ رسول الله ﷺ دعاه فقال له إنَّ هذه المساجد لاتصلح لشيءٍ من هذا البول ولا القذر، إنَّما هي لذكر الله عزوجلَّ والصلاة وقراءة القرآن، أو كما قال رسول الله ﷺ، قال: فأمر رجلاً من القومِ، فجاء بدلو من ماءٍ فشنهُ عليه،﴿فصبه عليه﴾)(١)

ب ـ روى مسلم عن المعاوية بن الحكم السلمي قال: بينما أنا أُصلي مع النبي ﷺ إذ عطس رجلٌ من القوم فقلتُ: يرحمك الله، فرماني القوم بأبصارهم ، فقلتُ: وا ثكل أُماهُ ماشأنكم تنظرون إليَ ؟! فجعلوا يضربون بأيديهم على أفخاذهِم، فلما رأيتهُم يصمتونني لكنني سكتُ، فلما صلّى رسول الله ﷺ، فبأبي وأُمي ما رأيتُ معلماً قبلهُ

---

(١) أ. رواه الشيخان.

ب. واتە: لە أنس کوڕی مالك دەگێڕنەوە کەگوتویەتی: ( لەکاتێك دا ئێمە لەگەڵ پێغەمبەرﷺلەمزگەوت دانیشتبوین عەرەبێکی دەشتەکی هات ولەمزگوتدا دەستی کرد بەمیز کردن. سەحابەکان بەسەریاندا شیڕاندو گوتیان: نەکەی کوڕە نەکەی میز لەوێ نەکەیت. بەڵام پێغەمبەرﷺفەرموی: ناڵێ ی گەڕێن بامیزەکەی تەواو بکات ، جا کەلەمیزەکەی بوەوە، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردە لای خۆی وفەرموی: مزگەوتەکان جێگەی میز لێ کردن وپیسی تێ فرێدان نین، بەڵکو ئەم جێگایانە پاکن وتەنیا جێگەی نوێژ کردن وزیکری خواو قورئان تێدا خوێندنن. ئەمجار بەیەکێ لەسەحابەکانی فەرمو: بڕۆ دەولکەیەك ئاو بێنەو بەسەر جێگەی میزەکەی دابکە وپاکی بکەوە. ئەمجار دەولکە ئاوەکەیان هێنا بەشوێنەکەیان داکردو وپاکی یان کردەوە. (وەرگێڕ)

ولا بعدهُ أحسن تعليماً منهُ، فوالله مانهرني ولاضربني ولا شتمني، ثمَّ قال: { إنَّ هذهِ الصلاة لايصلح فيهِ شيءٍ من كلام الناس، وإنَّما هي التسبيح والتكبير وقراءة القرآن }(١)

جا خوشك وبرایانی پەروەردیار چ مامۆستایان وچ باوك ودایكان دەبێ ئەم خاڵانەی كەلەسەرەوە باسمان كردن لەمنداڵەكان یا قوتابیەكانیان بگەیەنن وزۆر باش وزۆر جوان لەسەر ئەم ڕەوشت و ئاكارو بەها بەرزانە پەروەردە ڕایان بهێنن بۆ ئەوەی لەدواڕۆژدا ئەندامێكی پاك وخاوێن وكارامە وچالاكیی خواپەرستیان لێ دەر بچێت.

---

(١) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: موسلم لەمعاویەی كوڕی حەكەمی سولەمی دەگێڕێتەوە كەدەڵێ: لەكاتێك دا من نوێژم دەكرد، پیاوێك پشمی ومنیش گوتم : ڕەحمەتی خوات لێ بێت، كەچی ئەوانەی لەوێ بون هەمو بەسەیرێكەوە سەیریان دەكردم: منیش گوتم: دەك خوا دایكی بێوەژن بكات چی یە بۆ وا سەیرم دەكەن؟! ئەوان هەمو بەدەست لەڕانی خۆیان دەدا و كاتێ بینیمن بێ دەنگیان دەكردم، من دەنگم نەكرد. كاتێ پێغەمبەرﷺلەنوێژ بوەوە گوتم: دایك وباوكم بەقوربانت بێت وەڵڵاهی تاكو ئێستا هیچ مامۆستایەكم دەست نەكەوتوەكەلەمە باشترم فێر بكات. وەڵڵاهی نەسەرزەنشتی كردم ونەلێ ی دام و نەقسەشی پێ گوتم ئەوجا پێ ی گوتم: { لەنوێژ كردندا بەهیچ شێوەیەك نابێ قسەی خەڵكی (مرۆڤ) ی تێدابێت.، بەڵكو هەموی دەبێ تەسبیحات و(الله أكبر) و خوێندنی قورئان بێت. }(وەرگێڕ).

# لەڕەوشتەکانی سەردان و ڕوخسەت وەرگرتنی چونە ژورەوە

## ( من آداب الزيارة والإستئذان )

١. قال تعالى:﴿ فَإِن لَّمْ تَجِدُوا فِيهَا أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ ۖ وَإِن قِيلَ لَكُمُ ارْجِعُوا فَارْجِعُوا ۖ هُوَ أَزْكَىٰ لَكُمْ ۚ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ ﴿٢٨﴾ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ (¹).

٢. ئەم ئاکارو ڕەوشتە شەرعیانە خوای گەورە بەندە بڕوادارەکانی خۆی پێی ڕازاندونەوە وفەرمانی پێ کردون کەئەنجامیان بدەن، یەکێ لەو ئاکارو ڕەوشتە جوانانە ئەوەیە کاتێ کەدەچینە سەردانی مالآن دەبێ لەدەرگا بدەین و بوەستین تارێگەی چونە

(١) أ. سورة النــور: (٢٨،٢٩). إبـن عبـاس ﷺدەڵێ : (الإستئناس) بـەواتای مۆڵـەت وەرگـرتن وڕوخسەت وەرگرتن دێت.( ذكره إبن كثير).

ب. واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان هێناوە مەچنە ناو ماڵانێك کەماڵی خۆتان نەبێت هـەتاکو ڕێگـەی چـونە ژورەوەتـان پـێ نـەدەن. کەڕێگـە دران واتـە ڕوخـسەتتان وەرگـرت بـچنە ژور وسـەلاو وسەلامیان لێ بکەن چونکە ئەوا جوانترو پاکترە بۆ ئێوەو بۆ ئەوانیش وەهـەروەها بـۆ ئـەوەی زیکرو یادی خوا بکەنەوە، ئەگەر چۆل بـون وکەسـیان تێدا نـەبو مەچـنە ژورو بگەڕێنـەوە هـەتاکو مۆڵـەتی چـونە ژورەوەتـان پـێ نـەدەن ، وەئەگـەر گوتیـان بگەڕێنـەوە و بوارمـان نیـە ئـەوا ئێـوە یەکـسەر بگەڕێنەوە، نەکەن تورە ببن وپرتـە پـرت وبۆڵـە بـۆڵ بکـەن ولەشـوێنان باسـی یـان بکـەن بەخراپـە، چونکەئەوان ماڵی خۆیانەو بۆیان هەیە ڕوخسەتتان نەدەن ومافی شەرعی خۆشیانە، دەی ئاوا بۆ ئێوە باشترو بەڕەوشت ترو پیرۆز ترە وخوای گەورەش ئاگادارە بەهەر کارو بەهەر شـتێك کـەئێوە بـەنهێنی وبەئاشکرا ئەنجامی دەدەن. وەگوناحیش نی یەئەگەر بچنە شوێنێك، جێگایەك کەکەل وپەلی ئێوەی لێ بێت وەك دوکان وئەو جۆرە شوێنانە. هەروەها خوای گـەورە ئاگـای لەهـەمو شـتێکی نهێنـی وئاشـکرا هەیە و هەرچی ئێوە بەپەنهانی وبەدزیەوە بیکەن وبتانەوێ بیـشارنەوە خـوای بـالا دەسـت وکاریـەجێ ئاگای لێ یەتی.(وەرگێڕ).

ژورەوەمان دەدەن، جاکەفەرموی چونە ژورەوەیان لێ کردین و چوینە ژورەوە دەبێ سەلام لەدانیشتوانی ناو ئەو ماڵە بکەین. سوننەتیشە دەبێ تا سێ جاران لەدەرگا بدەین وداوای چونە ژورەوە بکەین، خۆ ئەگەر کەسی لێ نەبو، نابێ بچینە ژورەوە ودەبێ بگەڕێینەوە، وەئەگەر لەماڵ بون وڕێگەی چونە ژورەوەیان پێ نەداین، پێویستە بگەڕێینەوەو ونەچینە ژورو عەنتەرانە خۆت پێدا نەکەیتە ژورو تورە نەبین وبڵێین بەخوا ماڵێکی ناکەس بەچەن وخۆ دەرگا لەکەس ناکەنەوە، کەی ئەوانە بەشەرن نەخێر ، دەبێ بەسینگێکی فراوانەوە بگەڕێینەوەو لای کەسیش باسیان نەکەین وگلەیی وگازاندەیان لێ نەکەین، ماڵێکی سوکن ووان و وان، چونکە لەوانەیە ئەوان لەو کاتەدا بواریان نەبێت سەرقاڵی ئیشی تایبەتی خۆیان بن. هەروەکو لەسوننەتی ڕاستدا هاتوە کە:أبا موسا کاتێ لەماڵی عمرداﷺسێ جار لەدەرگای داو داوای چونە ژورەوەی کرد، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە، بۆیە ئەویش گورج گەڕایەوە. عمر گوتی: ئەوە گوێتان لەدەنگی عبدالله کوڕی قبس نی یە داوای هاتنە ژورەوە دەکات؟ دەفەرموی بکەن با بێتە ژورەوە، کاتێك کەچون سەیریان کرد لەوێ نەمابو، دوایی عمرﷺپێ ی گوت:

- ئەوە بۆ ڕۆیشتبوی ونەهاتیە ژور؟

ـ سێ جاران لەدەرگام دا وداوای هاتنە ژورەوەم لێ کردن کەس وەڵامی نەدامەو فەرموی نەکردم بۆیە منیش گەڕامە دواوە.

منیش گوێم لەپێغەمبەرﷺبوە کەدەی فەرمو:{ إذا إستأذن أحدكم ثلاثاً ولم يؤذن له فلينصرف} (١) ئەمجار ئیمامی عمر ﷺگوتی: دەبێ ئەمە کەگوتت بۆم بێنی ویەتەواوی بۆم شی بکەیتەوە یان بەلێدان ئازارت دەدەم، أبا موسا چوە ناو کۆمەڵی

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: ئەگەر سێ جار لەدەرگات داو داوای چونە ژورەوەت کردو ڕێگەیان پێ نەدای وفەرمویان نەکردیت بگەڕێوە.(وەرگێڕ).

پشتیوانان(الأنصار) وئەوەی عمر پێ ی گوتبو بۆی گێڕانەوە، ئەوانیش گوتیان: بچوکترین کەسمان گەواهی(شاهد) یت بۆ دەدات. ئەمجار أبو سعید الخدری هەستا لەگەڵی دا ڕۆیشتو ئەم هەواڵەی بەعمر ڕاگەیاند. ئیمامی عمر گوتی: سەرقاڵیم لەبازاڕدا لەمەی بێ بەش کردم. (متفق علیه) (واتە: موسلم وبوخاری ڕیوایەتیان کردوە).پێویستە لەسەر پەروەردیاران منداڵان وقوتابیانیان لەسەر ئەو ئاکارو ڕەوشتە بەرزە ئیسلامیانە پەروەردە بکەن وڕایان بهێنن بۆ ئەوەی لەدوا ڕۆژدا کەسێکی ڕێك وپێك وبڕوا پتەوو پێ دامەزراویان لەسەر قورئان وسننەت لێ دەربچێت.

**لەسودەکانی ئەم ئایەت وفەرمودانە**

- پێویستە هەر کەسێك دەچێتە سەردانی ماڵان پێش ئەوەی لەدەرگا بدات ومۆڵەتی چونە ژورەوە وەر بگرێت نابێ یەکسەر خۆ بەژوردا بکات وبچێتە ژورەوە، بەڵکو دەبێ مۆڵەتی چونە ژورەوە لەو خانەوادەیە وەربگرێت وفەرمو بکرێت، دەنا دەبێ بگەڕێتەوە.
- کەفەرمو کراو چوە ژورەوە بەم شێوەیە سەلامیان لێ بکات وبڵێ:{ السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته} چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ مُبَـٰرَكَةً طَيِّبَةً﴾(١)
- مجاهد گوتویەتی: ئەگەر چویتە ناو مزگەوت بڵێ: (السلام علی رسول الله) وەئەگەر چویتەوە ناو ماڵ ومنداڵی خۆت سەلامیان لێ بکە، ئەگەر چویتە ناو ماڵێك، خانویەك کەسی لێ نەبو بڵێ: (السلام علینا وعلی عباد الله الصالحین). قتادەش ئەمەی بۆ خستۆتە

---

(١) أ. سورة النور:٦١.

ب. واتە: ئەگەر چونە هەر ماڵێك سەلام لەخۆتان بکەن، بەسەلامێك لەلایەن خوای گەورە کەپیرۆزو باش وبەبەرەکەتە.(وەرگێڕ)

سەر ( إن الملائكة ترد عليه) (١) . جیاوازی لەنێوان پیاو وژندا نیە بۆ سەلام کردن. ژنێك کەگەیشتە ژنان وخزم وکەس وکاری خۆی لەپیاوانێك کەلێ ی حەرامن واتە(محرم) ن وەك براکانی و کوڕەکانی سەلامیان لێ دەکات. پیاویش سەلام لەژنان دەکات کەلێ ی حەرامن(محرمات عليه).

- ژنان بۆیان نیە بچنە ماڵی کەسەوە بەبێ مۆڵەتی چونە ژوورەوە هەروەکو لای زۆرێك لەژنان ئەم ڕەوشتە باوە، چونکە لەوانەیە ئەو پیاوە لەو کاتەدا ڕوت بێت وخەریکی خۆ گۆڕین بێت، یان لەگەڵ خێزانەکەی دا خەوت بێت.
- وریابەخێزان و یامنداڵەکان یاقوتابی یەکانت لەسەر درۆ کردن ڕانەهێنی، بەوەی کەپێ یان بڵێ ی ئەگەر یەکێك هات ولەدەرگای داو داوای منی کرد بڵێن لێرە نیە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کەمنداڵەکانت یاقوتابیەکانت لەسەر ئەم سیفەت ڕابێن ولاسایی تۆ بکەنەوەو چاو لەتۆ بکەن ولەسەر ئەم سیفەتە پەروەردە ببن، باشتر وایە ئەگەر پێت ناکرێت یا حەز ناکەیت ئەو کەسە ببینی داوای لێ بوردنی لێ بکەیت کەناتوانی لەگەڵی دا بچیتە دەر ئەگەر ئیشی هەبو یاخود ببینی، چونکە ئەمەت باشترە لەدنیاو لەقیامەت لەدرۆ کرنەکەت گوایە لەماڵ نیت. دیارە پێویستە لەسەر هەمومان کەعوزر قبوڵ بکەین، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِن قِيلَ لَكُمُ ٱرۡجِعُواْ فَٱرۡجِعُواْۖ هُوَ أَزۡكَىٰ لَكُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ عَلِيمٞ ٢٨﴾ النور:٢٨.
- نابێ ڕاستەوخۆ لەپشت دەرگاکەوە بوەستیت، بەڵکو لەسیلەی ڕاستی یاخود چەپی دەرگاکەوە بوەستە.هەروەها نابێ لەسەر دەرگاوە یا لەکونی دەرگاوە سەیری ناو ئەوە ماڵە بکەیت، وەدەبێ مۆڵەتی چونە ژوورەوە وەربگریت.. پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {مَنْ أطلع في بيت قومٍ بغير إذنهم، فقد حلَّ لهم أن يفقؤو عينيه}(٢) پێغەمبەرﷺئەگەر لەدوای

(١) واتەك فریشتەکان وەڵامی دەدەنەوە. ( تەماشای تەفسیری إبن كثير بکە)

(٢) أ. رواه مسلم.

دەرگای هەرماڵێکەوە بوەستایە، ڕوبەڕوی دەرگاکە ڕانەدەوەستا بەڵکو لەسیلەی ڕاستی یاخی چەپی دەرگاکە دەوەستاو دەی فەرمو:{السلام علیکم، السلام علیکم} .(( صحیح رواه أحمد))

- نابێ بچینە ناو ماڵێك کەخاوەنەکەی یا یەکێ لەکوڕەکانی لەماڵ نەبن چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ تَجِدُواْ فِيهَآ أَحَدًا فَلَا تَدْخُلُوهَا حَتَّىٰ يُؤْذَنَ لَكُمْ..﴾(١).

- لەکاتی سەردانی ماڵی خزماندا پێویستە پێش چونە ژورەوە ئیزن وەر بگریت وەك ماڵی مامو خاڵ وبراو هەتاکو سوننەت وایە لەخوشکەکانیشت مۆڵەت وەربگریت ئەوجار بچیتە ژورەوە. إبن جریج گوتی: گوتم لەعطاء کوڕی رباح بو کەهەواڵەکەی لەإبن عباسەوە دەگێڕێتەوە کەگوتویەتی: سێ ئایەت هەن پشت گوێ یان خستون، کەخوای گەورە فەمویەتی:﴿ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾ ﴾(٢) گوتی: دەڵێن: بەڕێزترینتان لەلای خوا ئەو کەسانەیە کەجوانترین ماڵو گەورە ترین خانوی هەبێت ڕاستی وڕەوشتە جوانەکان خەڵکی هەمویان شاردۆتەوەو ڕەوشتی خراپیان هێناوەتە جێ، گوتی: گوتم ئایا مۆڵەت لە خوشکە هەتیوەکانیشم کەلەماڵەوە لەگەڵ خۆم دان ولەیەك ماڵ داین وەربگرم؟ گوتی: بەڵێ، زۆرم دوبارە کردەوە گوتم بەڵکو ڕێگەم پێ بدات، بەڵام ڕێگەی نەداو فتوای بۆ نەدام گوتی: ئایا دەتانەوێ بەڕوتی ببینی ؟ گوتم: نەخێر. گوتی: دەی کەواتە ئیزنی لێ وەر بگرە ئەمجار بچۆرە ژور.هەروەها ژنی براو خاڵ ومام وخوشکی ژنەکەت بەهیچ شێوەیەك نابێ لەگەڵ هیچ کامێکیاندا بەتەنها بمێنیتەوەو لەگەڵیاندا کۆ ببیتەوەو بەڕازاوەیی و سفوری وماکیاجەوە بیان بینی. پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ إیّاکُم والدخول علی النساء} فقال رجُلٌ من الأنصار: یارسول

---

ب. واتە: هەر کەسێك تەماشای ماڵی خەڵکی بکات بەبێ مۆڵەتی ئەوان، ئەوا بۆیان هەیە چاوی کوێر بکەن و هیچیشیان لەسەر نیە.(وەرگێڕ).

(١)النور:٢٨.

(٢) أ.سورة الحجرات: (١٣).

الله، أفرأيت الحمو؟ قال: الحمو الموت}([1]) (الحمو) واتە: برای مێرد یاخزمەکانی تری مێرد.

- ئەگەر چویتەوە ماڵی خۆت وچویتە ژور بەدەنگی خۆت ئاگاداریان بکەوە بەگوتنی وشەی( سبحان الله) یا هەر نەبێ بەوەی کەبکۆکی یادەرگاکە تۆزێ بەهێز پێوە بدەیت. وەکەچویتە ژور سەلام لەماڵ ومنداڵەکانت بکە. بەگوێرەی قسەی جابر کوڕی عبدالله: ( إذا دخلت على أهلك فسلِم عليهِم تحيةً من عِندِ اللهِ مباركة طيِبَةً)([2]) کاتێ عبدالله کوڕی مسعود لەسەر پێشاو دەهاتەوە و دەگەیشتە بەردەرگا مینگەمنگی دەکرد تفی ڕۆ دەکرد تامنداڵەکانی ئاگادار بکاتەوە، ئەوەکا لەکاتێکی وادا بچێتە ژور منداڵەکانی خەریکی کارێکی وابن پێ یان ناخۆش بێتو دروست نەبێت بەو حاڵە بیان بیبنێ.([3])

---

(١) أ. رواه البخاري .

ب. واتە : بەرێز ترینتان لای خوای گەورە ئەو کەسەیە کەخۆ لەخوا پارێزە واتە: گوێ ڕایەڵ وفەرمانبەرداری خوای گەورەیەو لەسەر قورئان و سننەت دەڕوات بەرێوە بۆ دنیاو بۆ قیامەتیشی.(وەرگێڕ).

ب. واتە: ئاگادارتان دەکەم کەهەرگیز مەچنە لای ژنان وبەتەنها لایان مەمێننەوەو تێکەڵیان مەبن، چونکە ئەمەتان لێ حەرامە. یەکێك لەپیاوانی پشتیوانان(الأنصار) گوتی: ئەدی بۆ ماڵە خەزوران دەڵێی چی ئەی ڕەسولی خوا؟ فەرموی: ئەوە هەر مردنە مردن. واتە مردن باشترە لەوەی کەشوبرا یا هەرکەسێکی تری خزمی مێردەکەی بەتەنها لەماڵ دا یا لەهەر شوێنێکی تردا بێت بمێننەوە. جا چ جای بۆ سەفەر لەگەڵی دا بچێت ! ! (وەرگێڕ).

(٢) أ. ذكره إبن كثير.

ب. واتە: ئەگەر گەڕایتەوە ماڵ وچویە ژور سەلام لەماڵ ومنداڵەکانت بکە بەسەلامێکی خوایی پیرۆز ومبارەك وجوان وخۆشنود.(وەرگێڕ).

(٣) إبن كثير لەتەفسیرەکەی خۆی دا هێناویەتی و دەڵێ ئەم فەرمودەیە ڕاستە(صحيح) ە.

- منداڵەکانت هەر لەبچوکیەوە وا ڕابێنە کەچونە هەر ماڵێك، مۆڵـەتی چـونە ژورەوە وەر بگرن جابا مـاڵی خزمەکانیـشت بێـت. ئەگـەر چـونە ژورەوەش باسـەلام لەئەنـدامانی ئـەو خێزانەو ئەو ماڵە بکەن.
- بـاش وایـە سـەردانەکانتان کـورت بێـت و تانیوەشـەو یاتابـەرە بـەیان کەشـەو بـو ، وەتابەرەبەری ئێوارە مەمێننەوە ئەگەر ڕۆژ بوچونکە لەوانەیە ئەو ماڵە ئیشیان هەبێتن یـا وەعدو پـەیمانێکیان لەگەڵ ماڵ یا کەسانی تردا هەبێت. ئەوەتە خوای گـەورە لـەم بـارەوە ئامۆژگاری موسڵمانان دەکـات ودەفـەرموێ:﴿ فَإِذَا طَعِمْتُمْ فَٱنتَشِرُواْ وَلَا مُسْتَـْٔنِسِينَ لِحَدِيثٍ إِنَّ ذَٰلِكُمْ كَانَ يُؤْذِى ٱلنَّبِىَّ فَيَسْتَحْىِۦ مِنكُمْ وَٱللَّهُ لَا يَسْتَحْىِۦ مِنَ ٱلْحَقِّ﴾(١).
- بەبێ ئیزنی براکـەت تەماشـای کتێـب یانامـەکانی ئـەو مەکـە چـونکە لەوانەیـە چـەند نهێنی یەك هەبێت کەپێ ی ناخۆش بێ تۆ بیان بینی .

دیارە لەسەر پەروەردیار پێویستە چ باوك ودایك وچ مامۆستا و چ پیاو وچ ئافرەت پێویستە قوتابیان‌و یامنداڵەکانی لەسەر ئـەم سیفەت‌وڕەوشـت و بـەها بەرزانـە پـەروەردە وڕابهێنێـت بـۆ ئـەوەی لـە دوا ڕۆژدا کەسـێکی کـاراو چـالاك وبەسـود وبـەدینی لێ دەربچێت‌وخزمەت بەئایین وبەنیشتمانەکەی بکات.

## کەی چونە ژور بێ مۆڵەت وەر گرتن دروستە؟

- لەکاتی ڕودانی هەر کارەساتێکی ناخۆش ولەپڕ دروستە بەبێ مۆڵەت وەرگرتن بچیتە ئەو ماڵە وەك ئەوەی بۆ ڕزگار کردنی منداڵەکان، باڕزگار کردنی پارەو مـاڵ وسـامان و شتی گرنگی تر.

---

(١) أ. سورة الأحزاب: (٥٣)

ب. واتـە: ئەگـەر لـەماڵی پێغەمبـەرﷺداوەت کـران هـەر کـەنانتان خـوارد بـڵاوەی لێ بکـەن وبـڕۆن، چاوەڕوانی قسەو گفتار مـەبن و لێ ی پـاڵ بدەنـەوە، چـونکە پێغەمبـەرﷺشـەرمتان لێ دەکـات بـەلام خوای گەورە لەسەر هەق هەرگیزشەرم ناکات.(وەرگێڕ).

- دروستە بێ مۆڵەت بچیە ئەم شوێنانە: ( ئوتێلەکان، مزگەوتەکان، ئەو خانانەی کەگەشتیاران لێ ی دادەبەزن، میوانخانەکان، فەرمانگەو دام ودەزگا حکومیەکان ، دوکانەکان و شوێنە گشتی یەکانی تر). خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ لَّيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَدْخُلُوا بُيُوتًا غَيْرَ مَسْكُونَةٍ فِيهَا مَتَاعٌ لَّكُمْ ۚ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ سورة النـور: (٢٩)

## ڕێگای ڕاست ودروست بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی چونە ژوری شەرعی

١. ئەگەر ویستت سەردانی کەسێك بکەیت، پێویستە لەسەرت کەلەسەرخۆ لەدەرگا بدەیت، ئارام بگرەو لەلای ڕاستی دەرگاکە بوەستە بۆ ئەوەی کەدەرگاکەت لێ کرایەوە ناو ماڵەکە نەبینی، لەوانەیە ئافرەتێك دەرگات لێ بکاتەوە و سەیر کردنی لێت حەرام بێت، ئەگەر کەس وەڵامی نەدایتەوە. جارێکی تر لەدەرگا بدەوە کەمێك ڕابوەستە، ئەمجار جاری سێ یەم لەدەرگا بدەوە.. هەمیشە وایە لەدوای سێ یەم جار وەڵامت دەدەنەوە. ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺفەرمویەتی:{ إذا إستأذن أحدكم ثلاثاً فلم يؤذن له فليرجع} متفق عليه.( واتە: ئەگەر یەکێك لەئێوە چوە ماڵێك و سێ جار داوای چونە ژورەوەی کرد وکەس وەڵامی نەدایەوە بابگەڕێتەوە.(وەرگێڕ).)

٢. باشتر وایە چاوەڕوانیت لەنێوان لێدانی یەکەم ودوەم بۆ ماوەی ئەوەندە بێت کەخاوەن ماڵ لەنوێژ دەبێتەوە ئەگەر لەنوێژدا بو. وەدەبێ لێدانەکان بەهێز نەبێت و لەسەرخۆ لەدەرگا بدەیت ویەك لەدوای یەك نەبن، وابێ خاوەن ماڵ بترسێ وبشڵەژێ.

٣. ئەگەر گوتیان تۆ کێ ی ، یاکێ یە؟ بڵێ: (من فلان کەسم) وناوی ڕاستی خۆت ونازناوەکەشت بڵێ تا بت ناسن .(منم). کێ دەزانێ منم کێ یە؟. ( عن

جـابرﷺقـال: أتیـتُ النبـیﷺ، فـدققتُ البـاب، فقـال: {مـن ذا؟ فقلـتُ: أنـا، فقال:ﷺأنا، أنا،:أنَّهُ کرهها}(١)

إبن کثیر گوتی: ئەوەی بۆیە پێناخۆش بوچونکە بەو وشەیە کابرا ناناسرێت کێ یـەو کێ نیە. تاکو ناوی تەواوی خۆی و نازناوەکەشی نەڵێت کەپێ ی بەناوبانگە لـەناو خـەڵکی دا(٢). دەی ئـەم دەربڕینـە ی ئـەو کەسـەی لـەدەرگا دەدات بەوشـەی (مـن - أنـا) هـیچ واتایەکی مۆڵەت وەرگرتنی چونە ژورەوەی تێدا نیـەو، فـرێ بەسـەر ئـەو ئامۆژگاریانـەوە نیەکەخوای گەورە لەئایەتەکەدا داوامان لێ دەکات .( تەفسیری إبن کثیر ج٣/ ٢٧٩).

٤.ئەگەر خۆت یاخود یەکێ لەکوڕەکانت لەماڵ بون باخێزانت یاکچەکانت بۆ دەرگا کردنەوە لەمیوان نەچن، بەڵام ئەگەر کەس لەماڵ نەبو، قەیدی نیە ئافرەتان لەدوای دەرگاوە وەڵام بدەنەوە بۆ ئەوەی پیاوی بێگانە نەیان بینێت. بابڵێ کەسمان لەماڵ نیە. بەڵام ئەگەر ژن بون دیارە هیچی تێدا نیە ئەگەر فەمویان بکات . وەڵامەکەش دەبێ بەوشەی (کێ یە؟)و بەدەنگێکی ناسكو ونەرمی پێوە دیار نەبێت، بۆ ئەوەی سەرنجی بیسەران ڕانەکێشێت و بەو دەنگە توشی خراپە وئاشوب بېن. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَخۡضَعۡنَ بِٱلۡقَوۡلِ فَيَطۡمَعَ ٱلَّذِي فِي قَلۡبِهِۦ مَرَضٞ وَقُلۡنَ قَوۡلٗا مَّعۡرُوفٗا ﴿٣٢﴾﴾(٣). وەنابێ ژنان

---

(١) أ. متفق علیه.

ب. واتە: جابر دەڵێ:هاتمە بۆ ماڵی پێغەمبەرﷺو لەدەرگام دا فـەرموی: کـێ یـە؟ گـوتم: مـنم، فەرمی : منم ،منم . لاسایی کردمەوە وەك ئەوەی پێ ی ناخۆش بێت.(وەرگێڕ)؟

(٢)هەتاکو لەناو ئێمەشدا باوە بەوشەی( خۆمانین) وەڵام دەدەنەوە. خۆمـانین چ واتایـەکی هەیـە. ئەمە هیچ واتایەکی مۆڵەت وەر گرتنی چونە ژورەوەی تێدا نیە.(وەرگێڕ).

(٣) أ. سورة الأحزاب : (٣٢)

ب. واتە : بائافرەتان قسەو گفت وگۆی نەرم ونیان ولەنجە ومەکری تیا نەکەن، بۆ ئەوەی لەلای ئەو کەسانەی کەدڵی یان نەخۆشەو هەمیشە چاو برسی و داوێن برسین لەبۆسـە دان نـەی قۆزنـەوە

بچن دەرگاکە بکەنەوە لەو کەسەی کەلەدەرگا دەدات، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:
﴿وَإِذَا سَأَلْتُمُوهُنَّ مَتَٰعًا فَسْـَٔلُوهُنَّ مِن وَرَآءِ حِجَابٍ ۚ ذَٰلِكُمْ أَطْهَرُ لِقُلُوبِكُمْ وَقُلُوبِهِنَّ ۚ﴾(١)

## مۆڵەت وەرگرتنی منداڵان و ڕەنجبەرو خزمـــــان

خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لِيَسْتَـْٔذِنكُمُ ٱلَّذِينَ مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَبْلُغُواْ ٱلْحُلُمَ مِنكُمْ ثَلَٰثَ مَرَّٰتٍ ۚ مِّن قَبْلِ صَلَوٰةِ ٱلْفَجْرِ وَحِينَ تَضَعُونَ ثِيَابَكُم مِّنَ ٱلظَّهِيرَةِ وَمِنۢ بَعْدِ صَلَوٰةِ ٱلْعِشَآءِ ۚ ثَلَٰثُ عَوْرَٰتٍ لَّكُمْ ۚ لَيْسَ عَلَيْكُمْ وَلَا عَلَيْهِمْ جُنَاحٌۢ بَعْدَهُنَّ ۚ طَوَّٰفُونَ عَلَيْكُم بَعْضُكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْءَايَٰتِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٥٨﴾ ﴾ سورة النـور: (٥٨)

إبن كثير گوتویەتی: ئەم ئایاتانەی سەرەوە باس لەڕەوشت وئاکاری بەرزی مۆڵەت وەرگرتنـی چـونە ژورەوە دەکـات بـۆ خزمـان ولـەنێوان خۆیانـدا. خـوای گـەورە فرمـان بەبڕواداران دەکات کەدەبێ خزمـەتکارو منـداڵان کەنەگەیشتونە تەمـەنی بـاڵق(بـالغ) بـون مۆڵەتی هاتنە ژورەوە وەر بگرن لەسێ حاڵەتاندا:

١. پێش نوێژی بەیانیان: چونکە لەو کاتەدا خەڵکی لەناو جێگەی خۆیاندا خەوتون.

---

توشی خراپەو ئاشوب وگوناح وتاوان نەبن . خۆتان بپارێزن لەقسەی خراپ وحەلەق ومەلەق وسوك وبێ واتا کەسەر بکێشێت بۆ خراپەکاری و قسەو گوفتاری باش وبەڕێزانە بکەن.(وەرگێڕ).

(١) أ. سورة الأحزاب: (٥٣).

ب. واتە: ئەگەر داوای هەر شتێك ، هەر پێویستیەکتان لە ئافرەتان کرد لەدوای پـەردەوە داوایـان لێ بکە،، چونکە ئەمە باشترو سەلامەت تـر و پـاکترە بـۆ دڵـی ئێـوەو بـۆ دڵـی ئـەوانیش. شـەیتان بـواری خۆتێوەردانی نامێنێ وەسوەسەتان بخاتە ناو دڵ وتوشی کاری خراپ وناشیرینتان بکات.(وەرگێڕ).

٢. لـەكاتى نێـوە ڕۆيانـدا( فـى وقـت القيلولـة) : چـونكە مرۆڤـەكان لـەو كاتـەدا لەگـەڵ خێزانـەكانى خۆيانـدا جلـەكان دادەكـەنن واتـەخۆيان دەگـۆڕن و خـەريكى ئيـستراحەت وپشودانن.

٣. لەدواى نوێژى خەوتنان( فى وقت العشاء): چـونكە ئـەو كاتـە، كـاتى خەوتنە،خـەڵكى دەچنە ناو جێگەو پێخەكانى خۆيان بۆ خەوتن وئيستراحەت كردن.

فرمان بەڕەنجبەرەكانتان بـدەن كەلـەو سـێ كاتانـەدا نەچـنە ژورى خـاوەن مـاڵ، هەروەها پەروەردەى منداڵەكان وزارۆكانتان بكەن وڕايان بێنن كەلەو كاتانەدا خۆ بـەژورى تايبەتى باوك ودايكاندا نەكەن ونەچنە ژور وەئەگەر پێويستيەك هـەبو كـەدەبێ هـەر بـچن فێريان بكەن لەدەرگا بدەن وداواى مۆڵەتى چونە ژورەوە بكـەن وئـەمجار كەمۆڵـەت دران بابچنە ژورو ئيشەكەيان جێ بەجێ بكەن و خێرا بگەڕێنەوەو ئەوێ بەجێ بێڵن.نـەبادا لـەو كاتەدا ئەو پياوە لەگەڵ خێزانەكەى دا بێت. جوێ لەو سێ حاڵەتانـەدا ئەگـەر بشـچنە ژور قەيدى نيە وگوناح نيە. هەروەها پێويستە بـاوك ودايكـانيش نـابێ لـەو سـێ كاتانـەدا خـۆ بكەن بەژورى تايبەتى منداڵـەكانيان چ كچ وچ كـوڕ، بـەڵكو دەبـێ مۆڵـەتى چـونە ژورەوە وەربگـرن ئـەمجار بۆيـان هەيـە بـچنە ژورەكـەيان. هـەروەها خـاوەن مـاڵ چ ئافرەتـان وچ پياوان بۆيان نيە لەو كاتانەدا خۆ بكەن بەژورى تايبەتى خزمەتكارانيان چ ژن بن وچ پياو، مەگەر دواى مۆڵەت وەر گرتن. بەبێ مۆڵەت نابێ بچنە ژورەكەيان .

٤ ـــ منـداڵان ئەگـەر گەيـشتنە تەمـەنى بـاڵق بـون دەبـێ لەهـەمو كاتێـك دا مۆڵـەتى چونەژورەوە وەربگرن.(( سەيرى تەفسيرى إبن كثير ج٣/ ٣٠٢ بكە)).

منيش دەڵێم: لەسـەر خوشـك وبرايـانى پـەروەرديار پێويـستە كەمنـداڵان وباڵقـان وخزمـەتكاران فێـرى ئـەو ڕەوشـتە كۆمەڵايەتيانـە بكـەن كەئيـسلام بـۆى هێنـاوين كـاتێ كەدەچنە ژورى دايكان وباوكان بۆ پاراستنى ئـەخلاق وڕەوشـتيان تابەشـێوەيەكى وايـان نـەبينن كـە بۆيـان دروسـت نيـە. خۆزگايـەكو دەزگاكـانى ڕاگەيانـدنى دەوڵـەت لـەوڵاتانى ئيسلامى دا بەگشتى بەفێر كردنى گەوران ومنـداڵان و هـەمو چـين وتوێـژەكانى كۆمـەڵگاى موسڵمانان بەڕەوشـتە ئيـسلاميەكان هـەڵ دەسـتان بەتايبـەتى تەلـەفزيۆن و كەناڵـەكان و

گـشت سـایتەكان وگۆڤارەكـان بـۆ پـاك وخـاوێن ڕاگرتنـی ئـەخلاق وڕەوشـتی ئوممـەتی ئیسلامی بەگشتی.

بـەڵام زۆر بەداخـەوە، بەپێـچەوانەوە دەبیـنین نـەك هـەر منـداڵان بـەڵكو گـەنج ولاوەكانیش مێشك بۆگەن دەكرێن بـەهۆی بانگەشـە كردنـی بـێ ئـەخلاقی وبـێ ڕەوشـتی لەكەناڵ وتەلەفزیۆنەكانی وڵاتانی ئیسلامی دا چەندان شـتی بـێ شـەرعی و بـێ ئـەخلاقی هەڵفریوێنـەر وبۆگـەن دەبیـنن لـەبێ ئـەخلاقی سێكـسی( جنـسية) كەئـەخلاق وڕەوشـتی كۆمەڵگا بۆگەن وپیس دەكەن وبەئاشكرایی وبـێ شـەرمانە بانگەشـەی بـەرەڵایی دەكـەن. كـوا شـەرم كـوا ئـەخلاق، كـوا ڕەوشـت وشـەرەف هیـچی نـەماو بـو بەكـەفی سـەر دەریـا ڕۆیشت؟!!! زۆر بەداخەوە!! بۆیە ئەمڕۆ ڕۆڵ. ڕۆڵی باوك‌و دایكانە كەچاكی مەردایەتی لێ بكـەن بـەلاداو قـۆڵی لێ هـەڵ بمـاڵن وزۆر پێویـستە لەسـەریان كەهـەنگاوی یەكـەمی پەروەردەیی بنێن و كچ وكوڕەكانیان لەسەر ئەخلاق وڕەوشتە ئیـسلامیەكان پـەروەردەو ڕا بهێنن وكەسایەتیەكی بڕواداریان لێ بەرهەم بهێـنن و كەگەیـشتنە تـافی پێگەیـشتن كچ وكوڕەكانیان بۆ مێرد كردن وژن هێنان هان بدەن. وەخۆشیان و كچەكانیشیان هان بـدەن كەداوای مارەیی وخەرجی زۆر نەكەن كەئەركی قورس نەخەنە ئەستۆی گەنجەكان و داوای ئاهەنگی ناشەرعی و بانگی تیپی مۆسیقاو شتی نابەجێ ی وا نەكـەن كـە هەڵنەسـوڕێن. و دەبێتە ئەگەری ئەوەی كەزۆرێك لەگەنجان ولاوان نەتوانن ژن بهێنن وهاوسـەرگیرێتی پێـك بێنن و واز لەژن هێنانی شەرعی بێنن و لەولاوە پەنا بەرنە بەر زیناو كـاری ناشـەرعی وبـێ ئەخلاقی خوانەخواستە.

هەروەها لەسەر ڕۆڵەو جگەرگۆشەكان ، كوڕان وكچان پێویستە كەداوای ژن هێنان وشو كردنـی شـەرعی لـەباوك ودایكـانی خۆیـان بكـەن ومـارەیی وتێـچونی كـەم داوا بكـەن وئاسانكاری یەكی تەواوبكەن لەپێناو دامەزراندنی ماڵ وخێزانی شەرعی دا كەخوای گەورە پـێ ی ڕازی بێـت و لـەبێ ئـەخلاقی وپیـسی وچـەپەڵی و داهێزرانـی دەرونـی ولەشـی وكۆمەڵایـەتی دەیـان پارێزێـت و تەندروسـتی وسـاخلەمیان دەپارێزێـت و لەنەخۆشـیە مەترسـی دارەكـانی وەك ئایـدزو سـوزەنەك و...تـد دور دەگرێـت وسـەربەرزی ئـایینی و شەرەفیان سەربەرزو پاك وخاوێن ڕادەگرێت.

## لەڕەوشتەکانی برایان و خوشکانی مامۆستایانی پەروەردیار

شتێکی زۆر چاکە ئەگەر خوشك وبرایانی مامۆستا لەکاتی وانە گوتنەوەکانیاندا چاودێری ئەم خاڵانەی خوارەوە بکەن:

١. کاتێ کەچویتە ناو پۆل پێویستە سەلام لەقوتابیەکان بکەیت( السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته) نابێ بەیانی باشیان لێ بکەیت، چونکە لەشەریعەتی ئیسلامدا ئەمە نەهاتوە، هەر کارو کردەوەو هەر شتێکیش لەشەرعیەتی ئیسلامدا نەهاتبێت بۆ ئێمەی موسڵمان دروست نیە ئەنجامیان بدەین. بەڵام لەدوای سەلام کردن دروستە ئەم (بەیانیت باشە) و هەر شتێکی تری دروست وبەجێ بێت بەکار بهێنرێت وبگوترێت. وەلەسەر قوتابیەکانیش پێویستە بەم شێوەیە(وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته) وەڵامی مامۆستاکانیان بدەنەوە. وەپێویستە لەسەر خوشکان وبرایانی مامۆستا بەهیچ شێوەیەك نەهێڵن لەکاتی هاتنە ژورەوەی پۆل قوتابیان لەبەریان هەڵبستن، چونکە لەنامەی مامۆستاو ئەرکەکانی یاندا(واجباتهم) قەدەغە کراوە ولەشەریعەتی پیرۆزی ئیسلامیشدا قەدەغەو دروست نیە لەبەر هەڵسان، چونکە نیشانەی بەگەورە کرتن وپیرۆزیە.

٢. پێویستە لەسەر مامۆستایان کەبەڕویەکی خۆش وزەردەخەنەو ناوی خۆشەوە پێشوازی لە قوتابیان بکەن. چونکە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی:{ تبسمك في وجه أخيك صدقة}(١)

٣. دەست پێ کردنی وانەکان ووانە گوتنەوە بە(خطبة الحاجة) دەست پێ بکەن، وەك سوننەتێکی پێغەمبەرﷺ چونکە هەمیشە وتارو قسە کردنو وانەکانی بەو خوتبەیە دەست پێ دەکردنو سەرەتاکەی پێ دەکردنەوە کەبریتیە لە:{إنَّ الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا

---

(١) أ. صحيح رواه الترمذي وغيره.

ب. واتە : زەردەخەنەت لەڕوی برای موسڵمانت خێرو چاکەیە(صدقة). (وەرگێڕ).

مضل له، ومن يضلل فلا هادي له . وأشهد أن لاإله إلاّ الله وحده لاشريك له، وأشهد أن محمداً عبده رسوله. أما بعدُ : فإنَّ أصدق الحديث كلام الله تعالى ، وخير والهدى هديٌ محمد ﷺ... إلى آخر الخطبة}.

٤. بەكار هێنانی وشەی جوان وڕێك وپێك لەگەڵ قوتابیاندا و پاراستنی كەسایەتی خۆی لەناو قوتابیان ومامۆستایان وهەتا لەماڵەوەو لەناو خەڵكیش دا بەگشتی ڕێزو خۆشەویستی لەنێوان قوتابیان و مامۆستایاندا پتر دەكات. بەقوتابی زیرەك وباش وڕەوشت بەرز بڵێ: ئافەرین ، دەست خۆش، خوا بەرەكەت بخاتە تەمەنت (أحسنت، بارك الله فيك). وەبە قوتابی خراپ وتەمبەڵیش بڵێ: خوا چاكت بكات و ڕێنومایت بكات. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ والكلمة الطيِّبَةُ صدقة}(١)

٥. دور كەوتنەوە لەقسەی خراپ و بریندار كەرو ڕوشتێنەرو ناشیرین و گاڵتەجاڕی ، كەدەبێتە هۆی سوك كردنی خاوەنەكەی لای بەرامبەرەكەی چ مامۆستا بن وچ قوتابی یاكەسانی تر و دابەزینی پلەی كەسایەتی خۆی. چونكە قوتابیان كردەوەو قسەی باش وخراپ لەمامۆستاكەیان فێر دەبن وچاو لەو دەكەن. مامۆستا ئاوێنەیەو وێنەی قوتابیەكانی دەداتەوە. بۆ خۆی چۆن بێت قوتابیەكانیشی ڕوی دوەمنی.

٦. ئاگادار كردنەوەی ئەو قوتابیانەی كەلەپۆل دا دەخەون یا بەشتێكی تری دەرەوەی وانەكەیان خۆ سەرقاڵ دەكەن، یا وس كردنی ئەو قوتابیانەی كەلەپۆل دا قسەو هۆسەو غوڵبە غوڵب دروست دەكەن.

٧. ڕێك خستنی پرسیار كردنەكان لەوانەدا، نابێ مامۆستا ڕێگە بەقوتابیان بدات كەلە پرسیار كردندا بیكەن بەهۆسەو هەر كەس لەبەر خۆیەوە پرسیار بكات وهیچ قوتابیەك بەبێ مۆڵەت وەر گرتن پرسیار بكات و وەڵامی ئەم جۆرە پرسیارانە نەداتەوە و سەرەیان بۆ دابنێت وبەسەرەوە وەڵامیان بداتەوە.

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: هەتاكو گوتنی قسەیەكی خێرو باشیش لەهەر شوێن ولەهەر كێشەو تەنگژەیەكدا بێت خێرو چاكەیە واتە(صدقه) یە.(وەرگێڕ).

٨. پێویستە لەسەر مامۆستایان کەچاودێری ڕەوشتە ئیسلامی یەکان لەناو خۆیان ولەناو قوتابیەکانیاندا بکەن وخۆیانی پێ برازێننەوە، بۆ ئەوەی قوتابیان وئەندامانی تری کۆمەڵگاش لەوانەوە فێر ببن وچاو لەوان بکەن، چونکە هەروەکو لەپێشەوە گوتمان مامۆستا ئاوێنەی تیشك دەرەوەیە لەناو کۆمەڵدا. بۆ نمونە: ئەگەر مامۆستایەك پشمی بابڵێ: (الحمدالله) .. ئەوانەشی وان لەتەنیشتیەوە پێ ی بڵێن: (یرحمك الله). ئەوەی پشمیوە وەڵام بداتەوەو بڵێ: ( یهدیکم الله ویصلح بالکم) . وەئەگەر مامۆستایەك باوێشکی دا بادەستی چەپی لەسەر دەمی دابنێت وبڵێ: (أعونو بالله من الشیطان الرجیم) با یەك بەخۆی دەم نەکاتەوەو هاوار بکات و بڵێ: ( ها..ها.. ها..) . چونکە پێغەمبەرﷺئەم سیفەتەی قەدەغە کردوە وفەرمویەتی:{ إذا تثاءب أحدکم فلیضع یده علی فمه، فإنَّ الشیطان یدخل مع التثاؤب}([١]).

٩. لەسەر خوشك وبرایانی مامۆستا پێویستە کەگرنگی بەپاك وخاوێنی خۆیان وجل وبەرگ وپۆشاکیان بدەن، دەبێ لەبەر دەمی قوتابیاندا بەشێوەیەکی جوان وڕواڵەتێکی قەشەنگەوە بێ خۆ بەزل زانی و لەخۆبایی بونەوە دەر بکەون. بەکار کردن بەفەرمودەی پێغەمبەرﷺکەفەرمویەتی:{لایدخل الجنَّةَ من کان في قلبه مثقال ذرةٍ من کبر، قیل : إنَّ الرجل یحب أن یکون ثوبه حسناً ونعله حسنة، قال:إنَّ اللهَ جمیلٌ یحب الجمال، الکبر بطر الحق وغمط الناس} أي إحتقارهم.. رواه مسلم . واتای ئەم فەرمودەیە لەپێشتر لێکمان داوەتەوە.

١٠. پێویستە لەسەر مامۆستایانی ناوەندی ودواناوەندی یەکان کوڕان وکچان(المدرسین والمدرسات)ئەگەر لەقوتابخانە تێکەڵاوەکاندا بون کەکوڕو کچی تێدا بون لەقوتابیان

---

(١) أ. متفق علیه.

ب.واتە:هەر کەسێك پشمی بادەستی لەسەر دەمی دابنێت و بڵێ:( أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) هەر چەندە ئەمە هیچ دەقێکی لەسەر نیە، چونکە شەیتان لەگەڵ باوێشك دا دەچێتە ناو دەمی مرۆڤەوە.(وەرگێڕ).

ولەمامۆستایان کەئەمـەش پێچەوانەی شـەریعەت وبەرنامـەی ئیـسلامی پـیرۆزە هـەروەکو هەمو لایەك دەزانن ئەگـەر خـۆ گێـل نەکـەن، کـەکوڕان لـەپێش کـچان دابنـێن و کـچەکان لەدواوە بن لە پـۆل دا بـۆ دور کەوتنـەوە لەفیتنـەو ئاشـوب وکێشەو ئاسـتەنگ. هـەروەها لەسەر مامۆسـتایان پێویـستە کـەڕێگا نـەدەن کوڕەکـان تێکـەڵی کـچەکان بـبن و قـسەیان لەگەڵ دا بکەن مەگـەر بـۆ مەبەسـتی ئامۆژگـاری وپێویـستی بـێ، بەتـەنها مانـەوە لەگـەڵ یـەکتری داو لەپـشت پـەردەش دەبـێ گفـتو گـۆ بکـەن. هـەروەها پێویـستە لەسـەر مامۆسـتایانی کـوڕو کـچ تێکـەڵ بـەکتری نـەبن و لـەژوری جیـادا دابنیـشن بـۆ پاراسـتنی شەرەفـو ڕوسوریو دور کەوتنەوە لەتێکەڵ بونی نێرو مـێ کـەخوای گـەورە دروسـتکەری زەویو ئاسمانەکانوهـەمو بونـەوەر. ئـەرکێکی پێویـستە لەسـەر وەزارەتـی پـەروەردە کەقوتابخانـەکانی کـوڕان وکـچان لەیـەکتری جیـا بکاتـەوە، وەپێویـستە بەچـەمك وزانیاریەکانی بەرنامەکەی خوا، شەریعەتی ئیسلام کـار بکـەن و بـەڕێوە بـچن ئەگـەر خـۆ بەموسڵمان دەزانن.

ئەوەتـە لـەولاتی سعودیەدا ئەمـە جـێ بـەجێ کـراوەو تێـشی دا سـەرکەوتو بـون وسەرۆکایەتی پەروەردەو فێر کردنیـان دامەزرانـدوە بـۆ ڕاپەڕانـدنو چاودێری کردنـی پەروەردەو فێر کردنی کچان و کوڕان لەهـەمو قوتابخانـەکانی پـەروەردەو فێرکردنـداو قوتابی کچیان لەهەمو کێشەودەردە سـەریەك ومەینەتـەکانی تێکـەڵ بـونی نێـرو مـێ پاراستوە.

سیفەتی قوتابخانەی تێکەڵ وەك ئەم ڕاسـتیە وایـە کەشـاعیر لـەم دێـڕە شیعرەدا دەڵێ: ألقاه في اليم مكتوفـاً ثم قال له إيَّاك إيَّـــاك أن تبتل بالمـــــاءِ([1])

(١) واتە: بەدەست وپێ بەستراوی فڕێت داوەتە ناو ڕوبارو پێشی دەڵی ی : ئاگات لەخۆت بێ و گەلێك وریابە ئاو تەڕت نەکات.(وەرگێڕ).

## لە ڕەوشت و ئاکاری خوشك و برایانی قوتابی

لەسەر خوشك وبرایانی قوتابی پێویستە کەچاودێری ئەم ڕەوشت وئاکارانەی خوارەوە بکەن لەپۆل داو لەکاتی وانەکانیاندا:

١. ڕێز گرتنی مامۆستاکانیان چ پیاو وچ ژن، چونکە مامۆستا قوتابیان فێری ڕەوشتی جوان وزانست وزانیاری دین ودنیا دەکەن ([1]) جوێ لەمەش لەئێوە گەورەترو بەتەمنترن، پێغەمبەری نازدارمان ﷺ ئامۆژگاری کردوین کەڕێزیان بگرین هەر وەکو فەرمویەتی: {لیس منا من لم یجل کبیرنا، ویرحم صغیرنا، ویعرف لعالمنا حقه}([2])

٢. گوێ گرتن بۆ مامۆستا لەکاتی وانە گوتنەوەدا ، بێ دەنگیت زۆر پێویستە بۆ سود وەرگرتن لەوانەکان.

٣. قسە نەکردن لەوانەدا مەگەر بەئیزنی مامۆستا بێت، هەتاکو دەرسەکە نەبێتە هۆسەو ئاژاوەودەرسەکە بەهێدی وهێمنی ولەسەر خۆ و وەك پێویست بڕوات بەرێوە وهەمو قوتابیان سودی لێ وەر بگرن .

٤. کەپرسیارت هەبو بەبێ مۆڵەتی مامۆستاکەت پرسیار مەکە، زۆریش پرسیاری بێ هودە وبێ سود مەکە بۆ ئەوەی کاتی وانەکە بەفیڕۆ نەڕوات و دەرسەکە بەتەواوی بگوترێتەوە.

---

(١) بەڵام ئێستا دەڵێین بەداخەوە کەنەك هەر مامۆستاکە، بەڵکو سیستمی خوێندن وپەروەردەو لایەنی فەرمانڕەواو دەسەڵاتدار دژی دین وزانیاری وچەمکەکانی ئیسلام وپەروەردە کردنی ئەمڕۆ هەموی پێچەوانەی بەرنامەی خواو ئەو چەمکانەی کەخوای گەورە بەدی هێنەری زەوی وئاسمانەکان و هەمو ئەوانەشی کەوان لەناویاندا. بەڵکو بانگەشەی تەواوە لەدژی بەرنامەکەی خواو قورئانی پیرۆز وچەمکە پیرۆزە خواییەکان، جاچ گلەیی لەمامۆستاو تاکەکانی کۆمەڵ دەکرێت. ئەگەر جۆگەلەکان لەسەرچاوە وکانیەکەوە شلوێ بن هەرگیز چاوەڕوانی ڕون بونەوەیان لێ ناکرێت.(وەرگێڕ).

(٢) أ.حسن رواه أحمد.

ب. واتە: لەئێمە نیە ئەو کەسەی ڕێزی گەورەمان ناگرێت وبەزەیی بەبچوکەکانماندا نایەتەوەو مافی زاناو مامۆستاکانیشمان نادات واتە ڕێزیا لێ نانێت.(وەرگێڕ).

٥. گـوێ ڕایـەڵ بـە بـۆ فرمـانی مامۆسـتاکانت، بەسـینگێکی فراوانـەوە زانیـاری وئامۆژگاریـەکانی مامۆسـتاکانت وەر بگـرە، گـەر لەچوارچـێوەی شـەریعەتی خـوادا بـون ولەسەرپێچی خوای گەورەدا نەبن.

٦. خۆ سەرقاڵ نەکردن بەشتێکی تری بێ سود کەپەیوەندی بەوانەکەتەوە نەبێت.

٧. سەرنج دانی تەواو بۆ ئەو ماددەی کەمامۆستا بۆتی باس دەکات ونابێ لەدەرس دا بخەوی یاخەوت بێت وخەواڵو و وەنەوزە بتباتەوە.

٨. تۆمار کردن ونوسینەوەی هـەمو خاڵە گرنگـەکان وخـاڵ بەنـدی وانەکـە لەدەفتـەرێکی تایبەتدا بۆ ئەوەی دوایی پێ ی دابچیتەوەو لەبەریان بکەیت وئیدی لەبیرت نەچنەوە.

٩. قوتابی ئەگەر لەدەرس دواکەوت دەبێ مۆڵەت لەمامۆستاکەی وەربگرێت ئینجا بـچیتە ژور، کەچوە ژور دەبێ سەلام لەمامۆستاو برا قوتابیەکانی بکات.

١٠. پێویـستە لەسـەر خوشـك وبرایـانی قوتـابی کەلەقوتابخانەیـەکی تێکـەڵ دا بـون، کەمامۆستای ناوەندی و دواناوەندی وانەی تێدا دەڵێتەوە(المـدرس والمدرسـة) دیـارە ئـەم تێکەڵیەی نێرو مێ یـە پێچەوانەی شـەریعەتی خواوچـەمکە قورئانیەکانـەو دژی سیـستمی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامە کەتیایدا شەرەف وڕوسوریەتی کـچان پـارێزراوە، هـەروەها شەرەف وڕوسوریەتی خێزان وکۆمەڵگاش لەم شەریعەتە پاك وبێگەردەدا پارێزراوە بەهۆی تێکەڵ نەبونی نێرو مێ، کەبەداخەوە ئەم دیاردە دزێو وناشەرعیە لەزۆربەی زۆری ، بگـرە لەهەمو وڵاتانی ئیسلامی ئێستادا ئـەم سیفەتە قێـزەون وبۆگەنـە بـاوە. جـا لێـرەدا بـەبرا قوتابیەکان دەڵێین کەزۆر خۆ بپـارێزن لەتێکـەڵی لەگـەڵ کـچان بەتێکـەڵی نەچنەوە ژورو نەیەنە دەرەوە, قسەی سوك وبێ شەرمیانەو بێ شەرعیانەیان لەگەڵ دا نەکەن وتێکـەڵیان نەبن ولێ یان دور بکەونـەوە. ئەگـەر لـەکوڕێك بپرسـیت: ئایـا پێـت خۆشـە کوڕێـك لەگـەڵ خوشکەکەتدا ڕابوەستێ وقسەی لەگەڵ دا بکات؟ یالەگەڵی دا بەیەکەوە بەناو باخـچەکانو پارکەکاندا پیاسە بکەن وڕازو نیازی خۆیان ئاڵوگۆڕ بکەنو تێر تێر سەیری خوشـکت بکـات ودەست بازی لەگەڵ دا بکات؟ بێ گومان دەڵێ:نەخێر، چۆن شتی وا دەبێت. وەهـەروەها

پێ ی خۆش نیە خوشکی ئەویان خۆش بوێ وئەوین وئەویندارى لەگەڵ دا بکەن. ئەدی کەواتە چۆن جەنابت ویژدانت هەڵ دەگرێت ئەم هەمو بەزم ورەزم وکەین وبەینە لەگەڵ کچ وخوشکی خەڵکی دا بکەیت وناموس وشەرەفی بزرێنی. هەروەها لەسەر خوشکانی قوتابی پێویستە کەحیجاب وپۆشاکی بەحەیاو بەحەشمەتی ئیسلامی بپۆشن و خۆ لەپیاوان و لەکوڕانی قوتابی بەدور بگرن و تێکەڵاویان نەبن وتوشی قسەوقسەڵۆکی ناشیرین نەبن وکەسایەتی وشەرەفو ڕوسوریەتی یان خوانەخواستە لەکە دار ببێت ولەئاستی کەسایەتیان کەم بکاتەوەو کار بکاتە سەر کچان لەکاتی شوکردنیاندا ونەبێتە پەڵەو لەکەیەك بەنێو چاوانیانەوە( ئاخر کچانمان بەتایبەتی ئافرەت بەگشتی زۆر ناسك و پاك وڕونن زو دەڕوشێن ودەشکێن هەروەکو کورد گوتەنی: (( ئافرەت شوشەیە زو دەشکێ))وەرگێڕ) .

١١. هەروەها لەسەر کچانی قوتابی پێویستە کەحیجاب بپۆشن ولەبەرچاوی کوڕانی قوتابی وهەتا لەبەر چاوی مامۆستاکەشی قژو سەرو سینگ ولەش ولاری ڕوت نەکات ودەر نەکەون بەتایبەتیش لەقۆناغی ناوەندی ودواناوەندی وزانکۆوپەیمانگاکان ودواتریش لەکاتی دامەزراندنیاندا لەفەرمانگەو ودام ودەزگا میری ونامیریەکاندا، حەرامە کەدەم وچاو ونینۆکەکانیان بۆیەو ماکیاج بکەن و خۆ برازێننەوە خۆ لەدرو دەرماندا شەلاڵ بکەن وشلّپەیان بێت وبەبۆنی عەترو درودەرمانی ماکیاجەکەیان ئەو کوڕو گەنج ولاو وپیاوانە هەتا پیرەکانیش کاس و وڕو گێژ بکەن.دیارە دەبێ ئافرەت ئەم ڕاستیە زۆر بەباشی بزانێت کەئەمانەی باسمان کردن تەنها وبەس دەبێ بۆ مێردەکەی ولەماڵەوە بەکاریان بێنێت، بۆ دەرەوە حەرامە. سەبارەت بەبۆن وبەرامەش بۆ ژنان بەهیچ شێوەیەك لەدەرەوەو بۆ غەیری مێرد دروست نیە بەکاری بێنێت ولەخۆی بدات، لەکاتی چونە دەرەوەی لەماڵ بۆ پیاوانی بێگانە بۆن لەخۆدان حەرامەو نابێ لەخۆی بدات. چونکە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{أیما إمرأةٍ أستعطرة، ثمَّ خرجت، فمرت علی قومٍ لیجدوا ریحها

فهي زانية وكلُّ عين زانيةٌ}(١) هەروەها بەهیچ شێوەیەك دروست نیە کەئافرەتان وکچانی قوتابی تەوقە لەگەڵ پیاوان وکوڕانی قوتابی بێگانەدا بکەن، بۆ پاراستنی سومعەوشەرەف وکەسایەتی وڕوسوری خۆیان هەروەکو پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {لأن يطعن في رأس أحدكم بمخيط من حديد خيرٌ له أن يمس أمرأة لاتحل له}(٢)

---

(١) أ. حسن رواه أحمد.

ب. واتە: هەر ئافرەتێك بۆنی خۆش لەخۆی بداو لەماڵ بچێتە دەرو بەناو خەڵکی دا بڕوات بۆ ئەوەی پیاوان وگەنجان بۆنەکەی وەربگرن وخەڵکی بەبۆن و بەرامەکەی کاس ووڕ ببن، ئەوە ئەو ئافرەتە زینای کردوە، هەمو چاوێکیش زینا دەکات، هەروەکو لەفەرمودەیەکی تردا هاتوە دەفەرموێ زینای چاویش سەیر کردن وتەماشا کردنە (النظر) .(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح رواه الطبرانيٌ وغيره.

ب. واتە: بەسیمی ئاسن یا بەزنجیری ئاسنی ئەستور لەسەرت بدەن ، یاخود بەچەکوچ بزماری پۆلات لەسەرسەری دابکوتن باشترە لەوەی کەدەستت بەدەستی ژنێکی بێگانە بکەوێت، یاپێستت بەپێستی ئافرەتی بێگانە بکەوێت کە(محرم)ی یەکتری نین.(وەرگێڕ).

## مامۆستای موسلمانی بانگەوازیکار

لەسەر مامۆستای موسڵمان پێویستە کەلەناو برا مامۆستاکانی دا بانگەوازکار بێت، ئامۆژگاریان بکات، ڕێنومایيان بکات ودەستیان بگرێت بەرەو ئایینی پیرۆزی ئیسلام وخوا پەرستی ویەکتاپەرستی ڕایان بکێشێت و داوایان لێ بکات کەتەنیا بەرنامەکەی خوا بگرن و لەبەرنامەی ئیسلام بەولاوە دەست بەهیچ بەرنامەیەکی تری دەست کرد نەگرن و تەنیا کار بەقورئان وسوننەت وئەخلاقە بەرزەکانی ئیسلامی پیرۆز بکەن، دەبێ بانگەوازیەکەی دەمارگیریانەو توندو تیژ نەبێت، لەسەرخۆو هێمنانەو ژیرانە بانگە خەڵك بکات. بەکار کردن بەفەرمودەی خوای باڵا دەست وکاربەجێ:﴿ فَبِمَا رَحْمَةٍ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمْ ۖ وَلَوْ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلْقَلْبِ لَٱنفَضُّوا۟ مِنْ حَوْلِكَ ۖ فَٱعْفُ عَنْهُمْ وَٱسْتَغْفِرْ لَهُمْ وَشَاوِرْهُمْ فِى ٱلْأَمْرِ ۖ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾ ﴾(١)

هەروەها خوای گەورە لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ:﴿ ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ ﴾(٢)(١٢٥) سورة النحل.

---

(١) أ. سورة آل عمران: (١٥٩).

ب. واتە:خوا ڕەحمی پێ کردویت ودڵی تۆی نەرم کردوە بەرامبەر بەمرۆڤەکانو لەدەورت کۆبونەوە، خۆ ئەگەر بێت ولەگەڵیاندا دڵ ڕەق بایت هەمویان لەدەورەت بڵاوەیان دەکردو لێت دور دەکەوتنەوە، لەهەڵەو سەرکەشی یەکانیان ببورەو داوای لێ خۆش بونیان بۆ بکەو لەکارو فرمانەکانت دا ڕاوێژیان پێ بکە. ئەگەر ویستت هەر کارێك، هەر غەزایەك، هەر بانگەوازێك بکەیت پشت بەخوا ببەستەو دەستی پێ بکە، خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆش دەوێن کەپشت بەخوا دەبەستن.(وەرگێڕ).

(٢) أ. سورة النحل: (١٢٥).

ب. واتە: زۆر بەهێدی وهێمنانە وزیرەکانەو ژیرانە وزۆر بەحیکمەتەوە بانگەواز بۆ لای خوا بکەو ئامۆژگاری باش وپڕ بەسودیان بکەو ، تۆ بەباشترین وبەنەرمترین شێواز دیالۆك ودەمەتەقێ یان لەگەڵ دا بکە.(وەرگێڕ).

ئەم بەیەك داچون ودیالۆكە موسڵمانان‌وناموسڵمانانیش دەگرێتەوە. ئەگەر لەناو مامۆستایان‌و قوتابیاندا ناموسڵمان هەبو، دەبێ بەباشترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵ دا بكرێت. دەبێ زۆر ژیر بێژانە ئامۆژگاریان بەچاكە بكەین‌و بۆ ئیسلام بانگیان بكەین. هەروەها دەبێ كار بەئایەتەكانی خوا بكەین‌و بەنەرمی دەمەتەقێ‌و كێ بەركێ یان لەگەڵ دا بكەین كەدەفەرموێ: ﴿وَلَا تُجَٰدِلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ إِلَّا بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُ إِلَّا ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنۡهُمۡۖ وَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَأُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَإِلَٰهُنَا وَإِلَٰهُكُمۡ وَٰحِدٞ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ۝٤٦﴾(١)

وەبــۆ جــێ بــەجێ كردن‌وئەنجامــدانی چــەمكەكانی قورئــانی پــیرۆز ئــەم چیرۆك‌وداستانە واقیعی وڕاستانە دەخەینە ڕوو بەردیدی خوێنەرانی ئازیزو خۆشەویست:

١- پێشتر لەسوریە مامۆستا بوم، لەقوتابخانەكەماندا مامۆستایەكی فەلە هەبو(نـصرانی)، ناوی (جودت) بو، زۆر بەنەرمی مشت‌و مڕم لەگەڵ دا كردو پێم دەگوت:

- ئایا تۆ لەگەڵم دا ڕێكی كەپێغەمبەران هەمو بران؟

- بەڵێ...

- موسڵمانان بڕوایان بەعیسی سەلامی خوای لەسەر بێت هەیە، هەر وەها بەمریەمی دایكی لە قورئانیش دا سورەتێك بەناوی مریەمەوە هاتوە من شایەدی دەدەم كەلـە(الله) بـەولاوە هیچ خوایەكی تر نین كەشایەنی پەرستن بێت وەشایەدی دەدەم كەمحمدﷺ نێردراوی خوایە، وەشایەدی دەدەم كەعیسی نێردراوی خوایە: گوتی:

---

(١) أ. سورة العنكبوت: (٤٦).

ب.واتە: مل ملانـێ ودەمەتـەقێ لەگـەڵ ئەوانـەی كتابیـان بـۆ هاتۆتـە خـوار لەجولەكـەو فەلـەكان بەباشترین شێوە وبەجوانترین ڕێگە و بەبەر چاو ڕوشنی و بەبەڵگەوە لەگەڵیاندا بدوێن، ئەو كەسانەیان نەبێت كەستەم دەكەن وقۆڵ لەكراسی دێننە دەرو ڕێ گری لەبانگەشـەی ئیسلام وڕاگەیانـدنی ئـایینی ئیسلام دەكەن وئیمانیان نیە، ئەوانەی بڕوا بەئایینی ئیسلام ناهێنن، پێ یان بڵێن: ئێمـە بڕوامـان بـەو قورئانە هەیە كەبۆ ئێمە هاتۆتە خوار و بەو بەرنامەیش كەبۆ ئێوە هاتۆتـە خـوار خـوای ئێـوە و خـوای ئێمە هەر یەكن كە(الله)جل جلالهُ وئێمە خۆمان داوەتە دەست ئەو. بڕوامان بەهەمو پێغەمبەران هەیـەو بڕوامان بەهەمو كتێبە ئاسمانیەكانیش هەیە.(وەرگێر).

ـ منیش شایەدی دەدەم کەلە(الله) بەولاوە هیچ خوایەکی تر نین کەشایەنی پەرستن بێت وەشایەدی دەدەم کەمحمدﷺ نێردراوی خوایە.

٢ ــ لەقوتابخانەیەك دا وانەم دەگوتەوە قوتابی(نصرانی) ی تێدا بو، هەندێ چیرۆك وبەسەرهاتم بۆ گێڕانەوە دەربارەی عیساو مریمی دایکی سەلامی خوایان لێ بێت کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتون.زۆری پێ خۆش بو، بۆیە زۆری خۆش دەویستم. ئەمجار لەوانەکانی ئاییندا ئامادە دەبو، هەرچەندە بۆشی هەبو نەیەتە وانەی ئایینەوە چونکە موسڵمان نەبو، لەپێش قوتابیە موسڵمانەکان دەرسەکانی ئایینی لەبەر دەکرد، منیش زۆرم هان دەدا ، تائەنجام باوکی پێ ی زانی وزۆر نامەردانەو دەمار گیریانە نەی هێشت کوڕەکەی چیدی لەوانەی ئایین دا ئامادە بێت .

٣ ــ قوتابیەکی مەسیحی (فەلە) لەگەڵ قوتابیانی موسڵماندا دەی خوێند، منیش وانەی ئایینم پێ دەگوتن. زۆریش پابەندی دەرس بو، زۆریش حەزی لەو چیرۆکە قورئانیانە بو، کەباسیان لەعیسی ومریمی دایکی دەکرد. بەوە دڵخۆش بو کەئیسلام ئەو هەمو ڕێزەی لێ گرتون، چونکە ئەوان بەپێچەوانەوە حاڵی کرابون و پەردەی ڕەشیان بەسەر چاوان دادابون، ئیدی لەم بارانەوە پرسیاری زۆری دەکردن.

٤ ــ پێویستە لەسەر شانی موسڵمانان ئەگەر خەڵکی ناموسڵمانیان لەگەڵ دا بو، مامەڵەی چاکی یان لەگەڵ دا بکەن وبەباشی تێ یان بگەیەنن و بانگی یان بکەن بۆ ئیسلام. لەئوتێل دا کرێکارێکی دوورزیم لەگەڵ دا بو، داوام لێ کرد نوێژ بکات، بەڵام لەبەر نەفامی داوای لێ بوردنی لێ کردم، واتە نەی دەزانی نوێژ بکات، ئەو جار فێری دەست نوێژو دەستنوێژ هەڵگرتنم کردو بەردەوام دەچوە مزگەوت ونوێژەکانی دەکردن([1])، لەمزگەوت

(١) موسڵمانان زۆر لەدینەکەیان دور کەوتونەوە.. وعەلمانیەت بەسەر فیکرو زیهنی موسڵماناندا زاڵ بوە، دوژمنانی ئیسلام لەمێژ ساڵە هەوڵی شوشتنەوەی دەماغ وفیکری ئیسلامی دەدەن. ئێستا نەك هەر نوێژ نازانن ، بەڵکو هەر بڕواشیان پێ ی نەماوە. زۆرێکیش لەسەرەتاوە لەدینەکەی حاڵی نەبوە چونکە کەسانێك نەبون پەروەردەو ئامادەیان بکەن و بەجوانی لەحوکم وڕەوشتەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیان بگەیەنن.(وەرگێڕ).

دا گوێ ی بۆ دەرس خوێندن دەگرت، ئەمجار هەمو جارێ لەدەرگاکەی دەداو کەبچین بۆ نوێژی بەکۆمەڵ ( الجماعة).

٥ ـ پێویستە لەسەر پەروەردیار کەشارەزاییەکی تەواوی لەسیرەت وژیانی پێغەمبەرﷺدا هەبێت بۆ ئەوەی بنوانێت منداڵەکان وقوتابیەکانی لەسەر ئەو سیرەتە فێر بکات وکۆشیان بکات ورایان بهێنێت چونکە بەڕاستی زۆر گرنگە لەژیانی مرۆڤدا هەم بۆ دنیاو هەم بۆ قیامەت تێبکۆشێت.

# دەوڵەتی ئیسلامی چۆن بەرپابوو؟

**هەنگاوی یەکەم** : بانگەشە کردن: پێغەمبەرﷺ سەرەتای بانگ کردنەکەی لەمەکەوە دەست پێ کرد ، کەسانێکی کەم بڕوایان پێ هێناو دوایی وردە وردە ژمارەیان پتر بو.

١. پێك هێنانی دەستەو کۆمەڵی موسڵمانان: دوایی پێغەمبەرﷺ توانی لەمەککە کۆمەڵێك دابمەزرێنێت، ئەم کۆمەڵەی لەسەر بیرو باوەڕێکی پوخت وجوانی یەکتاپەرستی خواو زۆر پتەوانە پەروەردە کردو ڕاهێنا لەسەر چەمکی(لاإله إلاّ الله) واتە هیچ پەرستراوێك نین کەشایەنی پەرستن بێت بیجگە لە(الله)، چونکە لەو بەولاوە هەموپەرستراوەکانی تر ی سەر ڕوی زەوی ناڕاست و بێ ناوەڕۆکن، پەرستراوی ڕاست وبەهەق تەنیا خوا (الله) ی بالاّ دەست و کاربەجێ یە. بەڵگەی ئەم ڕاستیەشمان فەرمودەکەی خوای گەورەیە﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْحَقُّ وَأَنَّ مَا يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ هُوَ ٱلْبَٰطِلُ وَأَنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْكَبِيرُ ﴿٦٢﴾﴾(١)

پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {الدعاءُ هو العبادة}(٢). پێغەمبەرﷺو هاوەڵە بەڕێزەکانی خۆڕاگرو پشوو درێژیەکی زۆریان هەبو بەرامبەربەوهەمو ئازارو ئەشکەنجەی دەستی کافرو بێ باوەڕەکان وزۆر بەئارام بون تاخوای گەورە سەری خستون و دینەکە یان سەرکەوتوەو تیشکی زێڕینی پیرۆزی ئیسلام باڵی بەسەر هەمو جیهاندا کێشاوە. ئەم

---

(١) أ. سورة الحج: (٦٢)

ب. واتە: تەنیا(الله) هەق وڕاستەو شایەنی پەرستنە، هەر شتێکی تر جوێ لەخوا کەهاواری بکەنێ و داوای لێ بکەن وبیپەرستن ناڕەوایە ودروست نیە وبێ ناوەڕۆك و باتڵن ، هەر خوا بالاّ دەست وبەرزو کاربەجێ یەو خاوەن دەسەلاتە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواهُ الترمذيُ قال حسن صحيح.

ب. واتە: نزاو پاڕانەوە و داوا لێ کردن خۆی لەخۆی دا بەشێکە لەبەندایەتی کردن وپەرستنشی.(وەرگێڕ).

ئایینە پیرۆزە هەمیشە موسڵمانان لەسەر ئارامگری و خۆڕاگری وپشو درێژی لەهەمو بوارەکانی ژیاندا پەروەردەو هەڵ دەنێ بەتایبەت لەبەردەم ئازارو سوکایەتی پێ کردنی کافران وبێ باوەڕان وعەلمانی وخوانەناسەکاندا تاسەرکەوتنی کۆتایی وهەمیشەیی.

٢.فراوان کردنی کۆمەڵی موسڵمانان: دوای ئەوەی کەکۆمەڵی موسڵمانانی لەمەککە پێك هێنا یا پێك هاتن، ئەوجار بەدوای کۆمەڵێکی تردا گەڕا لەشاری مەدینەدا، بۆ ئەم مەبەستە لەڕۆژەکانی وەرزی حەج کردن دا پەیوەندی بەخەڵکی مەدینەوە کردو داوای لێ کردن بۆ ئیسلام بون، ولەبەیعەتی(العقبة) ی یەکەم و دوەمدا پەیمانی لێ وەرگرتن.

٣.گرنگی دان بەیەکتاپەرستی : لەسەرەتادا ولەقۆناغی یەکەمی سەرهەڵدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا پێغەمبەری خوا ﷺ گرنگی یەکی سەرەکی وبێ پایانی بەیەکتاپەرستی دەدا، ئەمەش بەڕونی لەناردنی (معاذ) دا بۆ یەمەن دەردەکەوێت کەپێ ی فەرمو: {فليكن أول ماتدعوهم إليه شهادةُ أن لاإله إلاّ الله، وفى رواية إلى أن يوحدوا الله}([1]) . جاهەر کەسێك دەیەوێ دەوڵەتی ئیسلامی بەرپا بکات باسەرەتا لەعەقیدەی ئیسلامی وهەنگاوی یەکەم لەیەکتاپەرستی یەوە دەست پێ بکات و شوێن پێ ی پێغەمبەر ﷺ هەڵ بگرێت، هەر کەسێك پێچەوانەی ئەو ڕێچکەیە بێت بازۆر چاك دڵنیا بێت کەچارەنوسەکەی لەبەر یەك هەڵوەشان وسەرنەکەوتن وتێ چون دەبێت. چونکە پێچەوانەی قورئان وسوننەت وڕێگەی پێغەمبەری ﷺ کردوە لەبەرپا کردنی دەوڵەتی ئیسلامی دا. شتێکی بێ گومانە کەدەبێ سەرەتا دەوڵەتی ئیسلامی لەدڵەکاندا بچەسپێ وبنج دابکوتێت کەبنچینەو بنەماکەی عەقیدەی پاکی ئیسلامی یە تائەنجام بتوانرێت لەسەر زەوی دا ئەم دەوڵەتە ئیسلامی یە دابمەزرێنرێت. لەیەکێ لەبانگەوازکارانی سەردەم دەڵێ: ( ئەگەر دەتانەوێ

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: یەکەم هەنگاو ویەکەم شتێك کەبانگیان دەکەن با شایەتمانی (لاإله إلاّ الله) بێت ، لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە : تا خوای گەورە بەیەك دەزانن وتەنیا لە ویەولاوە هیچ شتێکی تر ناپەرستن.(وەرگێڕ).

دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر ڕوی زەوی دا بنیات بنێن، ئەوا دەبێ وپێویستە سەرەتاو هەنگاوی یەکەم لەدڵەکانی خۆتاندا بەرپای بکەن ئەوجار دەتوانن لەسەر زەوی دا بەرپای بکەن.

**پرسیار ــ** هەندێك دەڵێن : دەبێ ئیسلام لەڕێگەی حوکم وحاکمیەتەوە بگەڕێتەوە، هەندێکی تریش دەڵێن:دەبێ لەڕێگەی جۆماڵ کردن وخاوێن کردنەوەو ڕاست کردنەوەی عەقیدەو بیرو باوەڕو پەروەردەیەکی دروستی کۆمەڵایەتیەوە لەچوارچێوەی ئیسلام وشەریعەتی ئیسلامەوە بگەڕێتەوە، ئایا کامیان ڕاسترە؟

**وەڵام:** بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، بانگەوازکاری ناسراومحمد قطب ڕەزای خوای لێ بێت لەمحازەرەیەك دا کەلە( دار الحدیث المکیة) لەمەککەی پیرۆز دای وەڵام دەداتەوەو دەڵێ: چۆن ولەکوێوە ئەم حاکمیەی ئیسلام دەگەڕێتە سەر زەوی مادام چەند بانگەشەکارێك چاکی مەردایەتی لێ نەکەن بەلاداو بیرو باوەڕو عەقیدەی ئیسلام پاك نەکەنەوەو نەیهێنەوە سەر سککەی بنەڕەتی خۆی وئەم عەقیدە تێکەڵ بوەی بەجۆرەها چڵك وخڵت وخاش وپیس و پۆخڵی بێ باوەڕی ولادان وبیدعەو بیدعەکاری پاك نەکرێتەوە، ئیمان وبیروباوەڕێکی پاك وپوختە هەڵ نەگرن، لەسەر ئەم هەوڵ وتێکۆشان وبانگەوازی وبانگ کردنەیان توشی ناخۆشی وئازارو ئەشکەنجەو جۆرەها تاقی کردنەوە نەبن وسەبرو ئارام وخۆڕاگرو پشو درێژ نەبن لەسەری، لەپێناو خوادا هەموشتێك بنۆشن وهەوڵ وتێکۆشانی بەردەوام ونەپساوە نەدەن لەپێناو خوادا ، ئابەم خۆڕاگری وپێدامەزراوی وپشو درێژیە لەسەر دینی خوا و فرمان کردن بەچاکەو قەدەغە کردن لەخراپە گەڕانەوەی حوکمی خوا وحوکمی ئیسلام مسۆگەرەو دەگەڕێتەوە.

گومانی تێدانیەو شتێکی ڕون وئاشکرایە کەحاکم وسەرکردە لەئاسمان نایەتە خوارو لەگەڵ ئەوەشدا کەهەمو شتێك لەئاسمانەوە دێتە خوارو لەلایەن خوای گەورەوەن بەلام نەبوەتە سوننەتی خوا کەهەمو شتێکت لەئاسمانەوە ببارێت، بەڵکو سوننەتی خوایە دەبێ مرۆڤ خۆی هەوڵ بدات وخوای گەورەش سەرکەوتن وبەرەکەتت بۆ دەنێرێتە خوار، خوای گەورە لەسەر مرۆڤی فەرز کردوە هەوڵ بدات و تێ بکۆشێت وخوای گەورەش سەرکەوتن وسەرفرازیت پێ دەبەخشێت.( کورد دەڵێ: گەر هەوڵ نەدەیت لەئاسمانەوە

بۆت نابارێت. یان دەڵێ:حەرەکەت لەتۆ وبەرەکەت لەخوا.وەرگێڕ).خوای گەورە دەفەموێ:﴿ وَلَوْ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنْهُمْ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَا۟ بَعْضَكُم بِبَعْضٍ ﴾ (١)

٥ـ کۆمەڵگایەکی باش وساڵح (المجتمع الصالح):

پێغەمبەرﷺ لەمەدینەدا پێش کۆچ کردنی کەش وهەواو دەورو بەرێکی باشی هێنابوە کایەوە، کاتێ کۆچی بۆ کرد کۆمەڵگایەکی موسڵمان و بڕوا پتەو لەکۆچکردوان ولەیاریدەدەران( پشتیوانان ـ المهاجرين والأنصار)لەسەر بنچینەیەکی یەکتاپەرستی وخۆشەویستی خوا دروست کردو برایەتیەکی توندو تۆڵی لەناو موسڵماناندا دروست کردو دەوڵەتی ئیسلامی لەجیهاندا ڕاگەیاند، بەم جۆرە دەوڵەتی ئیسلام بەسەرۆکایەتی پێغەمبەری خواﷺهاتە کایەوە کەلەسەر بنچینەو بنەماکانی قورئان وسوننەت کاری دەکرد. دوای کۆچی دوایی کردنی پێغەمبەریش هەر چوار خەلیفەکانی ڕاشیدین لە سەر هێڵی ئەو حوکمیان کردو چەندان شوێنو وڵاتانی تریان خستە سەر دەوڵەتی ئیسلامی و ئائەم ئایینەیان بەکاملی وبەتەواوی گەیاندە ئێمە کەهەمیشە سەرکەوتن لایەنگیریان بو.

---

(١) أ. سورة محمد: (٤)

ب. واتەك ئەگەر خوای گەورە بیویستایە یەکسەر سەرتان بخات سەری دەخستن چونکە ئەم کارە لای خوا زۆر ئاسانە ئێوە هەر پەیشی پێ نابەن ، بەلآم حیکمەتی خوا وایە کە هەندێکتان بەهەندێکتان بەتاقی بکاتەوە داخۆ چەندە بیرو باوەڕو ئیمانتان بەخوای گەورە هەیەو چەندە خۆتان لەپێناو خوادا دەبەخشن لەسەر دینی خوا چەندە خۆتان دەبەخشن و خۆڕگرو پشو درێژ دەبن لەبانگەوازو بانگەشە کردن بۆ چەسپاندنی شەریعەتی خواو بنج داکوتانی حوکمی خوا لەسەر زەوی وتاکوێ شایەنی خەلیفایەتین بۆ خوای گەورە لەسەر زەوی. بەڵێ ئەگەر خوا بیویستایە بەبێ هیچ هۆیەك سەری دەخستن و ئەو بەرنامەیەی بەبێ ماندو بون وتێکۆشانی ئێوە دەیگەیاند، بەلام ویستی خودای گەورە خۆڕاگری وئارامیو پلەی ئیمانی ئێوە بەتاقی دەکاتەوە و هەروەها پلەو پاداشتێکی بۆ ئێوەش تێدا بێت لەقیامەت ولەدنیاشدا. هەروەها بێ باوەڕو کافرانیش بەدەستی ئێوە بەتاقی دەکرێنەوەو هەر لەسە ردنیا ئازارو ئەشکەنجە لەسەر دەستی ئێوە بچێژن بۆ ئەوەی هەندێکیان بەخودا بچنەوەو باوەڕ بێنن.(وەرگێڕ).

# پەیڕەو و پڕۆگرامی بانگەوازی سەلەفیانە

لەوڵاتانی ئیسلامی دا گەلێك گروپ ولایەنی ئیسلامی هەن کەبانگەواز بۆ ئیسلام‌وحوکم کردن بەشەریعەتی خوا دەکەن‌وهەوڵی بەرپا کردنی دەوڵەتی ئیسلامی دەدەن لەشێوەی حوکمی سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشدین . وە لەدوای ئەوانیش ئەم حوکمە بەرێوە چو، بۆ گێڕانەوەی شکۆمەندی‌و هێزو توانـاو سەربەرزی‌و سەرفرازی موسڵمانان.

١. پێغەمبەرﷺموسڵمانانی بانگ دەکردن‌و فرمانی پێ دەکردن کەتوند دەست بەقورئانی پەروەردگاری خۆیانەوە بگرن‌و سوننەتی پێغەمبەرەکەیان بەرنەدەن‌وجێ بەجێ ی بکەن‌و دەوڵەتی ئیسلامی یان توند ڕا بگرن کەلەسەردەمی پێغەمبەرﷺدا دامەزراوەو پەرەیان پێدا و چەندان وڵاتی تری دیکەشیان خستە سەر دەوڵەتی ئیسلامی‌و ئایینە پیرۆزەکەی ئیسلامیان بەتەواوی ڕاگەیاند تاگەیوەتە دەستی ئێمەوخوای گەورەش پشتی گرتون وبەسەر هەمو کەندو کۆسپەو ئەستەنگێك دا سەری خستون‌وکافران‌و بێ باوەڕانی بۆ سەر شۆڕو زەلیل کردون.

٢. ئەوەی پێویستە لەسەر موسڵمانان دەبێ لەسەر ڕێڕەوی پێشینانی پیاو چاکان بڕۆن‌و ڕێگەی ئەوان بەر نەدەن، کەبریتین لەپێغەمبەرﷺو سەحابەکانی‌ﷺوشوێن کەوتوانی، بۆ ئەوەی خوای گەورە پشتیان بگرێت‌و سەریان بخات، دەنا بەپێچەوانەوە سەرشۆڕو ڕیسوایان دەکات. هەروەك ئەمڕۆ دەی بینین. جاهەر کەس‌وکۆڕو کۆمەڵێك بانگەشە بۆ دەست گرتن بە قورئانەکەی خوا(الله) وسوننەتی پێغەمبەرەکەیﷺبەقسەو بەکردەوە بکات، ئەوە بێ گومانە کەکۆمەڵی سەرکەوتو(الطائفة المنصورة) وکۆمەڵی سەلەفی دەبن‌وئەوان لەئەهلی سوننەت‌و کۆمەڵ ( أهل السنة والجماعة) دەبن‌و ئەوان دوستەی ڕزگار بون (الفرقة الناجية).

## ٣. کۆمەڵی پێشینە( الجماعة السلفية)

ئەم کۆمەڵە چاکترین‌وپاکترین‌و نزیکترین کۆمەڵ‌وگروپێکن بۆ جێ بەجێ کردنی ئەحکامەکانی قورئان‌وسوننەت‌و گرنگی دانی تەواو بەعەقیدەو یەکتاپەرستی خوا کەقورئانی پیرۆز گرنگی یەکی تەواوی پێ دەدات‌و پێ ی لەسەر دادەگرێت‌و فرمان

بەموسڵمانان دەدات کەلەهەمو ڕکاتەکانی نوێژەکانیاندا دوبارەو چەند بارەیان دەبکەوە کەبریتین لەفەرمودەکانی خوای گەورە لەسورەتی (الفاتحة)دان ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢﴾(١).

### ٤-سەلەفیەکان توند دەست بە سوننەتەوە دەگرن:

فەرمودە ڕاستو دروستو بێ هێزو دانراوەکان هەمو لەیەکتری جیادەکەنەوە، فرمان بەبڕواداران دەکەن کەتەنیا کار بەفەرمودە ڕاستو دروستەکان بکەنو واز لەبێ هێزو دانراوەکان بێنن. بەکارکردن و بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمویەتی: {من قال عليَ مالم أقُل فليتبوأ مقعدهُ من النار}(٢)

سەلەفیەکان ئەوانەن کەدەگەڕێنەوە سەر پێشینانی پیاو چاك کەبریتین لە لەپێغەمبەر ﷺوسەحابەکانﷺ وشوێن کەوتوانی ئەوانوسەر بەهیچ کەسوگروپ ولایەنێك نینو لەبنچینەو بانگەشیان :

- تێگەیشتنو حاڵی بون لەقورئانی پیرۆزو سوننەت بەگوێرەی تێگەیشتنوحاڵی بونی پێشینانی پیاو چاك.
- ئەگەر بەڵگەی نەقڵی لەقورئانو سوننەت بەڕاستی زانی ئەوا عەقڵیش شاهیدی بۆ دەدات واتە بەڕاستی دەزانێ.

پێچەوانەشی نیە (إذا صح النقل شهد العقل ولاعكس).

---

(١) واتە تەنیا هەر تۆ دەپەرستین وبەندایەتی تەنیا هەر بۆ تۆ دەکەین ئەی خودای گەرەو وپەروەردگارمان وداوای یارمەتی کۆمەك ودەستگیرۆیی تەنیا هەر لەتۆ دەکەین و تەنیا هەر بۆ لای تۆ دێین.(وەرگێڕ).

(٢) أ. حسن رواه أحمد.

ب. واتە: هەر کەسێك شتێك بەزمانی منەوە هەڵ بەستێت وبیڵێ ومنیش نەم گوتبێت با ئەو کەسە جێگەی خۆی لەناو ئاگری دۆزەخ دا دابخات.(وەرگێڕ).

- گوێمان لێ بو وفەرمانبەرداریمان کرد(سمعنا وأطعنا) . خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ بەقسەو بەکردەوەش ئەنجام دەدەن.
- ئایینی ئێمە ئایینی شوێن کەوتنە نەك ئایینی داهێنان.
- بنچینەو وبنەڕەت وبنەماو بنەوان لەعەقیدەو بەندایەتی کردندا چاوەڕوان کردنە هەتا بەڵگەیەك دەست دەکەوێت، بەڵام لەمامەڵە کردنوخواردنو خواردنەوەدا ڕێگە پێدانە(مباح) هەتاکو بەڵگەی حەرامی پەیدا دەبێتودەست دەکەوێت.
- هەر کەسێك لەسەر پەیڕەو وپرۆگرامی قورئانی پیرۆزو سونەتوسەحابەکان بڕوات ئەوە سەلەفیەو دەچێتەوە سەر پێشینەی پیاو چاکان کەبریتین لەسەحابەکان و شوێن کەوتەکان وپێشەوایانی تێکۆشەر(الأئمة المجتهدون)ﷺ. وەئەوانە ئەهلی سونەتو جەماعەتن. واتە سەلەفیە بەخۆی بزانێت یان نان بیەوێت یان نەیەوێت، پێ ی خۆش بێت یان نا.

دەربارەی گروپی ڕزگار بو(الفرقة الناجية) پرسیاریان لەشێخ عبدالعزیز کوڕی باز کرد: فەرموی: هەر کەسێك لەسەر پەیڕەو وپرۆگرامی پێشینانی پیاو چاك بڕوات جا لەهەر کۆڕو کۆمەڵێك بێت ئەوە لەکۆمەڵی ڕزگار بوانە( الفرقة الناجية)(پرسیارەکەشو وەڵامەکەیشم لەحەرەمی مەککەی پیرۆز گوێ لێ بوە)

## ئامۆژگاری گشتی:

١. لەسەر موسڵمانان بەگشتیو پەروەردیارانو هەمو گروپە ئسلامی یەکان بەتایبەتی پێویستە کەلەسەر ڕێوشوێنی پێغەمبەرﷺ بڕۆن، هەر وەك ئەو سەرەتا بانگ کردن بۆ یەکتاپەرستی خوا دەست پێ بکەن بۆ پتر کردنو گەورە کردنی کۆمەڵگەی ئیسلامی، ئەوجار دەورو بەرو کۆمەڵگایەکی چاك پێك بهێنن، هەتاکو کۆمەڵگەیەکی باشو چاکخواز پێك نەهێننو شوێن کەوتەی قورئانوسوننەت نەبن سەرکەوتو نابن، جائەگەر هەلو مەرجە شیاو وباشەکان هاتنە دەست ئەوا حاکمێکی موسڵمانی باشو دادپەروەر دابنرێت کەحوکم بەقورئانوسوننەتی پێغەمبەرﷺبکاتوئاواتو ئامانجەکانو عیزەتوسەرفرازی بۆ موسڵمانان بێنێتەوەو سەرکەوتنی یەکجارەکی دۆستو پشکی موسڵمانان بێت، ئەویش بەدامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی ڕاستەقینە.

٢. ئەرکی سەر شانی موسڵمانان بەگشتی و بانگەوازکاران بەتایبەتی ئەوەیە کەپێویستە لە سەریان پێشەکی حوکمی ئسلام لەسەر خۆیانو خاو وخێزانوخزمانوکەسو کاری خۆیان جێ بەجێ بکەن، پێش ئەوەی داوا لەحوکمڕانان بکرێت بۆ جێ بەجێ کردنی - بۆ ئەوەی خوای گەورە سەرکەوتنیان بۆ بنوسێویارمەتیان بدات، بینیومانە زۆرێك لەگروپە ئیسلامیەکان حوکمی ئیسلام لەکاتی هەڵسوکەوتی یان لەگەڵ خەڵکی دا ڕەچاو ناکەنوکاتێك بەحوکمی ئیسلام حوکمیان بەسەردا بکرێت قبوڵی ناکەنو ڕازی نین، ئەمەی کەباسی دەکەین لەهەندێ لەتاکەکانیان دا ڕو دەدات.

٣. هەول دانو تێکۆشان بۆ چەسپاندنی حوکمی خوا لەسەر زەوی بەگوێرەی ئەو بەرنامەیەی کە خوا بۆی نادوینە خوار، ئەم تێکۆشانەش لەسەر شانی هەمو موسڵمانان پێویستە. دەبێ ئەم حوکم کردنەبەنەرمیو ژیریێژیو ئامۆژگاری باشوچاك بێت، بەپێ ی فەرمودەی خوای گەورە بێت کەدەفەرموێ:

﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ ﴾(١)

---

(١) سورة النحل: (١٢٥)

٤. نابێ بەهیچ شێوەیەك توندو تیژیو خۆپیشاندان بکرێت لەپێناو کار کردن بەحوکمی شەریعەتی ئیسلامی، چونکە ئەمە لەئیسلامدا جێگەی نابێتەوەوئاواتو ئامانجەکان ناهێنێتە دیوهەمیشە پشت گوێ دەخرێتو وەلام نادرێتەوە، سەرباری ئەمەش زەرەرو زیانێکی بەرجەستە بەسەر تاك وکۆمەڵی موسڵمانانوگروپە ئیسلامی یەکاندا دێنێت. ئەم دیاردەیە لە زۆرێك لەولاتە عەرەبیەکانو ئیسلامیەکاندا هاتۆتە دیوبەکاریان هێناوە، کارێکی زۆر نامۆو بەڵکو زۆر دڵ ناخۆش کەریشە کەخۆپیشاندانی ژنان لەولاتێکی عەرەبیوموسڵماندا دەڕژێنە ناو بازاڕو خۆپیشاندان دەکەن بۆ جێ بەجێ کردنی قورئانو پۆشاکی شەرعی بێ ئاگا لەوەی کەسەرپێچی قورئانیان کردوە کەفرمانیان پێ دەکات کەلەژور نەچنە دەر هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾ ((الأحزاب: ٣٣)) واتە لەماڵەکانی خۆتاندا بمێننەوە ومەچنەدەر.

٥. ئەو کەسانەی کەئەم ئایەتە ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ سورة المائدة(٤٧).دەکەنە بەڵگە بۆ کافر کردنی موسڵمانان. إبن عباس دەڵێ: هەر کەسێك بڕیاری کافر بونی واتە دەرچون لەدین بەم ئایەتە بدات ئەوە ستەمکارە(فاسق)ە، هەروەها إبن جرير هەمان هەڵبژاردەو وبۆچونی هەبوە و عطاء دەڵێ: بڕیار دان بەو ئایەتە واتە هەرکەسێك بەحوکمی خوا کار نەکات کوفری ژێر کوفرە واتە: پێ ی کافر نابێت بەلام کوفر کردنێکە لەکوفری گەورە بچوکترەو پێ ی لەئیسلام دەرناچێت.

أ ـــ هـــەر حکومـــەت وپێـــشەواو دادوەرێـــك(الحـــاكم) بەغـــەیری ئـــەو بەرنامەیـــەی کـــەخوا ناردویەتیە خوار حوکم بکات وپێشی ڕازی بێت و ددانی پێدا بنێت ئەوە ستەمکارو فاسـقە پێویستە ئامۆژگاری بکرێت و دوعای چاکی بۆ بکرێت کەبگەڕێتەوە، یابانگی گەڕانـەوە بـۆ حـوکمی خـوای لێ بکرێـت وداوای واز هێنـــان وفرێـدان ودور کەوتنـــەوە لـەو بـیرو بـاوەڕە پوچەڵەی لێ بکرێت.

ب ـ بەلام پەنا بەخوا ئەگەر بڕوای پێ نەبێت لەبەر ئەوە کاری پێ نەکات کەیاسایەکی تری دەستکردی مرۆڤی پێ باشتر بێت ولەجێگەی حوکمی خوای دای بنێت و پێ ی وابێ

ئەو دەستورو یاسایە لەدەستورو یاسای خوای گەورە چاکترەو یاسای خوا بەکەڵکی سەردەمی ئێستای پێشکەوتن وتەکنۆلۆژیا وەك خۆیان گوتەنی نایەت پەنا بەخوا ئەوە کافرەو لەدینی خوا هەڵ گەڕاوەتەوەو لەم دینە پاکە دەرچوە. ئەمەش دەبێ ئامۆژگاری بکرێت دەبێ بگەڕێتەوە بۆ حوکمی خوای پەروەردگارمان، بەکار کردن بەو فەرمودەیەی خوای بالاّ دەست وکاربەجێ کەبەموساو هارونی برای فەرمو: بچن بۆ لای فیرعەون وئامۆژگاری بکەن بەڵکو بگەڕێتەوە بۆ حوکمی خوای گەورە ، ئەو فیرعەونە ملهوڕەی کەداوای خوایەتی دەکرد خوا پەنامان بدات ﴿ٱذۡهَبَآ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُۥ قَوۡلٗا لَّيِّنٗا لَّعَلَّهُۥ يَتَذَكَّرُ أَوۡ يَخۡشَىٰ ﴿٤٤﴾﴾(١)

٦. لەسەر بانگەوازکاران پێویستە کەپشو درێژو خۆڕاگر بن لەپێناو دروست وکردن وبەرپاکردنی دەوڵەتی ئیسلامی دا، دەبێ ئارام بگرن لەسەر ئەو هەمو نەهامەتی ودەردی سەریەو گێرەو قەرقەشەیەی دێتە ڕێگەیان لەسەر دەستی کافران وبێ باوەڕان وهەڵ گەڕاوان لەدینی خوا هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ لەئازارو ئەشکەنجە وکێشە وئەستەنگ ودرِك ودالّەکانی ڕێگە سڵ نەکەنەوە ولەبانگەشەی خۆیان نەکەون وسارد نەبنەوە بۆ یەکتاپەرستی (الله) لەبەندایتی کردن ونزاو پاڕانەوە وحوکم گێڕان و بانگ کردنی خەڵکی بۆ ئیسلام وڕاگەیاندنی دینەکەیان وحاڵی کردنی موسڵمانان لەدینەکەیان بەردەوام بن. و دەست گیرۆیی ئەوانە بکەن کەلاڕێ وچەواشەکراون وهەوڵی دەرهێنانەوەیان لەزۆلکاوی بێ ئیمانی ونەفامی دا بدەن، هەروەها بەردەوام بن لەتێکۆشان وجەنگ کردن لەڕێگەی خواداو پەروەردە کردن وفێردنێکی ئیسلامیانە بۆ هێنانە دی کۆمەڵگایەکی چاك وپاك

---

(١) أ. سورة طـه:٤٣ ـ ٤٤)

ب. واتە: بچن بۆ لای فیرعەون وئامۆژگاری بکەن، بەڵکو بیر بکاتەوەو لەخوا بترسێت،بەنەرمی و لەسەرخۆ و ژیرانە قسەی لەگەڵدا بکەن وئامۆژگاری بکەن ، بەڵکو بگەڕێتەوە .(وەرگێڕ)

وخاوێن کەحوکم بەقورئان وسوننەتی پێغەمبەرەکەی خوا ﷺ بکات لەهەمو بوارەکانی ژیاندا.

## چالاکی قوتابخانە( النشاط المدرسي )

چالاکی قوتابخانە سودی زۆرو ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە بۆ قوتابیان، سەدەها سودو کەڵکی بۆ لەش ودڵ ودەرونی مرۆڤ هەیە.

١. **وشەی جوان وبەکەڵك ( الكلمة الطيّبة )**

باش وایە پێش ئەوەی بچنە پۆلەوە قوتابیان لەگۆڕەپانی قوتابخانەدا کۆبکرێنەوەو مامۆستا یا یەکێ لەقوتابیان هەندێ لەئایەتەکان وفەرمودەی پێغەمبەرﷺو لێکدانەوەیەکی کورتی قورئان وفەرمودەیان بۆ بخوێندرێتەوە(١)

٢. **بەسەرهات وچیرۆك ( القصة ):**

قوتابیان هەمیشە حەزیان لەبەسەرهات وچیرۆك گێڕانەوەیە، بۆیە لەسەر برایان وخوشکانی مامۆستای پەروەردیاری موسڵمان پێویستە ئەم بەسەرهات وچیرۆکانە لەوتەی بەیانیاندا بۆ قوتابیان زۆر بخوێندرێتەوە، هەروەها لەکاتی وانە گوتنەوەو گەشتە قوتابخانەییەکان وکاتەکانی تردا بۆیان بگێڕدرێتەوە بەتایبەتی ئەو بەسەرهات وچیرۆکانەی کەبیرو باوەڕ و عەقیدەی پاك لەدڵ و دەرونی قوتابیاندادەچەسپێنێ.ئێستاش بەیارمەتی خوای گەورەهەندێ لەوچیرۆك و پەخشانانەتان بۆدەگێڕمەوە کەلەسوننەتی پاکی پێغەمبەردا هاتون:

عن معاوية بن الحكم السلّمي رضي الله عنه قال: (.. وكانت لي جارية ترعى غنماً لي قِبَل أُحد و الجوانية، فاطلعت ذات يوم، فإذا الذئب قد ذهب بشاةٍ من غنمها، وأنا رجلٌ من بني آدم

---

(١) بەڵام بەداخەوە لەوڵاتی ئێمەدا دین شتێکی لاوەکی و خراوەتە پەراوێزەوە. ئەوەی بەخەیاڵ دا نەیات دینە جاچ جای ئەوەی کۆبکرێنەوەو ئایەت وفەرمودەیان بۆ بخوێندرێتەوە، خوای گەورە ڕێنومایی هەمو لایەکمان بکات.آمین .. (وەرگێڕ).

آسفُ كما يأسفون، ولكني صككتها صكة( ضربتها ولطمتها) فأتيتُ رسول الله ﷺ فعظَّمَ ذلك عليَّ، قلتُ يارسول الله، افلا أعتقها؟ قال: (إئتني بها، فقال لها: أين الله؟ قالت: في السماء، قال: من أنا؟ قالت: أنت رسولُ الله، قال: إعتقها فإنَّها مؤمنة) (١)

**سودەکانی ئەم فەرمودەیە :**

أ) سەحابەکان لەهەمو کێشەو تەنگ وچەڵەمەیەك دا دەگەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺبۆ حەل کردنوچارەسەری کێشەو تەنگژەکانیان بەحوکمی خواو پێغەمبەری خوا ئەویش سەرەداو وگرێ کوێرەی کێشەکانیانی بۆ دەکردنەوەو چارەسەری بۆ دەدۆزینەوە.

ب) ڕازی بون بەحوکمی خواو پێغەمبەری خوا هەروەك خوای باڵا دەست وکاربەجێ دەفەرموێ:﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾(٢)

---

(١) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: لەمعاویەی کوڕی حکم السلمی یەوە دەگێڕنەوە کەگوتویەتی: ( جاریەکم هەبو لەلای کێوی ئوحود وناوچەی جەوانیە مەڕەکانی منی دەلەوەڕاندن. ڕۆژێکیان چومە سەردانی ودیتم کە گورگ مەڕێکی خواردوە منیش تورە بوم و لێم داو بەر مشتە کۆڵانم دا. دوایی بۆ پێغەمبەرم گێڕایەوە، زۆری لێ قورس کردم منیش گوتم: ئازادی نەکەم ئەی ڕەسولی خوا؟ فەرموی بچۆ بۆم بانگ بکە، منیش بۆم بانگ کرد. لێ ی پرسی: خوا لەکوێ یە؟ گوتی: لەئاسمانە. فەرموی من کێم؟ گوتی: تۆ پێغەمبەری خوای. ئەوجار فەرموی: ئازادی بکە ئەوە بڕوادارە.دیارە ئەویش لەسەر فەرمودەی پێغەمبەرﷺئازادی دەکات.(وەرگێڕ)؟

(٢) أ. سورة النساء :(٦٥)

ب ــ واتە: سوێند بەپەروەردگاری تۆ ئەوانە بڕوایان نیە هەتاکو ئەو کێشەو ناکۆکی یانەی کەلەنێوانیاندا ڕو دەدات نەی هێننە لای تۆو بەحوکمی خوا ڕازی نەبن، کاتێکیش کەهاتنە لات و بەو حوکمە کەتۆ بۆت کردون ڕازی نەبن و بەتەواویش تەسلیمی خوا نەبن واتە لەدڵ ودەرونـدا

ج) قایل نەبونی پێغەمبەرﷺو قبوڵ نەکردن لەسەحابە معاویة کەلەجاریەکەی بدات وئەم کارەی بەگوناحێکی گەورە دانا. دەبا پەروەردیاران بەمە بەئاگا بێنەوەو لەمە وریا بن و شوێن پێ ی پێغەمبەرﷺ بگرنە بەر لەپەروەردەو فێر کردنیاندا لەژیانی رۆژانەیاندا.

د) پێویستە بڕواداران هەمیشە پرسیار لەیەکتا پەرستی و عەقیدەو ئەحاکامەکانی شەریعەتی ئیسلام بکەن، لەوانەش بەرز ڕاگرتنو لەسەرەوە بونی (علو)و بەپیرۆز ڕاگرتنی بەسەر دروستکراوەکانی خۆی دا، بەڵکو واجبە لەسەر هەمو کەسێك هەمیشە بەدوای ڕاستیەکاندا بگەڕێن وچی یان لەدڵ دا بو با لەزنا تر لەخۆیان بپرسن.

ه) دروستە موسڵمانان پرسیار بکەن کەخوا لەکوێ یە؟ ئەوەبوو پێغەمبەر ﷺ لە جاریەکەی پرسی: خودا لەکوێ یە؟

و) دروستەو شەرعیە وەڵام بدرێتەوە کە(الله) لەئاسمانە( واتە لەسەروی ئاسمانەکانەوەیە). بەپێ ی وەڵامدانەوەی جاریەکە بۆ پێغەمبەرﷺ.

ز) بڕوا بون بەوەی کەخوا لەئاسمانە بەڵگەی دروست بونی ئیمانە، کەئەمە لەسەر هەمو موسڵمانێك واجبە. خوای گەورەش لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:﴿ ءَأَمِنتُم مَّن فِي ٱلسَّمَآءِ أَن يَخۡسِفَ بِكُمُ ٱلۡأَرۡضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ ﴾(١) إبن عباس دەڵێ: ( من فی السماء) ئەوەی لەئاسمانە مەبەستی لەزاتی (الله) یە.

ح) دروست بونو کامڵ بونی ئیمان بەشایەتی دان بەمحمدﷺکەنێردراوی خوایە.

---

بەحوکمەکەی تۆ ڕازین هەروەکو پێغەمبەر لەفەرمودەیەکی دا فەمویەتی:{ والّذی نفسی بیدیة لایؤمن أحدکم حتی یکون هواه تبعا لما جئتُ بە} تەفسیری إبن کپر.(وەرگێڕ)

(١) أ. سورة الملك: (١٦)

ب. واتە: ئایا پێوە لەخۆتان ئەمینن کەخوای گەورە لەسەروی ئاسمانەکانەوە بەزەویتان دا ڕۆ بەرێتە خوار؟(وەرگێڕ).

ط) هەڵەیەو بەهەڵە داچوە هەر کەسێك بڵێ: خوا بەخودی خۆی لەهەمو شوێنێکە، ڕاستیەکەی خوا بەخودی خۆی لەئاسمانەو بەزانیاری وزانستی خۆی لەگەڵماندایە و دەمان بینێ ووگوێ ی لێمانە.

ی) داوا کردنی جاریەکە لەلایەن پێغەمبەرﷺ بۆ تاقی کردنەوەی کەبڕوای هەیە یان ن؟بەڵگەیە کەپێغەمبەر نهێن زان نیە(١) . هەروەکو سۆفی یەکان دەڵێن گوایە پێغەمبەرﷺغەیب دەزانێ.

ك) ئازاد کردن بۆ بڕوادارە نەك بۆ کافر، چونکە پێغەمبەرﷺجاریەکەی بەتاقی کردەوە، دوای ئەوەی بۆی ڕون بۆوە کەئیماندارە فرمانی بەمعاویە دا کەئازادی بکات.

### ٣. گۆڤار یا بڵاو کراوەی سەر دیوار( مجلـة الحائط ):

یـەکێ لـەکارو چـالاکیەکانی تـری قوتابخانـە بریتیـە لـە بـڵاو کردنـەوەی سـەردیوار کەلەقوتابخانـەدا لەشـوێنێکی بـەرزدا هـەڵ دەهـا وەسـرێت، کەتیایـدا جۆرەهـا بابـەت و زانیــاری وزانــستی بەکــەڵکی تێــدا بــڵاو دەکرێتــەوە. وەك ئامۆژگاریــەکان، پەنــدی پێشینان‌وقــسەی نەســتەق، هەواڵــەکان، پێــشبڕکێکان‌و کاتــەکانی تــاقی کردنەوەوگــەلێ زانیاری تری بەسـودو بەکـەڵك. لـەئامادە کردنـی ئـەم گۆڤـارەدا قوتابیـان بەسەرپەرشـتی مامۆسـتا بەشـداری تێـدا دەکـەن. ئـەو قوتابیانـەی کـە خۆشنوسـن هـەڵ دەبـژێردرێن بـۆ نوسینی وتەی ڕۆژانە وهەفتانە. لەئایەتی قورئان یا فەرمودەی پێغەمبـەرﷺیـاخود دێـرە شیعر، کەباسی ئەخلاقی بەرز یاسودی پەروەردەیی تێدا بێت ، هەروەکو شاعر دەڵێ:

والأم مدرسةٌ إذا أعدتها أعدتَ شعباً طيب الأعراق (٢)

---

(١) واتە: ئەگەر پێغەمبەرﷺئاگای لەغەیب بایە ئەوا جاریەکەی بانگ نەدەکرو پرسیاری لێ نـەدەکرد ویەتاقی نەدەکردەوە داخۆ بڕوادارە یان کافر. یەکسەر بەمعاویەی دەگوت: ئەو جاریـە بـڕوادارە و بـڕۆ ئازادی بکە ! !( وەرگێڕ).

(٢) واتە: دایك وەك قوتابخانـە وایـەن ئەگـەر بـاش و پـڕ ئیمـان پـەروەردە بکرێـت ئـەوا گـەلێکی ڕەگ وریشاڵ داکوتاو وپتەوت ئامادە کردوە.(وەرگێڕ).

هەروەها شاعرێکی تر دەڵێ:

الله أسأل أن يفرج كربنا فالكرب لايمحوه إلاّ الله[١]

٤. **پێشبڕکێ ی ئایینی وخەم ڕەوێنی یەکان( المسابقات الدينيه والترفيهيه ):**

یەکێکی ترلەچالاکیەکانی پەروەردیاران پێشبڕکێ یە کەڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەچالاك کردنی بیرو زیهنی قوتابیان. بەتایبەتی کاتێ مامۆستا پرسیاریان ئاراستە دەکات لەچەند بابەتێکی جۆراو جۆرداو قوتابیانیش لەوەڵامدانەوەی دا پێشبڕکێ دەکەن( بەتایبەتیش کەوەڵامەکە خەڵاتی پلە(درجة) ی تێدا بێت ـ وەرگێڕ ) باشتر وایە لەو کاتەدا مامۆستایان خەڵاتی ماددی و مەعنەوی بۆ هانداتی قوتابیان بدات بەو قوتابیانەی کەبەشداری پێشبڕکێ یەکە دەکەن.

٥. **گەشت وسەردانەکانی قوتا بخانە :**

لەسەر قوتابخانەکان پێویستە کەهەندێ گەشت وسەردان بۆ قوتابیان ساز بکەن کەتیایدا قوتابیان سەردانی مزگەوتەکان، کێڵگە کشتوکاڵی یەکان، گۆڕستانو کارگەو قوتابخانەکانی تری دراوسێ بکەن لەدەڤەرەکەدا، بۆ ئەنجامدانی یەکتری ناسینو ئاڵ وگۆڕ کردن و لەیەکتری وەرگرتنی زانست وزانیاریە جۆربەجۆرەکان وچاو کرانەوەی قوتابیەکانو مامۆستایان. هەروەها پێویستە ساڵانە قوتابخانەکان بەچەند گەشتێك بۆ گوندو لادێ نزیکەکان وبۆ هەندێ شوێنی تری وەك ڕوبارو دەریاکان بۆ فێر بونی مەلە کردن لەلایەن قوتابیانەوە کەزۆر گرنگو تەندروستی یە، هەروەها بۆ پێ دەشت وقەد پاڵە جوان و قەشەنگودڵڕفێنەکان.

٦. **سەردانی دایك وباوکان ( زيارة الآباء والأمهات ): ـ**

لەقوتابخانەکان دا پێویستە کەدایکان وباوکان بۆ سەردانی قوتابخانەبانگ هێشت بکات بۆ ئەوەی لەنزیکەوە هاریکاری مامۆستایان بکەن بۆ حەل کردنی کێشەکان ئەگەر هەبون، وەبۆ پەروەردە کردنی کوڕو کچەکانیان، ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە ئەوەیە

---

(١) واتە: خوایە داوات لێ دەکەم کەتەنگ وچەڵەمەو نەهامەتیەکانم لەسەر لابەری کەتۆ نەبێ کەسی تر ناتوانێت لەسەرمان لابەرێت ورزگارمان بکات.(وەرگێڕ).

هەڵوێستی باوکان ودایکان ومامۆستایان یەکتری دەگرنەوە لەڕوی قوتابیاندا وهەڵوێستەکانیماڵەوە و قوتابخانە یەکتری نابڕن و ئەمانەش هەمو کار لەژیان و ڕەوشتی قوتابیان دەکات. پێویستە لەسەر باوکان ودایکان ئەگەر ڕەوشت و هەڵوێستێکی خراپیان لەمامۆستایەك لەقوتابخانەدا بینی بالای کوڕو کچەکانیان دەری نەخەن و با بێ ئەوەی منداڵەکانیان بزانن سەردانی قوتابخانەکە بکەن وچارەسەری کێشەکە بکەن بۆ ئەوەی ڕێزو خۆشەویستی لە نێوان قوتابی ومامۆستایاندا بەردەوام بێت. هەمو لایەك دەزانین کەهەمو کەسێك قابیلی هەڵە کردنە تەنیا خوای گەورە نەبێت، باشترینی هەڵەکەرانیش ئەوانەن کەتۆبە دەکەن و جارێکی تر ناچنەوە سەر هەڵەکانیان هەروەکو لەفەرمودەی ڕاستی پێغەمبەرداﷺ هاتوە.

## پێشبڕکێ لە قوتابخانە دا

چاك وایە مامۆستایان لەقوتابخانەکاندا پێشبڕکێ ی زانستی لەنێوان قوتابیەکانیاندا ئەنجام بدەن، چونکە پێشبڕکێ توانای بیر کردنەوەو لەبەر کردنی قوتابیان پتر دەکات و بیرو زیهنی یان بۆ زانیاریەکان دەکرێتەوەو زۆری پێ کەیف خۆش و دڵخۆش دەبن . پێشبڕکێش گەلێ جۆری هەن، پێویستە لەسەر مامۆستایان گرنگترینیان پێش گرنگیان بخەن، بەم شێوەی خوارەوە:

**١) پێشبڕکێ ی لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز:**

پێویستە مامۆستایان لەم بوارەدا پێشبڕکێ یەك ساز بکەن کەبەشێك لەقورئان، یان چەند ئایەتێکیان بداتێ کەلەبەری بکەن. ئەوجار پێشبڕکێ یەکە لەنێوان دو یا سێ قوتابی دا ئەنجام بدات ونیشانەی باش یا ئافەرین یاخود خەڵات بۆ سەرکەوتوان دابنێت([1]).

---

(١) وەك ئەم پێشبڕکێ یە پەروەردیاران لەهەر شوێنێك بن، یا باوکان ودایکان لەماڵەوە لەنێوان منداڵەکانیاندا ساز بکەن و دوایش خەڵات بەسەر سەرکەوتوان و یەکەم ودوەم وسێ یەمەکان دا دابەش بکەن بەپێ ی پلەو ئاستی سەرکەوتنەکەیان بۆ ئەوە قوتابیان یامنداڵەکان هان بدەن کەئەوپەڕی هەوڵ و کۆششی خۆیان بخەنە گەڕ بۆ بەرز کردنەوەی ئاستی زانست وزانیاریەکانیان . ئەوانەی پلەی

هیوای باشتر بون بۆ سەرنەکەوتوەکانیش بخوازن و هانی پتر هەوڵ دانیان بۆ بدات. وە هەر ئەم پێشبڕکێ یە دەتوانرێ فراوان تر بکرێت لە نێوان دو پۆل یا لەنێوان دو قوتابخانەدا بکرێت. هەروەها لەنێوان مامۆستایان و خۆیان دا یالەنێوان دو وڵات یا چەند وڵاتێك دا ئەنجام بدرێت. هەروەکو شانشینی عەرەبی سعودی لەمیانەی دەزگاکانی ڕاگەیاندنی دا ئەنجامی دەدات:

(أ) بەرنامەیەکی ئیستگەیی لەژێر ناو نیشانی(ناشئ في رحاب القرآن) لەتەلەفزیۆنەوە منداڵان نیشان دەدات کەمنداڵان ئەوەی لەبەریان کردوە دەی خوێننەوە، ئەمە هۆکارێکە بۆ هاندانی قوتابیان ومندالان کەقورئانی پیرۆز لەبەر بکەن، هەروەها بۆ وەرگرتنی ئەو خەڵاتانەی کەبەم بۆنەیەوە وەری دەگرن.

(ب ) پێشبڕکێ یەکی جیهانی کەوەزارەتی حەج وئەوقاف ساڵانە پێ ی هەڵ دەستێت بۆ لەبەر کردنی قورئانی پیرۆز وتەفسیر کردنی قورئان وجوان خوێندنەوە( تجوید) . هەروەها خەڵاتی ڕێز لێنانی ماددی ومەعنەوی یان دەدرێتێ بۆ هاندانیان، ئەمە وێڕای ئەو پاداشتە زۆرەی کەلەئەنجامی لەبەر کردنی قورئان لەڕۆژی قیامەتدا کەدەیان درێتەوە([1])

(ج) بەرنامەیەك بەناوی( أبناؤ الإسلام - ڕۆڵەکانی ئیسلام) کەبریتیە لە لەبەرنامەیەکی ئیسلامی سەرکەوتو کەپەیوەندی ئیسلامی جیهانی پێ یەوە هەڵ دەستێت.

**٢ ) لەبەر کردنی فەرمودەی پیرۆز:**

هەروەهامامۆستایان چ پیاو وچ ژن پێویستە کەچەند پێشبڕکێ یەك بۆ لەبەر کردنی فەرمودە پیرۆزەکانی پێغەمبەرﷺ ساز بکەن، چونکە زۆر گرنگ وپێویستەودوەمین

کەمتریان هێناوە پێش ئەوانی تر بکەونەوە یان هەر نەبێ بگەن بەوان، هەروەها جۆری ئەم پێشبڕکێ یانە خۆشەویستی لەنێوان قوتابیان و پەروەردیاراندا زێدە تر دەکات.(وەرگێڕ).

(١) بەمەرجێ نیاز پاکی (الإخلاص) یان تەنیا بۆ خوابێت، نەك هەوڵ دان و خۆماندو کردنەکەیان لەپێناو بەدست هێنانی ئەو خەڵاتەدا بێت کەلەدنیادا لەمامۆستا یان لەهەر کەسێ، یا لەهەر داموو دەزگاو دامەزراوەیەك وەری دەگرن( إنّما الأعمال وبالنيات) .(وەرگێڕ).

سەرچاوەیە لەتەشریع وبەرنامەی خوادا دوای قورئانی پیرۆز وسود بەقوتابیان دەگەیەنێت لەدنیاو لەقیامەتدا.

**٣) زمـــــانی عەرەبی:**

پێویستە لەسەر خوشك وبرایانی پەروەردیار کەلەگەڵ قوتابیاندا بەعەرەبی قسە بکەن و هانیان بدەن کەبەعەرەبی قسە بکەن وپێشبڕکێ لەنێوانیاندا دروست بکەن بۆقسە کردن بەزمانی عەرەبی لەگەڵ مامۆستایان وبرادەرەکانیاندا.وەهانی سەرکەوتوەکان بدەن کەعەرەبی ڕەوان( الفصحی) باش دەزانن بەو شێوە زمانە قسە بکەن نەك شێوە عامی یەکە( [١] ) .

**٤) لەبەر کردنی هۆنراوە( الشعر ):**

پێویستە قوتابیان هان بدرێن بۆ لەبەر کردنی چەندان دێڕ هۆنراوەی پڕ واتاو بەسود کەبانگی یەکتاپەرستی وتێکۆشان (الجهاد) دەکات. پێغەمبەرﷺکاتێ خەندەکی لەگەڵ سەحابەکان دا لێ دەدا ئەم دێڕە شیعرانەی ( إبن أبی رواحة)ی دەگوتنەوە:

والله لـــولا الله ماإهتدینـــــا ولا تصـــدقنـــا ولا صلّینـــــا
فـــأنزلن سکینة عــلینـــــا وثبـــتِ الأقدام إن لاقینـــــا
والمشـرکــون قد بغوا علینـــا إذا أرادوا فتنَـــة أبینـــــا( [٢] )

(وە وشەی دواییان دووبارە دەکردەوە (أبینا أبینا) ودەنگیان لەگەڵدا بەرز دەکردەوە.

---

(١) ئەمە سەبارەت بەو قوتابیانەی کەعەرەبن یالە وڵاتە عەرەبیەکاندان وتەنیا عەرەبن بەڵام سەبارەت بەئێمەی کوردیش شتێکی باشە کەهەمان مەبەست بگرینە بەر بۆ فێر بونی زمانی عەرەبی لەلایەن قوتابیانی کورد وپێویستە کەزمانی عەرەبی فێر ببن چونکە لەژیانی دنیاماندا سودێکی زۆری لێ وەردەگرین وبەتایبەتیش کەزمانی قورئان وئاینی ئیسلام زمانی عەرەبیە، وەهەروەها لەبەر ئەوەی زمانی عەرەبی زمانێکی سەرەکی جیهانیە و ڕۆشنبیریەکانی پێ دەنوسرێنەوە.(وەرگێڕ).

(٢) واتە: وەڵڵاهی ئەگەر(الله) نەبوایە ئێمە هەرگیز ڕێگەی ڕاستمان نەدەدۆزیەوە. نەچاکەمان دەزانی و نەنوێژیشمان دەکردن.(دەی خوایە هەر کاتێك ڕوبەڕوی کافران وهاویەش پەیدا کەران و دوژمنانی ئیسلام بوینەوە ئارامی وخۆ ڕاگری و پێدامەزراویمان پێ ببەخشیت و هاریکاریمان بکەیت وپێکانمان لەگۆڕەپانی جەنگ دا توند ڕابگریت و ئەو خوایەی قاچمانی چەقاند، بێ باوەڕانو هاویەش پەیداکەران وکافران ستەمیان لێ کردین ، هەر کاتێك ویستیان ئاشوبمان بۆ بنێنەوەو شەڕمان پێ بفرۆشن پێشمان پێ گرتن و نەمان هێشتن. (جائەم وشەی دوایی بەدەنگی بەرز دوجار دەگوتنەوە ــ نەمانە هێشتن، نەمان هێشتن).وەرگێڕ).

## چۆن قورئان بلێینەوە؟:

١) مامۆستا باسورەتەکە، یائەو ئایەتانەی کەمەبەستە لەبەر بکرێن لەسەر تەختە ڕەشەکە یان لەسەر وەرەقەیەك بەخەتێکی جوان وڕونو سەرو ژێری یان بۆ بکات وبینوسێتەوەبەدیوارو لەشوێنێکی بەرز هەڵی یان بهاوەسێت، یاخود لەسەر قورئانەکە بیان خوێننەوە.

٢) بەدەنگی جوانو ڕونو بەرز لەگەڵ (ترتیل) و نەرم کردن وخۆش کردنی دەنگی دەی خوێنێتەوە، ئەمجار دەنگی دەبڕێت واتە ڕادەوەستێت، بەواتا ئایەتێك دەخوێنێتەوەو لەکۆتایی ئایەتەکە دەوەستێ. بەگوێرەی فەرمودەی (أُم سلمة) کاتێ پرسیاریان لێ کرد، ئایا خوێندنەوەی پێغەمبەرﷺچۆن بوە؟ گوتی: (کانﷺ یقطع قُرآنه آية آية) (١) ﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝١ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ۝٢ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ۝٣ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ۝٤ ،....﴾

٣) هیچی تیا نیە ئەگەرقوتابیەکان بچوك بون ئایەتەکان لەگەڵ مامۆستادا بڵێنەوە بۆ ئەوەی لەکۆکردنی ئایەتەکاندا زمانیان ڕابێت. بەڵام ئەگەر گەورە بون پێویست بەوە ناکات.

٤) ماوەیەك بدرێت بەقوتابیان بۆ ئەوە لەبەر خۆیانەوە بەسرپە سرپو بێ دەنگە دەنگو ژاوە ژاو دروست کردن ئایەتەکان لەبەر بکەنو بۆ ئەوەی کار لەیەکتری نەکەنو بەیەکتریەوە سەر قاڵ نەبن. چونکە پێغەمبەرﷺئەمەی قەدەغە کردوە کەفەرمویەتی: {لایجهر بعضکم علی بعض فی القرآن}(٢)

---

(١) أ. صحیح رواه البحاری.

ب. واتە خوێندنەوەی پێغەمبەرﷺ ئایەت ئایەت دەی خوێندەوەو لەسەری دەوەستا.(وەرگێڕ)

(٢) أ. رواه البخاری.

ب. واتە دەنگ بەسەر یەکتریەوە بەرز مەکەنەوە لەکاتی قورئان خوێندندا.

٥) نـابێ لـەکاتی قورئـان خوێنـدن دا پەلـە پـەل بکـەن‌و خێـرا بخوێننـەوە . إبـن مسعودﷺگوتویەتی: ( لاتنثروا نثر الرمل، ولاتهذوهُ هذَّ الشعر، قفوا عنـد عجائبـهُ، وحرِّكوا به القلوب، ولايكن همَّ أحدكم آخر السورة) ( الهذُّ: الإسراع في القراءة)([١])

٦) مامۆستا باقوتابیان وافێر بکات کـە( صـدق اللهُ العظـيم) نەکـەن کـاتێ کـە دەسـت لـەقورئان خوێنـدن هـەڵ دەگرن، چـونکە ئەمـە هـیچ بەڵگـەیـەکی شـەرعی لەسـەر نەهاتوە. قورئـان خوێنـدنیش بەندایـەتی کردنـەو بەندایـەتیش نـابێ هـیچ شـتێکی زیـادی بخەیتـە سـەرو بیدعـەی تێـدا بکـەیت باقوتـابی وا نـەزانێ کەئەمـە شـتێکە لەقورئان.

---

(١) أ. رواه البغوي.

ب. واتە:هێندە بەپەلە قورئان مەخوێننـەوە وەك چـەنگە لیـو پـەرش وبـڵاوی بکەنـەوە، نـەوەك هۆنراوەش بەلەراندنـەوە و بەپەلـە بیخوێننـەوە. لەشـوێنە سـەرنج ڕاکێشەکاندا بوەسـتن و تێبینـی لێ بکەن، بەخوێندنەوەیـەکی وا بیخوێننـەوە کـەدڵی خـەڵکی ڕاچڵەکێنن‌و کەمەنـد کێش بکـەن. بائـاوات ومەبەستتان ئەوە نەبێ کەخێراو زو تەواوی بکەن و بگەنە کۆتایی سورەتەکە یا بۆ تەواو کرنـی خـەتم پەلـە پـەلتان پـێ بکـەوێت وهـیچ لەخوێندنـەوەی قورئانەکـە سـود وەرنـەگرن و پەنـدو عیبرەتـی لێ وەنەگرن.(وەرگێر).

## وەرزشی لەش( الرياضة البدنية ):

قوتابخانەکان گرنگی یەکی تەواو بەوەرزشی لەشی دەدەن، بۆ وانەی وەرزش مامۆستای تایبەتمەند هەیە چ لەسەرەتایی یەکان‌و چ لەناوەندی‌و ئامادەیی ودواناوەندی‌و زانکۆکاندا بێت. پێویستە لەسەر خوشك وبرایانی مامۆستاو پەروەردیاران بۆ قوتابیتان ڕون بکەنەوە کەئایینی ئیسلام چ گرنگی یەکی بەپەروەردە کردنی ئایینی داوە ئەو گرنگی یەشی داوە بەپەروەردە کردنی وەرزشی لەشی ولەش ساغی، بۆ ئەوەی موسڵمانانی بەهێزو بەتوانا بەرهەم بهێنێ، چ لەڕوی ئایینەوە بێت وچ لەڕوی هێزی بازو ولەشەوە بێت. بەکار کردن بەفەرمودەی پێغەمبەرﷺ: { المؤمن القوى خيرٌ وأحبُ إلى اللهِ من المؤمن الضعيفِ، وفي كلٍ خير، إحرص على ماينفَعكَ، إستعن بالله، ولا تعجز، فإن أصابك شيءٍ فلا تقول لو أنِّي فعلت... كان كذا وكذا، ولكن قُل قدَّر اللهُ ما شاء فعل، فإن لو تفتح عمل الشيطان}([1])

چونکە موسڵمانی بەهێزو لەش ساغ هەمیشە بەتوانا ترە لەبەندایەتی لەشی یەکان بۆ خوای گەورە وەك نوێژ کردن و ڕۆژو گرتن‌و حەج کردن‌و تێکۆشان (الجهاد)

(١) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: موسڵمانی بەهێزو بەتواناو لەش ساغ گەلێك لەموسڵمانی لاوازو بێ هێزو بێ ورەو ئیمان لاواز خێر ترو باشترە،ئەگەر شتێك بەلایەك ، ناخۆشیەك، یانەخۆشیەکت توش بو مەڵێ ئەگەر ئەوام بکردایە وا نەدەبو، یا ئەگەر نەچوباما بۆ فلان شوێن توشی ئەم قەدەرە نەدەبوم، نەخێر ئەمە هەرگیز وا نیە ئەگەر نەش چوبای ئەو ناخۆشی یا ئەو بەلایەت هەر بەسەر دەهات، لەبری ئەوە بڵێ زۆر سوپا س بۆ تۆ ئەی خوای پەروەردگارم ئەوە قەزاو قەدەری تۆیە و هەر دەبێ بێت وگەڕانەوەی نیە مەگەر خۆت ویستت لەسەر بێت. تۆ لەسەر ئەو شتە سور بە کەسودی بۆ دین ودنیا تێدایە پشت بەخوا ببەستەو داوای یارمەتی وسەرکەوتنی لێ بکەو دەست بەئیشەکەت بکەو هەرگیز پەکت نەکەوێت و ورە بەر نەدەی جا هەر شتێکت هاتە ڕێ نەڵێ ی ئەگەر وام نەکردایە توش نەدەبوم و وادەبو یا وانەدەبون بەڵکو بڵێ ئەمە قەدەری خوایە هەر دەبوایە بهاتایە و چونکە خوای گەورە هەر شتێك ویستی لەسەر بێت دەی کات .ئەو خەتەرەو خوت خوتانە کاری شەیتانن گوێ یان پێ مەدەن.(وەرگێڕ).

لەبرواداریێکی لەش ناساغ وبێ هێزو لاوازو ڕوتەڵە . بۆیە پێویستە ڕاهێنەری وەرزشی سەرکەوتوو سودەکانی بەندایەتی کردنە لەشی یەکانو پەیوەندیان بەبەهێز کردنی لەشی مرۆڤەوە بۆ قوتابیانی ڕون بکاتەوە:

(١) نوێژ:

بریتیە لەبەندایەتی کردن بۆ خوا لەگەڵ ئەمەشدا سودو کەڵکێکی زۆری هەیە بۆ بەهێز کردنی لەشی مرۆڤ، چونکە وەستان و بەچۆك داهاتنو کڕنۆش بردنو ئەم جموجوڵانە سودێکی زۆریان هەیە بۆ بەهێز کردنی لەشی مرۆڤ.

(٢) ڕۆژو (الصیام): ـ

ڕۆژو بەندایەتی کردنێکە بۆ خوای گەورە. سەرباری ئەمەش نوژداران سەلماندویانە کە سودێکی زۆری هەیە بۆ تەندروستی لەشی مرۆڤ، چونکە گەدەو کۆئەندامی هەرس بەهێز دەکاتو جگەرو ئەندامەکانی تری ناو هەناوو لەشی مرۆڤ چالاك دەکاتو سودێکی یەکجار زۆری بۆ سەرتاپای لەشی مرۆڤ هەیە.

(٣) حـــەج :

حەج کردن سەرباری ئەوەی بەندایەتیو مل کەچ کردنێکە بۆ خوای گەورە چەندان وەرزشی بۆ مرۆڤ تێدایە وەك:

(أ) خۆشوشتن پێش ئیحرام بەستن:

چالاکی یەکە هێز بەسوڕی خوێن دەدات، پاکو خاوێنیشە بۆ لەشی مرۆڤ وپاکو خاوێنی پێستو موەکان،هەروەکو خۆشوشتن لەکاتی(جِماع) کردنو ڕۆژانی هەینیو دستنوێژ هەڵ گرتن، ئەمانە هەمویان چەند کارو چالاکیەکی وەرزشی بەکەڵکن بۆ لەشی مرۆڤ.

تـــهواف:

ئهمیش بهندایهتیهکه بۆ خوای گهورهو ڕۆیشتنوگورگهلۆقه(ترمل)و ڕاکردنی تێدایه، کهبریتیه لهچهند ههنگاوێکی خێرا تر لهڕۆیشتنی ئاسایی. پێغهمبهرﷺبۆیه فهرمان بهئهنجام دانی ئهم تهوافهدهکات، وهبۆ ئهوهی کافرانو بیّ باوهڕان هێزو توانای موسڵمانان ببینن.

(ج) سهعی: بهندایهتی کردنێکه بۆ خواو ڕۆیشتن بۆ ماوهیهکی درێژی تێدایه، لهگهڵ ڕاکردن لهنێوان دو میل دا. ههروهها سهرکهوتن بۆ تهپۆلکهی صهفاو مهروه، ئهمانهش خۆی لهخۆی دا بریتین لهچهند جۆره چالاکی یهکی وهرزشی.

(د) هـات وچـۆو گواسـتنهوهو ڕۆیـشتن لـهمینا(منـی) وه بـۆ عـهرهفاتو گهڕانـهوه بـۆ مزدهلیفهو مانهوه له(منی) و وهشـاندنی (الحجـرات) واتـه ڕهجـم کردنـی شـهیتان لهچـهند ڕۆژێك دا.

(ه) ڕهمی کردنی شهیتان( رمی الجمار): ئهمهش بهندایهتی کردنێکه بۆ خوای گهوره، سودێکی وهرزشی زۆریشی بۆ لهشی مرۆڤ ههیه. ههروهها سودێکی زۆری سهربازیشی ههیه بۆ موسڵمانان بۆ فێر بونی ڕهمی کردن، خوای گهورهو بالاّ دهست فرمانی بهبڕواداران کردوهو دهفهرموێ:﴿ وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ تُرۡهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمۡ ﴾ (١) ئهمهته پێغهمبهریشﷺ هێزو تواناو سودی

(١) أ. سورة الأنفال: (٦٠)

ب. واته:ئهوهندهی دهتوانن هێزو تواناو چهكو چۆڵه و ئامرازو کهلو پهلـهکانی جـهنگ ئامـاد بکـهنو مهشـقو ڕاهێنان لهسهر چهكو سوار چاکی وبهکار هێنانی ئهسپ بکهن کهئهو کات ئهسپ باو بو لهجهنگ ولهسـواری دا، بهڵام ئهمڕۆ تۆپ وفڕۆکهو تانك وزرێ پۆشو ڕۆکێتوچهکه سوکهکانو گهلێ کهلو پـهلو ئـامێری تـری جـهنگی ههن موسڵمان پێویسته خۆیان لهسهر بهکار هێنان یان ڕابهێننو مهشـقی لهسـهر بکـهنو ههمیـشه خـۆ تـهیارو ئامادهباش بکهن، بۆ ئهوهی ههمیشه دوژمنانی خوای گهرهو دوژمنانی خۆتانی پیّ بترسێنن.(وهرگێڕ).

ڕەمی کردنی بۆ لێك داوینەوەو فەرمویەتی:{ألا إنَّ قوة الرمي، ألا إنَّ قوة الرمي}(١) .
هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ هەمیشە موسڵمانان هەڵ دەنێت بۆ فێر بون و مەشق کردن و بەرز کردنەوەی ئاستی سەربازی و پەروەردە کردنی سەربازان و بەرز ڕاگرتن و برەو پێدانی هونەری سەربازی و جەنگ، لەم بوارەوە فەرمویەتی:(من تعلَّمَ الرمي ثمَّ نسيهُ فليس منا، أوقد عصى)

هەتاکو لەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا بەڵکو پتریش لەجاران فێر بون و ڕاهێنان لەسەر چەکەکان و فێر بونی زانستەکانی جەنگ پێویست وکارێکی حەتمی وفەرزە لەسەر موسڵمانان لەهەمو جیهاندا بەتایبەتی کەئێستا هەمو جیهان دوژمنی موسڵمانان و ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، چونکە فڕۆکەو ڕۆکێت و تۆپە دور هاوێژەکان پێویستی یەکی زۆریان دەوێ بۆ فێر بون و دروست کردنیان و ڕاهێنان و کار کردن پێ یان و دەبێ دەرسی نەزەری و پراکتیکی( عملي) یان لەسەر بخوێندرێت هەتاکو موسڵمانان بەباشی فێری ببن و بەکاریان بهێنن بەبێ گرفت وکێشە دروست بون.

(٤) ئەسپ (**الخـــيل**):

ئەسپ لەکات و سەردەمی سەرەتای ئیسلامدا یەکێك بوە لەئامرازە هەرە پێویستی یەکانی تێکۆشان و جەنگ لەپێناو خوای گەورە بۆ بەرپا کردنی دەوڵەتی ئیسلامی. هەتاکو ئێستاش زۆرێك لەوڵاتان پێشبڕکێ ی ئەسپ دەکەن و ئەنجامی دەدەن و هانی سوار چاکی و برەو پێدانی دەدەن. دیارە ئەمە شتێکی حاشا هەڵ نەگرە کەسودو کەڵکێکی وەرزشی زۆریشی بۆ لەشی مرۆڤ تێدایە. زۆر لە دەوڵەتە بیانیەکان گرنگی یەکی زۆر بەسوار چاکی ئەسپ دەدەن.

---

(١) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: هێز لەخۆ ئامادە کردن و ڕاهێنان و مەشق کردن بەچەکەکان و فێر بونی زانست و تاکتیکەکانی جەنگ دایە. هێز لە پەروەردە کردن و مەشق و ڕاهێنانی جەنگاوەران و ئامادە کردنی جۆرەکانی چەك وپێداویستی یەکانی جەنگ دایە ئەویش لەپێناو خوادا.(وەرگێڕ).

(٥) پێـــشـــبڕکێ ( السبـــــــاق):

ئەمەشـــیان جـــۆرێکی تـــری بەســـودە بـــۆ لـــەش جـــوانی لەشـــی مرۆڤـــ، پێغەمبەرﷺ پێشبڕکێی غاردانی لەگەڵ عائشە خاتون﵁ دا کردوە عائشەش لەگەڵ ئەودا ڕای کردوە.

## پـــوختـــەی کار

پێویـسـتە لەسـەر مامۆسـتای سـەرکەوتو بەتایبـەتی تایبەتمەنـدان‌و پـسپۆڕانی وەرزشی کە ئیسلام گرنگی پێداون‌و هێناونی بۆ خزمـەتی قوتابیـان‌و تـێ یـان بگەیـەنێت‌و بۆیان ڕون بکەنەوە کەزۆربەی زۆری کاتە زێڕینـەکانی خۆیـان بـە دەوری یـاری تـۆپی پـێ وبەدەوری تۆپەوە بەفیڕۆ نەدەن، بەتایبەتیش ئەگەر کاتی نوێژ کردن هات ، نوێـژەکانیان لەسەر نەچوێنن، هەروەها لەئـەنجامی مـل ملانـێ ی یـاری دا لـە گـۆڵێن دا ڕق بەرقـەو دو بەرەکی‌و کینەو دوژمنایەتی ڕو دەدات. لەخستەخانەی (النور) لەشاری مەککە گـەنجێکم دیت کەقاچی توشی(عضال ـ خزین) ببو، کاتێ پرسیارم لێ کرد:

ـ ئەوە بەچی توش بوی؟

ـ یەکێك لەیاریکەران، لەیاریەکماندا کاتێ بینی بەسەریدا زاڵ بوم خۆی بەقاچم کێشاو قاچم شکا، هێنایانم بۆ خەستەخانەو ئێستاش چاك بونەوەم زۆر زەحمەتە.

## ڕێگا پەروەردەییە سەرکەوتووەکان

لەسەر خوشك‌و برایانی مامۆستا پێویستە لەسەر ئەو ڕێگە پەروەردەی یانە بـڕۆن کەقورئانی پیرۆزو سونەتی پێغەمبەرﷺبۆ پـەروەردە کـردن‌و دروسـت کردنـی بەریـەکی ڕەوشـت بـەرزو ئـازاو بەجـەرگو بـەرگری کـار لـەئاین‌و ئوممـەتی ئیـسلام هێنـاونی . کەدەتوانین لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا بیان گوشین:

## ترس وئومـــــێـد: (الخـوف والرجـــاء):

پێویستە لەسەر مامۆستایان کەترس‌وئومێد لەخوای گەورە لەدڵی قوتابیەکانیانـدا بـرِوێنن. چـونکە خـوا تۆڵــە ئەسـتێنێکی زۆر تونـدە بـۆ ئـەو کەسـانەی کەسەرپێـچی فرمانەکانی دەکەن‌و فرمانەکانی ئەنجام نادەن، پەیمانی ئاگرێکی سوتێنەرو بـە ئـازارێکی سفت‌و سویَ ی بەو کەسـانە داوە لـەدۆزەخ کەسەرپێـچی دەکـەن‌و بەرنامـەی خوانـاگرن‌و رِازی نـین قورئـان‌و سـوننەت بەرنامەوکەتـەلۆکی ژیانیـان بێـت لـەدنیادا. لەبەرامبـەر ئەمانەشدا خوای باڵا دەست پـەیمانی بـەبرِواداران‌و گـویَ رِایـەڵانی خـۆی‌و ئـەو کەسـانەی مافەکانی خوا ئەنجام دەدەن‌و بەرنامەی خوا دەکەنە سەرمەشقی ژیـانی دنیایـان‌و بـەهیچ بەرنامەیەکی تری ناراسـت‌و دەسـتکرد رِازی نـین، بەبەهەشـتێك کەپاداشـتی کردەوەکـەی خۆیانەپرِیەتی لە جۆگاو جۆبـارو دارو درەخـت‌و میـوەو میوەجـات‌و حـۆری جـوان‌و گـەلیَ نازو نیعمەتێك کەبرِانەوەیان بۆ نیە، نەهیچ نەفسێك‌و نەهیچ چـاوو نـەهیچ گـویَ یـەك ئـەم نازو نیعمەتانەی بینیوەو بیستوەو نەبەخەیاڵی کەس داهاتوە.هۆکـارو رِێگـەی بەدەسـت هێنانی ئەمانە هەموی بونی ترس‌و ئومێدە لەدڵی موسڵمانانی برِواداردا، واتـە: موسـڵمانان دەبیَ هەمیشە لەنێوان ترس‌و هیوداری دا بن. ئەوەنـدە بترسـن لـەخوا کەئـەو بەندایـەتی‌و پەرستشی یەی کەکردویانە لیَ ی وەرگرتون یاخود نا. ئەوەندەش ئومیدی هەبێت کەهەمو بەندایەتی وپەرستشی یەکـەی لیَ وەر گرتـون‌و دەیـان باتـە بەهەشـت، ئەوەنـدەش زیـادە رِەوی نەکەن کەپەنا بەخوا لەخۆ بایی ببن‌و منەت بەسەر خوادا بکەن‌و توشـی تـاوان بـبن تیَ دا. لەم ئایەت‌و فەرمودانەی خوارەوەدا دەردەکەوێت:

(أ) خوای گەورە دەفەرمویَ:﴿ ۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ۝٤٩ وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ۝٥٠ ﴾(١)

---

(١) أ. سورة الحجر (٤٩، ٥٠)

ب. واتە: هەر من لیَ بوردەو بەخشندەم، وەهەر عەزابی منە بەهێزو توندو تیژو بەسفت‌و سویَ یە.(وەرگێرِ)

وەهەروەها دەفەرموێ:﴿ وَلَا تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بَعۡدَ إِصۡلَٰحِهَا وَٱدۡعُوهُ خَوۡفٗا وَطَمَعًاۚ إِنَّ رَحۡمَتَ ٱللَّهِ قَرِيبٞ مِّنَ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٥٦﴾ ﴾(١)

لەم ئایەتەدا خوای گەورە فەرمانمان پێ دەکات کەداوای لێ بکەینو لەبەری بپاڕێینەوە. نزاو پاڕانەوەش بەشێکە لەبەندایەتی .. بەترسان لەئاگری دۆزەخوتەماحو ئومێد بون بەبەهەشتەکەی، بۆ ئەوەی بابای موسڵمان هەمیشە لەنێوان ترسو ئومێد ( الخوف والرجاء) دا بێت. بەمە قوتابی ڕەوشت و ئاکاری ڕاست دەبێتەوەو پاكو خاوێن دەردەچێتو بەردەوام دەبێت.

(ب) لەفەرمودەدا هاتوە:{اللهُمَّ إنِّي أسألك الجنَّةَ، وأعوذُ بِكَ من النار} (٢). ئەم ئایەتانەوئەم فەرمودەیە بەرپەرچ دانەوەیەکی خوایی‌و سوننەتەبۆ سۆفیگەرێتی کەدەڵێ: ئێمە بەندایەتی‌و پەرتشی خوا لەپێناو بەهەشتولەترسی ئاگری دۆزەخ ناکەین. هەروەکو لەبایان دی بێ‌و نەباران‌وئەوقورئان‌و فەرمودانەی کەلەمەو بەر باسمان کردن نەبیستبێ.

---

(١) أ. سورة الأعراف: (٥٦)

ب. واتە: خراپەکاری‌و بێ فەرمانی خوا مەکەن دوای ئەوەی ئەم زەویە پاکە پڕ لەخێرو بێرەی بۆ دروست کردون پێغەمبەران‌وچەندان بەرنامەی خوایی بۆ ناردونە خوار کەدوایەمینیان قورئانی پیرۆزو جارێکی تر ئێدی ئەم زەویە پیس مەکەنەوە. هەروەها بەترس‌و سەرێکی کزۆڵەوەو لەنێوان ترس‌و ئومێدەوە(الخوف والرجاء) لەخوا بپاڕێنەوە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح رواه أبوداود.

ب. واتە: خودایە گیان داوات لێ دەکەم بەهەشتم پێ ببەخشی، وە پەناشت پێ دەگرم لەئاگری دۆزەخ.(وەرگێڕ).

# چیرۆكو بەسەرهـــاتە گرنگەكـــان

چیرۆکو بەسەرهات کاریگەریەکی زۆر گرنگی لەسەر دەرونی مرۆڤدا هەیە، بۆیە لەسەر براو خوشکانی پەروەردیار پێویستە کەزۆرێك لەو چیرۆکو بەسەرهاتانەی کەلەقورئانی پیرۆزو سوننەتی پاکی پێغەمبەرﷺدا هاتون بۆ قوتابیەکانی بگێڕێتەوە کەئێمە هەندێك لەو چیرۆکو بەسەرهاتانە لەم چەند ڕیز بەندیەی خوارەوەدا گرد دەکەینەوە:

(أ) چیرۆکی یارانی ئەشکەوت(اصحاب الکهف): پەندو دەرس وەرگرتنو ئامۆژگاریەکی زۆری بۆ ئێمە تێدایە. ئەمانە دەستەیەکی بڕوادارو خاوەن بڕوایەکی پتەووپۆلایین بون بەخوای گەورەو پەروەردگار. ئامانج لەبۆ گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە پێك هێنانو دروست کردنی بەرەیەکی بڕوادارە بەخوای گەورە(الله) گیان، کەهەمیشە حەزو ئارەزویان یەکتاپەرستی خوای گەورەیە، هەمیشە زۆریشیان ڕەق لەهاوبەشی پەیدا کردنە.

(ب) چیرۆکو بەسەرهاتی عیسا(علیە الصلاة والسلام)، مەبەستو ئامانج لەم بەسەرهاتەدا دان نانە بەوەی کەعیسی بەندەو نێردراوی خوایە نەك کوڕی خوا هەروەکو فەلەکان(النصاری) دەڵێن.

(ج) چیرۆکو بەسەرهاتی یوسف (علیە الصلاة والسلام) : لەئامانجەکانی هێنانەوەی ئەم بەسەرهاتە ئاگادار کردنو وریا کردنەوەی موسڵمانانە لەدور کەوتنەوەو تێکەڵیو بەتەنها مانەوە لەگەڵ ئافرەتانداو خۆڕاگریو پاراستنی داوێنە لەکاری خراپەو بێ شەرعیو فاحشەدا کەچارەنوسەکەی تێچونو داڕزانە، هەروەها خۆڕاگریو ئارامیو سوپاسگوزاری خواو خیانەت نەکردن وتەبایی ویەك ڕیزیە.

(د) چیرۆکو بەسەر هاتی یونس سلامی خوای لەسەر بێت: پەندوئامۆژگاریەکانی ئەم بەسەر هاتەش بریتیە لەوەی کەتەنیا پەنا بردنو هانا بردنە بۆ خوای باڵا دەستو کاربەجێ(الله) بەتایبەتیش لەکاتێك دا کەتوشی بەڵاو موسیبەتو نەهامەتیەك ببیت تەنیا پشت بەخوا ببەستریێ.

(هـ) چیرۆکی یارانی غار(أصحاب الغار): ئەم بەسەر هاتـە پێغەمبـەرﷺ بـۆ سـەحابەکانو بۆئێمەی گێڕاوەتەوە بۆ ئەوەی فێری ئـەوەمان بکـات کەلـەکاتی پاڕانـەوەدا کردەوەکـانی خۆمانو ڕەزامەندی باوكو دایك و داگیر نەکردنی مافی کەسانی ترو زینا نـەکردن لەترسـی خوا بکەین بەهۆ(الوسیلة) واسیتە لەڕوی خوای گەورەدا. سوننەتی پێغەمبـەرﷺ پڕیـەتی لەم چیرۆكو بەسەر هاتە بەکەڵكو سود بەخشانە.

## پوختەی کار

لەسەر هـەمو پـەروەردیاران پێویـستە کەئـەم چـیرۆكو بەسـەر هاتـە بەسـودانەبۆ قوتابیەکانیان بگێڕنەوە، چونکە باشترین یارمەتی دەرێکن بۆ پەروەردە کردنی بـەرەکانی دواڕۆژ. وەلەچیرۆكو بەسەرهاتە خراپو پـیسو بۆگەنـەکان بیـان پـارێزنو بیـان گێڕنـەوە کەهەمیـشە بـەرەو خراپـیو خراپـەکاریو دزیو قـۆڵ بـڕیو لادانو ڕەوشـت نزمـیو خراپیوشەڕواڵ پیسیو سەر گێژ کردن پەل کێشیان دەکات. منیش دەڵێم:( واتە مامۆستا جمیل زینۆ...وەرگێڕ)کۆمەڵە کتێبێکی بەسـودم بـۆ گـەنجو لاوان دەرکـردون کـەدەتوانن سودیان لێ وەربگرن بەم ناونیشانانەی خوارەوە:

١. من بدائع القصص النبوی الصحیح.
٢. معجزة الإسراء والمعراج، نشر دار المنار فی الخرج.
٣. قطوف من الشمائل المحمدیـة والأخـلاق النبویـة والآداب الإسـلامیة(مطبـوع سـابقاً) وغیرها من الکتب المفیدة.
٤. الصوفیة فی میزان الکتاب والسنة.
٥. معلومات مُهمة من الدین لایعلمها کثیرٌ من المسلمین.
٦. أرکان الإسلام والإیمان.
٧. العقیدة الإسلامیة فی الکتاب والسنة الصحیحة.
٨. الوهابیة علی ضوء الکتاب والسنة.

٩. شهادة الإسلام لاإله إلاّ الله.

١٠. تحفة الأبرار في الأدعية والآداب والأركان.

١١. التحذير الجديد من مختصرات الصابوني في التفسير.

١٢. فضائل الصلاة والسلام على محمد خير الأنام.

## پاراستنی نوێژەکان و کردنیان بە کۆمەڵ( الجماعه )لە مزگەوتدا :

نوێژ کردن بەکۆمەڵ لەمزگەوتدا واجبە لەسەر پیاوان، بۆیە لەسەر مامۆستایان وباوکانو دایکان پێویستە کەقوتابیانو منداڵانیان لەسەر نوێژ کردن بەکۆمەڵ (الجماعة) لەمزگەوتدا هان بدەنو ڕایان بهێنن بۆ ئەوەی هەر لەئێستاوە فێر ببن وڕابێن کەگەورەش بون بەردەوام بچنە مزگەوتو قورس نەبێت و تەمەڵی تێدا نەکەن. بۆ ئاسانکاریو سەرکەوتنی ئەم کارەش باش وایە ئەم نەخشەی خوارەوە لەسەر تەختە ڕەشەکە بنوسنەوە تاقوتابیانیش لای خۆیان لەدەفتەرەکانیاندا بینوسنەوە. ئەمجار هەمو نوێژەکان بچنە مزگەوت و نوێژەکانیان بەکۆمەڵ بکەنو نەخشەکەش لەگەڵ خۆیاندا بەرن، باپێشەوا(إمام) ی ئەو مزگەوتە یاخود بانگ دەرەکە ناوی خۆی بنوسیو بۆیان ئیمزا بکات کەئامادەی جەماعەت بون، هەمو ڕۆژێ خشتەکە لەگەڵ خۆیاندا بێننەوە بۆ قوتابخانەو مامۆستا لەجێگەی تایبەتی خۆی دا بۆیان ئیمزا بکات و نیشانەی باشیو نمونەیی یان بەپێ ی ئامادە بونیان لە جەماعەتەکانیاندا لەبەشی خوو ڕەوشتو پەروەردەی ئیسلامی دا بۆ دابنێتو خەڵاتیان پێکەش بکات.

ناوی قوتابی:..............................................

ناوی ئەو مزگەوتەی کەنوێژی تێدا دەکات :.......................

| ڕۆژەکان | نوێژی بەیانی | نیوەڕۆ | عەسر | نوێژی شێوان | نوێژی خەوتنان | واژۆی مامۆستا |
|---|---|---|---|---|---|---|
| شەممە | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | |
| یەك شەممە | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | |
| دو شەممە | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | |
| سێ شەممە | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | |
| چوار شەممە | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پشەوا | |
| پێنج شەممە | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | |
| هەینی | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | پێشەوا | |

تێبینی: بەڵام قوتابیانی کە لەماڵی خۆیان نوێژەکانیان دەکەن و بەخێوکەرەکانیان لەبری پێشەوا واژۆیان بۆ دەکەن بۆ مامۆستای دەبەنەوە.

## گێڕانەوەی قوتابیان و منداڵان لە کاری خراپ:

### هەڵس و کەوتە خراپەکان:

لەسەر مامۆستای سەرکەوتو پێویستە کەقوتابیەکانی لەڕەوشتو هەڵس و کەوتی خراپو ناشیرینەکان بپارێزێ: وەك نوسین بەدەستی چەپو چەمینەوە لەکاتی نوسینو فڕێ دانی کاغەزو پاشەڕۆی قلم دوای دادانی لەسەر زەوی‌و هەڵکێشانی پەڕی دەفتەرو پیس کردنی بەمەرەکەب، نوسین بەخەتێکی ناشیرینو تێکەڵو پێکەڵو خراپ، قسەی ناشیرین کردنو شەڕە جنێووئەم جۆرە ڕەوشتە خراپانە. هەروەها گێڕانەوەیان لەخراپترینو بێزراو ترین ڕەوشتێك کەبریتیە لەجگەرە کێشان کەبەشێوەیەکی زۆر ناشیرینو بەربڵاوو ترسناك لەناو قوتابیاندا تەشەنەی کردوە. بۆیە لەسەر مامۆستایانو پەروەردیاران پێویستە بەهەمو شێوەیەكو بەهەمو ڕێگە جۆربەجۆرەکانو بەوپەڕی توانو لێبڕاویەوە بەر لەشاڵاوی ئەگریسی ئەم ئاکارەناشیرینەو ناهەموارەو موسڵمانان بەتایبەتیش هی منداڵانو قوتابیان بگیرێتو دەستیان بگیرێت نەکەونە ناو زۆلکاوی ئەم پەتا کوشندەیەو نەخنکێن تێ ی دا هەروەکو گەورەکان تێ ی کەوتون. پێویستە لەسەر مامۆستایان کەزیانو مەترسی یەکانی جگەرە بۆ قوتابیان ڕون بکەنەوە کەبۆنێکی پیسو هەراسان کەری هەیەو دەبێتە هۆی زەرد هەڵگەڕانی ددانو سمێڵو پەنجەکانی جگەرە کێش، وەهەروەها کەڵەکە بونی نیکۆتینو قەترانو پڕ کردنی سی یەکانو ئەنجام دەبێتە هۆی مردنی ناوەخت. بەم کارەشی نەفسێکی کوشت کەخوای گەورە حەرامی کرد بو. هەروەها کارێکی پێویستە ئەوەی کەلیژنەی نوژدارانی جیهانی دەربارەی جگەرەو زیانەکانی ڕای گەیاندوە کەدەبێتە هۆی سەرەتانی سی یەکانو جگەرو خوێنو گەلێ نەخۆشی تر بۆ قوتابیەکان ڕون بکاتەوە.

بەڵام ئەو مامۆستایانەی کەبەم ژەهرە گیرۆدە بون، پێویستە لەسەریان کەلەناو خەڵکی‌و لەناو قوتابیەکانیدا جگەرە نەکێشن، هەروەکو لەفەرمودەی پێغەمبەردا ﷺ

هـاتوه: { كـلُّ أمَّتـي معـافى إلاّ المجـاهرين}([1]) بـەڵكو پێويـستە لەسـەر جگەرەكێـشان كەبەيـەكجاري واز لەجگـەرە كێـشان بهێـنن. هـەروەها لەسـەر مامۆسـتايان پێويـستە كەقوتابيانيان تێ بگەيەنن كەباباي جگەرەكێش زيان بـەو كەسـانەش دەگەيـەنێت كـەوان لەتەنيـشتيەوەو ئـازاري ئـەو دو فريـشتەيەش دەدات كـەخواي گـەورە لەسـەري تـەرخان كردون بۆ نوسيني چاكەو خراپەكان. ديارە ئازارداني خەڵكيش لەئاييني پيرۆزي ئيسلامدا قەدەغەو حەرامە. جائەگەر مامۆستا تواني قوتابيەكاني قەناعـەت پـێ بكـات، و بەتـەواوي لەزيانـەكاني جگـەرە هوشـياريان بكاتـەوەو ئـەوەي كـەئامۆژگاري قوتابيـەكاني دەكـات لەخۆشـي دا ڕەنـگ بداتـەوە ئـەو كـات ئـەو قوتابيانـە لێ ي دور دەكەونـەوە متمانەشـيان بەمامۆستاكەيان دەبێتو بەڕاستگۆي دەزانن، بەڵام ئەگەر مامۆستاكەيان ببيـنن كەڕاسـت نالێو كردەو قسەكاني تێك ناكاتەوە ئـەوا متمانـەيان لاي قوتابيـەكان نـامێنێو بـەدرۆزني لەقەڵەم دەدەن.

### ١) ســـــنەماو تەلەفزيـــــۆن:

ئەوەي كەلەبەهێزترينو گرنگترينو كاريگـەر تـرين هۆكارەكـاني غـەزو كـردنو ڕەش كردنەوەي كلتوري لەوڵاتاني موسڵماناندا دەژمێردرێت كەلەلايەن كـافرانو بـێ باوەڕانـەوە بـەدياريو خـەڵات بـۆ ئێمـەي موسـڵمان هێنـراوە بـۆ هـەرەس پـێ هێنـاني ئەخلاقيـەتو ڕەوشتو بـەها بـەرزەكان سـينەماو تەلەفزيۆنـە. كەبەڕاسـتي لـەژێر نـاوو لـەژێر پـەردەي ئـازاديو ديمـوكراتيو گـەلێ شـتي تـري لـەم نـاوە زاقو بريقانـەي كەڕواڵـەتو بـەرگي دەرەوەيـان ڕەحمـەتو نـاوەڕۆكو ناپۆشەكەشـيان عـەزابو دەردەسـەريە بەتـەواوي ئەخلاقيەتو ڕەوشتي موسـڵمانان دادەهێزرێنـيو بەسـەر يەكدا داتـەپاوەو دادەتـەپێنێ.

---

(١) أ. متفقٌ عليه.

ب. واتە: ئوممەتي من هەمويان دەبەخشرێن تەنيا ئەوانە نەبێت كەبەئاشكرا گوناحو تاوان ئەنجام دەدەن.(وەرگێڕ).

ئیمپریالیستی داگیرکەر زۆرێك لەم فیکریەیان لەگەڵ خۆدا بەدیاریو خەڵات بۆ وڵاتانی موسڵمانان هێناوە. دیارە یەکێ لەو دیاریە بۆگەنانە دیاری غەزوی فیکریو داهێزەری ئەخلاقیەت بۆ وڵاتانی موسڵمانان بەتایبەتی بۆ وڵاتانی جیهان بەگشتی کەڕۆڵی خراپی بەرچاوی هەیە سینەماو تەلەفزیۆنە، کەزیانێکی یەکجار مەترسی بۆ سەر گەنجانو لاوانی موسڵمان هەیە.

ترسناکی یەکەی لەوە دایە کەدەبێتە هۆی بڵاو کردنەوەی سەر شۆڕیو سوکایەتی پێ کردن. ئامانجەکانیشیان لەوە دایە کەگەنجو لاوان بەرەو شتێك دەست کێش دەکەن کەزیانی هەبێت نەك قازانج، بۆ ئەوەی سود لەوزەو تواناو هێزی بازوی خۆیان وەرنەگرنو سودی بۆ ئاینو بۆڕۆڵەکانی ئوممەتی موسڵمانانو نیشتمانەکەی خۆیان نەبێت، نەك بەدیوی سودو قازانجەکانی دا، چونکە ئەم دو دەزگایە دو سەرین واتە دێویکیان بەسودو قازانجە ئەگەر لەو ڕوەدا بەکاری بێنیت وئەوی تریان زیانێکی یەکجار زۆری هەیەو پڕیەتی لەژەهری کوشندە گەر بەو ڕوەدا بەکار هێنرا. ئەمە یەکێکە لەنەخشە گڵاوەکانی جولەکەو سەهیۆنیەتی جیهانیو دەمێکە پێ یەوە خەریکە. شتێکی سەیرە کەبەرپرسان بەهیچ شێوەیەك ورياو بەخۆ نايەنەوەو بەئاگا نايەنەوە بۆ ڕزگار بون لەم میحنەتە بۆگەنە سڵ ناکەنەوە. ئەگەر فیلمی زانستیو ئەخلاقیو ئاسایی پێ لێ بدرێت قەیدی نیەو هیچ کێشەیەکمان نابێت، وەك فیلمی فێرکاری بۆ فێر کردنی قوتابیان چۆن دەست نوێژ هەڵ بگرنو چۆن نوێژ بکەن، هەروەك پێغەمبەرﷺ کردویەتی. هەروەها فلمێك قوتابیان فێر بکاتکەچۆن گوێ ڕایەڵی و ڕێز لەدایكو باوكو مامۆستاکانیان دەگرن. یان فلمێك لەبواری فیزیاو کیمیاو هەر وانەیەکی تر بێت، ئەمانە هەمویان کارێکی باشو ئاکارێکن بۆ قوتابیان سود بەخشن.

لەسەر مامۆستاو پەروەردیاری سەرکەتو پێویست ئەوەیە کە زیانە بۆگەنەکانی سنەماو تەلەفزیۆنو ڤیدیۆیان تێ بگەیەنن و لێ یان وريا بکەنەوە ئەگەر بەدیوی خراپەکەیدا بەکار هێنرا.وەبۆیان ڕون بکاتەوە کەئەو فیلمە ڕوتە ئابڕۆ بەرانە چەندە

ترسناكو مەترسی دارنوچۆن پیاوەتیو ڕێزو كەرامەت لەدڵو دەرونو ویژدان نەك هەر قوتابیان بەڵكو سەرجەم تاكوتەواوی ئەندامانی كۆمەڵگا دەكوژێتو چۆن فێری بێ ئەخلاقیو دزینو ئەنجام دانی چەندەها تاوانی نابەجێ یان دەكات، چەندان تاوانبارو دز ددانیان بەوە داهێناوە كەهەمو ئەو كردەوە خراپو بۆگەنانەی وەك دزیو بێ ئەخلاقیو پیاو كوژی هەیە لەو فیلمە ڕوت وخراپانەوە فێر بون كەئەو سینەماو تەلەفزیۆنو ڤیدیۆیانە پەخشیان دەكەن. چیرۆكو بەسەرهاتە واقعیی یەكانیش كەلەم ڕوەوە بەچاوی سەری خۆمان دەیان بینین پتر ئەم ڕایەمان دەسەلمێنن. ئەمە سەرباری ئەوەی كەچاوەكانو كۆمپیوتەری مێشكی مرۆڤەكان ماندو شلو شەكەت دەبن لەئەنجامی سەیر كردنی ئەم هەمو فیلمە بۆگەنو شاشە تیشك دەرەوەكانی ئەم دەزگایانەو سەرباری بەفیڕۆ دانی كاتوتوشی ژەهراویو پیس بونی هەوای پەنگ خواردوی بۆگەنی هەناسەو بۆنی دوكەڵی جگەرەی ئەو هەمو خەڵكە دەبن. هەروەها تێكەڵ بونی نێرو مێو ئەنجام كاری ناشیرینو لاسایی كردنەوەی ڕوداوە ناشیرینو بێ ئەخلاقی یەكانی ناو ئەو فیلمە ڕوتو جنسی یانەی كەلەشاشە سینەماكانەوە نیشانو پەخش دەكرێن.

بۆیە زۆر پێویستە لەسەر مامۆستایان كەئەم ڕاستیانە بۆ قوتابیەكانیان شەرح بكەنو تێ یان بگەیەنن، كەئەگەر قوتابی یاهەر كەسێكی تر بێت لەبری ئەم كارە دزێوو نابەجێ یە كتێبێكی بەسودی زانستی یاچیرۆكێ كەبەكەڵكو پڕ لەپەندوئامۆژگاری بكڕێتو بۆ خۆی بیخوێنێتەوە گەلێك باشترو بەسود ترە بۆی لەم كارە خیانەتكاریەو خوای گەورەش پاداشتی دەداتەوەو كاتەكەشی بەفیڕۆ ناچێت. خوای گەورە وڵاتی سعودیەی لەو ئامێرە سینەما بۆ گەنانەو ئەوەیشی دەبێتە هۆی تێكەڵ بونی پیاوو ژن پاراستوە.

**٢) قـومـارو یانەسـیب (المیسـر والیانصیب):**

پێویستە لەسەر مامۆستای سەركەوتو لەپەروەردە كردنو فێر كردندا كەهەمیشە چاوەدێری قوتابیەكانی بكاتو سەرنجیان بدات لەهەڵسو كەوتو ڕەوشتە ناشیرینەكان نزیك نەكەونەوەو حاڵی یان بكات كەیاری كردن لەسەر حەلواو چكلێتو شیرینیەكانیش

هەر بەشێکن لەقومارو حەرامن هەر کەسێك بیان کات توشی ڕقو توڕە بونی خوای گەورە دەبێتو هەمیشە گیرفان بەتاڵو ئیفلاس دەبێت. وەئاگادارو وریایان بکاتەوە کەهەر کەسێ دەست لەو قومارە وردانە وەر بدات بەرەو قوماری گەورە سەر دەکێشێت، نەك هەر بەماڵ بەڵکو بەناموسیش دەکەوێتە ناو زەلکاوی ئەم ڕەوشتە پیسو بۆگەنەوە واتە سەرو ماڵو ناموسیشی دەدۆڕێنێو هیچی پێ نامێنێو قەلاش دەبێت. زۆرێك لەم ڕوداوانە ڕوی داوە. کچەکەی خۆی فرۆشتوە یادۆڕاندویەتی . ئەوەتە جارێکیان یەکێك لەقومارکەران دەست لەقومار هەڵ ناگرێ هەتا سەرو ماڵی دەدۆڕێنێو هیچی پێ نامێنێ، لەسەر قومار هەڵ ناستێ هەتا کچەکەشی دەدۆڕێنێ، بەمەش ناوەستێ هەتا لیترێك لەخوێنی خۆشی دەدۆڕێنێ. پاش ماوەیەك بەمردویی لەیەکێ لە ئوتێلەکانی بیروت دیتیانەوە([1]).

ئەگەر لەقومار کردنداوەی خواردنەوەدا خێرو چاکە هەبایە خوای گەورە لێمانی قەدەغە نەدەکرد کەدەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾

(١) لەم جۆرە کەسانە لەوڵاتی ئێمەشدا زۆرن، چەندان کەس هەن دوای ئەوەی هەرچی پارەو پولی هەبوە هەموی دۆڕاندوە ئەم جار موڵكو خانوەکەشی فرۆشتوە. بەوەشەوە نەوەستاوە کچەکەشی فرۆشتوە سەر شۆرش ماوەتەوە. زۆرێك هەن کەسایەتیان داهێزراوو داڕزاوە. یەکێك هەبو دەمناسی و لەگەڕەکی خۆمان دراوسێمان بو شەوێکیان لەبەر سەرخۆشیو ئیفلاس بونی لەقوماردا ئاگای لەخۆی نەمابو بەگەڵو لینگی ڕوتیەوە هاتەوە ناو ماڵو منداڵەکەی خۆیو پانتۆڵەکەی لەبازاڕ فڕێ دابو. لەگەڵ ژنەکەی لێ یان بو بەهەراو قیژە قیژ . ژنەکەی دەی گوت: ئەبڕۆ پیاوەکە ئەوە بۆ وات لێ قەوماوە ئەدی کوا پانتۆڵەکەت، ئەوە فەسادیان کردوی؟ ئیدی بەو نیوە شەوە هەرچی قەوم وقیلە هەبو لەگەڵ دراوسێکان لێ کۆ بونەوەو تابەیانی کردیانە ژورێکەوەو بەندیان کرد.(وەرگێڕ).

﴿إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ۝٩١﴾ (١)

**هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: { من لعب بالنردشیر فكأنَّما غمس یدَهُ فی لحم الخنزیر ودمهُ }(٢) لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کەدروست نیە یاری کاغەزو تاوڵەوشەترەنج بکرێت، هەرچەندە لەسەر خۆشیش بێت واتە لەسەر شت بردنەوە نەبێت. چونکە ئەمەش سەر دەکێشێت بۆ قومارو دەبێتە هۆی دەمە تەقێ ودەم بەدمەوبەیەکدا**

---

(١) أ. سورة المائدة: (٩٠، ٩١)

ب. واتە: ئەی بڕواداران مەی خواردنەوەو قومار کردنو بت پەرستیو تیرو پشك هاویشتن کارێکی خراپەو لەکردەوەکانی شەیتانن لێ یان دور بکەونەوە بۆ ئەوەی سەرکەوتو بن. شەیتان بەهۆی ئەو کارانەوە دەیەوێ دوژمنایەتیو ڕقو کینەتان بخاتە نێوانو دەیەوێ لەبەندایەتیو زیکرو ویردی خواو لەنوێژ دورتان بخاتەوە. ئەوە هەتا کەنگێ ئاقڵ نابن و کەی دەگەڕێنەوە.

زاراوەی (المیسر) بەواتای قومار دێت. لەعلی کوڕی أبی طالبە وەﷺ: قومار مەبەستی لەشەترەنجە . هەروەها قاسم کوڕی محمد گوتویەتی: هەر یاریەكو هەر شتێك لەزیکرو ویردی خواو لەنوێژ کردن بێ ئاگات بکات ئەوە قومارە. هەتاکو یاری منداڵان بەگوێز وات گوێزانێو کەلایەنێ (هەلماتێن) وکلاوێنو ڕەسمێنو باقی یاریەکانی منداڵان هەمویان قومارن و حەرامن جا چ جای ئەو هەمو یاریو قومارو مەیسرەی کەپیاوان لەسەر پارە یا لەسەر هەر شتێکی تر بێت دەکەین هیچ جیاوازی نیە ئەگەر لەسەر شتیش نەبێت هەر حەرامە مادام لەزیکرو ویردی خواو لەنوێژ کردن بێ ئاگات دەکات . تفسیری إبن کثیر(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواهُ مسلم.

ب. واتە: هەرکەسێك بەنەردەشێر کەمەبەست لەتاوڵەیە یاری بکات، ئەوە وەك ئەوە وایە کەدەستی لەگۆشتو خوێنی بەراز وەردابێت، دیارە مەبەستی لەخواردنی گۆشتی بەرازە. کەواتە وەك ئەوە وایە کەگۆشتی بەرازی خواردبێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە کردنی یاری تاوڵە حەرامەو دروست نیە (وەرگێڕ).

چون‌و ناخۆشی و ناحەزی پەیدا بون لەناویاندا، ئەم بەو دەڵێ فێڵت کردوەو ئەو بەم دەڵێ: نەخێر تۆ فێڵت کردوەو داشەکەت جوڵاندوەو بەسەر یەکتریدا دەشێرێنن. سەدان جار سوێندی بەدرۆو سویند بەتەلاقان بایی پولێکە. ئەنجام قسەیان لەیەکتری وەرگرتوەو یەکتریان نەدواندوە هەر چەندە دراوسێ‌و خزمیش بو بن.

٣) جنێودان‌و دەم لەدەمی یەکتری نان (السب والتشاجر):

زۆر لەمێژ نیە کەدیاردەیەکی ناشیرین لەناو قوتابیاندا بڵاو بوەتەوە کەبریتیە لەدەمە قاڵێ کردنی قوتابیان‌و جنێو دان بەیەکتری، بەجۆرێك هەیان بوە جنێوی بەئایین داوە خوای گەورە پەنامان بدات. بۆیە پێویستە لەسەر سەرپەرشتیاران‌و بەخێوکەرانی منداڵان کەگرنگی یەکی تەواو بەمنداڵەکانیان بدەن‌و ڕێگایان پێ نەدەن لەم بوارەدا. پێشینە بەڕێزەکانمان ئەم هەڵس‌و کەوتە ناشیرینانەیان نەبوەپێویستە مامۆستایان‌و دایکان‌و باوکان بەیەکەوە هاوبەشی یەکتری بکەن بۆ ڕیشەکێش کردنی ئەم ڕەوشتە ناشیرینانەو باقی کێشەکانی تر لەبن‌و ڕەگەوە بەئامۆژگاری‌و ژیر بێژیەکی چاك چارەسەری ئەم سیفەتانە بکەن. ماوەیەك بو دەم دیت قوتابیەك هەمیشە جنێوی بە ئایینی برادەرەکەی دەدا، منیش لێ ی نزیك بومەوەو پێم گوت:

ـ ناوت چی یە؟ ولەکام پۆل‌و لەکام قوتابخانەی؟ دوایش پێم گوت: کێ تۆی دروست کردوە؟

ـ (الله) منی دروست کردوە.

ـ ئەدی کێ چاوو گوێ‌و زمانی پێ بەخشیوی‌و خۆراك‌و میوەو سەوزەی پێ بەخشیوی؟

ـ (الله) پێ ی بەخشیوم.

ـ ئەی کەواتە چ لەسەر تۆ پێویستە بەرامبەر بەو هەمونازو نیعمەتەی کەبەتۆی بەخشیوە؟

ـ سوپاسگوزاری بۆ خوای گەورە.

ـ ئەدی پێش کەمێك چیت دەگوت؟

کەبیری هاتەوە جنێوی بەبرادەرەکەی داوە تەریق بوەوەو گوتی:

ـ برادەرەکەم تەعدای لێ کردمو خەتای ئەو بو کەجنێوەکانم پێ دان ! !

ـ خوای گەورە دەست درێژی(تعدی) لەکەس قبوڵ ناکات هەروەکو خۆی دەفەرموێ:﴿ وَلَا تَعْتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿١٩٠﴾ ﴾(١) بەلام پێم بلێ کێ ئەم وەسوەسەی خستە دڵی برادەرەکەتو وای لێ کرد لێت بدات؟

ـ شەیتان وای لێ کرد لێم بدات.

ـ کەواتە چاك وابو جنێو بەشەیتانەکەی بدەیت(٢) نەك بەئاییەنەکەی، ئەمجار( نەفرینی لەشەیتانەکەی کرد) و پێم گوت:

ـ پێویستە لەسەرت تۆبە بکەیتو داوای لێ خۆش بونو لێ بوردن لەخوای گەورە بکەیتو ئیدی جارێکی تر نەگەڕێیتەوە سەر ئەم کارە خراپانە چونکە تۆ جنێوت بەئاییەنەکەی ئەو داوە.

ـ أستغفر الله وأشهد أنَّ لا إله إلاَّ الله وأشهد أنَّ محمد رسول الله.

ئەمجار منیش سوپاسم کردو داوام لێ کرد ئیدی جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر ئەم خراپانەو ئامۆژگاری برادەرەکانیشی بکات کەهەرگیز گوناحی لەم جۆرە نەکەنەوە.وەئەو بەیەکدا چونو چنگەپرچەی لەنێوان قوتابیاندا دەکرێت ئەرکی سەر شانی مامۆستایانە کە

---

(١) أ. البقرة:١٩٠

ب. واتە: دەست درێژی مەکەنە سەر یەکتری چونکە خوای گەورە دەست درێژی کارانی خۆش ناوێ. (وەرگێر).

(٢) باشتر وایە بابای موسڵمان لەکاتی تورە بوندا پەنا بەخوابگرێت لەشەیتان(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) بڵێت . هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٌ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِۖ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٣٦﴾ ﴾ سورة فصلت: (٣٦). وەپێغەمبەر ﷺ تورە بو دەفەرموێ:{إنِّي لأعلم كلمةً لو قالها لذهب عنه الغضب أعوذُ بالله من الشيطان الرجيم} متفق عليه.

ئامۆژگاری قوتابیەکانیان بکەنو لێ یان حالّی بکەنو تێ یان بگەیەنن کەئەوان برای یەکترین یاخوشکی یەکترین و دروست نیە برا برا، یاخوشك خوشك بکوژێت([1]) یاجنێوی پێ بداتو لێ ی بدات. پەروەردیاری گەورەمان محمدﷺلەم کارە خراپو دزێوانە قەدەغەی کردوینو فەرمویەتی:{ سباب المؤمن فسوقٌ وقتالهُ كفرٌ}([2])

پێویستە لەنێوان قوتابیاندا کەشو هەوایەکی برایانە دروست بکەنو یەکتریان خۆش بوێتو لەسەر مامۆستایانیش پێویستە کەقوتابیان لەسەر برایەتی و خۆشەویستی ڕابهێننو گیانی برایەتیو پشتی یەکگرتنیان لەدڵدا بروێنن پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ أولا أدلكم على شئٍ إذا فعلتموهُ تحاببتُم، أفشوا السلام بينكم}([3])

## دەستخۆشیو خەلاَتکردنو سزادتن( المکافا والعقوبات ):

مامۆستای سەرکەوتو کەم وایە پەنا بۆ سزادانو لێدان بەرێت، مەگەر لەکاتی زۆر پێویست دا نەبێت، بەڵکو هەمیشە بەخۆشیو بەنەرمیو دەست خۆشی کردنو خەلاَت پێشکەش کردن پێش سزادان دەخات، چونکە ئەمەهەمیشە قوتابیان بەجۆشو خرۆش تر بەرەو فێر بونو پەروەردەیی هان دەدات. بەپێچەوانەی سزادان کەهەمیشە شوێنەواری خراپ لەسەر دڵو دەرونی قوتابیان بەجێ دێڵێو دەبێتە بەر بەستێك لەنێوان قوتابیو

---

(١)دیارە لێرەدا مەبەست لەبرای دینیە نەك برای باوكو دایكی چونكە برای نەسەبی ئەگەر لەدین دەرچو دژی دینی خوا وەستا یا كافر بو ئەوا ئەو كاتە كوشتنی دروستە بەپێ ی شەریعەتی ئیسلام .(وەرگێڕ).

(٢) أ. متفقٌ عليهِ.

ب. واتە:جنێو دان بەبڕوادار گوناحی گەورەیەو كوشتنی كوفرە.(وەرگێڕ).

(٣) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: ئایا شتێكتان فێر بكەم ئەگەر ئەنجامی بدەن یەكتریتان خۆش دەوێت و برایەتی دەكەوێتە نێوانتانەوە بایەكتریتان خۆش بوێو هەمیشە سەلام لەیەكتری بكەن بیناسی یا نەی ناسی. لەوانەیە نەناسینەكە خێرو پاداشتی پتر بێت.(وەرگێڕ).

تێگەیشتن‌و زانست‌و گیانی پەروەردەیی‌و گیانی بەردەوامی‌و بەرەو پێش چون‌و گەشە کردن لەدڵ‌و دەرونی قوتابیدا دەکوژێت، هەر بەم هۆیەوەش زۆرێك لەقوتابیان قوتابخانە بەجێ دەهێڵن‌و دەست لەخوێندن هەڵ دەگرن. چونکە گیانی بێ ئومێدی لەدڵیاندا دەڕسکێ بەهۆی هەندێ توندو تیژی و ستەم کەلەهەندێ لەمامۆستایان دەی بینن. وەزۆرێك لەقوتابیان ئەو مامۆستایانەی کەتوندو تیژن لەناو خەڵکی‌و قەتابیانی تردا زۆر باسیان دەکەن‌و بەستەمکاریان ناودەبەن.

دەبا هەمیشە دەست خۆشی کردن‌و پاداشت‌و خەڵات کردن پێش سزادانەکان بخرێن، چونکە ئەم بنچینەترو ڕەسەنترو بەکەڵك ترەو بۆندی برایەتی‌و خۆشەویستی‌و یەکتری خۆش ویستن لەدڵەکاندا دەڕسکێنی‌و ڕیزی موسڵمانان بەهێزترو بەتین ترو بەگوڕتر دەکات وەهەمیشە پێشەنگی هەمو شتێکە. هەروەکو لەم خاڵ بەندیەی خوارەوەدا دەیان بینین:

١. **ناو دەرکردن یا باس کردن بەباشی(الثناء الجميل):**

پێویستەلەسەر مامۆستا کەهەر کارێکی باشۆ دەست پێشخەری جوانی لەقوابیان دیت‌و لەوانەکانی دا زیرەك‌و سەرکەوتو بون ڕەوشت‌و ئاکاری جوان‌و ڕێك‌و پێکی هەبو، هەمیشە ستایشی بکات‌و بەباشی باسی بکات‌و دەست خۆشی لێ بکات، هەر قوتابیەك وەڵامەکانی باش بون پێ ی بڵێ:{ئافەرین، دەستت خۆش بێت‌و خوای گەورە بەرەکەت بخاتە تەمەنتەوە(( بارك اللهُ فيك))}. وەلەناو قوتابیاندا بەتایبەتی‌و لەناوخەڵکی دا بەگشتی بەباشی باسی بکات‌و بڵێ فلان قوتابی باشترین‌و زیرەك ترین قوتابیە لەقوتابخانەکەماندا بۆ ئەوەی قوتابیانی تریش چاو لەو بکەن‌و وەك ئەو دەربچن([1]). ئائەم

(١) لەساڵەکانی شەستەکاندا بو لەپۆلی چوارەمی سەرەتایی دا بوم قوتابیەکی زیرەك‌و ڕەوشت‌و ئاکار بەرز بوم مامۆستاکان یادیان بەخێر بێت زۆریان ڕێز لێ دەگرتم ، یەکێ لەوانە مامۆستا کمال علی حسن بو کەبەکەماڵە سور بەناوبانگ بو بەڕێوەبەرمان بو، هەروەها مامۆستا کمال صابرکەلەبەرنامەی کەشکۆڵی تەلەفزیۆنی یەکیەتی دوای ڕاپەڕین ناوی سالە نیوە زمان بو ئەویش هەر بەڕێوەبەرمان بو

هەڵس‌و کەوتە لەڕێز لێنان‌و باش باس کردن‌و خـەڵات کردنـە قوتابیـان هـان دەداتو یـانی مەعنەویان واتە ورەیـان بـەرز دەکاتـەوەو شـوێنەوارێکی چـاك لـەدڵو دەرونـی قوتابیانـدا بەجێ دەهێڵێ، وا لەقوتابیان دەکات کەئەو پەڕی هەوڵی خۆیـان بدەن تاسـەرکەوتو بـن‌و لەلایەکی ترەوە دەبێتە هۆی پتـەو کردنـی پەیوەنـدی وخۆشەویستی لـەنێوان مامۆسـتاو قوتابیاندا، هـەروەکو مێشکوبیری قوتابیـان بـۆ دەرسـەکانیان فـراوانترو والا تـر دەبێـتو ئاسـودە تـرو ورە بـەرز تـر دەبـن، لەهـەمان کاتیـشدا هاندەرێکـە بـۆ قوتابیـەکانی تـری هاوەڵیان کەچاو لـەوان بکـەن هـەوڵی خـۆ چـاك کـردن‌و تێکۆشـان پـتر بـدەن بـۆ ئـەوەی ئەوانیش وەك ئەو قوتابیانە زیـرەك‌و بەڕەوشـت بـن‌و سـتایش‌و سـوپاس‌و خـەڵات بکـرێن. کەواتە لەسزادان‌و سەرکۆنە کردن‌و لێدان باشترە کەدوچاری برێ لەقوتابیان دەبێت.

٢) **پاداشت‌و خەڵاتی ماددی( المكافات المادية):**

سروشتی منـداڵ وایـە هەمیـشە حـەزی لەخـەڵات کردنـە. حـەزی لێ یـەو هەمیـشە هەوڵی بۆ دەدات بۆیە پێویستە لەسـەر مامۆسـتایان کـەوەڵامی ئـەم حـەزەیان بدەنـەوەو لەبۆنەکانـدا خـەڵاتیان بکـەن‌و بەسـەر ئـەو قوتابیانـەدا کـەزیرەك‌و بەڕەوشـتو ئاکـار

---

یـەك لـەدوای یـەك ، دەیـان گـوت: تـۆ ئەگـەر بەپەنجـە چـاومان دەر بێنـی پێمـان نـاخۆش نیـە مـادام قوتابیەکی زیرەك و ڕەوشت بەرزی . هەروەها ڕۆژێك لـەکاتی کۆ کردنـەوەی بـەیانیان واتـە ڕیـز بـونی بەیانیان لەساحەکە لەپێش چاوی هەمو قوتابیانی قوتابخانەی چوارقورنەی سەرەتایی دەریان هێنام و گوتیان: لێرە بەولاوە أحمد چاودێری گشتی قوتابخانەکەیە لەناو قوتابخانـەو لـەدەرەوەی قوتابخانـەو نوێنەری ئێمە دەبێ وەك ئێمە ڕێزی بگرن . ئیدی برا ئەمە بۆ من بو بەهاندەرێك بـۆ پـتر هـەوڵ دان و تێکۆشان وبو بەپاڵ پـشتێك بـۆمن لـەلای قوتابیـان کـەڕێزم لێ بنـێن . هـەروەها ئەمـە وای لـەمن کـرد کەهەمو ساڵێك بەیەکەم دەر بچم تا گەیشتمە سێ ی ناوەنـدی‌و لـەوێ بـاوك ودایکم بەتایبـەتی دایکـم توشـی ژن هێنانیـان کـردم وکێـشەکەیان بـۆ نامـەوە ئیـدی کێـشەو ئاسـتەنگی خێـزانیم بـۆ خولقـاو لەوانەکانمدا یەك دو ساڵ دابەزیم وتادوایی هەر چۆنێك بێت گورم نایەوە بەر خۆم‌و تا ئەنجام لەکۆلێژی ئـادابی موستەنسریە لەبەغـداد بەشـی کتێبخانـەکانم تـەواو کـرد زۆر سـوپاس بۆخـوای بـالا دەسـت و کاریەجێ.(وەرگێڕ).

بەرزوجوانن، ئەوانەی کەئەرکی سەر شانیان بەرامبەر بەپەروەردگاریان ئەنجام دەدەن لەنوێژ کردنو باقی بەندایەتیەکانی ترو کارە خێریەکانو ئەرکەکانی قوتابخانەکەیان هەڵ دەستن دابەش بکەن. کەئەم خەڵاتانە لەبەر دەم هاوەڵەکانیاندا وەر دەگرن زۆری پێ کەیف خۆش دەبنو لەدڵو دەرونیاندا غەریزەو خۆشەویستی ومالداریو هەبون لەدەرونیاندا دەروێنیوتێر دەکات. سەرباری ئەمەش پێویستە مامۆستاکان کەنیشانەی باشیەتیو پلەی بەرزیان بۆ لەبەشی رەوشت(السلوك)و ئەو وانانەی تیایاندا باشە بۆ قوتابی دابنێت.

٣) نزاو پاڕانەوە (الدعاء):

پێویستە لەسەر مامۆستا هەر قوتابیەك زیرەكو هەوڵ دەرو بەئەخلاقو نوێژكەری باشو پابەندی بو دوعای خێری بۆ بكاتو بڵێ : خوای گەورە سەرت بخاتو هیوادارم کەپاشەڕۆژێکی باشو پرشنگدارت هەبێت (وفقك الله أرجو لك مستقبلاً باهراً). هەروەها دوعا بۆ قوتابیانی تەمبەڵو خراپیش بکاتو بڵێ:( خوای گەورە باشت بکات و ڕێنومایت بکات ـ أصلحك الله وهداك).

٤) تەختەی ڕێز لێنان (لوحة الشرف):

کارێکی زۆر باشو بەجێ یە کەلەقوتابخانەدا لەوحێکی گەورەی ڕێز لێنان هەبێتو لەشوێنێکی بەرزدا هەڵ بهاوەسرێت، ناوی ئەو قوتابیانەی تێدا بنوسرێت کەزیرەكو ڕەوشت بەرزو بەتواناو پاكو خاوێنن. ئەم ڕاگەیاندنە پاڵ نەرێکی باشو هۆکارێکی گرنگە بۆ هاندانی قوتابیانی تر کەئەوانیش چاو لەقوتابیە زیرەكو باشەکان بکەن. بکەونە مل ملانێو قۆڵی هەوڵ دانو تێکۆشانو خۆچاك کردنی لێ هەڵ بکەن.

٥) چاکە لەگەڵ دا کردن (الإستحسان):

لەکاتی هەستانی قوتابی بۆ سەر تەختە ڕەشە بۆشەرح کردنی دەرس یاگوتنی سرودێك، یا شی کردنەوەو حەل کردنی پرسیارێك یاخوێندنەوەی سورەتێکی قورئانی پیرۆز، لەسەر مامۆستا پێویستە دەست لەشانی قوتابیەکە بداتو پێ ی بڵێ:{ بەرەکەتی

خوات لێ بیو هەر سەرکەوتو بیت ـ بارك الله فیك} هەروەها ئافەرین و هەر بژی لێ بکات، چونکە ئەمە هاندەرێکە بۆ قوتابیان بۆئەوەی پتر هەوڵ بدەن وتێ بکۆشن،( وەك بەنزین بکەیت بەسەر ئاودا.وەرگێڕ ).

٦ ـ خـــۆ جیـــانەکردنەوە( الإعداد ):

پێویستە مامۆستا هەمیشە خۆ بەیەکێ لەقوتابیە زیرەكو باشەکان بزانێتو وای دابنێ کە یەکێکە لەوانو هەرگیز خۆی جیانەکاتەوە. ئەمەش دیسان خۆی لەخۆی دا پاداشتو خەڵاتێکی ترە لە دڵی قوتابیاندا. پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{ لولا الهجرة لكنتُ إمرأً من الأنصار}(١) ئەم زاتە بەڕێزە خۆی لە موسڵمانان جیا نەکردۆتەوە نەلەپشتیوانانو نەلە کۆچکەران، ئەدی بۆ دەبێ ئێمە هێندە لەخۆباییو خۆ بەزل زان بینو خۆمان بەسەر موسڵماناندا هەڵ بدەین؟!!.

٧) ئامـــۆژگاری ( التوصية ):

پێویستە مامۆستا هەمیشە ئامۆژگاری باشی قوتابیانو مامۆستایان بکات بۆگەڕانەوە لەخراپەو ئەنجام دانی کاری چاکەو چاك گوزاری. وە دەست نیشانی قوتابیانی باش بکات وئاماژە بۆ زیرەكو ڕەوشت بەرزەکان بکات وەك هاندانێك بۆ ئەوانی تر کەچاو لەو باشانە بکەنو هەوڵی خۆچاك کردن بدەن.

٨) هاوڕێیەتی کردنو تێکەڵ بون ( المصاحبة )

مامۆستا چاك وایە هاوڕێ یەتیو شان بەشانی ئەو قوتابیانە بڕوات کەحەز دەکەن لەگەڵ مامۆستاکەیاندا بڕۆن بۆ مزگەوت، بۆ گەشتە قوتابخانەییەکان، کەقوتابیان ئەمە بەخەڵات کردنێك دەزانن، و شانازی پێوە دەکەن کەمامۆستاکەیان شان بەشانیان دەڕواتو زۆری پێ کەیف خۆش دەبن.

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: ئەگەر کۆچ کردنی تیادا نەبایە من پیاوێك دەبوم لەپشتیوانان(الأنصار).(وەگێڕ).

**٩) ئامۆژگاریو ڕاسپاردەکانی کەس و کاری قوتابی (توصية أهل الطالب):**

هەروەها مامۆستا دەتوانێ نامە بۆ کەسو کاری قوتابی بنوسێتو هەر بەقوتابیەکە خۆشی دا بینێرێت. زیرەکیو چاکیو ڕەوشت بەرزی قوتابیەکەیانی تێدا بنوسێت بۆ ئەوەی مامەڵەی باشی لەگەڵ دا بکەن، ئەمەش هۆکارێکی ترە بۆ هاندانی قوتابی بۆ هەوڵ دانی پترو بەرەوپێش چونو گەشەکردنو ڕەوشت بەرزی لەماڵو لەقوتابخانەدا، هەروەها بەردەوام بونیان لەسەر نوێژەکانیان بەکۆمەڵ (الجماعة). وەداوا لەبەخێو کەری قوتابیان بکەن کەلە ئیمامی مزگەوتەکە هەڵوێستی کوڕەکەیانو لەخۆشیان هەڵوێستی کچەکەیان بۆ بێنن. ئەگەر بەپێچەوانەوەش بو بابەهەردولا قوتابخانەو ماڵەوە هەوڵی ڕاست کردنەوەی قوتابیەکان بدەن.

**١٠) دەست گیرۆیی هەژاران (مساعدة الفقراء):**

لەسەر مامۆستایان پێویستە کەلیژنەیەك لەقوتابیان پێك بێنن بۆ کۆکردنەوەی پیتاكو باربۆیی هەژارانو بۆ ئەم مەبەستە سنوقێکی خەیری دابنێن. هەروەها هاریکاریان بکاتو دەست پێشخەری بکات لەبەخشین بۆ ئەو سندوقە بۆ ئەوەی قوتابیان چاو لەو بکەنو ماڵ ببەخشن. دابەش کردنی ماڵە کۆکراوەکە قوتابیان لەژێر چاوەدێری مامۆستادا بەسەرقوتابیە دەست کورتەکاندا پێ ی هەڵ بستن بۆ کڕینی هەندێ لەپۆشاكو خۆراكو کتێبو کەلو پەلی قەتابخانەو دابەش کردنیان بەسەریاندا. هەروەها پێویستە لەسەر مامۆستایان سوپاسی هەمو ئەو قوتابیانە بکەن کەهاریکاری کۆکردنەوەی پیتاك و بەخشینی ماڵیان داوە لەپێش قوتابیەکانی تر کەهاریکاریان نەکردوەنەکردوەو پارەیان نەبەخشیوە بۆ هاندانیان تاجارێکی تر ئەوانیش هاریکاری بکەنو ببەخشن. وەبۆیان ڕون بکەنەوە کەپاداشتێکی زۆریان هەیە لەلایەن خوای باڵا دەستو کاربەجێوە. چونکە ئەو ماڵەی کەدەی بەخشن کەم ناکاتو خوای گەورە جێگاکەیان پڕ دەکاتەوەو سەرباری ئەمەش لەڕۆژی قیامەتدا پاداشتێکی بێ شوماریان وەدەست دەکەوێت. ئەم ئایەتە

پیرۆزەی خوارەوەشیان بۆ بخوێنێتەوە کەدەفەرموێ:﴿ وَمَآ أَنفَقْتُم مِّن شَىْءٍ فَهُوَ يُخْلِفُهُۥ ۖ وَهُوَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾(١)

مامۆستا یا بەڕێوەبەر دەتوانێ لەو سندوقە هەندێك دیاری بۆ قوتابی یە زیرەكو گوێ ڕایەڵەكانو ڕەوشت بەرزەكانو پاكو خاوێنەكان بكڕێت و بیان داتێ.

**١١) سزادانو زیـــانەكـانی (العقوبات وأضرارها):**

لەسـەر مامۆسـتای سـەركەوتو پێویـستە كەلەسـزا ماددیـەكان دور بكەوێتـەوە، چونكە هەم بۆ قوتـابیو هـەم بـۆ مامۆسـتاش خـراپو زیـان بـەخشو بـەفیڕۆ دانـی كاتـە، چونكە لەوانەیە قوتابی لەو لێدانەی مامۆستا زیانی پـێ بگـاتو شـوێنێكی سـەقەت ببێـت وقوتابی بترسێو ببێتە كەندو كۆسپەیەكو بوغزێك لەنێوان قوتابیومامۆسـتادا، سـەرباری ئەمـەش مامۆسـتاكە لەبــەردەم سەرپەرشـتیاری پــەروەردەییو دادگــا ســزاییەكانو بەخێوكـەرانی قوتابیـان لێ بپرسـرێتەوەو لەمانـەش هـەمویان قورسـتر لەبـەردەم خـوای گەورەدا لەڕۆژی قیامەتـدا بـەرپرس بێـتو سزایەكی قورسـی بـدات. ئـەمجار ببێتـە هـۆی نەمانو دابەزینی سـومعەو كەسـێتی مامۆسـتاكە لـەناو كۆمەڵداو ڕۆڵـی لەخزمـەت كردنـی كۆمـەڵگادا نـزم ببێتـەوە. دواتـر مامۆسـتاكە پەشـێمان ببێتـەوە كاتێـك پەشـیمانی دادی نـادات. ئەمـەش لەئـەنجامی سـزاو لێـدانی قوتـابی لەلایـەن مامۆسـتاوە دێنـەدی. بۆیـە بەرپرسیاران ناچار بون ئەم جۆرە سزایە هەڵ بگرنو قەدەغەی بكەنو بڕیاریانـدا كۆتـایی بەم شوێنەوارە بهێننو پەنای نەبەنە بەر مەگـەر لـەكاتێكی زۆر پێویـستی دا نـەبێتو لـەو ڕێگەچارەیە بەولاوە هیچ شتێكی تر دادی نەدات بۆ سەر زەنـشت كردنـی قوتابیـە لاسـارو لادەرەكـان یـا بـۆ پاراسـتنی هەیبـەتو كـەشو هـەواو پـشێویو پاراسـتنی سیـستمی

---

(١) أ. سورة سبأ : (٣٩)

ب. واتە: هەر شتێك لەڕێگەی خوادا ببەخشن، خوای گەورە جێگەكەی پڕ دەكاتەوە، هـەر خـۆی ڕۆزی دەرو بەخشندەیە.(وەرگێڕ).

وانەکە.لەدوای ئەوەی مامۆستا زمانی ئامۆژگاریو پەندی خستەڕوی ئەو قوتابیە لاسارانە، بەلام هیچ دابی نەدانو گوێ یان پێ نەدا ئەمجار پەنا بەرێتە بەر لێدان. هەروەکو لەپەندێکی عەرەبیدا هاتوە: (آخر الدواء الكی)([1]).

## زیانەکانی سزادانی ماددی واتە لێدان:

١) شێواندنی ڕێڕەوی وانە گوتنەوەو دواخستنی قوتابیان بەگشتی.
٢) هەڵچونو تورە بونی مامۆستاو قوتابی لەکاتی لێدانو سزاداناو کاریگەری لەسەر هەردو لایان.
٣) زیان گەیاندن بەلەشی قوتابی لێدراو لەدەمو چاووگوێو شوێنەکانی تری لەشی ئەو قوتابیە.
٤) پچڕانی دەرس وەرگرتنو زنجیرەی بیری قوتابی سزادراوو تەریق بونەوەی.
٥) پچڕانی زنجیرە بیرۆکەکانی مامۆستا بەهۆی ئەو لێدانەوە.
٦) بەرپرس بونی مامۆستا لەبەردەم دادگاو خەڵکیو سەرپەرشتیاری پەروەردەیی.
٧) بەفیڕۆ چونی کاتی قوتابیانو کارتێکردنیان بەوەی کەلەدەرسەکەیاندا ڕو دەدات.
٨) نەمانی ڕێزو کەرامەتو خۆشەویستی لەنێوان قوتابیو مامۆستادا.

## سزا قەدەغەکراوەکان( العقوبات الممنوعة ):

ئەگەر مامۆستا هەندێ جار ناچار بو سزا بداتولەقوتابی بدات دەبێ هەندێ جۆری سزاو لێدان هەیە خۆیانی لێ بپارێزنو لێ ی دور بکەونەوە کەبریتین لەمانەی خوارەوە:

١) لێدان لەدەمو چاو:

ئەمە کارێکی بڵاوو شیاوە لەناو مامۆستایان، کەلەسەرو چاوی قوتابیان دەدەن بەتایبەتی بەشەقازلە، کەزیان بەدەمو چاوو گوێ ی قوتابی دەگەیەنێتو دوایش دوچاری

---

(١) واتە: دواین چارەسەرو دەرمان داغ کردنە.(وەرگێڕ).

بەرپرسێتیو دادگایی کردن دەبێتەوەو توشی تۆڵەدان دەبێت. دوریش نیە ببێتە هۆی لەدەست دانی یەکێ لەهەستیارەکان(الحواس) یالەکار خستنی، بۆیە پێغەمبەری نازدارﷺئەمەی قەدەغە کردوە هەروەکو فەرمویەتی: {إذا ضرب أحدكُم خادمه فليتقِ الوجه}([1])

٢) **دڵ ڕەقی و توندو تیژی (القسوة الشديدة):**

مامۆستای دڵ ڕەق و توندو تیژو بێ بەزەیی قوتابیان ناوێکی پێوانەییو پڕ بەپێستی خۆیان لێ ناوەو پێ ی دەڵێن: فلان مامۆستا ستەمکارە(ظالم) دیارە ئەم ناوەش بیزراو ترینو خراپترین ناوێکە لەسەر ڕوی زەوی کەلەمرۆڤ بنرێت. لەدوای ستەمو دڵڕەقیش هیچ شتێکی تر نیە پەشیمانی نەبێت. زۆرێك لەمامۆستایانمان دیون کەداوای لێ بوردن لەکەسو کاری قوتابیان دەکەن لەدوای ئەوەی کەلەکوڕەکەیان یاخود لەکچەکەیان داوە.

پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: { من يُحرم الرفق يُحرم الخير كلّهُ}([2]) هەروەها فەرمویەتی: {ماكان الرفق في شئ إلاّ زانه، ولا ينزع من شئٍ إلاّ شانهُ}([3])

٣) **قسەی ناشیرین (الكلام السئ):**

پێویستە لەسەر مامۆستا لەهەندێ قسەی ناشیرینو نابەجێ دور بکەوێتەوە کەدەبێتە هۆی سڵ بوەو لادانو دورکەوتنەوەی قوتابیو لەوانەیە ببنە هۆکارێك بۆ لاداو پێ خلیسکاندنی قوتابیان ومەیل چونی بەلای تاوانو تاوانکاری لەدوا ڕۆژدا. ئەو وشە

---

(١) أ. حديث حسن أنظر صحيح الجامع ١٨٥.

ب. واتە: هەر کەسێك کەلەخزمەتکارەکەی دا ، بالە دەموسەرو چاوی نەدات.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: هەر کەسێك سۆزو بەزەیی نەبێت هیچ چاکەو خێرێکی لێ چاوەڕوان ناکرێت.(وەرگێڕ).

(٣) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: سۆزو بەزەیی لەهەر شتێك دا بو ئەوا بەڕێزو بەنرخوخۆشەویست دەبێت، وەلەهەر شتێکدا نەما بێ ڕێزوبێ نرخو سوكو چروكو ڕیسوا دەبێت.(وەرگێڕ).

ناشیرینانەش وەك گوتنی: { پیس، نەفرەت لێکراو، تاوانبارو... گەلێ شتی تری ناشیرینی دڵ ڕەقانە بەقوتابی گوتن} کەدەبنە هۆی هەستو شعورودڵ بریندار کردنی قوتابی. ئەویش دواتر لەمامۆستاکەیەوە فێر دەبێتو بەهاوەڵە قوتابی یەکانو برادەرەکانی لەدەرەوەو بەبراو خوشکەکانی لەماڵەوە دەڵێت.

بێ گومان گوناحو بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو پەروەردیارە کەقوتابیەکانی ئاوا فێر کردوەو ڕای هێناونو ئەم قسە ناشیرینانەی پێ گوتون کەهەرگیز ئەم جۆرە قسانە لایەق نین لەدەمی مامۆستاوە بێنە دەرو دەربچن. لەفەرمودەی ڕاستدا هاتوە: {... من سنَّ سنَّةً سيئة فعليه وزرها ووزر من عمل بها من غير أن ينقص من أوزارهم شيئاً }(١)

٤) **لێـــدان لەکاتی تورِەیی دا ( الضرب عند الغضب ):**

پێویستە لەسەر مامۆستایان کەلەکاتی تورەە بونیاندا دان بەخۆیاندا بگرنو لەقوتابیان نەدەن چونکە لەو کاتەدا شەیتان لەگەڵت دا دەست دەوەشێنێ. قال أبو مسعود: كنتُ أضرب غلاماً لي بالسوط، فسمعتُ صوتاً من خلفي: (( إعلم أبا مسعود)) فلم أفهم الصوت من الغضب، قال: فلما دنا مني إذا هو رسول اللهﷺ، فإذا هو يقول: { إعلم أبامسعود } قال: فألقيت السوط من يدي.فقال:{إعلم أبا مسعود أن الله أقدرُ عليك منك على هذا الغلام، فقلتُ لاأضرب مملوكاً بعدهُ أبداً.}(٢)

---

(١) أ. رواه مسلم وغيره.

ب. واتە: هەر کەسێك سوننەت یاکارێکی خراپ لەئیسلامدا دابهێنێت ئەوا گوناحی خۆشیو وگوناحی هەمو ئەو کەسانەشی دەگاتێ کەکار بەوسوننەتەی ئەو دای هێناوە بەبێ ئەوەی لەگوناحی هیچیان کەم بکاتەوە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواه مسلم.

ب. واتە: أبو مسعود گوتی: لەکاتێك دا لەخزمەتکارەکەی خۆم دەدا، گوێم لەدەنگێك بولەدوامەوە دەی گوت: ( بزانە ئەی أبا مسعود) بەلام من لەتورەییو لەکەللە گەرمیاندا دەنگەکەم نەناسی ، گوتی: کاتێ لێم نزیك بوەوە دیتم پێغەمبەری خوایەﷺو دەی گوت: { بزانە ئەی أبامسعود، بزانە ئەی أبامسعود} .گوتی: قامچی یەکەم لەدەست کەوتە خوار.ئەوجار پێ ی گوتم: { بزانە أبو مسعود خوای

**٥) لـێدان بەشەق و پێلاقە یا لێدانی پاشە لوشکە (الرفس بالرجل):**

هەندێ لەمامۆستایانم بەپێلاقەوبەنەعلوبەپێڵاو لەقوتابیان دەدەن یا جوتـەیان لێ دەدەن. دور نیە بەو لێدانە شوێنێکی ترسناکی ئەو قوتابیە توش ببێت و ببێتە هۆی لـەناو بردنی ژیانی ئەو قوتابیەو ئەوجار تـێ ی دا بەرپرسـیار ببێـت و پەشـیمان ببێتـەوە کەئـەو کات پەشیمانی دادی نادات. خۆ ئەگەر ئەمەش نەبێت جوتەو پێلاقە لەسیفات و کردەوەی مرۆڤ نیە.

**٦) تـوڕە بـون و هەڵچونی توند(الغضب الشديد):**

پێویستە مامۆستا هەمیشە لەکاتی وانـە گوتنـەوەدا بەسـەر مێشك و دەمارەکـانی (الأعصاب)ی خۆی دا زاڵ بێت و جڵەوی بۆ شل نەکات حساب بۆ هەست و تەبیات و نەفـسی منداڵان بکات و ئەوە لێك بداتەوە کەمنداڵان ناتوانن بەسەر نەفس و عەقڵیـەتی خۆیانـدا زاڵ بـبن و ڕێـشمەی ئارەزوەکانیـان بگـرن بۆیـە دەبـێ چـاودێریان بکـات و لێ بـوردنی هـەبێت بەرامبەر بەهەڵس و کەوتەکانیان. بابگەڕێتەوە دواوەو بۆ سـەردەمی خـۆی و تـافی منـداڵی خۆی بیر بێتەوە، کـاتێ لەقوتابخانـەدا قوتـابی بـوە، لەوانەیـە خـراپترین هـەڵس و کـەوتی هـەبوبێت. جـا هـەر کـاتێ مامۆسـتا بـیری لـەوە کـردەوە ئـەوا تـوڕە بـون و هەڵچونەکەی دادەبـەزێت و کـەم دەکاتـەوە، ئەوسـا بەسـەر نەفـسی خـۆی دا زاڵ دەبێـت، کەبەڕاسـتی ئازایەتیـشی دەوێـت. پـەروەردیاری گـەورەمان محمـدﷺفەرمویـەتی: {لـيس الـشديد بالصرعة، إنما الشديد الذي يملك نفسه عند الغضب}(١)

---

گەورە گەلێك لەسەر تۆ بەدەسەڵات تـرە وەك تـۆ بـە سـەر ئـەو خزمەتکارەتـدا هەتـە لـەخوا ناترسـی لەتۆڵەی ئەو غولامە لێت بداتەوە، جاگوتم: لێرە بەولاوە تۆبەو ئیـدی هـەرگیزاو هـەرگیز لەخزمـەتکارم نادەمەوە.(وەرگێڕ).

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: پاڵەوان ئەو کەسە نیە کەلەزۆرانبازی دا دەیباتەوە بـەڵکو پاڵـەوان ئـەو کەسـەیە کەلـەکاتی توڕە بوندا نەفسی خۆی دەگرێت و بەسەر خۆی دا زاڵ دەبێت.(وەرگێڕ).

- با پەروەردیاران چ مامۆستا بن‌و چ باوك‌و دایك وریا بن لەكاتی تورە بوندا سزای قوتابی و منداڵەكانیان نەدەن‌و ترش‌و دۆشاو تێكەڵ نەكەن نەبادا لەئەنجامی ئەم لێدان‌و سزادانەدا توشی زیان ببن‌و ئەنجامەكەی باش نەبێت. لەسەر مامۆستایان پێویستە ناوی قوتابیە سەرپێچی كەرەكان بنوسێت‌و هەڵی یان بگرێت بۆكۆتای دەرس‌و ئەو كاتە سزایان بدات. من مامۆستایەكم دەناسی لەكورەكەی تورە بو ، چو كەلێ ی بدات، بەڵام كورەكەی لەترسان رای كردو لەئەنجامی راكردنەكەی دا قاچی زامدار بو و شكاو بەپەلە بردیان بۆ لای بەیتاڵ بۆ هەڵ ببەستنەوەو تیماری بكەن. دوایش باوكەكە پەشیمان بوەوە( ١ ).

هەندێ لەمامۆستایان لەكاتی تورە بونیاندا لەقوتابیان دەدەن‌و جنێویان پێ دەڵێن‌و كوفریش دەكەن. دیارە ئەمە كارێكی ناشیرین و نابەجێ یەو قوتابیانیش بەچاوێكی سوكەوە سەیریان دەكەن.جائەگەر ئەم تورە بونەی مامۆستاو پەروەردیاران هەڵچوو چەند جارە بوەوەو بەسەر قوتابیاندا شیراندی‌و تەندو تیژو تۆسن‌و جنێو فرۆش بون .( ٢ )

## چارەسەری توورەبوون‌و هەڵچوون( علاج الغضب والإنفعال ):

ئەگەر پەروەردیار دوچاری تورە بون‌و هەڵچون هات با پەنا بۆ ئەو دەرمانە چارە سەرهێنەرە بەرێت كەلەنوژداری پسپۆر محمدﷺوەرگیراوەو بۆی باس كردوین كەفەرمویەتی:

---

(١) لەساڵەكانی شەستەكاندا بو باوكی رەحمەتیم لەگەڵ چەند وەستاو كرێكارێك دا دیواری حەوشەیان دەكرد ، منیش منداڵ بوم بانگی كرد بوم منیش گوێم لێ نەبو، ئەویش تورە دەبیٚ‌و بەردێك هەڵ دەگرێت‌و دای دەوەشێنێتە من یەكسەر بەلوتم كەوت‌و خوێن فیچقەی كردو سەرم تاساو گێژ بوم‌و لەبابەرۆم داو بەلادا هاتم. ئەو جار رای كردە سەرم هەی دەستی بابت بشكیٚ، هەی دەستی بابت بشكیٚ.. پەشیمانی دادی نەدا. خێرا بردیانم بۆ لای دكتۆرو تەداویان كردم.(وەرگێر).

(٢)(كوردیش دەڵیٚ، گەورە ئاو دەرێژیٚ‌و گچكەش پیٚ ی لیٚ دەخشێنیٚ. یا دەڵیٚ: گیا لەسەر بنجی خۆی دەروێتەوە. وەر گێر).

(أ) { إذا غضب أحدكم فقال:أعوذ باللهِ، سكن غضبه } (١) وەلەفەرمودەیەکی تردا فەرمویەتی:

(ب) { وإذا غضب أحدكم وهو قائم فليجلس، فإن ذهب عنه الغضب وإلاَّ فليضطجع}(٢)شتێکی ئاشکراو بەڵگە نەویستە کەتوڕە بون‌و ڕق هەستان‌و هەڵچونی مرۆڤ لەشەیتانەوەیە، پێویستە مرۆڤ لەو کاتەدا پەنا بەخوای پەروەردگار بگرێت لەشەیتانی نەفرین لێکراو بۆ ئەوەی ڕقەکەی بنیشێتەوە. دیارە لەکاتی بەپێوە بوندا سودێکی زۆری هەیە بۆ دابەزینی پلەی توڕە بون‌و ڕق هەستان‌و نیشتنەوەی، بەتایبەتیش دەست نوێژ هەڵ گرتن پڕیەتی لەدەرمانی بەکەڵك بۆ سارد کردنەوەی گڕی توڕە بون‌و هەڵچون، چونکە توڕە بون ئاگرەولەشەیتانەوەیە ئاگریش بەئاو دەکوژێتەوە.

## سزا پەروەردەییە بەسوودەکان( العقوبات التربوية المفيدة ):

گەلێك سزای پەروەردەیی بەکەڵك‌و سود بەخش‌و سەرکەوتو هەن، کەپێویستە مامۆستا بەرامبەر بەسەرپێچی کەران بەکاریان بێنێت بۆ هێمن ڕاگرتنی ئادابەکانی وانە گوتنەوەو ڕێزو پلەو پایەی مامۆستا، کەبریتین لەو سزا پەروەردەیی یانەی کەهیچ زیان‌و خراپەکاریەکیان لێ ناکەوێتەوەو بەیارمەتی خوای گەورە سەرکەوتنیشیان مسۆگەرە، کەئەمانەی خوارەوەن:

➢ **ئامۆژگاری‌و ڕێنومایی کردن ( النصح والإرشاد ):**

بریتیە لەڕێگەیەکی بنچینەیی پەروەردەو فێرکردن‌و بەهیچ شێوەیەك ناتوانرێ دەست بەرداری ببیت. پەروەردیاری پێشەنگ‌و گەورەمان پێغەمبەرﷺئەم ڕێگە چارەسەریەی لەگەڵ منداڵان‌و لەگەڵ گەورانیشدا بەکار هێناوە بەم شێوەی خوارەوە:

---

(١) أ. صحيح: أنظر صحيح الجامع ١٧٠٨.

ب. واتە: ئەگەر هەر یەکێك لەئێوە توڕە بو بابڵێ ( أعوذ بالله) توڕەییەکەی دەنیشێتەوە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح: بروانە ( صحيح الجامع: ١٧٠٧).

ب. واتە: هەر یەکێك لەئێوەکەتوڕە بو بەپێوە بوبادابنیشێت ئەگەر توڕەییەکەی نەما ئەوە باشە دەنا با ڕابکشێ.(وەرگێڕ).

➢ (أ) لەگەڵ منداڵاندا: پێغەمبەرﷺ مێرد منداڵێکی بینی بەناشیرینی دەستی لەقاپە چێشتەکەی ڕۆ دەکردو دەی خوارد، ئەویش ڕەوشتی خواردنی فێر کردو پێ ی گوت: { یاغلام سمِّ اللّهَ، وکل بیمینیك وکلْ مما یلیك}(١)

باکەس نەڵێ، ئەم ئامۆژگاریانە بۆ منداڵان هیچ سودو کاریگەریەکی نیە، نەخێر، من خۆم چەند جار بەتاقیم کردۆتەوە باشترین کاریگەری هەبوە. هەروەکو لەمەو بەر لەبابەتی ئاگادار کردنەوەدا لەهەندێ کارو پیشەی خراپو لەچیرۆکی ئەو کوڕەی کەجنێوی بەئایین دابو، کاتێ ئامۆژگاریم کرد، ئامۆژگاریەکانی وەرگرتو پەشیمان بوەوە.

جارێکیان لەگەڵ مامۆستاکان بەشەقامێکدا دەڕۆیشتین وا ڕوی دا دیتمان لەناوەڕاستی شەقامەکەدا منداڵێك میزی دەکرد. مامۆستایەك بەسەریدا شیڕاندو گوتی: هاوار بۆ تۆ، هاوار بۆ تۆ، کوڕە هۆو میز لەوێ نەکەیت، منداڵەکە لەترسان میزەکەی پچڕاندو ڕای کرد. بەو مامۆستایەم گوت:

- لەکیست داین ئامۆژگاری ئەو منداڵەمان بکردایە.

- باشە ئەدی دەبێ وازی لێ بێنم لەبەر چاوی ئەو خەڵکە لەسەر شەقامەکە میز بکات؟

- نــا..

- ئەدی دەتەوێ لەمە پتر چی بکەیت؟

- وازت لەمنداڵە هێنا با هەتا لەمیز کردنەکەی دەبوەوە، ئەوجار بۆ منت بانگ بکردایە، خۆم پێ دەناساندو پێم دەگوت: کوڕم ئەم شەقامە بۆ بەسەردا ڕۆیشتنی خەڵکی دروست کراوە، نابێ میزی لەسەر بکەیت، چونکە پیس دەبێت.. ئەوەتە لەنزیك خۆتەوە ئاودەست و جێگەی پیسایی کردنو دەست بەئاو گەیاندن(دورة المیاه)ی لێ یە وریابە جارێکی تر

---

(١) أ. متفق علیه.

ب. واتە: ئەی کوڕ یای ئەی لاوە پێش ئەوەی دەست بەخواردن بکەیت ناوی خوای گەورە بێنەو بەدەستی ڕاستت بخۆو لەپێش خۆتەوە بخۆو دەست بەملاو بەولادا مەگێڕەو دەست بۆ لای بەرامبەرەکەت درێژ مەکەو مافی هاو خوانەکەت مەخۆ.(وەرگێڕ).

میـز لەسـەر شـەقام نەکـەیت، تـۆ کـوڕێکی جـوان‌و ئاقڵ‌وڕێـک‌و پێکـی، داوای ڕێنومـایی‌و سەرکەوتنت بۆ لەخوا دەخوازم. ئەمجار گوتی:

ـ ئەم ڕێگەیە بەڕاستی ڕێگەیەکی ژیرو یەکەڵکە.

ـ ئەم ڕێگەیەڕێگەی پەروەردیاری مرۆڤایەتی محمد کوڕی عبدالله یەﷺئـەمجار بەسـەر هاتی ئەعرابیەکەم بۆ گێڕایەوە کەلەخاڵی (ب) دا باسی دەکەین.

**(ب) ئامۆژگاری کردن‌و ڕێنومایی گەوران (النصح والإرشاد البالغين):**

بۆ ئامۆژگاری کـردن‌و ڕێنومـایی گـەوران باشـترین نمونـە، نەمونـەی ئـەو عەرەبـە دەشتەکیەکەیە (الأعرابی) کەلـەم فەرمودەیـەدا هـاتوە: عـن أنـسرضي الله عنهقـال: بینمـا نحـن في المـسجد مـع رسـول اللهﷺإذ جـاء أعرابـي فقـام يبـول في المـسجد. أصـحاب رسـول الله: (يـصحون بـه) مـه مـه٠أي اتـرك). الرسـول: لاتزرمـوه (لاتقطعـوا بولـه). ( يـترك الـصحابة الأعرابي يقضي بوله ثم يدعو الرسول الأعرابی ). الرسول( للأعرابي): (إن المساجد لاتصلح لشيء من هذا البول والقذر إنَّماهي لذكر الله، والصلاة، وقراءة القُرآن). الرسـول (لأصـحابه): (إنما بثعتُم ميسرين، ولم تبعثوا معسرين، صبوا عليه دلو من الماء).

الأعرابی: اللهُمَّ أرحمني ومحمدا، ولا ترحم معنا أحداً. الرسولﷺ (لقـد تحجـرت واسـعاً ) ( أي ضيقت واسعاً).(١)

---

(١) أ.متفق عليه.

ب.واتە: لە(أنـس) ەوەرضي الله عنهدەگێڕنـەوە کەگوتویـەتی: لـەکاتێك دا ئێمـە لەگـەڵ پێغەمبـەرداﷺ لەمزگەوتـدا بـوین عـەرەبێکی دەشـتەکی هـات‌و هـەر لـەناو مزگەوتەکـەدا دەسـتی کـرد بـەمیز کـردن. سـەحابەکان بەسـەریاندا شـیڕاندو گوتیـان: هـۆی، کـوڕە نەکـەی لـەوێ میـز نەکـەیت. بـەڵام پێغەمبەرﷺفەموی: لێ ی گەڕێن بامیزەکەی تەواو بکات.

کـاتێ کـابرا لەمیزەکـەی بـۆوەو تـەواوی کردپێغەمبـەرﷺبـانگی کـردە لای خـۆی‌و پـیێ ی فـەرمو: ( مزگەوتەکان بۆ میز تێدا کردن‌و پیسایی تێدا کردن و تێدا فڕێ دان نابن‌و دروست نیە، مزگەوت جێگەو شوێنی ویردی خواو نوێژ کردن‌و قورئان تێدا خوێندنن).

➢ **خۆ لێ تورە کردن وخۆ لێ مۆر کرنەوە (التعبیس):**

مامۆستایان بۆیان هەیە خۆ لەڕوی قوتابیاندا سوربکەنەوەولەکاتی دروست کردنی قیژە قیژو قاوەقاودا خۆیان لێ تورە بکەن بۆ پاراستنی سیستەمو هێمنایەتی دەرس. باەلسەرتادا ئامۆژگاریان بکات ئەگەر دابی نەدا باخۆیان لێ مۆر بکاتەوەو هەڕەشەیان لێ بکات.

❖ **تەریق کرنەوەو سەرکۆنە کردن (الزجـــر):**

زۆر جـاری وا هەیە مامۆسـتاو پـەروەردیاران یـەکێ لـەقوتابیان لـەکاتی بێعاریوهارەبەتانیو قاوەقاو زۆر پرسیار کردنی بێ جێو بێ تامو ئاژاوە نانەوە دا بۆ مەبەستی دواخستنی وانەکە تەریق دەکاتەوە. زۆر جار هەبوە ئەگەر مامۆستا بەسەر قوتابیدا شیڕاندو یەتیو تەریقی کردۆتەوەبەخۆی دا شکاوەتەوە و بێ دەنگ دانیشتوە.

ئـەم ڕێگەیـە پێغەمبـەر ﷺ بـەکاری هێنـاوە کـاتێ کـەبینی پیاوێـك وا حوشـترێك لێ دەخورێتو پێش خۆی داوە:پێغەمبەر ﷺ: سوار بە (إركبها).

پیاوەکە: ئەوە حوشترە(إنها بدنة) .

پێغەمبەرﷺ: سواری بە(إركبها). ((رواه البخاری))

پیاوەکە سواری حوشترەکەی بوو لەچەپی پێغەمبەرەوە دەڕۆیشت.

---

ئەوجار بە سەحابەکانیشی فەرمو:ئێوە بۆیە نێردراون کەکار ئاسانی بۆ خەڵکی بکەن، نەك کارگرانیو بار لێ قورس کردنو سەر لێشێواندنی خەڵکی ، بڕۆن دەولکەیەك ئاو بێننوبەسەر شوێن میزەکەی دابکەنو پاکی بکەنەوە.

ئەوجار کابرای دەشتەکی گوتی: خوایە ڕەحم بەمنو بەمحمد بکەیتو لەئێمە بەولاوە ڕەحم بەکەسی تر نەکەیت.

پێغەمبـەرﷺفـەرموی:بەڕاسـتی یـەکجار زۆرت تەنگەبـەرکردەوە و واشـی لێ مەکـە وا بەیـەکجاری تەنگەبەری بکەیتەوە.بەڵکو بڵێ خوایە ڕەحم بەئێمەو بەبڕواداراانیش بکەیت.(وەرگێڕ).

❖ بێ دەنگ کردن( الكف عن العمل ):

کاتێ قوتابیان لەپۆل دا ژاوە ژاوو دەنگە دەنگ دەکەن‌و بێعاری دەکەن بەدەنگێکی بەرز پێ یان بڵێ: بێ دەنگ بن! پێغەمبەری خوا ﷺ بەو کەسەی گوت کەلەلای بەرێزیان قرقێنەی دەهاتنێ فەرموی: ( كُفَّ عنا جشاءك)(١)

❖ لەڕودان (الأعراض):

پەروەردیار ئەگەر منداڵەکەی یاخود قوتابیەکەی درۆی کرد، یا پرسیاری نابەجێ ی زۆری دەکرد، یاهەر کارێکی تری نابەجێ ی دەکرد دەتوانێ لەڕوی بداتو لەدەمی بداتەوە، بەڵکوئەو منداڵە یا ئەو قوتابیە لو سەرزەنشتو لەڕو دانەوەیەی باوکی یامامۆستایەکەی هەست بەخۆی بکاتو لەهەڵەکەی خۆی واز بهێنێت ئاقڵ ببێت.

❖ دەنگ لێ وەرگرتن‌ونەدواندن (الهــجـر):

لەسەر پەروەردیار پێویستە خۆ لەقوتابیەکەی زیور بکاتو دەنگی لێ وەر بگرێت ئەگەر بێعاری‌و لاساری کرد، وەك ئەوەی واز لەنوێژ کردن بێنێ، یابچێ بۆ سینەماو ڤیدیۆخانەو شوێنە خراپەکان، یالە کاتی دەرسدا بێعاری و ئاژاوە بنێتەوەو دەرسەکە بشێوێنێ .. ماوەی دەنگ لێ وەر گرتنیش زۆر ترینی سێ ڕۆژە. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ لايحل لمسلم أن يهجر أخاهُ فوق ثلاث}(٢) . خۆ لێ زیور

---

(١) أ. حسن: بڕوانە ((صحیح الجامع٤٣٦٧)).

ب. واتە: بەسە چیدیمان قرقێنە بەسەردا مەکە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحیح، بڕوانە (الجامع ).

ب. واتە: دروست نیە بۆ موسڵمان کەلەسێ ڕۆژ پتر دەنگ لەبرای موسڵمانی خۆی وەربگرێت.(وەرگێڕ).

کردن جۆرە پەندو ئامۆژگاریی‌و عیبرەتێکی بۆ منداڵ تێدایەو دەبێتە هۆی تەریق بونەوەو ئاقڵ بونی هەروەك شاعیر دەڵێ:

یا قلب صبراً علی هجرٍ لأحبة لا    تجزع لذاك فبعض الهجر تأديبٌ (١)

❖ سەر کۆنە کردن (التوبيخ):

پەروەردیار بۆی هەیە هەر کاتێك منداڵەکەی یاقوتابیەکەی هەڵەیەکی کردو ئامۆژگاری و ڕێنومایی کردن چارەسەری نەکرد، سەرکۆنەی بکات بۆ ئەوەی لەو هەڵەیەی خۆی دابەزێت.

❖ **سزادان بەباوکی (معاقبة الأب):**

ئەگەر مامۆستا دەروەستی قوتابی نەهات‌و بەردەوام بێعاری دەکرد یاتەمبەڵ بو دەتوانێ بەدوای بەخێوکەرەکەی دا بنێرێت حاڵی قوتابیەکەیانی تێ بگەیەنێت‌و داوای هاریکاری وئامۆژگاری کردن‌و ئەمجار سزادان‌و چاك کردنی منداڵەکەیانی لێ بکات . بەم کارەش هاریکاری لەنێوان قوتابخانەو ماڵەوەدا دروست دەبێت .

❖ **هەڵتروشکاندن (جلوس القرفصاء):**

ئەگەر قوتابی بیعاری کرد، یا تەمبەڵ‌و پیس‌و پۆخڵ بو، مامۆستا دەتوانێ لەجێگاکەی خۆی دەری بێنێ‌و لەبەر دەم قوتابیەکانی دا بەشێوەی هەڵتروشکاندن‌و دەستەکانی بۆ سەرەوە یا بەپێوە لەسەر یەك قاچ‌و دەستەکانی بۆ سەرە وە (القرفصاء) بیوەستێنێ یا دای بنیشێنێ، قوتابیەکە بەمە ماندو دەبێت‌و سزایەکی دەرونی دەخوات، و پەندی لێ وەر دەگرێت‌و پەشیمان دەبێتەوە. ئەمە گەلێك لەلێدان بەدارو بۆکس و شەقازلە بەسود ترە.

---

(١) واتە: ئەی دڵ ئارام بە لەسەر زیور بونی خۆشەویستان‌و دڵ ناڕەحەت مەبە لەو زیور بون‌و دور کەوتنەوەیە، چونکە هەندێ زیور بون‌و دورکەوتنەوە جۆرە پەندو ئامۆژگاریەکی خێرو بەخۆدا چونەوەیەکی خۆ ڕاست کردنەوەی تێدایە بۆ مرۆڤەکان.(وەرگێڕ).

❖ هەڵواسینی دار یاقامچی (تعلیق العصا):

بۆ مامۆستاو پەروەردیاران‌و باوکان دروستە کەقەمچیەك یان دارێك کەپێ ی لێ دەدرێت بەدیوارەوە هەڵ بهاوەسن بۆ ئەوەی قوتابیان یان منداڵان ببینن‌و بترسن کەلێ یان بدەن. یامامۆستا کەدێتە دەر یا دەچێتە پۆلەوە داری بەدەستەوە بێت. چونکە پێغەمبەرﷺفەمویەتی: {علّقوا السوط حيث يراهُ أهل البيت فإنَّهُ أدبٌ لهم} (١)

إبن الأنباری دەڵێ: پێغەمبەرﷺلێرەدا مەبەستی لێدان نەبوە، چونکە هەرگیز فەرمانی وای بەکەس نەداوە، هەر کەسێکی بینیبێ کەلەمنداڵەکەی یا لەقوتابیەکەی دەدات قەدەغەی کردوەو نەی هێشتوە لێ ی بدات هەتاکو لەگەڵ گیاندارانیش، بەڵکو مەبەستی لەم هەڵواسینی قامچی یان دار ئاقڵ کردن‌و ترسان‌و بەڕەوشت بون‌و بێ دەنگ بون‌و ژاوە ژاو دروست نەکردن بوە. کەدەفەرموێ:{فإنَّهُ أدبٌ لهم} واتە: لەئەنجامی هەڵواسینی قەمچیەکەو بینینیان لەلێدان بترسن‌و ببێتە هۆیەك بۆ گەڕانەوەو ئاقڵ بون، خۆ جوان کردن‌و بەئەخلاق‌و ئاکاری جوان‌و سیفەتی باش..لە(المناوی فی فیض القدیر ج٤/٣٢٢)ی وەرگیراوە.

❖ لێدانێکی سوك( الضرب الخفيف ):

ئەگەر ئەم کارانەی ڕابردو سودی نەبو، پەروەردیاران‌و باوکان بۆیان هەیە کەبەلێدانێکی سوك لەقوتابی یالەمنداڵەکانیان بدەن نەك بەلێدانێکی قورس کەزیان بەلەشیان بگەیەنێت بەتایبەتی لەسەر نوێژ نەکردن کاتێ تەمەنیان گەیشتە دەساڵان، بە گوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ: {علِّموا أولادكم الصلاة إذا بلغوا سبعاً وأضربوهُم عليهاإذا بلغوا عشراًوفرقوا بينهُم في المضاجع } (٢)

---

(١) أ. حسنه الألباني في صحيح الجامع.

ب. واتە: لەماڵەوە قەمچیەك یا دارێك هەڵ بهاوەسن بۆ ئەوەی منداڵەکان ببینن‌و لێ ی بترسن‌و بیعاری‌و هارە بەتانی نەکەن، چونکە ئەمە هۆیەکە بۆ ئاقڵ کردن‌و بێ دەنگ بونیان.(وەرگێڕ).

(٢) أ. صحيح رواهُ البزار وغيرهُ.

ب. واتە: منداڵەکانتان فێری نوێژ بکەن کەگەیشتنە حەوت ساڵان.وەلەدەساڵی دا ئەگەر نوێژیان نەکرد لێ یان بدەن‌و جێگەشیان لەگەڵ خۆتان‌و لەگەڵ خوشکەکانیان لێك جیا بکەنەوە واتە کوڕو کچان لەیەك جیا بکەنەوە دروست نیە بەیەکەوە لەژورێك دا بەیەکەوە بخەون.(وەرگێڕ).

جیاکردنـەوە لـەنێوان کـوڕان‌و کـچاندا کـارێکی زۆر گرنگـە، بـۆ ئـەوەی باوك‌ودایکـان بتوانن منداڵەکانیان لەلادان‌و پیێ هەڵ خلیسکان ڕزگار بکەن‌و بیان پـارێزن لەکـەل کەڵـەی شەیتان بەتایبەتیش کاتێك منداڵان ئەو هەمو فیلم‌و زنجیرەسێکسی‌و ڕوتە بـیێ ئەخلاقیانـە لەسـینەماو کەناڵـە تەلـەفویۆنی و ڤیـدیۆیی یەکانـەوە دەبیـنن، کـەهۆکارو پاڵنـەرێکی کاریگەرە بۆ گەنج و هەرزەکارە تازە هەڵچوەکان وەك بـەنزین بەسـەر ئـاگردا بکـەیت! !. بۆیە پێویستە باوکان‌و دایکان لا لەم بابەتە گرنگە بکەونـەوە و وریـا ببنـەوە. ئەگـەر هـەر چاریان نەکرا با پەردەیەك لەنێوانیاندا دروست بکەن‌و لەیەکیان جیا بکەنەوەو چـاودێریان بکەن([1]) هەرنەبیێ لێکیان دور بخەنەوەو هەر کـەس لەسـەر پێخـەفـو جێگـەی خـۆی جیـا بێت‌و چاودێری و ئاگاداریان بکەن.

## ئەو هەڵانەی کە دەبیێ ڕاست بکرێنەوە( أخگاو یجب تصحیحها ):

گەلێك هەڵەی ناشیرین‌و کاری ناشەرعی لەنێوان خەڵکی دا بڵاو بونەوە بەتایبەتیش لەنێوان مامۆستایان بەگشتی‌و فەرمانبەران‌و کرێکاران‌و باقی چین‌و توێژەکانی تری کۆمەڵگادا کەبەکارو باری گشتی‌و بەرژەوەندیەکانی گەل هەڵ دەستن. بۆیە پێویستەئەم هەڵە وبیرو بۆچونانە ڕاست بکرێنەوە.بارو ڕەوشت‌وئاکارو هەڵس‌و کەوتیان ڕاست بکرێنەوە. چونکە ئەوانە بەتایبەت لیێ پرسراون لەبەر دەم خوای گەورەدا هەروەکو خوای باڵا دەست‌و کاربەجیێ دەفەرمویێ :﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا

---

(١) نمونـە لـەم بـارەو لـەم بابەتـەوە زۆرن کەهـەرزەکاران دوای ئـەوەی لەکەناڵـە تەلەفزیۆنیـەکان‌و لەسینەماکان ئەم جۆرە فیلمە بیێ ئەخلاقیانـەیان بینیـوە هێـزی ئارەزوەکانیـان هەڵچوەو هێرشـی بـۆ هێناون کاتیێ گەڕاوەتەوە ماڵەوە دەست درێژی کردۆتە سەر خوشکی خۆی یادایکی خـۆی، یـەکیێ لـەو نمونانـە مامۆسـتا إبـراهیم النعمـة پێـشەواو پـێش نوێـژی مزگـەوتیێ( ) لەموصـڵ دەی هێنێتـەوە کەهەرزەکارێك دوای ئەوەی لەسینەما گەڕاوەتەوە دەست درێژی کردۆتە سـەر خوشـکێکی بـچکۆلەی‌و لەئەنجامی خوێن بەربونی(النزیف) خوشکەکەی مردوە, لەکوردسـتانی خۆشمانـدا لـەم جۆرەمـان زۆرن هەروەکو دەماو دەم دەیان گێڕنەوە.(وەرگێڕ).

يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ (١) هەروەها پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: {إنّ اللهَ سائلٌ راعٍ عما إسترعاهُ: أحَفِظَ ذلك أم ضيَّعَهُ؟} (٢)

---

(١) أ.سورة الحجر : (٩٢،٩٣)

ب. واتە: سوێند بەپەروەردگاری تۆ ئەی محمد هەمویان واتەمرۆڤەکان هەر قسەو گفتارو کارو کردەوەیەك بکەن لەڕۆژی دوایی دا لێ یان دەپرسرێتەوە. چاکەکەیان پاداشتی چاکە وەردەگرێتەوە، خراپەش سزای خراپەی خۆی وەردەگرێتەوە.

(٢) أ. حسن رواهُ النسائي .

ب. واتە خوای گەورە لەهەمو شوانێك، سەرپەرشتیارێك، لەهەمو سەرکردەو بەرپرسیارێك دەپێچێتەوە لەوەی کەلەژێر دەستو چاو دێری یان دایە، ئایا وەك پێویست پاراستویانو هەقی خۆیانیان داونەتێ یا بەپێچەوانەوە؟

## هەڵەکانی هەندێ لە مامۆستایان و فەرمانبەران

بزانە ئەی برای موسڵمان - خوا ڕێنومایی ئێمەش و ئێوەش بکات - کەزۆرێك لەمامۆستایان و فەرمانبەران هەن کەمتەر خەمو هەڵەیان زۆرەو پێویستی یان بە دەستگیرۆیی ونامۆژگاری و ڕێنومایی و گێڕانەوە هەیە کەلەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گرد دەبنەوە:

١) لەدەوامو لەکاتی دیاری کراودا دوا مەکەون. ئەمە زیان بەخەڵکی دەگەیەنێت و دەبێتە هۆی دوا خستنی کارەکانیان. ئەو مامۆستاو فەرمانبەرانەی کەلەدەوام دوا دەکەون و لەکارەکانی خۆیاندا ئەو موچەیەی کەوەری دەگرن بەقەدەر ئەوەندەی کەمتەر خەمی لێ دەکەن لێ یان حەرامە. جێگەی داخە کەلەفەرمانگاکاندا کەسێك نیە چاودێری فەرمانبەران و مامۆستایان بکات. بۆ ئەوەی ئەوانەی لەدەوام دوا دەکەون یا لەکارەکانیاندا کەمتەرخەمی دەکەن سزا بدرێن. زۆرێك هەن لەکاتی ئیش کردن و قەڵەبالغی دا دەڕۆنە دەرو دوای بەرژەوەندی یەکانی خۆیان دەکەون یان لەبازارەکاندا بێ هودەو بێ ئیش دەسوڕێنەوەو ئەو هەمو خەڵکەش وا لەپاش دەرگای ژورەکەی دا چاوەڕێ ی دەکەن. لەخوا ناترسن و کارەکانیان بۆ ڕاناپەڕێنن و چەندان ڕۆژ هەر بەفشە هات و چۆیان پێ دەکات. هەیانە لەڕێگەی دورو لەشوێنە دورەکانەوە دێن و خەرجیەکی زۆریش خەرج دەکەن و کارەکانیشیان بۆ جێ بەجێ ناکرێت. ئەگەر بێت و لێ پرسینەوەو چاودێری هەبێت ئەم کەمتەر خەمیانە ڕو نادەن. سەیر لەوە دایە زۆرێك لەسەرۆك فەرمانگەو بەرپرسیاران خۆیان بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵناستن، ئەی گلەیی چی لەفەرمانبەرانی ژێرەوە دەکەیت و چۆن بەئەرکی سەرشانیان هەڵ دەستن.

٢) کاتەکانی خۆت بەخوێندنەوەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان و پێشوازی کردن و دانیشتن لەگەڵیانداو هەر کارێکی تر کەدەبێتە هۆی دواخستنی کارەکانت بەفیڕۆ مەدە، چونکە ئەوانە دەبنە هۆی دواخستنی کارەکانت و کاری ئەوانەی کاریان لای تۆیە لەهاولاتیان

بەتایبەتیش لەکاتێك دا کەخەڵکێکی زۆر ئیشی یان بەتۆ بێتو چاوەڕوانت دەکەن. یاخود قوتابیان لەپۆل دا چاوەڕوانی تۆ بکەن کەوانەیا پێ بڵێیت. زۆر جاری واهەیە فەرمانبەر میوان لەدوای میوانی هاتوەو بردویەتیە ژورو ماوەیەکی زۆر بەچەند قۆڵی یابەدو قۆڵی قسەو باسی درێژ درێژیان کردوەو خەڵکانێکی زۆریش لەپاش دەرگا چاوەڕوانی جەنابین ئیشەکانیان بۆ جێ بەجێ بکات. هی وا هەیە تەنیا ئیمزایەکی دەوێ. وای لێ هاتوە لەگەڵ دۆستو خزمەکانیاندا کاتی دەوامی تەواو بوەو خەڵکەکەی بۆ بەیانی ئیزن داونەوە و ڕۆیشتون.

ئەمە لەزۆرێك لەفەرمانگاکان ڕوی داوە، کاتێك بابای بەرپرس میوانی هاتوە بەکابرای بەردەستی گوتوە دەرگاکە دابخەو بڵێ: کاك فلان کەس جارێ میوانی هەیەو کەس مەکە ژورێ. تا خەڵکێکی زۆر لەو ماوەیەدا کۆ دەبنەوەو لەسەر پێ یان وەستاونو ئێشو ئازاری دەرونیان لەسەر یەك کەڵەکە بوەو هێندەی چاوەڕوان بونو پیشیان خواردۆتەوە. زۆر جار لەئەنجامی ئەم کارە نابەجێ یە ناچاری بەرتیل دانودیاری بۆ بردن بون بە کابرای بەردەست هەر ئەوەندە بیان کاتە ژور یاخود وەرەقەکانیان لێ وەر بگرێتو بۆ جەنابی فەرمانبەری بەڕێوەبەر یابەرپرسیان بەرێت و ئەویش تەنیا بەهەوای نەفسێکەوە ئیمزاکەیان بۆ بکات، یان زۆر جاریش بەرتیل بۆ کاکی فەرمانبەرو بەردەست بەیەکەوە هاوبەش دەبن. بێ ئەوەی گوێ بدەنە ماندو بونو کوێرەوەری ئەو خەڵکە(مراجعین) انە کەئاپۆرەی خەڵکەکەش دەبینی خۆ بەزوردا دەکەن لەناچاریان، ئەویش بەسەریاندا دەشیرێنێتو دەڵێ: بەسەرە وەرنە ژور، کەچی بۆ خۆی لەولاوە کاتەکەی بەقسە کردن لەگەڵ دۆستەکانی دا دەباتە سەرو بەفیڕۆی دەدات و کەسیش بەسەر ئەودا ناشیرێنێ، لەسەر سەریشی نوسیوە(سەردانی تایبەتی قەدەغەیە ـ الزيارات الخصوصية ممنوعة) . ئەم کارە نابەجێو پڕ خەماویانە هەندێ لەبەرپرسان لێ ی بەرپرسن کەنەرمی لەگەڵ ئەوانی ژێر دەستی خۆیانو بەردەستەکانیاندا دەی نوێنن.

.١

یاخود خۆیان ئەنجامی دەدەن. ئەوەتە عثمان ﷺ فەمویەتی :( إنَّ اللهَ ليزع بالسلطان مالايزُع بالقرآن)([1]).

٣) خوای گەورە چاودێری کردەوەکانی تۆ دەکاتو ئاگای لێتە چ بلّێ یو چی بکەیت دادوەر (الحاكم) بیت، مامۆستا بیت یافەرمانبەر بیت، یان هەر شتێکی تر بیت.ئاگات لەبرا هاولآتیەکانت(المراجعين) بێتو سۆزو برایەتیت هەبێت بۆیان، بەشێوەیەکی باشو دروست هەڵسو کەوتیان لەگەڵدا بکە، هەروەك چۆن خۆت پێت خۆشە هەڵسو کەوتت لەگەڵ دا بکەن، چیت بۆ خۆت پێ خۆشە ئەوەشت بۆ ئەوان پێ خۆش بێت، کارەکانیان بۆ جێ بەجێ بکەو ئاسانکاریان بۆ بکەو کاریان لێ قورس مەکەو ئامۆژگاریان بکەو خەڵکی لە هەڵە بیان گێڕەوە. بڕوانە فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کەفەرمویەتی: {الدِّين نصيحةٌ، قلنا لمن يارسول الله؟ قال: للهِ ولكتابهِ، ولرسولهِ، ولأئمة المسلمين وعامتهم}([2]) ئامۆژگاری کردنو گێڕانەوەی موسڵمانان تەنیا ئەرکی سەرشانی زانایانو وتار بێژان نیە کەلەمزگەوتدا خەڵکی ئامۆژگاری دەکەن ، بەڵکو ئەرکی سەرشانی هەمو موسڵمانێکە لەئاست خۆیەوە بەتایبەتیش مامۆستایانی سەرەتاییو ناوەندیو دواناوەندیەکانو ...تد. ئاخر چەندان فەرمانبەر هەن ڕێنومایی مراجعەکانیان ناکەنو ڕێگەی ڕاستیان نیشان نادەن پێ یان ناڵێن کارەکەیان چی دەویو چی ناوێ، بەسەری زمان وەلآمیان دەدەنەوەو هەر وێڵیان دەکەن. چەندان جار بەنەشارەزایی ئەم شارو ئەو شارو ئەو

---

(١) واتە: هەندێ کاروشت هەن بەقورئان لاناچن، خوای گەورە بەهێزو دەسەلآت لایان دەبات. بۆیە ئەگەر بەر پرسان لێ پێچانەوەو هەست بەبەرپرسیارێتیان هەبێت فەرمانبەران ناتوانن وا بکەن.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواهُ مسلم.

ب. واتە: ئاین ئامۆژگاریو گوێ ڕایەڵیە. گوتمان بۆ کێ ئەی ڕەسولی خوا؟ گوتی: بۆ خوای گەورە بۆ قورئانی پیرۆز و بۆ پێغەمبەرو بۆ زاناو پێشەواو بەرپرسانی موسڵمانانو بۆ هەمو خەڵکی موسڵمانان بەگشتی.(وەرگێڕ).

فەرمانگەو ئەو فەرمانگەیان پێ دەکەن‌و خەرجیەکی زۆریشیان پێ خەرج کردون. ئەمە لەئەنجامی ڕێنومایی نەکردنی کاکی فەرمانبەر! ! ڕاستیەکانیان پێ نەگوتون کەچی پێویستە بیکات، زۆر جار فەرمانبەری وا هەیە لەناو خودی فەرمانگەکەدا پێ ی ناڵێ : کاکە بیبە بۆ فڵانە شوێن یا بۆ فڵان کەس‌و فڵان بەشی فەرمانگەکە. ناچار کابرای مراجع ماوەیەکی باش خولی خواردوەو لەم‌و لەوی پرسیوە تادۆزیویەتیەوە بەتایبەتی ئەوانەی نەخوێندەوارن .

٤) خۆت بەزل مەزانەو خۆت بەسەر مراجعەکان دا بامەدەو لەخۆت بایی نەبیت‌و خۆت لەوان بەزلتر مەزانە، چونکە هەر چەندە گەورە بی تۆ لای خوای پەروەردگاری جیهانیان بچوك‌و بێ دەسەلاتیت. تۆش هەر یەکێکیت لەو خەڵکەو ئەندامێکی لەوان واتە ئەندامێکی ئەم گەلەی‌و ئەوانیش برای تۆن و هیچت لەوان پتر نیە. تەنیا شارەزایی‌و زانیاریت نەبێت لەو بوارەدا، موچەش لەبەرامبەر ئەو کارەدا وەردەگریت‌و بەبەلاش ئیش ناکەیت‌و بۆ خزمەتی ئەو خەڵکە بەکرێ گیراوی‌و بەخێری خۆت کاریان بۆ ناکەیت. بۆ ڕاپەڕاندنی بەرژەوەندیەکانی هاوڵاتیان لەسەر ئەو کورسی‌و جێگەیە دانراوی وریابە خۆت لێ نەگۆڕێت‌و سەرت لێ نەشێوێت. دەی ئامۆژگاریەکەی لقمان بێنەوە بەر چاوی خۆت کەخوای گەورە لەسەر زمانی لقمانەوە بۆمانی دەگێڕێتەوەو دەفەرموێ:﴿ وَلَا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلَا تَمْشِ فِي ٱلْأَرْضِ مَرَحًا إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ ﴿١٨﴾﴾ (١)

---

(١) أ.(سورة لقمان: ١٨)

ب. واتە: هەرگیز ڕوت لەخەڵکی وەر مەگێڕەو خۆت لەخەڵکی بەزلتر مەزانەو لێو لەخەڵکی هەڵ مەقرچێنەو یالێویان لێ بامەدەو تێزو لێو ولچکیان لێ مەگرە، و بەفیزو ڕوح زلیەوە بەسەر زەوی دا مەڕۆ و لەخۆت بایی نەبێت چونکە خوای گەورە ڕوح زل لەخۆبایی بو وئەو کەسانەی خۆش ناوێن کەشانازی بێ شەرعیانە بەخۆیانەوە دەکەن.(وەرگێڕ)

## ئەرکی کرێکارو خاوەنکار (واجب العامل وصاحب العمل):

١) بەدڵسۆزی ئیش بکەو بێ کار کاتی خۆت بەفیڕۆ مەدە، هەر کاتێك ئیشت بۆ هەر کەسێك کرد، بۆ ئەوەی کرێ یەکی حەڵاڵ وەر بگریت بەدڵسۆزی و بەپاکی بێ کەمتەر خەمی و بێ خیانەت ئیشی بۆ بکە.

٢) ئامۆژگاری خاوەنکار بکە، و فێڵی لێ مەکە باناموسڵمانیش بێت بەپێ ی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کارەکەی بۆ بکەکەدەفەرموێ: { من غشنا فليس منا }([1]).

٣) پێویستە لەسەرت لەئیشەکاندا کارامەو شارەزاو لێزان بیت چونکە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: { إنَّ اللهَ يحب إذا عمل أحدكم عملاً أن يتقنَهُ }([2])

٤) زۆر سور بەلە جێ بەجێ کردنو بەجێ گەیاندنی پەیمانو وەعدو وەفاییت هەبێت و پێچەوانەی وەعدەکانت مەبە، بۆئەوەی متمانەی خەڵکی بۆ خۆت وەدەست بێنیتو بروایان پێت هەبێت، بۆ ئەوەی نەکەویتە ناو گوناحی گەورەوە. پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {آيةُ المنافقِ ثلاثٌ: إذا حدَّثَ كذب، وإذا وعد أخلف، وإذا أؤتمن خان}([3])

---

(١) أ. صحيح رواه الترمذي .

ب. واتە: هەر کەسێك فێڵمان لێ بکات لەئێمە نیە واتە موسڵمان نیە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. حسن رواهُ البيهقي.

ب. واتە: خوای گەورە ئەو کەسەی خۆش دەوێت کەئەگەر کارێك بکات ئەوا لێ ی دەخەفتێو بەشارەزای و بەلێزانانە ئەو کارە دەکات نەك بەنەزانی و بەهەرەمەکی ملی پێوەنێت و ئیشەکەش لەخاوەن کارەکە تێك بداتو زیانی پێ بگەیەنێت.(وەگێڕ).

(٣) أ.متفق عليه.

ب.واتە: نیشانەکانی دوڕویی سێ شتن: ئەگەر قسە دەکات درۆیانی تێدا دەکات، وەئەگەر وەعدو پەیمانێکی دا پێچەوانەی پەیمانەکە دەجوڵێتەوەو موخالەفە دەکات، وەئەگەر ئەمانەتو سپاردەیەکی پێ سپێردرا خیانەتی تێدا دەکات .(وەرگێڕ).

٥) پێویستە لەسەر خاوەنکار کەکرێ ی تەواو بەقەدەر ئەو کارەی بۆ کردوە بداتە کرێکار. بەتایبەتی ئەگەر ڕێك کەوتنێك لە نێوانیاندا هەبو، وەنابێ کرێ یەکەی دوا بخات لەگەڵ لەکارەکەی بوەوە باخێرا کرێ یەکەی بداتێ و نەهێڵێ ئارەقی نێو چاوانی وشك ببێتەوە. ئەوەتە پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: { مَطلُ الغنی ظُلمٌ }(١)

## لاسایی کردنەوەی کوێرانە زیانبەخشە( التقلید الأعمی ضارٌ):

لەو هەمو خەوش‌و هەلانەی کەلەناو موسڵماناندا بلاَوو تەشەنەی کردوە، دەبێ چارە سەری لێبڕاوانەو بەپەلەی بۆ بکرێت، یەکێ لەو هەڵە گرچو بڕانە بریتیە لەلاسایی کردنەوەی کوێرانە. لەهەندێ لە موسڵمانان خوا چاکی بکات‌و ڕێنمواییمان بکات هەن هەروەك توتی ئاسا لاسایی کوێرانەی ڕۆژهەلات‌و ڕۆژئاوا دەکەنەوە. هەر کارو کردەوەو گۆتەیەك کەلەوێ دەکرێت یادەگوترێت بێ ئەوەی لەواتاکەی بگەن‌و لەبێژنگو لە تەتڵەی بدەن. بەداخەوە لێرە دەست بەجێ کاوێژ دەکرێتەوەو دوبارە دەکرێتەوەو کوێرانە لاسایی دەکەنەوە بەناوی شارستانیەت‌و پێش کەوتنەوەوە، بەرلەوەی لەوێ بکەوێتە مەیدانی کار پێ کردنەوە، لێرە لێ ی بونەتەوە، ئەمەش کارێکی زۆر خراپ‌و ترسناك‌و پڕ مەترسیە.

١) زۆر وریاو ورد بین بە ئەی برای موسڵمان، هەر شتێك تابەتەواوی نەچیە بنج‌و بناوانی لاسایی کوێرانەی مەکەوە، بەتەرازوی ئیسلام و بەرنامەکەی خوا بیکێشە ئەگەر لەگەڵ بەرنامەی خوا هاتەوە ئەوا جێ بەجێ ی بکەو کاری پێ بکە، چونکە لەوانەیە لەئیسلامدا جێگەی نەبێتەوە: یەکێ لەو کارانە ئەڵقەی بوك‌و زاوایەتی( ژن‌و مێردایەتی ..) کەئاهەنگی ناشەرعی بۆ دەگێڕن‌و کچە(بوکە خان) لەپێش چاوی ئەو هەمو ئاپۆرەی خەڵکە تێکەڵە

---

(١) أ. متفق علیه.

ب. واتە: هەر کەسێك پارەی هەبوو قەرزەکانی نەدانەوە ئەوە ستەمکارە.(وەرگێڕ)

لەپیاوو لەژن، لەکوڕو لەکچ ئەڵقە لەپەنجەی کوڕە(کاکی زاوا) دەکات گوایە بەمە دەزگیران یامێردەکە لە تێکەڵی لەگەڵ ژنان‌و کاری خراپە دەگێڕێتەوەو کورت بەستویەتیەوە، نازانێ کە مێردەکەی خوانەخواستە خراپ‌و شەڕواڵ پیس بێت هەر کەلەو دور کەوتەوە ئەڵقەکەی لەپەنجە دەر دێنێ‌و بەکەیفی خۆی دەتوانێ کەین‌وبەینان بکات‌و بێ ئەوەی ژنەکەی ئاگاشی لێ بێت. ئەم نەریتە هی موسڵمانان نیە و لەفەلەکان (النصاری) وەرگیراوە بەتایبەتیش کەئەڵقەکە یان ئەنگوستیلەکە لەزێڕ دروست کرابێت، ئەوە لەم حاڵەتەدا هەر حەرامەودروست نیە لەپەنجە بکرێت.. پێغەمبەرﷺقەدەغەی کردوە کەچاو لەکارو کردەوەو گفتارەکانی کافران بکەین‌و خۆ بەوان بچوێنین هەروەکو فەرمویەتی: { مَنْ تشبهَ بقومٍ فهوَ منهُم}([1])

٢) لاسایی کردنەوەی شتە بێزراوو بۆگەنەکان کەسەرشۆڕی‌و مل کەچی‌و نەهامەتی بۆ موسڵمانان دێنێت، بەهۆی کار کردن‌و حوکم کردن بەیاساو دەستوری ڕۆژئاوایی دژو پێچەوانەی یاساو دەستورەکانی ئیسلام‌و واز هێنان لەشەریعەتی خوای بەرزو باڵا دەست کەموسڵمانان لەسەر دەمی چەرخی پێغەمبەرایەتی‌و سەحابەکان‌وشوێن کەوتوانی پێ سەر بەرزو سەرفرازو بەختەوەرو بەعیززەت بون.

٣) وریابە زێڕ لەدەست‌و لەپەنجە نەکەیت چونکە بۆ پیاوان حەرامەو بۆ ژنان حەڵاڵ: { فعن إبن عباسرضي الله عنه، أنَّ رسول اللهﷺرأى خاتماً من ذهب في يد رجلٍ، فنزعهُ فطرحهُ، وقال: {يعمد أحدكم إلى جمرةٍ من نارٍ، فيجعلها في يده} فقيل للرجل بعدما ذهب رسول اللهﷺ : خُذ خاتمك إنتفع بهِ، قال: لاوالله لاأخذهُ أبداً وقد طرحهُ رسول الله}([2])

---

(١) أ. صحيح رواهُ أبو داود.

ب. واتە: هەرکەسێك خۆ بەهەر کەس‌وگەڵ‌و کۆڕو کۆمەڵێك بچوێنێت ئەوە لەوانە.(وەرگێڕ).

(٢) أ. رواهُ مسلم.

ب. واتە: پێغەمبەرﷺ ئەنگوستیلەیەکی زێڕی لەپەنجەی پیاوێك دا بینی دەری هێناو فڕێ ی دا. فەرموی: ئایا ئێوە بەدەستی خۆتان حەز دەکەن پشکۆیەکی ئاگر لەدەستی خۆتان بکەن؟ ئەو

**لەم فەرمووودەدا ئەم حوکمو سودانەی خوارەوە وەردەگرین:**

- هەرکەسێك خراپەکارێکی بینی کەوا خراپە دەکات پێویستە قەدەغەی بکاتو بیگێڕێتەوە، وەك ئەوەی لەنمونەی سەرەوە بینیمان واتە لەدەست کردن ولەپەنجە کردنی زێڕ. هەروەکو پێغەمبەرﷺ لەم فەرمودەیەدا ڕونی کردۆتەوە کەفەرمویەتی:{ من رأى منكم منكراً فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه، فإن لم يستطع فبقلبه، وذلك أضعف الأيمان}(١)
- پێغەمبەرﷺ زێڕی بەپشکۆیەکی ئاگر چواندو فەرموی لەڕۆژی قیامەتدا دەبێتە پشکۆیەکی ئاگرو لەپەنجەتان دەکرێت، ئەمە خۆی لەخۆی دا ئەوە دەگەیەنێت کەلەگوناحە گەورەکانە.
- ئەگەر ئەنگوستیلەی زێڕت هەبو دەتوانی بیفرۆشیتەوەو سود لەپارەکەی وەر بگرێت، ئەویش بەگوێرەی قسەی سەحابیەکە کەلەفەرمودەکەدا هاتوە: ( ئەنگەستیلەکە هەڵ بگرەوەو سودی لێ وەر بگرە).
- ڕازی بونی سەحابیەکە بەقسەی پێغەمبەرو فڕێ دانی ئەنگوستیلەکە لەپەنجەی داو بەو پەڕی سنگ فراوانیەوە فەرمانی پێغەمبەری قبوڵ کردو ناڕازی

---

ئەنگوستیلە زێڕە لە ڕۆژی قیامەت دەبێتە پشکۆیەکی ئاگرین لەدۆزەخداو دەکرێتە پەنجەتان. دوای ئەوەی پێغەمبەرﷺ ڕۆیشت بە کابرایان گوت: بڕۆ ئەنگوستیلەکەت هەڵ بگرەوەو بڕۆ بیفرۆشەو پارەکەی بۆ ماڵەوە خەرج بکەو سودی لێ وەر بگرە، گوتی: نەبە خوا هەڵی ناگرمەوە مادام پێغەمبەرﷺ فڕێ ی دا و فەرموی حەرامە تازە من نامەوێتەوەو هەڵی ناگرمەوە.(وەگێڕ).

(١) أ. رواهُ مسلم.

ب. واتە: هەرکەسێك خراپەکارێکی دیت خەریکی گوناح کردنە با بەدەست بیگێڕێتەوو نەهێڵێ ئەو خراپەیە، ئەو گوناحەیە بکات، خۆ ئەگەر بەدەستو بەدەسەلات نەیتوانی با بەزمان پێ ی بڵێ و ئامۆژگاری بکات، ئەگەر بەم ڕێگەیەش نەیتوانیو لەوە ترسا کەتوشی فیتنەو ناکۆکی دەبێت هەرنەبێ بابەدڵ پێ ی ناخۆش بێت. دیارە ئەمەش نیشانەی بێ هێزی پلەی ئیمانەو تەنیا گەردیلەیەکیش ئیمانی لەدڵ دا نیە دەنا نابێ موسڵمان ئەوەندە بێ هێز بێت کەنەتوانێ ئامۆژگاریش بکات.(وەرگێڕ).

نەبو،دواتریش هەڵ نەگرتنەوەی هەر چەندە سەحابیەکی تر پیّ ی گوت هەڵی بگرەوەو بیفرۆشەو سودی لیّ وەر بگرە, ئەمە خۆی لەخۆی دا بەهێزی ئیمان و قوربانی دانە لەپێناو دینەکەیدا دەسەلمێنێت.

**پوختەی کار( تاخلاصە ):**

گەنجولاوی موسڵمانان گەر حەزیان لیّ بو ئەنگوستیلە بکەنە دەستیان دەتوانن ئەنگوستیلەو ئەڵقەی زیو لەپەنجە بکەن. لەزێڕیش جوانترەوشێوەی زیوینی درەوشاوەیی هەیە، سەرباری ئەمەش نرخەکەشی کەمترەو ئایینی پیرۆزی ئیسلام بۆ پیاوانو بۆ ژنانیشی حەڵاڵ کردوە.

جارێکیان ئامۆژگاری برایەکی موسڵمانم دەکرد کاتێك دیتم ئەنگوستیلەیەکی زێڕی لەدەستدا بو، ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرمﷺ بۆ باس کرد، ئەویش زۆر بەسینگ فراوانی وەڵامی دامەوەو ئەنگوستیلەکەی داکەندودای بەمنو منیش چومە بازاڕو بۆیم فرۆشتو ئەنگوستیلەیەکی تری زیوم بۆ کڕیو باقیەکەی ترم دایەوە دەستی وزۆریشی پیّ کەیف خۆش بو، هەمو مامۆستاکانی تریش چاویان لەو کردو زێڕەکانیان فرۆشتەوەو هی زیویان کڕی. فەرمودە بۆندارەکەی پێغەمبەرﷺ زۆر ڕاستە کەفەرمویەتی:{ من سنّ سُنة حسنة فلهُ أجرها وأجر من عمل بها من غير أن ينقص من أجرهم شئ}([1])

١) ئێمەی موسڵمان پێویستە لەسەرمان تەنیا لەو شتانەدا لاسایی ڕۆژئاواییەکان بکەینەوە وەك دۆزینەوەو داهێنانە تازەکان لە بواری تەکنۆلۆژیای پێداویستی یەکانی ژیانی دنیایی وەك: فڕۆکەو زریّ پۆشو ژێر دەریایۆك(الغواصة) وگەلێکی تر لەم چەکە پێش کەوتوانە، تائێمە پێویستیمان بەوان نەبێتو خۆمان دروستیان

(١) أ. رواهُ مسلم.

ب. واتە: هەرکەسێك لەئیسلامدا سوننەتێکی باش دابهێنێت ئەوە پاداشتی ئەوە پاداشتی خۆشیو پاداشتی ئەوانەش وەردەگرێتەوە کەلەدوای خۆی کار بەو سوننەتە دەکەن بیّ ئەوەی لەپاداشتی هیچیان کەم بکاتەوە.(وەرگێڕ).

بکەینو بەرگری پێ لەئایینو نیشتمانو خاکو نیشتمانو خاکوخۆڵو زێدی باوکو باپیرانی خۆمانی پێ بکەین وبیپارێزین. نەك لەخۆڕازاندنەوەو سەماو سوڕدانو بانگەشەو بڵاو کردنەوەی بێ ئەخلاقیو ڕوت کردنەوەی ئافرەتانو گەلێکی تر لەو کردەوە بۆگەنە زیانە بەخشانەدا لاسایی کوێرانەیان بکەینەوە، ئەمە خزانو داهێزران و لادانە بۆ موسڵمانان. ڕاستی گوتوە شاعیر کەگوتویەتی:

قلّدوا الغربي، لكن بالفجور　　　　وعن اللب إستعاروا بالقشور( [١] )

٢) ئایینی ئیسلام نەك هەر لەمە قەدەغەی کردوین، بەڵکو لەناو خۆشماندا قەدەغەی کردوین لاسایی یەکتری لەکردەوە خراپەکاندا نەکەینەوە. هەروەکو (إبن مسعود) فەرمویەتی: ( لايكن أحدكم إمَّعة، يقول: إنَّ أحسن الناسِ أحسنت، وإن أساء الناس أسأت، ولكن وَطِّنوا أنفسكم على أن تحسنوا إذا أحسن الناس، وألاّ تظلموا إذا أساءت الناس)( [٢] )

جێگەی داخە هەندێ کەس کەئامۆژگاری دەکەیت و پێ یان دەڵێیت فێڵ مەکەنو درۆیان مەکەنو کچانتان و ژنانتان باڕوت (سفور) و بەرەڵا نەبن و بۆ بێگانە لەبەرو

---

(١) واتە: لاسایی ڕۆژئاواییەکان دەکەنەوە، بەڵام لەچیدا؟ لەکاری خراپو فیتنەو لەتاوانو بێ ئەخلاقیو فاحشەو ئاوەڕوت کردنی ئافرەتانوسفوری دا، لەبری ئەوەی لەکارە باشو کاکڵەو کرۆکو ناوەرۆك وبەسودەکاندا لاسایان بکەنەوە لەشتی پوخڵو توێکڵی بێ سودیان لێ وەردەگرن (وەرگێڕ)

(٢) واتە: هەر یەکێك لەئێوە وا نەبێت بڵێ: ئەگەر خەڵکی باش بون وکردەوەی چاکیان کرد ئەوا منیش باش دەبمو کردەوەی باش دەکەم، وەئەگەر خەڵکی خراپ بو و کردەوەی خراپی کرد منیش خراپ دەبمو کردەوەی خراپ دەکەم، بەڵام ئێوە بەپێچەوانەی ئەم ڕایە بن، هەمیشە نەفسی خۆتان وا لێ بکەن کە خەڵکی چاکەیان کردو لەگەڵتدا باش بون تۆش باشتر وەڵامیان بدەوەو لەگەڵیاندا باشتر بە، یان تۆ لەخەڵکی باشتر بە موسڵمانێکی کردەوە باش وخۆ لەخوا پارێزی بڕوادار بە، وەئەگەر خەڵکی خراپ بون وکردەوەی خراپیان دەکرد تۆ وامەبە مرۆڤێکی بڕواداری داد پەروەرو باش بە، یا ئەگەر خەڵکی لەگەڵ دا خراپ بون تۆ بەپێچەوانەوە چاکەیان لەگەڵ دا بکەو ستەمکار مەبە ئەگەر خەڵکی خراپ بون، واتە لەهەقی خۆت پتر دەست درێژی مەکە چونکە خوای گەورە دەست درێژی کارانی خۆش ناوێ﴿ إِنَّ اللَّهَ لاَيُحِبُّ الْمُعْتَدِينَ﴾

بازاڕەکان خۆ نەڕازێننەوەو بۆنو بەرامەی خۆش لەخۆ نەدەنو دەمو چاو لەدەرمانی ماکیاجو ڕەنگاڵە سورە نەڕازێننەوەو دەر بچن بۆ دەرەوەو خەڵکی بەتایبەتی گەنجو لاوانو هەرزەکاران بەخۆیانەوە گوناح بار نەکەن، چونکە ئەوانە وێڕای گوناحی خۆیان هی ئەوانیشیان دەگاتێ، کەچی ئەو بەڕێزانە لێوت لێ هەڵ دەقرچێننو لوت بەرزانە دەڵێن: کاکە ئەو خەڵکە هەمویان بەلێشاو دزیان دەکەن، فێلو فێڵبازی دەکەن، مۆدیلە هەمو کەسێك ژنو کچەکانیان ڕوتن خۆ من لەوان پتر نیم...

دەیانەوێ هەمویان لاسایی یەکتری بکەنەوە، نەخێر براکەم ئاگاداربە لەگەڵ کاروانی بیرۆکە بۆگەنەکاندا بەڕێدا مەڕۆ ولاسایی کوێرانەی خراپو خراپەکاریان مەکەوە.

٤) لاسایی جلو بەرگو پۆشاکی بێگانە مەکەنەوە، ئەو پانتۆڵە تەسکو بێ شەرعیانە لەبەر مەکەن کە هەمو عەورەتی مرۆڤ دەردەپەڕێنێت چ هی ژنانو چ هی پیاوان. باائافرەتەکانتان سەر ڕوتو قوتوسفور نەبن و پۆشاکی شەرعی لەبەر بکەن،و لاسایی ڕۆژئاوایو فەرەنسی یەکان مەکەنەوە(البرنطیة) کەدروشمێکی کافرانو جولەکەو فەلەکانە ڕەچاو مەکەن. ئەو فەرمودەی کەدەفەرموێ: { من تشبه بقومٍ فهو منهُم}([1])

موسڵمان پێویستە لەسەری کەخۆی بەپێغەمبەرﷺو سەحابەکانو پیاوچاکان بچوێنێتو شوێن کەوتەی ئەوان بنو چاو لەو کەسانە نەکەین کە دەستیان بە غەیری بەرنامەی ئیسلامەوە گرتوەو موسڵمان نین. دژایەتی بەرنامەکەی خواو موسڵمانان دەکەنو بەبەرنامەی خوای بالاّ دەستو کاربەجێ ڕازی نین.

---

(١) أ. صحیح رواه أبو داود.

ب. واتە: هەر کەسێك خۆ بەهەر کەسو گەلێك بچوێنێت ئەوە لەوانەو لەئێمە نیە واتە موسڵمان نیە.(وەرگێڕ).

## بۆ خوشکانی مامۆستا لە سەرەتاییو قۆناغەکانی تری خوێندن(الى المعلمات والمدرسات):

ئەو زانیاریو ڕێنومایيانەی کەئاراستەی مامۆستایانو پەروەردیارانی پیاو کراوە، ئاواش ئاراستەی پەروەردیارانومامۆستایانی ئافرەت کراوە، وەلێ هەندێ ئەرکو پێداویسی تر هەن پەیوەندن بەخوشکانی مامۆستاو فەرمانبەرو پێویستە ڕەچاویان بکەنو بەو پەڕی ڕەزامەندیو سنگ فراوانیەوە جێ بەجێ یان بکەن، دەنا لەبەردەم دادگای دادوەرێتی خودای دادپەروەردا لەدنیاو لەقیامەتدا بەرپرس دەبنو خوای گەورە لێ یان دەپێچێتەوە.هەندێ لەو ئەرکو پێویستی یانە بریتین لەمانەی خوارەوە:

### پۆشاکی شەرعیانە(الحجاب الشرعي):

پێویستە لەسەر خوشکانی موسڵمان بەتایبەتی مامۆستایانو پەروەردیارانی ئافرەت چ لەقۆناغی سەرەتاییوچ ناوەندیو دواناوەنیو زانکۆکانو پەیمانگاکاندا کەبەپۆشاکی شەرعی تەواوە بچنە قوتابخانەو پۆلەکانیانەوە ، دەنا خۆیان بەرپرسیار دەبن لەبەر دەم خوای گەورەدا، باشتریش وایە پۆشاکە ڕەنگی ڕەش بێت، چونکە لەهەمو ڕەنگەکانی تر دورە فیتنە ترە. أم سلمة گوتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوار کەدەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ۚ﴾ (١)

---

(١) أ. سورة الأحزاب: (٥٩).

ب. واتە: ئەی پێغەمبەرﷺ بەخێزانەکانتو بەکچەکانتو بەژنانی بڕواداران بڵێ: با لەچکو باڵاپۆشەکانیان بەسەر سەرو شانو ملو بەسەر گشت گیانیان دا شۆڕ بکەنەوە تالەبەر چاوی خەڵك دیار نەبن وەك لەتەفسیرەکاندا هاتوە دەفەرمون لەشاری مەدینەدا پیاو خراپ و داوێن پیس زۆر بون کاتێ شەوانە ئافرەتانی دەچونە دەرەوە بەکەنیزە(الإماء)و بەئافرەتانی ئازادەوە(الحرائر) بۆ ئەنجام دانی

ژنانی ئەنسار هاتنەدەرو لەسەر سەریان کۆمەڵێك پۆشاكو لەچکی شەرعیو بەحەیاو حەشمەتیان لەسەر کردبوو هەر دەتگوت پۆلە قاژوەیەکی ڕەشو بەویقاری ئارام گرتوو بێ جمو جوڵ لەسەر سەریان نیشتونەتەوە.

مامۆستای خانم ئەگەر بەپۆشاکی شەرعی بەویقارو بەحەشمەتو دور لەخۆڕازاندنەوەو سورو سپیاو کردنو ماکیاج کردن بچنە قوتابخانەو ناو پۆلەکانیانەوە دەبنە نمونەیەکی کردەکی (عملي) زیندو بۆ قوتابیە کچەکانو ئەوانیش چاو لەمامۆستاکانی خۆیان دەکەنو شوێنیان دەکەون لەپۆشینی پۆشاکی ئیسلامی بالآ پۆشدا، چونکە هەروەکو پێشتریش ئاماژەمان پێ کرد مامۆستا ئاوێنەی بالآنوما یا وێنەی دوەمی مامۆستاکانیانن، ئەوانە بەپێچەوانەی ئەو مامۆستا خانمانەی کەبەڕوتو قوتیو سفورەوە یابەپانتۆڵی تەسك لەبەرو بەلێوو بەنینۆکی سورو دەمو چاو شەلآڵ لەسوراو و سپیاوەوە کەهیچ ڕواڵەتێکی بەحەیاو بەحەشمەتیان پێوە دیار نیە دەچنە قوتابخانەو ناو پۆلەکانیانەوە بۆلای قوتابیەکانیان. دیارە ئەمانە خراپترینو بۆگەنترین وشەڕترین نمونەی چاو لێکەری بۆ کچە قوتابی یەکانیان و بەتەواوی لاسایان دەکەنەوەو دەبنە نمونەیەکی هەڵفریوێنەر و لەخشتەبەرو خزانو لادانی ئەو نەفسە پاك وبێ گەردانەی کەهێشتا نینۆکی ڕەشی بۆگەنی شەیتانیان نەگەیوەتیو وەك خۆیان بۆگەنوپیس نەبون. دیارە ئەوانە

---

پێداویستیەکانی خۆیان ڕێ یان پێ دەگرتنوخراپەیان داوا لێ دەکردن. بۆیە ژنانی بروادراری ئازاد ئەم سکالآیەیان بەرز کردەوە کە پێویستە پۆشاکی ئافرەتانی ئازاد جیا بێت لەهی کەنیزەکان واتە نائازادەکان تا ئەمەگەیشتە پێغەمبەرﷺ دوایش ئەم ئایەتە هاتە خوار وەکو لەسەرەوە واتاکەیمان لێك دایەوە ئیدی لەو ڕۆژەوە ئافرەتانی ئازاد ئەو (جلبابة) کەئەو عەبایەی ئێستا دەگرێتەوە کەئافرەتان بەسەر خۆیان هەڵ دەکێشن لەسەر هەمو جلەکانیانەوە و تەنیا چاوی چەپیان دەردەخست بۆ بینینی ڕێگا ئیدی لەو ڕۆژەوە ئەو خراپەکارە داوێن پیسانە کەئەو ئافرەتانەیان دەدیت کەعەبایان بەخۆدا داوە دەیان زانی کەئافرەتانی ئازادن خۆیان تێ نەدەگەیاندن و تەنیا گێچەڵیان بەکەنیزەکان دەکرد.( تفسیر إبن کثیر، القرطبي، الآلوسي، البغوي ، الطبري، ..)(وەرگێڕ).

گوناحی خۆشیانو گوناحی ئەو خونچە گوڵانەشیان لەئەستۆدایە، چونکە بەهۆی ئەوانەوە توشی گوناحو بێ فرمانی خوای گەورە بون، بۆیە:

١ ) پێویستە لەسەر مامۆستایانی ئافرەت کەقوتابیانو کچەکانیان هان بدەن بۆ پۆشینی پۆشاکی ئیسلامی شەرعی، کەبریتیە لەدروشمێکی سەربەرزانەی ئافرەتی موسڵمان واتە دروشمێکی ئیسلامی شەرعیە بۆ ئافرەتانی بڕواداری موسڵمان. وەپێویستە لەسەریان کەمەرجەکانی پۆشاکی ئیسلامی شەرعیان بۆ ڕون بکەنەوە کەبەرژەوندی ئافرەتی موسڵمانی تێدایە، زرێ پۆشێکەو لەتیرو گوللەی ژەهراوی چاوی چاو پیسو داوێن پیسو شەڕواڵ پیسان دەیان پارێزێت، هەروەها ڕێز لێنانێکە بۆ ئەوانو پاراستنی شەرەفو کەرامەتی ئافرەتانی موسڵمان.

٢. دەبێ پۆشاکەکە وابێ هەمو لەشی ئافرەت داپۆشێت هەتاکو دەستو دەمو چاویشی.وەنابێ تەسكو تەنگەبەر بێت وەك ئەو بانتۆڵو شانتۆلو ستریجانەی ئەمڕۆ لەبەری دەکەن. پێویستە ڕەنگەکەشی ڕەش بێت هەروەکو لەڕابردودا باسمان کردو نابێ جلەکانی ژێر پۆشاکەکەی تێڕا دیار بن واتە تەنكو ڕون نەبن هەمو گیانی ئافرەتەکەی وەك خۆی تێڕا دیار بێت.

٣. نابێ پۆشاکی شەرعی ئافرەتان بەپۆشاکی پیاوان بچێت. لەبەر ئەوەی لەفەرمودەدا هاتوەو قەدەغەی لێکراوە: {لعن الله المتشبهات من النساء بالرجال}(١)

٤. نابێ ڕەنگی پۆشاکەکە زاقو بریقو ڕازاوە بێت واتە: ڕەنگاو ڕەنگو ڕازاوە بێت بەشێوەیەکی وا سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، بەتایبەتیش گەنجانو هەرزەکاران.

٥. دەبێ ئەو ژنە جولەکەو فەلانەی کەمێرد بەموسڵمانان دەکەن هەمان پۆشاکی شەرعی ئیسلامی لەبەر بکەن. بەگوێرەی فەرمودەی خوای گەورە کەدەفەرموێ:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِىُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ وَبَنَاتِكَ وَنِسَآءِ ٱلْمُؤْمِنِينَ يُدْنِينَ عَلَيْهِنَّ مِن جَلَـٰبِيبِهِنَّ ﴾ سورة الأحزاب: (٥٩) .

---

(١) أ. رواه البخاري. ب. واتە: نەفرەت لەو ژنانەی کەخۆ بەپیاوان دەچوێنن، هەروەها بەپێچەوانەوەش.(وەرگێڕ).

٦. لێرەدا ئایەتەكە بە(نكرة) واتە(نساء المؤمنين) هێناویەتی واتە ژنانی بڕواداران نەك بە(معرفة) واتە(النساء المؤمنات) واتە ژنە بڕوادارەكان كەدەست نیشانی ئافرەتانی بڕواداری نەكردوەو لەبێ باوەڕەكانی جیا بكاتەوە واتە بە(علم) نەی هێناوە.

٧. لەسەر مامۆستای ئافرەتی موسڵمان پێویستە كەفرمان بەقوتابیانی كچ بكات كەهەر كاتێك تەمەنی گەیشتە حەوت ساڵان سەری خۆی دابپۆشێت و لەچك لەسەری خۆی بكات بۆ ئەوەی كاتێك گەورە بۆ بەتەواوی لەسەری ڕابێتو سەر ڕوت نەكاتو سەرپۆش لەسەر بكات. هەروەك چۆن لەتەمەنی حەوت ساڵیدا دەبێ فێری نوێژ بكرێنو فرمانی نوێژ كردنیان پێ بكەن. هەروەكو پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{ مروا أولادكم بالصلاة وهم أبناء سبع سنين، واضربوهم عليها وهم أبناء عشر سنين، وفرقوا بينهم في المضاجع}(١)

---

(١) أ. حسن رواهُ أحمد وغيرهُ.

ب. واتە: هەركاتێك منداڵەكانتان گەیشتنە تەمەنی حەوت ساڵی فێری نوێژیان بكەن و فرمانی نوێژ كردنیان پێ بكەن، وەلە تەمەنی دەساڵی دا لێ یان بدەن ئەگەر نوێژیان نەكرد، ژورو جێگەی نوستنیان لێك جیابكەنەوە واتە لەنێوان كوڕو كچدا، مەبەست لەلێدان لێدانێكی سوكەو دور لەدەمو چاو و نابێ بریندارکەر بێت.(وەرگێڕ).

# پوختەی ئەم کتێبە( خلاصة الرسالة ):

لەسەر پەروەردیاران پێویستە لەسەر کاری پەروەردەو فێرکردندا زۆر زیرو کارامەو بوێرو لەخۆ بوردو بن، پێش هەمو شتێك دەبێ خۆشەویستیو دڵسۆزی یان بۆ کارەکەی خۆیان هەبێتو خۆشەویستی و دڵسۆزی بۆ برادەرانیو قوتابیەکانی هەبێت تائەوانیش ئەویان خۆش بوێت وبۆی دڵسۆز بن وپێویستە ئامۆژگاری ورێنومایبیان بکات، زۆر بەنەرمیو لەسەر خۆییو ژیرانە هەروەك خوای گەورەدەفەرموێ:﴿ ٱدۡعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلۡحِكۡمَةِ وَٱلۡمَوۡعِظَةِ ٱلۡحَسَنَةِۖ وَجَٰدِلۡهُم بِٱلَّتِي هِيَ أَحۡسَنُۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦۖ وَهُوَ أَعۡلَمُ بِٱلۡمُهۡتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ ﴾(١)

دەبێ مامۆستا چاك لێ حاڵی ببێت کەئیشەکەی ئەو باشترین و پیرۆز ترین ئیشەو دوا ڕۆژی ئوممەتو ئاینو نیشتمانەکەی لەسەر بەندەو چاوەڕوانی ئاسۆی ڕونە لەسۆنگەی ڕێنومایی و پەروەردەو فێرکردنی ئەوەوە، کەئاراستەی قوتابیەکانی دەکات. هەر ئامۆژگاریەکانی ئەوە کەگەنجو لاوانی باوەڕدار و دڵ پڕ سۆزو خۆشەویستی یان بۆ ئاینو ئوممەتەکەیان دروست دەکاتو ڕۆڵەی بەجەرگو لەخۆ بوردو بڕوادری پتەو بەرهەم دێنێت. کەشانازی بەباوكو باپیرانیانەوە دەکەن کەئەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلامیان بەجیهان گەیاندو دەوڵەتێکی ئیسلامیان بەرپا کردو وڵاتێکی زۆریان خستە سەر ئەو دەوڵەتە ئیسلامیە. کێ دەزانێ لەو قوتابیانەی کەئەو مامۆستایەپێ ی گەیاندون چی یان لێ هەڵ دەکەوێت؟ سەرۆکی دەوڵەت، سەر لەشکر، یا هەر کارو پیشەیەکی وەدەست دەگرن کەدوا ڕۆژی ئوممەتی ئیسلامی چاوی تێ بڕیوە، بەتایبەتیش کەئێستا

---

(١) أ. سورة النحل : (١٢٥)

ب. واتە: زۆر بەژیریوبەهێمنیو بەچاکی بانگەشە بۆ ڕێگەی پەروەردگارت بکەو بەباشترین شێوە دەمەتەقێو قسەیان لەگەڵ دا بکە.(وەرگێڕ).

ئێمە وا لەبەر دەم دەروازەكـانی شـەڕێكی دژواری يـەكلايی كـەرەوەين لەگـەڵ ئيـسرائيلی سەهيۆنيەتو كوفری جيهانی داپێويـستيمان بـەئامادە كردنـی بەرەيـەكی بـڕواداری ئـازاو بەجەرگ و لەمردن سڵ نەكردنەوەو شەهيدی خوازو ئاواتی هـەرە سـەرەكی شـەهيد بونـە لەڕێگەی خواداوئازاد كردنی خاكی داگير كراوی موسڵمانان لەهەركوێ يەك بێت.

وەلەسەر مامۆستای پێويستە كەنوێنەری كەسايەتيەكی ئيسلامی خۆشەويست بێت لەپێش چاوی هەم دوژمنانو هەم برادەرانو قوتابيانی دا، بۆ ئەوەی ببێتە پێشەنگێكی باش لەقوربانی دانو تۆڵە سەندنەوە، وەبەئەركی سەرشانی خۆی هەڵ بستێتو ڕێزو ڕەوشت بەرزومامەڵە لەگەڵ كردنو هەڵسو كەوت كردندا نمونەی پێشەنگە بۆ ئەوەی ئەم سيفاتە لەسەر ڕوپەڕی پاكو بێ گەردی دڵو دەرونی قوتابیو برادەرانی دا وێنا ببێتو بەچاو ببينە ڕەحمەتو بەرەكەتو يارمەتی خوای گەورە كەدەفەرموێ:﴿ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ۝٩٢ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ۝٩٣ ﴾ (١)

هەروەها خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ۝٧٤ ﴾ سورة الفرقان: (٧٤){واتە: ئەی پەروەردگارا بمان كەيتە پێشەنگو پێشەوای بڕواداران.(وەرگێڕ)} هەروەها فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ:{كلكم راعٍ وكلكم مسؤلٌ عن رعيتهِ} متفق عليهِ واتەكەيمان پێشتر ئاماژەپێ كرد.دەی كەواتە مامۆستا شوانە لەقوتابخانەكەی داو بەر پرسە لەقوتابيەكانی هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمويەتی: {فوالله

---

(١) أ. الحجر:(٩٢,٩٣) .

ب. واتە: سوێند بەپەروەردگاری تـۆ ئـەی محمد لەهـەمو شـتێكی مرۆڤـەكان دەپێـچينەوە كەلـەدنيادا ئەنجامی داون لە گفتارو لەكردەوە.(وەرگێڕ).

لأن يهدي اللهِ بك رجلاً واحداً خيرٌ لك من حُمر النعمِ}(١) هەروەها فەرمویەتی: {إذا مات الإنسان إنقطع عملهُ إلاّ من ثلاث: صدقة جارية، أو علم يَنْتَفِعُ به، أو ولد صالح يدعو لهُ}(٢)

دەی مامۆستاش ئەو قوتابیانە گەر فێری زانستێك بكات كەشەرعیو ڕێگە پێدراو(مباح) بن لەدوای مردنی خێری دەگاتێ، ئەگەر قوتابیەكانی ببنە مامۆستاو هەر شتێكی فێری قوتابیانی تر كردو هەروەها بەم پێ یە هەتا دنیا دنیایە ئەو زنجیرە خێرە بەردەوام دەبێتو لەخێری هیچیشیان كەم نابێتەوە یەك بەیەك تادەگاتەوە مامۆستای یەكەم خێرەكە كۆو كەڵەكە دەبێت.خوایە بمان كەیتە یەكێك لەوانە...آمین.

اللهُم علمنا ماينفعنا، وأنفعنا بما علمتنا وزدنا علماً. وصلى الله على محمد وعلى آله وسلم..آمين.

واتە: خوایە زانستێكمان فێر بكەیت كەسودی هەبێت بۆمان، وەلەوزانستەی فێرت كردوین كەڵك وەر بگرینو زانستمان فێر بكەیت. ئامین. سەلاتو سەلامیش بەسەر گیانی پاكی محمدو خاو وخێزانو یارو یاوەرانی دا تا ڕۆژی قیامەت.

---

(١) أ. متفق عليه.

ب. واتە: سوێند بەخوا ئەگەر خوای گەورە یەكێك لەسەر دەستی تۆ ڕێنومایی و هیدایەت بدات گەلێك باشترە بۆ تۆ لەیەك مێگەل حوشتر یاخود لەمەڕو ماڵاتو وڵساتو لەماڵی دنیا. (وەرگێڕ).

(٢) أ. رواهُ مسلم.

ب. واتە: ئەگەر مرۆڤ مرد كردەوەكانی هەمو دەپچڕێنو نامێنن تەنیا لەسێ بواردا نەبێت: خێرێكی نەبراوە، وەك ئەوەی لەدنیادا مزگەوتێكی دروست كردبێت، پردێكی دروست كردبێت ، بیرێكی لیدا بێت یا نەمامو درەختی چاند بێت،. یاخود زانستو زانیاریەك كەلەدنیادا خوێندویەتی و ئەوجار كەسانی تری فێر كردبن هەتا دنیا دەبڕێتەوە خێری ئەو زانستوزانیاریەی دەگاتێ دەست بەدەستو بێ ئەوەی لەخێری هیچیان كەم ببێتەوە، بێ گومان زانستێك كەبێ شەرعی نەبێت، دەنا بێ شەرعیەكان بەپێچەوانەوە گوناحی دەگاتێ هەتا هەتایە. یاخود منداڵی صالحی لەدوا بەجێ بمێنێت چ كوڕو چ كچ دوعای چاكو خێرو خێراتی بۆ بكەن ئەو دوعاو پاڕانەوەو خێرو خێراتەی بۆ دەچێتو خوای گەورە لەگوناحەكانی دەبورێتو پلەی بەرزی پێ دەبەخشێت.(وەرگێڕ)

# چەند نزاو پاڕانەوەیەك لە قورئانی پیرۆز دا

١. ﴿إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ۝١٠﴾(١).

٢. ﴿رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ۝٢٠١﴾(٢).

٣. ﴿رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً ۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ۝٨﴾(٣).

---

(١) أ.سورة الكهف: (١٠) .

ب. واتە: ئەی پەروەردگاری ئێمە لەلایەن خۆتەوە بەزەیی‌و ڕەحمەت‌و بەخشندەیی خۆتمان پێ ببەخشەو لەگوناحەکانمان ببورە لەدنیاو لەقیامەت سەرفرازو سەرکەوتومان بکە، وەلەلوتف‌وبەخشندەیی خۆت ڕێگاڕۆشنایی‌و ڕێنومایی یەکی وامان نیشان بدە کەپێ ی بگەینە ئەو مەبەستەی کەهەمانە ئەویش گەیشتن بەدیداری پڕ سۆزی لوتفی خۆتە ئەی پەروەردگارمان.(وەرگێڕ).

(٢) أ.سورة البقرة: (٢٠١)

ب. ئەی پەروەردگاری ئێمە، لەدنیاو لەقیامەتدا چاکەمان لەگەڵ دا بکەو ڕێنوماییمان بکەو خێرو بەرەکەتی خۆتمان بەسەردا برێژەو لەئاگری دۆزەخمان بپارێزە.(وەرگێڕ).

(٣) أ.سورة آل عمران: (٨).

ب. واتە: ئەی پەروەردگاری ئێمە غەڵ‌و غەش‌و دو دڵی نەخەیتە دڵەکانما نەوە دوای ئەوەی ڕێنومایيت کردوین‌و هیدایەتیت داوین‌و هێناوتینە سەر ڕێگەی ڕاستی بەرنامەکەی خۆت. وەڕەحمەت‌و بەزەیی خۆتمان پێ ببەخشی تۆ بەهرە بەخش‌و بەخشندەی.(وەرگێڕ).

٤. ﴿وَٱلَّذِينَ جَآءُو مِنۢ بَعۡدِهِمۡ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَا تَجۡعَلۡ فِي قُلُوبِنَا غِلّٗا لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ رَبَّنَآ إِنَّكَ رَءُوفٞ رَّحِيمٌ ﴿١٠﴾﴾(١).

٥. ﴿رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذۡنَآ إِن نَّسِينَآ أَوۡ أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾﴾ (٢).

---

(١) أ. سورة الحشر: (١٠).

ب. واتە: ئەی پەروەردگاری ئێمە لەئێمەو لەو برایانەشمان خۆش ببە کەلەپێش ئێمەدا بڕوایان بەتۆو بەبەرنامەکەی تۆ هێنا بو، وەهیچ جۆرە ڕقو کینەو غەلو غەشێك نەخەیتە دڵمانەوە بەرامبەر بەو کەسانەی کەبڕوادارن خوایە گیان، ئەی پەروەردگارمان تەنیا هەر تۆی بەخشندەو میهرەبانو بەبەزەیی‌و لێ بوردەی، دەریای ڕەحمەت‌وبەزەیی تۆ فراوانە فراوان.(وەرگێڕ).

(٢) أ. سورة البقرة: (٢٨٦).

ب.واتە: ئەی پەروەردگارا هەر گوناحێکمان کردو لەبیرمان چو واتە بەنەزانی یا لەبیرمان چو بوەوە کەگوناحە، یاخود بەهەڵە کردمان لێمان نەگری‌و ئەو بارە قورسەی کەخستوتە سەر ئەو گەلانەی کەپێش ئێمە ڕۆیشتون نەی خەیتە سەر شانی ئێمەش، وە شتێکمان نەخەیتە سەر شان کەنەتوانین هەڵی بگرین‌و لەتوانامان دا نەبێت، خوایە لێمان خۆش ببە، ڕەحم‌و بەزەیت پێمان دابێتەوە تۆ سەروەرو گەورەو پەروەردگاری ئێمەی دەی خودایە گیان بەسەر کافران‌و ستەمکاران‌و ملهوڕان‌و تاغوتان‌و خوانەناسانماندا سەر بخەیت ئەی پەروەردگاری جیهانیان.(وەرگێڕ)

٦. ﴿رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٤﴾ ﴾(١).

٧. ﴿رَبَّنَا افْتَحْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا بِالْحَقِّ وَأَنتَ خَيْرُ الْفَاتِحِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾ (٢)

٨. ﴿رَبَّنَا لَا تَجْعَلْنَا فِتْنَةً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ ﴿٨٥﴾ وَنَجِّنَا بِرَحْمَتِكَ مِنَ الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾(٣).

٩. ﴿رَّبَّنَا اكْشِفْ عَنَّا الْعَذَابَ إِنَّا مُؤْمِنُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ (٤).

١٠. ﴿رَبَّنَا أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا مُسْلِمِينَ ﴿١٢٦﴾ ﴾(٥)

---

(١) أ. الممتحنة: ٤.

ب. واتە: پەروەردگاری ئێمە تەنیا پشتمان بەتۆ بەستوەو هەر بۆ لای تۆ دەگەڕێینەوە و هەر بۆ لای تۆ دێین‌و لەبەرنامەکەی تۆ بەولاوە شوێن هیچ بەرنامەیەکی تر ناکەوین.(وەرگێڕ)

(٢) أ. سورة الأعراف: (٨٩)ز

ب. واتە: ئەی پەروەردگارا ئاشتی‌و ئارامی‌و رێکخستنەوە و سولْح‌وئاشت بونەوە لەنێوان ئێمەو گەلەکەمان یالەنێوان ئەندامانی خێزان‌و گەلەکەمان بخەیتەوە،و ناکۆکی‌و دوبەرەکیمان لەنێواندا هەڵ بگریت، چونکە باشترین دادوەرێك‌و سولْح کەرێکی لەدنیاو لەقیامەتدا.(وەرگێڕ).

(٣) أ.سورة يونس: (٨٥،٨٦).

ب. واتە: ئەی پەروەردگارا هەرگیز نەمان کەیتە فیتنەو تاقی کردنەوەی دەستی ستەمکاران‌و بەڕەحمەت و بەزەیی خۆت لەگەلی کافرانمان بپارێزە.(وەرگێڕ).

(٤) أ. سورة الدخان: (١٢).

ب. واتە: ئەی پەروەردگارمان ئازارو ئەشکەنجەو عەزابمان لەسەر لابەری ئێمە بڕوامان بەتۆ هێناوە. لەتۆ بەولاوە کەسی تر ناپەرستین و لەبەرنامەکەی تۆ بەولاوە هیچ بەرنامەیەکی ترمان قبوڵ نیە.(وەرگێڕ).

(٥) أ. سورة الأعراف: (١٢٦).

## إلهی أنت المغيث وحدك- خودايا تەنيا تۆ فريا ڕەسی

يامن يرى مافي الضمير وسمع — أنت المُعضدُ لكـــــل مـايتوقـع
يامن يرجى للشدائد كلـهـــــا — يامن إليهِ المشتكـــــى والمـفزع
يامن خزائن رزقه فى قول كـن — أُمنن فإن الخير عــــندك أجمـع
مالى سوى فقرى إليك وسيــلة — فبالأفتقار إليــك فقرى أدفــــع
مالى سوى قرعى لبابك حيــلة — فلئن رُدِدْتُ فأىُّ فضلك باب أقرع
ومن الذى أدعو وأهتف باسـمَه — إن كـــان فضلك عـن فقيرك يُمنع
حاشـا لجودك أن تُقَنِّطَ عاصياً — الفضلُ أجزل والمواهب أوســــع
ثم الصـلاة على النبى وآلــــه — (من جاء بالقرآن نوراً يسطـــع).

## إلهی أنت عونی- خودايا هەر تۆ يارمەتيدەری منی

إلهى ليــــس لى إلاك عونٌ — فكن عونى على هذا الزمـــــان
إلهى ليــــس لى إلاك ذخرٌ — فكن ذخرى إذا خلـت الــيدان
إلهى ليـــس لى إلاك حصنٌ — فكن حصنى إذا رامٍ رمــــــاني
إلهى لـــــيس لى جــــاهفك — جاهى إذا هاجٍ هجـــــــــــاني
إلهى أنت تعلم مابنفـــــسى — وتعلم مايجيش بــه جنــــــاني
فهب لى يارحيم رضاً وحلماً — إذا مازلَّ قلبى أو لســـــــــــاني
إلهى ليس لى إلاك عــــــزٌ — فكن عزى وكن حصــن الأماني .

---

ب. واتە: ئەی پـەروەردگارا سـەبرو ئـارامو پـشو درێـژیمان بەسـەردا بڕێـژێت و بەموسـڵمانەتی بمـان مرێنی.(وەرگێڕ).

## لا تدعوا مع الله أحداً- جویٚ له خوا هاوار مەکەنه کەسی تر

قولوا لمن يدعو سوى الرحمـــــن متخشعاً فى ذلة العبـــــدان
يـــــــــاداعياً غير الإله ألا إتئـد إن الدعاء عبــادة الرحمـــــان
أنسيت أنك عبدهُ وفقيـــــــــرهُ ودعاءهُ قـد جاء فى القـرآن
الله أقرب مٌن دعـــــــــوت بكربة وهو المُجيبُ بلا توسط ثـــان
هل جــــــاء دعوة غيرهفى سنَّة؟ أم أنت فيـه تابع الشيطـان؟
إن كنت فيما تدعيه على هـــدى فلتأتنا بسواطع الــبرهـــــان
والله مادعت الصحـــــــابة غيرهُ يتقربون به كذى الأوثـــــان
لكن هذا الفعل كـــــــان لديهـمو شركاً، وفـروا منـهُ للإيمـــان
ليس التوسل والتقرب بالهـــــوى بل بالتُقى والـبر والإحســـان
هذا كتاب الله يفصل بينـنـــــــا هل جاء فيـه توسلوا بفـــلاك
إن التوسل فى الكتاب واضــــحٌ وإذا فطنت فإنَّهُ نـوعـــــــان
الشيخ عبدالظاهر أبو السمح ـ ـــ. مدير دار الحديث بمكة المكرمة.

## ئەم بانگەوازە( هذا النداء ):

ئاراستەیە بۆ هەمو خوشكو برایانی موسڵمان بەگشتیو بەتایبەتیش ئاراستەیە بۆ:

١. هەمو خوشكو برایانی پەروەردیارو بەرپرسانی پەروەردەو فێر کردنی ڕۆڵەکانمان بۆ ئەوەی بەئەرکی سەرشانی خۆیان هەڵ بستن لەپەروەردەو فێرکردنی کوڕانو کچانمان.

٢. هەمو مامۆستایانی پیاوانو ژنان کەخوای گەورە زانستی پێ بەخشیون و ئەم شەرەفەیان وەرگرتوەو دەیانەوێ ڕۆڵەکانمان پەروەردەو فێر بکەن.

٣. هەمو مامۆستایانی ناوەندیو دواناوەندیو قۆناغەکانی تر کەگرنگی دەدەن بەدەرس گوتنەوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئەو ئەمانەتەی کەلە ئەستۆیاندایە.

٤. دایکانو باوکان کەداوای پەروەردەو فێر کردنێکی باش و ڕاستو شەرعیانەی ڕۆڵەکانی یان دەکەن بۆ ئەوەی لەژیانی دنیاییو لەدوای مردنیشیان لەڕۆژی قیامەتدا سودیان لێ وەر بگرن. هەروەکو پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{ إذا مات الإنسان إنقطع عمله إلاَّ من ثلاث: صدقة جارية، أو علم ينتفع به أو ولد صالح يدعو له) رواه مسلم.

٥. خوشك و برایانی خزمەتكار كەبەكاری پەروەردەو فێر کردنی ڕۆڵەکان هەڵ دەستن.

٦. خوشكو برایانی قوتابی کەحەزیان لێ یەو دەیانەوێ لەدوا ڕۆژدا سەرکەوتوو سەرفراز بنو ئەوانیش بتوانن لەدوا ڕۆژدا خزمەتی گەلەکەی خۆیان بکەن.

٧. کوڕانو کچان کەبەختەوەریو سەر بەرزیو سەرفرازی بۆ خۆیانو بۆ ئەندامانی خێزانو ئوممەتی ئیسلامی دەخوازن لەدنیاو لەقیامەتدا.

لەکۆتایی دا داوا لەخوای باڵا دەستو کار بەجێ دەکەین کەهەمو لایەکمان بۆ کارێك کەبۆ خۆی پێ ی ڕازیەو خۆشی دەوێت یارمەتی و هاریکاری بکات... ئامین.

# فیقهی بێ نوێژی و خوێنی منداڵبوون و خوێنی سروشتی ئافرەتان

نوسینی
شیخ محمد صالح عثیمین

وەرگێرانی
ئەحمەد میرزا ڕۆستەمی ژێرو

# بەشی یەكەم

## واتای بێ نوێژی و حیكمەتەكەی

### بێ نوێژی ( الحیض ) لەزماندا : لەبەر ڕۆیشتنی شتێك و بەردەوام بونی.

لەزاراوەی شەرعدا: لەبەر ڕۆیشتنی خوێنی سروشتی مێینە بەبێ هیچ هۆكارێك و لەچەند كاتێكی دیاریكراودا. خوێنێكی سروشتیەو بەهۆی نەخۆشیەوە یابرینداربون و كەوتن و منداڵ بونەوە ڕو دەدات. جالەبەر ئەوەی كەخوێنێكی سروشتیە بەگوێرەی حاڵ و بارو گوزەرانی مێینەكەو شوێن و ئاوو هەوا دەگۆڕێت و جیاوازن تیایدا. بۆیە ئافرەتان تیایدا جیاوازو هەمە چەشنەن.

حیكمەتی ئەو بێ نوێژیە: لەبەر ئەوەی منداڵ لەناو سكی دایكی دا ناتوانێت خواردن وەربگرێت و بیخوات وەك چۆن لە دەرەوەی سكی دایكی دا دەستی دەكەوێت و دەیخوات. وەهیچ كەس و بەبەزەیی ترین دروست كراوێك ناتوانێت ئەو خواردنە لەناو سكی دایكی دا بگەیەنێتە ئەو كۆرپەلەیە. ئالەو كاتەدا خوای بالا دەست و كار بەجێ بۆ دروست كراوەكەی خۆی و لەناو بۆشایی لەشی مێینەدا چەند ڕژێنەیەكی خوێنینی دروست كردون بۆ خواردنی ئەو كۆرپەلەیە لەناو سكی دایكی دا بێ ئەوەی پێویستی بەخۆراك خواردن و هەرس كردن هەبێت، لەرێگەی ناوكەوە ئەو ڕژێنە خوێنینانە دەگوازرێنەوە بۆ ناو لەشی كۆرپەلەكەو خوێن بەهەمو دەمارەكانی دا دەڕوات و دەبێتە خۆراك و خواردن بۆ ئەو كۆرپەلەیە. بەرزو پیرۆزی بۆ خوای گەورە باشترینی دروستكاران﴿فتبارك الله أحسن الخالقين﴾.

ئائەمە بو حیکمەتی دروست بون‌و ڕودانی بێ نوێژی لەمێینەدا. بۆیە ئەگەر ئافرەت سك پڕ بو ئەو بێ نوێژیە دەوەستێت‌و ڕو ناداتو کەم وایە ئافرەتان بێ نوێژی ببینن.

هەروەها لەکاتی شیر دانیشدا کەم وایە ژنان بێ نوێژی ببینن بەتایبەتیش لەسەرەتای کاتی شیر پێدان.

# بەشی دووەم

# کاتی بێ نوێژی و ماوەکەی

## کاتی بێ نوێژی بەدو پێگەدا دەڕوات:

### پێگەی یەکەم: لەو تەمەنەدا کەبێ نوێژی ئاسایی تێدا ڕو دەدات:

ئەو ساڵو تەمەنانەی کەبێ نوێژی ئاسایی تێدا ڕو دەدات بەزۆری دەکەوێتە نێوان دوازدە ساڵیو پەنجا ساڵی یەوە. وەدەش بێت مێینە پێش ئەو تەمەنو دواتریش بکەوێت لەبێ نوێژی دا بەگوێرەی حاڵو گوزەرانو ژینگەو ئاوو هەواکەی کەتیایدا دەژیات.

* زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت جیاڕان لەوەدا: کەئایا ئەو تەمەنەی کەتیایدا بێ نوێژی سەرهەڵ دەدات سنورێکی دیاریکراوی هەیە، بەوەی کەمێینە پێش ئەو تەمەنە یادوای ئەو تەمەنە توشی بێ نوێژی نابێت. وەئەو خوێنەی کەپێش ئەو تەمەنە یادوای ئەو تەمەنە دێت ئەوە خوێنی پیسو نەخۆشیە نەك خوێنی بێ نوێژی؟ زانایان لەمەدا جیاوازن. (الدارمي) دوای هێنانەوەی هەمو جیاوازیو جیاڕاکان گوتویەتی:

ـ ئەمانە هەمویان لای من هەڵەن! چونکە سەرچاوەی بۆ گەڕانەوەی هەمو ئەوانە بونە(الوجود) واتە ڕودانی ڕوداوەکە ، ئەوە چ قەدەرێکە لەهەر حاڵەتێك و تەمەنێکدا کەپێویستە بێ نوێژی دروست بکرێت یاببێت؟ خوای گەورەش لەهەموان زاناترە.(المجموع شرح المهذب:١/٣٨٦).

ئەوەی (الدارمي) دەیڵێ ئەوە ڕاستە، هەر ئەمەش هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام(إبن تيمية)یە، جاهەر کاتێك مێینە بێ نوێژی دی یاکەوتە بێ نوێژیەوە ئەوە کەوتۆتە عادەتی سروشتی خۆیەوەو بێ نوێژە جابا تەمەنی لەنۆ ساڵیش کەمتر بێت، یاخود تەمەنی لەپەنجا ساڵی پتر بێت، چونکە حوکمەکانی بێ نوێژی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی

پەیوەستیان کردوە بەبونی خۆی واتە بەڕودانی بێ نوێژیو خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی هیچ تەمەنێکی دیاریکراویان بۆ دانەناوە، جا بۆیە لەم کێشەدا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ بونو ڕودانی ئەو حاڵەتە کەحوکمەکانی پێوە پەیوەست کراون، وەدەست نیشان کردنو دانانی تەمەنێکی دیاریکراو بۆ ڕودانی بێ نوێژی پێویستی بەبەڵگە هەیە لەقورئان یا لەسوننەتدا، دەی بەڵگەش نیە.

## پێگەی دووەم: لەماوەی بێ نوێژی دا:

زانایان دەربارەی ئەم ماوەیە زۆر جیاڕان کە نزیکەی شەش یاحەوت گۆتەی لەسەرن: إبن المنذر گوتویەتی: دەستەیەك لەزانایان گوتویانە :( نەبۆ کەمترین بێ نوێژیو نەبۆ زۆر ترینی سنورێك نیە بەڕۆژ بژمێردرێت)). گوتم: ئەم قسەو گۆتەیە وەك هەمان گۆتەی ڕابردوی(الدارمي) وایە، کەئەمە ڕای شێخی ئیسلام(إبن تیمیة)شە و گۆتەو ڕایەکی ڕاستە چونکە قورئانو سوننەتو ئیعتبارو پشت ڕاستی دەکەنەوەو بەڵگەیان هەیە:

**بەڵگەی یەکەم**: فەرمودەی خوای باڵا دەستو کار بەجێ:﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ﴾(١). لەم ئایەتەدا خوای گەورە کۆتایی قەدەغە کردنەکەی بەپاك بونەوە بەستۆتەوەو نەی فەرموە تاشەوو ڕۆژێك یاتاسێ ڕۆژان یاتا پانزە ڕۆژانو کاتی دیاریکراوی بۆ دانەناوە. ئەمە وادەگەیەنێ کەدەردو بەڵگەی حیکمەتەکە بریتیە لە بێ

---

(١) أ ـ سورة البقرة: (٢٢٢).

ب ـ واتە: پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی بێ نوێژی ئافرەتان تۆ لەوەڵامدا پێ یان بڵێ: ئەوە ئازارێکەو توشی ئافرەتان دەبێت، ئێوە لەو کاتەی بێ نوێژی دا کەنارگیر بن لەگەڵ ژنەکانتانداو نزیکیان مەکەونەوە واتە لەگەڵیاندا جوت مەبنو جیماعیان لەگەڵ مەکەن هەتاکو ئەو کاتەی کەپاك دەبنەوەو بێ نوێژیەکەیان تەواو دەبێت. وەرگێر.

نوێژی لەبون‌و نەبونی واتە ڕودان‌و کۆتایی هاتنی، جاهەر کاتێك بێ نوێژیەکە سەری هەڵ دا ئەوە حیکمەتەکە جێگیر دەبێت واتە حیکمەتەکە هەیە، وهەر کاتێکیش کۆتایی هات‌و نەما ئەوە حیکمەتەکەش لەگەڵ ئەودا دەڕوات‌و نامێنێ.

**بەڵگەی دوەم:** ئەوەی لە(صحیح) مسلم دا هاتوە کەپێغەمبەرﷺبەعائشەی فەرموە: کاتێ لەعەمرە کردندا بەرگی ئیحرامی پۆشیوەو توشی بێ نوێژی بوە :{افعلي مايفعل الحاج غير ألاَّ تطوفي بالبيت حتى تطهري. قالت: لما كان يوم النحر طهُرَتْ}(١). وەلە(صحيح البخاري) دا هاتوە کەپێغەمبەرﷺبەعائشەی فەرموە :{إنتظري فإذا طهرتِ فاخرجي إلى التنعيم}(٢). جا پێغەمبەرﷺکۆتایی قەدەغە کردنەکەی بەپاك بونەوە و تەواو بونی بێ نوێژیەکەی بۆ داناو کاتێکی دیاریکراوی بۆ دانەنا. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت یابەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەحوکمەکەی پەیوەست کرد بەبێ نوێژیەکەو سەرهەڵدان‌و تەواو بونی. واتە بون‌و نەبون‌و کۆتایی هاتنی بێ نوێژیەکە.

**بەڵگەی سێیەم:** ئەو خەملاندن‌و دانان‌و درێژە پێدانانەی کەهێنرانەوە کەلەزانایان‌و فیقهزانانەوە دەربارەی ئەم کێشەیە هێنرانەوە هیچیان نەلەکتێبی خوای باڵا دەست‌و کار بەجێ‌و نەلەسوننەتی پێغەمبەر ﷺی خوا دا نەهاتون، لەگەڵ ئەمەشدا پێویستە زۆریش پێویستە کەڕون بکرێنەوە. ئەگەر ئەمە وەك ئەوە پێویست باکەپێویستە لەسەر بەندەکانی خوا تێ ی بگەن‌و لێ ی ورد ببنەوەو بەندایەتی پوختە بۆ خوای گەورە بکەن ئەوا خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی بەڕون کردنەوەیەکی دیارو بەرچاو بۆ هەر یەکێ

(١) أ ـ الحديث(٤/٣٠).

ب ـ واتە:حاجیەکان چی دەکەن تۆش ئەوە بکەو تەنیا تەوافی دەوری بەیت مەکە. وەرگێڕ.

(٢) أ ـ ٢/٦١٠ باب أجرة العمرة على قدر النصب/ صحيح البخاري.

ب ـ واتە: چاوەڕوان بە هەتا پاك دەبیتەوە ئەوجار بچۆ بۆ تەنعیم لەوێ ئیحرام ببەستە تەلبی یە بکەو دەست بەتەواف بکە. وەرگێڕ.

لەئێمە ڕونیان دەكردەوە، وەلەبەر گرنگی ئەو حوكمانەی كەلەسەر ئەمە خال بەند دەبن لەنوێژو ڕۆژوو نیكاحو مارە بڕین، تەلاقو میراتو گەلێ حوكمی تر. هەروەكو چۆن خوای گەورەو پێغەمبەرەكەی ﷺ ژمارەی نوێژەكانو كاتەكانیو ڕكوعو كڕنۆشەكانیان بۆ ڕون كردوینەوە، هەروەها زەكاتو ماڵەكەیو بڕەكەیو نەسابەكەیو دەدرێ بەكێ، وەڕۆژوو ماوەكەیو كاتەكانیو، هەروەها حەج...تد. و هەتا ڕەوشتو ئاكارەكانیی خواردنو خواردنەوەو ونوستنو كۆبونەوە لەگەڵ خێزانو دانیشتنو چونەوە ماڵو دەرچون لێ یو ڕەوشتەكانی چونە سەر ئاو، و هەتاكو ژمارەی ئەو بەردانەی كەبۆ خۆ پاك كردنەوە كەسوننەتە ژمارەیان سێ بەرد بن لەكاتی چونە سەر ئاو ونەبونی ئاوداو گەلێك ڕون كردنەوەو كاری وردە كاریو كارە زلەكانیان بۆ ڕون كردوینەوە كەخوای گەورە ئاینەكەی خۆی كۆتایی پێ هێناوەو نازو نیعمەتی خۆی بەسەر بڕواداراندا تەواو كردوە كەبریتیە لەم ئاینی ئیسلامەیە. هەروەكو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾(١). هەروەها دەفەرموێت:﴿ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَـٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ﴾(٢).

كاتێك كەئەم هەڵ سەنگاندنو شی كردنەوەو درێژە پێدانانە لەكتێبی خوای پەروەردگارو بەتەنێو لە سوننەتی پێغەمبەرﷺدا نەبێت ڕون دەبێتەوە كەهیچ متمانەی

---

(١) أ ـ سورة النحل: (٨٩).

ب ـ واتە:ئێمە ئەو قورئانەمان بۆ ناردویتە خوار كەلێك دانەوەو شرۆڤە كردنو ڕون كردنەوەی هەمو شتێكی تێدایە. وەرگێڕ.

(٢) أ ـ سورة یوسف: (١١١).

ب ـ واتە: ئەم قورئانە شتێكی هەڵ بەست نیە بەڵكو پاڵشتو بەڕاست گێڕانی ئەو بەرنامەیە كەلەژێر دەستی پێغەمبەرداﷺو ڕون كردنەوەو شی كردنەوەو درێژە پێدانی هەمو شتێكە. وەرگێڕ.

پـێ ناکرێـتو بـاوەڕی پـێ ناکرێـت، بـەڵکو متمانـە بـەزاراوەی بـێ نوێـژی یەکـە دەکرێـت کەحوکمە شەرعیەکانی پێوە بەندن بەبونو نەبون..وەئەمەش بەڵگەیە، مەبەستم ئەوەیـە کـە نـەبونو بـاس نـەکردنی حـوکم لـەقورئانو لەسـوننەتدا بەڵگەیـە لەسـەر پـشت پـێ نەبەستنو گوێ پێ نەدانی کەلەم سەرەباسەو لەم کێشەو سەرە باسـە زانستیەکانی تـردا سـودی لێ دەبینیـت، چـونکە حوکمـە شـەرعیەکان دانامـەزرێن مەگـەر بەبەڵگـەی شـەرع لەقورئانو لەسـوننەتی پێغەمبـەرداﷺ، یـاخود بـەکۆڕای ڕونو ئاشـکراوو ناسـراو یـاخود بەپێوانە( القیاس)ی ڕاست. شێخی ئیسلام(إبن تیمیة) لەبنەماو دەستورێکی دا گوتویەتی: (لەوانە بێ نوێژی خوای گەورە گـەلێك حـوکمی جـۆراو جـۆری جـوێ لـەقورئانو سـوننەت پێـوە پەیوەنـد کـردوە. بـڕو مـاوەی کـەمیو زۆری بـۆ دیـار نـەکردوە، و پـاك بونـەوەش لـەنێوان دو بـێ نوێـژی دا نیـە، لەگـەڵ ئەوەشـدا کەزۆربـەی زۆری بـەلای ئوممـەت واتـا زانایانەوە لەوەوەیەو زۆریشیان پێویستی پـێ یـەتی. وەزمـانیش جیـاوازی نێـوان بڕێـكو بڕێکی تر ناکات، هەر کەسێك سنورێك بۆ ئەمە دابنێت ئەوە پێچەوانەی قورئانو سـوننەت دەجولێتەوە) قسەکانی إبن تیمیە تەواو بون([1])..

**بەڵگەی چوارەم:** بەڵگەی متمانەو بڕوا پێکراو واتە پێوانەی ڕاست(القیاس الصحیح)، ئەمەش لەبەر ئەوەیە چونکە خوای پەروەردگاری بەرز بنەڕەتی بێ نوێژی بەوە پێناسە کردوە کەبریتیە لەئازارو ناڕەحەتیەك، هەر کاتێك ئافرەت توشی بێ نوێژیەکە دەبێت، ئەو ئازارو ناڕەحەتیەشی توش دەبێت. جیاوازی لەنێوان ڕۆژی دوەمو ڕۆژی یەکەمدا نەکردوە، وەنەجیاوازیشی لەنێوان ڕۆژی چوارەمو سێ یەمدا کردوە، وە نەجیاوازیشی لەنێوان ڕۆژی شانزەهەمو ڕۆژی پانزە هەمدا کردوە،نەجیاوازیلەنێوان ڕۆژی هەژدەهەمو ڕۆژی حەڤدەهەمدا کردوە. بێ نوێژی هەر بێ نوێژیە، ئازارو ناڕەحەتیش هەر ئازارو ناڕەحەتیە.

---

(١) رسالة في أسماء التي علق الشارع الأحكام بها ص٣٥.

کەواتە دەردەکە لەهەردو ڕۆژەکاندا وەکو یەك هەیە، ئەی کەواتە چۆن دەتوانرێت جیاوازی لەنێوان حوکمی هەردو ڕۆژەکەدا بکرێت لەگەڵ ئەوەشدا کەهەردو ڕۆژەکە لەدەردونەخۆشیەکەدا یەکسانن‌وهیچ جیاوازیەکیان نیە؟ ئەدی ئەمە پێچەوانەی پێوانەی ڕاست(القیاس الصحیح) نیە؟ یاخود قیاسی ڕاستەقینە هەردو ڕۆژەکان یەکسان دەکات لەحوکم دا لەبەر ئەوەی هەردو ڕۆژەکان لەدەردەکە(العلة) دا یەکسانن؟

بەڵگەی پێنجەم: جیاوازی لەنێوان گوتەی سنور دانەران‌و پشتیوانەکانیان، ئائەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەلەکێشەکەدا هیچ بەڵگەیەك نیە بۆی بگەڕێینەوە، بەڵکو تەنیا حوکمی هەوڵ‌و تێکۆشانی ( الإجتهاد) ی دوچار بەهەڵەو بەڕاست واتە هەڵە دەکەن‌و ڕاستیش دەکەن هیچیان لەهیچیان باشتر نین کەشوێنیان بکەویت. بەڵکو ژێدەرو سەرچاوەی ڕاستەقینەی چارەسەری کێشەکە تەنیا قورئان‌و سوننەتەو بەس.

ئەگەر بەهێزی ڕاو قسەکە دەر کەوت کەسنور بۆ کەمترین‌و زۆر ترینی بێ نوێژی نیەو ئەو کات ڕاو قسە ڕاست ترینی ڕاکانە، بزانە ئەوەی کە ئافرەت دەیبێنێ لەخوێنی سروشتی‌و هیچ هۆکارێکی نەبو لەنەخۆشی یابریندار بون‌و ئەو جۆرە شتانە ئەوە خوێنی بێ نوێژیە(الحیض) بێ ئەوەی هیچ کات‌و تەمەنێکی بۆ دابنێت، مەگەر ئەو خوێنە بەردەوام لەبەر ئافرەت بڕوات‌و پسانەوەی نەبێت، یاخود ماوەیەکی کەم بوەستێت وەك ڕۆژێك یان دو ڕۆژ لەمانگ دا، ئەوە ئەو حاڵەتە خوێن لەبەر ڕۆیشتنی دەمارە(الاستحاچە)یە نەك بێ نوێژی(الحیض) گەر خوا ویستی لەسەر بێت لەداهاتودا باسی دەکەین.

شێخی ئیسلام إبن تیمیە گوتویەتی:(( بنەڕەتی هەمو ئەو خوێنەی کەلەمنداڵ دانەوە دێتە دەر بێ نوێژیە(الحیض) تائەو کاتەی کەبەڵگەی بونی خوێن لەبەر ڕۆیشتن(الإستحاضة) دەکەوێتە دەست. ئەو کاتە(الإستحاضة)یە نەك بێ نوێژی(الحیض)).

هەروەها گوتویەتی:(( هەر خوێنێك كەدەكەوێتە خوار بێ نوێژیەوە، ئەگەر نەزانرا كەئەو خوێنە خوێنی دەمار( الإستحاضة)ە یاخود بەهۆی بونی برینەوە پەیدا دەبێت ))([1]).

وەئەم قسەیە هەروەكو لەڕوی بەڵگەوە ڕاستو دروستە وەلەڕوی تێگەیشتنو لێ حاڵی بونیشەوە نزیك ترەو بەكار هێنانو جێ بەجێ كردنیشی ئاسانترە هەروەكو سنور دانەران ئاماژەیان پێ كردوە، بێجگە لەمانەش پتر لەدڵدا دەچەسپێو بیرو هۆش قبوڵیەتی ، چونكە لەگەڵ ڕوحی ئایینی ئیسلامو بنكەو بنەماكانی دا دێتەوە، كەئەویش نەرمیو ئاسانكاریو گیانی لێ بوردنە(الیسر والسهولة). ئەوەتە خوای باڵا دەستو كار بەجێ دەفەرموێت:﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ ﴾([2]) واتە: ئەم ئایینە هیچ قورسكاریو زەحمەتی تێدا نیە هەر هەموی ئاسانكاری یەو ئەنجامدانو جێ بەجێ كردنی فرمانو ئەحكامەكانی هەرهەموی سوكو ئاسانو هیچ بەزەحمەتو قورس نین. وەرگێڕ. بەسود وەرگرتن لە تەفسیری گوڵشەن ب٢ل٨٦١..( هەروەها پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {إنَّ الدين يُسرٌ ولن يشادَّ الدين أحدٌ إلاَّ غلبهُ، فسددُوا وقاربُوا وأبشرُوا}([3]).( واتە: ئایین ئاسانكاریە، ئایینی ئیسلام توندو تیژیو تەنگی بەكەس هەڵ نەچنیەوەو ئاسانكاری كردەوەو توانیویەتی بەنەرمیو بەهێدیو هێمنی تێ ی بگەیەنێتو بڕوا بەر ئایینە بهێنێتو لەخۆی بگرێت، جاهەر كەسێك نەسەر خۆی گران كرد بەسەری دا زاڵ دەبێت؛ دەی كەواتە ئێوەش ئەی بڕواداران ئەم ئامانجە بپێكینو ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوەو خۆنزیك بكەنەوەو نەرمو لەسەرخۆو هێمن بنو ئاسانكاری بكەنو توندو تیژ مەبنو مزگێنی دەر بن بۆ خەڵكی بەژیرانە لەگەڵ خەڵكی دا هەڵسو كەوت بكەن تاهەمو خەڵكی لەدەوری ئیسلامدا كۆببنەوە. وەرگێڕ). وەلەڕەوشتو ئاكارەكانیﷺئەوە بو

---

(١) ا.ە (المصدر السابق ص٣٦-٣٧).

(٢) سورة الحج: (٧٨).

(٣)رواه البخاري.

لەنێوان دو شتاندا سەر پشك کراوە، نەرمو نیانیو ئاسانکاریو توندو تیژی دیارە ئەوە نەرمو نیانیو ئاسانکاری هەڵبژاردوە ئەگەر گوناحو بێ فەرمانی خوای گەورەی تێدا نەبوبێت.

## بێ نوێژی دوگیان = سك پڕ( حیض الحامل )

زۆربەی زۆری مێینە وایە کەئەگەر دوگیان بو بێ نوێژی نامێنێ، ئیمامی أحمد ڕەحمەتی خوای لێ بێت گوتویەتی:( إنما تعرف النساء الحمل بانقطاع الدم) واتە: ژنان بەوە دەزانن کەدو گیان بون، کاتێ خوێنی بێ نوێژی(الحیض) نابینن‌و دەوەستێت. ئەگەر ژنی دوگیان پێش منداڵ بون بەماوەیەکی کەم دو ڕۆژ یاسێ ڕۆژ خوێنی بینی‌و ژانی لەگەڵ دا بو ئەوە خوێنی منداڵ بونە نەك هی بێ نوێژی (الحیض)، وەئەگەر پێش منداڵ بون بەماوەیەکی زۆر یان کەم بەڵام ژانی لەگەڵ دا نەبو ئەوە خوێنی منداڵ بون نیە، بەڵام ئایا ئەوە خوێنی بێ نوێژیە(الحیض)کەحوکمەکانی بێ نوێژی بەسەردا بچەسپێت، یاخود خوێنی پیسەو حوکمی بێ نوێژی بەسەردا ناچەسپێت واتە خوێنی نەخۆشیە؟

لەمەدا جیاوازی‌و جیاڕا لەنێوان زانایاندا هەیە، بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە کەخوێنی بێ نوێژیە(الحیض) بەمەرجی ئەو ژنە لەباری ئاسایی بێ نوێژی خۆی دا بێت(المعتاد في حیضها)، چونکە لەبنەڕەتدا ئەو خوێنەی کەتوشی ژن دەبێت ئەوە بێ نوێژیە ئەگەر هیچ هۆکارێك قەدەغەی ئەو بێ نوێژیە نەکات‌و لەبەردەمدا بەربەست نەبێت، وەلەقورئان‌و سوننەتدا هیچ هۆو هیچ بەڵگەیەك نیە کەبەربەستی بێ نوێژی ژنی دوگیان بکات‌و قەدەغەی بکات.

ئائەم ڕایە ڕاو ڕێبازی ئیمامی مالك‌و ئیمامی شافعیەو هەروەها هەڵبژاردنی شێخی ئیسلام(إبن تیمیة) شە لە(الإختبارات ص٣٠) هێناویەتی‌و باسی دەکات‌و ( البیهقی)ش دەی گێڕێتەوە بەڕیوایەتی أحمد، بەڵکو دەگێڕێتەوە کەئەو بۆ ئەو سەرچاوە گەڕاوەتەوەو لەوێ ی هەڵێنجاوە(أ.ه). وەلەسەر ئەم بنچینەو بنەمایەدا جێگیر بوەو سەلمێنراوە کەئەوەی بۆ بێ نوێژی(الحیض)ە بۆ بێ نوێژی دو گیانیش جێگیرو سەلمێنراوە.. واتە ئەوەی کەخوێنی بێ نوێژی ئاسایی ژنانە دەبینێ ژنانی دوگیانیش واتە سك پڕیش دەی بینن. تەنیا لەدو ڕوەوە نەبێت:

١- **ئازاد کردن(الطلاق):** تەڵاق دان ژن بێ بەش دەکات لەپابەندی بێ نوێژی لەوەی کەلەژنانی تری ناسك پڕدا هەیە. واتە ئەو ماوە(عدة)ی کەژنانی ناسك پڕ دەبێ پێوەی

پابەند بن کەلەکاتی بێ نوێژی دا تەلاق دراون، ئەوا ژنانی سك پڕ ناگرێتەوە چونکە تەلاق دان لەکاتی بێ نوێژی داو لەژنانی ناسك پڕدا پێچەوانەی فەرمان‌و فەرمودەی خوای گەورەن کەدەفەرموێ:﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحْصُوا ٱلْعِدَّةَ ﴾(١). بەلام تەلاق دانی ژنانی سك پڕ و لەکاتی بێ نوێژی دا ئەم سەرپێچی یە نایانگرێتەوە واتە سەرپێچی فرمانی خوای گەورە نیە، چونکە هەر کەسێك ژنی سك پڕ تەلاق بدات، بۆ ماوەی خۆی تەلاق دەدات واتە تا ماوەیەکی شەرعی تەلاقی ناکەوێت، جائەو ژنە لەبێ نوێژی دا بێت یاخود لەکاتی بەنوێژی واتا پاکی دا بێت چونکە ماوەکەی تائەو کاتەیە کەمنداڵەکەی دەبێت جالەبەر ئەوە حەرام نیە کەلەدوای لەگەڵ کۆبونەوە(الجماع) تەلاقی بدات بەپێچەوانەی ژنانی تری ناسك پڕ.

**٢ـ دو گیانی(الحمل):**

ماوەی سك پڕی هەڵ ناوەشێتەوەو کۆتایی نایەت تەنیا بەدانانی سکەکەی نەبێت، جالەبێ نوێژی دا بێت یان نا.. بەپێ ی فەرمودەی خوای گەورە کەدەفەرموێ: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلْأَحْمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ﴾(٢).

---

(١) أ ـ سورة الطلاق: (١).

ب ـ لەماوەی خۆیان دا ئازادیان بکە، وەرگێڕ.

(٢) أ ـ سورة الطلاق: (٤).

ب ـ واتە: ئەو ژنانەی کەسك پڕن و تەلاق دەدرێن ماوە (عدة) کەیان دانانی منداڵەکەیانە. وەرگێڕ.

# بەشی سێ یەم

## بێ نوێژی لە پڕ (الطواريء)

* بێ نوێژی لەپڕ چەند جۆرێکی هەن کەلەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گردیان دەکەینەوە:

**یەکەم:** کەمیو زۆری وەك ئەوەی کەعادەتی ئافرەت شەش ڕۆژ بێت، وبەردەوام بێت تاحەوت ڕۆژ، یاخود عادەتی ئاسایی ئافرەت خۆی حەوت ڕۆژ بێت بەڵام ئەو شەش ڕۆژان ببینێت.

**دووەم:** پێش کەوتن: وەك ئەوەی کەعادەتی ئاسایی خۆی لەکۆتایی مانگ دابێت، بەڵام ئەولەپڕ لەسەرەتای مانگ دا تووش ببێت. یاخود بەپێچەوانەوە عادەتەکەی لەسەرەتای مانگ دا بێت، کەچی ئەو لەکۆتایی مانگ دا ببینێت. ئەهلی زانستو زانیاری لەحوکمی ئەم دو جۆرەدا جیاوازن. بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەیە هەر کاتێك خوێنی بینی ئەوە خوێنی بێ نوێژیە(الحيض) وەکەی پاك بوەوە چ لەعادەتی ئاسایی خۆی پتر بێت یاخود کەمتر بێت. وەدوا بکەوێت یاخود پێش بکەوێت کەلە پێشتر بەڵگەکەیمان هێنایەوە لەبەشی پێشو تردا، کە خوای گەورە حوکمەکەی پەیوەست کردوە بەبونی بێ نوێژیو نەبونیەوە.

ئەم ڕایەش ڕێبازو ڕای ئیمامی شافیعیەو شیخی ئیسلام(إبن تيمية)ش ئەم ڕێبازو ڕایەی هەڵبژاردوە. وەخاوەنی (المغني)ش ئەم ڕایەی بەهێزو پشت ڕاست کردوەو پاڵپشتی دەکاتو دەڵێت:(ئەگەر ئەو عادەتی بێ نوێژیە ی بەو شێوەیەی ناوبراو باسی کردوە موعتەبەر بێت لەو ڕێبازەدا ئەوە پێغەمبەری خواﷺ بۆ ئوممەتەکەی ڕون کردۆتەوە، لەوەی کەڕون کردنەوەی دوا کەوتوە ، کەنابێ لەکاتی خۆی دوا بخرێت.

کەکاتێك کەخێزانەکانیو ژنانی تری غەیری خێزانەکەی خۆی لەهەمو کاتێکدا داوای ڕون کردنەوەو بەڵگەی ڕونکردنەوەیان کردوە، کەنابێ ڕون کردنەوەکان پشت گوێ بخرێنو لەیاد بچێتەوە، وەئەوەی لەئەوەوە ﷺهاتوە عادەتی بێ نوێژیە نەك ڕونکردنەوەکانی تەنیا دەربارەی خوێنی نەخۆشی ( المستحاضة) دا نەبێت.(أ.ە. المغني ٣٥٣/١).

**سێیەم :** ڕەنگ زەردیو تاریکی(لێڵی) خوێن(الصفرة والكدرة):

بەشێوەیەك کەڕەنگی خوێنەکە زەردباو بێت وەك ئەو ئاوە زەردەی کەلەبەر برین دەڕوات، یاخود ڕەنگی مەیلەو تاریك بێت لەنێوان زەردیو ڕەشی دا واتە لێڵ بێت. ئەگەر ئەم خوێنە لەکاتی بێ نوێژی دا بو، یاخود پێش بێ نوێژی بو بەسەر یەکەوە لەگەڵ خوێنی بێ نوێژی دا ڕوی دا ئەوە هەر بێ نوێژیەو حوکمی بێ نوێژی بەسەردا دەچەسپێ، بەڵام ئەگەر دوای بێ نوێژی بو ئەوە بێ نوێژی نیە، بەپێ ی گوتەی دایکی عگیە ڕچی الله عنها کە گوتویەتی:(كنا نعدُّ الصفرة والكدرة بعد الطهر شيئاً)([1]).( واتە: ئێمە لەکاتی عادەتی ئاسایی خۆماندا ڕەنگی زەردباوو تاریکیو لێڵی خوێنمان لەدوای پاك بونەوە بەکەمێك دەبینیو دادەنا بەماوەی بێ نوێژی. وەرگێڕ).

أبو داود ڕیوایەتی کردوە هەروەها بوخاریش بەڵام بەبێ دەستەواژەی(بعد الطهر) واتە دوای پاك بونەوەو لەبەشی(باب الصفرة والكدرة في غير أيام الحيض) دا هێناویەتیو لەشرۆڤە کردنەکەی خۆی دا دەڵێ: ( ئاماژە بەکۆکردنەوەی فەرمودەی عائشە کەپێشتر باس کرا کەگوتویەتی(حتى ترين القصة البيضاء) واتە خوێنی بێ نوێژی بەردەوامە هەتاکو ئاوی سپی دەبینن، هەروەها فەرمودەکەی دایکی عگیە کەلەم بەشەدا باس کرا، ئەگەر ڕەنگی زەردو لێڵی بینرا لەکاتی بێ نوێژی دا ئەوا بەگوێرەی فەرمودەکەی عائشەیەو پشت بەو دەبەسترێت، بەڵام جوێ لەم حاڵەتەو لەحاڵەتەکانی تردا بەگوێرەی فەرمودەکەی دایکی عگیە دەڕۆین بەڕێوەو پشت بەو دەبەسترێت. أ.ھ.

---

(١) رواه أبوداود بسند صحيح، ورواه أيضاً البخاري بدون قولها بعد الطهر.

هەروەها فەرمودەی عائشە کەئاماژەی پێکرا ئەوەیە کەبوخاری بابەتەکەی پێوەپەیوەست کردوەو بڕیویەتیەوە . لەپێش ئەم بەشەدا کەدەڵێ: ژنان تارادەیەکی زۆر دەیان نارده لای عائشە ئایا بۆیان دروستە کەشتێك بەکار بهێنن کەپارچە لۆکەیەك( الکرسف)ی تێدا بێت بۆ ئەوەی خۆیانی پێ بپشکنن، داخۆ شوێنەواری بێ نوێژیان پێوە ماوە، یاخود ئەو پارچە پەڕۆیە بە لۆکەیان بەکار دەهێنا کەڕەنگی زەردی پێوە دیار بو، عائشە پێ ی دەگوتن:( لاتعجلن حتى ترينَ القصة البيضاء) واتە: پەلە مەکەن هەتاکو ئەو کاتەی کەئاوێکی سپی دەبینن.(القصة البيضاء) ئاوێکی سپی یە لەمنداڵدان لەدوای نەمانی بێ نوێژی(الحيض) فڕێ ی دەدات.

**جۆری چوارەم:** پچڕ پچڕی خوێن ڕۆیشتن لەکاتی بێ نوێژی دا (تقطع في الحيض):

ئەم حاڵەتە ئەوەیە کە ڕۆژێك خوێن دەبینێت، ڕۆژێك نا و بەردەوام ئاوا دەبێت. ئەمەش دو جۆری هەیە:

**حاڵەتی یەکەم:** وا دەبێ کەئەم حاڵەتە لەهەمو کاتەکاندا لەگەڵ مێینەدا هەمیشە بەردەوام دەبێت، ئەوە خوێنی بێ نوێژی نیە بەڵکو خوێنێکی ترە کەپێ دەگوترێت(الإستحاضة). جا هەر ئافرەتێك ئەمەی بینی ئەوە حوکمی(الإستحاضة)ی بەسەردا دەچەسپێ واتە(أستحاضة)یە نەك بێ نوێژی.

**حاڵەتی دوەم:** لەم حاڵەتەدا ئەم خوێن لەبەر ڕۆیشتنە بەردەوام نیە، و هەندێ کات لەبەری دەڕواتو هەندێ جاریش نا، پاك بونەوەی ڕاستەقینەی هەیە، واتا ناوە بەناوەیە.

زانایان ڕەحمەتی خوایان لێ بێت لەم پاك بونەوەیەدا(النقاء) جیاڕانو جیاوازن:

- ئایا ئەمە پاك بونەوەیە، یان حوکمەکانی بێ نوێژی(الحيض)ی بەردا دەچەسپێن؟.

ڕاو ڕێبازی ئیمامی شافعی لەڕاسترین دوڕاکانی دا ئەوەیە کەئەو ئافرەتە حوکمی بێ نوێژی لەسەر دا دەچەسپێنو بەبێ نوێژی دەژمێردرێت. ئەم ڕایە هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام(إبن تيمية)و خاوەنی(الفائق) و ڕێبازی أبي حنيفەیە. ئەمەش لەبەر ئەوەی چونکە ئاوی سپی (القصة البيضاء)ی تێدا نابینرێت، هەروەها لەبەر ئەوەی ئەگەر بەپاك بونەوە

بژمێردرایە ئەوە دەبوایە لەبەرایییەکەی دا بێ نوێژی هەبایەو هەروەها لە دواوەشی دا هەر بێ نوێژی هەبایە، وەهیچ گۆتەیەکیش نیە دەنا ماوەکە(العدة)بەپێنج ڕۆژ نامێنێت. وەئەگەر پاك بونەوەش بێت ئەوە ئەو ئافرەتە توشی بێزاریو ماندوو بار قورسیەك دەبێت لەخۆ شوشتنەوەو (غوسلا) دەرکردنو گەلێ شتی تری لەم جۆرە هەردو ڕۆژ جارێك. دیارە بار قورس کردنو ئازار دانیش لەشەریعەتی ئیسلامدا کارێکی بێزراوو نەخوازراو و قەدەغەیە سوپاسو شتایش بۆ خوای گەورە.

- ئەوەشی لەمەزهەبە حەنبەلیەکان دا هەیەو باوە ئەوەیە کەخوێنی بێ نوێژیو پاکی(النقاء) پاك بونەوەیە. بەڵام ئەگەر کۆی هەردو حاڵەتەکە لەو ماوە ئاسایی یەی بێ نوێژی ئەو ئافرەتە پتر بو کەهەمیشە دەی بینێت، ئەوە ئەو ماوە زیادەیە بەخوێنی (الإستحاضة) دەژمێردرێت. وەلەکتێبی(المغنی)دا گوتراوە: کەوەستانی خوێن هەر کاتێك لەیەك ڕۆژ کەمتر بو ئەوە بەپاك بونەوە(الطهر) ناژمێردرێت بەگوێرەی ئەو ڕیوایەتەی کەلەبەشی خوێنی منداڵ (النفاس)دا هێناومانەتەوە. چونکە بەهیچ شێوەیەك ئاوڕ لەو پچڕانی خوێنەکە لەکاتی بێ نوێژی دا نادرێتەوە کەلەڕۆژێك کەمتر بێتو ئەمەش ڕای ڕاستو دروستە. إنشاو الله - چونکە سروشتی خوێن وایە ماوەیەك دەڕواتو ماوەکیش دەوەستێت. وەفەرز بونو پێویست بونی خۆشوشتنەوە لەسەر ئەو ئافرەتانەی کەلەم حاڵەتانەدا پاك دەبنەوەو دەبێ هەر کات ژمێرێك نا کات ژمێرێكو هەر کاتە ناکاتێك خۆشوشتنەوە کارێکی زۆر قورسو گرانو ناخۆشەو گوناحەو شەرع ئەوەی قبوڵ نیە بەگوێرەی فەرمودەی خوای باڵا دەستو کار بەجێ کەدەفەرموێت:﴿ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴿٧٨﴾ ﴾(١). جالەسەر ئەم بنەمایە وەستانی خوێن بۆ

---

(١) أ - سورة الحج: (٧٨).

ب - واتە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هیچ قورسی و گرانی نەخستۆتە سەر شانی مرۆڤەکان. وەرگێڕ.

کەمتر لەڕۆژێك بەپاك بونەوە ناژمێردرێت، مەگەر شتێك ببینێت کەپاك بونەوە بسەلمێنێت، وەك ئەوەی کەئەم وەستانی خوێنە لەکۆتایی عادەتی ئاسایی خۆی دا ببینێت، یاخود ئاوی سپی (القصة البیضاء) ببینێت. أ .هـ.

بەمە ڕای خاوەنی(المغنی)دەبێتە ناوەندێك لەنێوان هەردوگوتەکاندا یان هەردو ڕاکاندا.

خواش لەهەموان باشتر ڕاستیو دروستیەکان دەزنێت.

**جۆری پێنجەم: وشکێتی خوێن( جفاف في الدم ):**

ئەم جۆرەشیان ئەوەیە کەئافرەت لەکاتی بێ نوێژی دا تەنیا تەڕیەك(رطوبة) دەبینێت، ئەوە ئەگەر لەکاتی ئاسایی عادەتی خۆی دا بێت یاخود هەر بەسەر کاتی بێ نوێژیەوە بێت پێش پاك بونەوە ئەوە هەر بەبێ نوێژی دەژمێردرێت، بەڵام ئەگەر لەدوای پاك بونەوە بو ئەوە بەبێ نوێژی ناژمێردرێت. لەبەر ئەوەی کە ئەوپەڕی حاڵەتەکە ئەوەیە کەبەڕەنگی زەردو تاریکی(لیّلی) خوێن کۆتایی بێت واتە ڕەنگی زەردو تاریکی(الصفرة والکدرة) خوێن پاشکۆی کاتی بێ نوێژیەکەی بێتو هەر ئەمەش حوکمەکەیەتی.

# بەشی چوارەم

# حوکمەکانی بێ نوێژی

* بێ نوێژی گەلێك حوکمی هەن کەپترن لە بیست حوکمو لێرەدا تەنیا ئەوانە ئاماژە پێ دەکەین کە گرنگنو وزۆر پێویستنو دەتوانین لەم چەند خاڵانەی ژێری دا بیان گوشین:

**یەکەم:** نوێژ: هەر ئافرەتێك کەوتە بێ نوێژیەوە ئەو نوێژ کردنی لەسەر حەرام دەبێت بەفەرزو بەسوننەتەوە. هەروەها نوێژی لەسەر واجب نابێت هەتاکو ئەو کاتەی کەپاك دەبێتەوە واتە ماوەی ئاسایی‌و بێ نوێژیەکەی کۆتایی هاتو بەبڕی یەك ڕکات لەماوەی شەرعی ئەو نوێژە مابو، ئەوە دەبێ ئەو نوێژە بکات دوای ئەوەی پاك دەبێتەوەو خۆی پاك دەشواتەوە. جا ئەوە چ لەدوای ماوەی کاتی نوێژەکەدا بێت یاخود لەپێش ماوەی شەرعی نوێژەکەدا بێت.

نمونە بۆ سەرەتای کاتەکە: ئافرەتێك لەدوای ڕۆژ ئاوا بون بەبڕی ماوەی یەك ڕکات پێش نوێژی شێوان دەکەوێتە بێ نوێژیەوە، ئەوە ئەو ئافرەتە دەبێ نوێژی شێوان(المغرب) بکاتەوە دوای ئەوەی لەبێ نوێژیەکەی پاك دەبێتەوە، چونکە لەکاتی شەرعی ئەو نوێژەدا ماوەی یەك ڕکاتی مابو پێش ئەوەی بکەوێتە بێ نوێژیەکەی.

نمونە بۆ کۆتایی کاتەکە: ژنێك پێش هەڵ هاتنی ڕۆژ بەبڕی ماوەی یەك ڕکات لەزەیستانی(النفاس)و بێ نوێژی ( الحیض) پاك دەبێتەوە. ئەو ژنە پێویستە لەسەری دوای پاك بونەوەی لەزەیستانی یابێ نوێژی کەنوێژی بەیانی بکاتەوە، چونکە لەماوەی شەرعی نوێژی بەیانی دا بڕێکی مابو کەدەتوانرێت ڕکاتێکی تێدا ئەنجام بدرێت واتە: بڕێکی لەو کاتەدا مابو کەدەتوانرێ ڕکاتێکی تێدا بکرێت ئەو ژنە لەبێ نوێژیەکەی دا پاك بوەتەوە.

* بەڵام ئەگەر هەر ژنێك کەوتە زەیستانیو بێ نوێژیەوە ئەو ماوەی کەتێ ی کەوت بەشی ئەنجامدانی ڕکاتێك نەدەبو، وەك ئەوەی کەلەنمونەی یەکەم تێ ی کەوتبو لەدوای ڕۆژ ئاوا بون بەکاتێکی زۆر کەم(بلحظة)و وەك ئەوەی کەلەنمونەی دوەم دا تێ ی دا پاك بوەوە پێش ڕۆژ هەڵات بەکاتێکی زۆر کەم(بلحظة) ئەوە ئەو کاتە پێویست ناکات ئەو نوێژە بکەنەوەو لەسەریان واجب نابێت. بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺکەفەرمویەتی:{من أدرك ركعة من الصلاة فقد لأدرك الصلاة}(١). جا هەر کەسێك زانی یابۆی ڕون بوەوە کەبەکەمتر لەڕکاتێك ڕاگەیشتوە ئەوە ئەو کاتە بەنوێژەکەی ڕانەگەیشتوە.

* وەئەگەر بەیەك ڕکات لەنوێژی عەسر ڕاگەیشت واتە کەوتە بێ نوێژیەوە ئایا کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆیەی لەگەڵ عەسر لەسەر واجب دەبێت؟ یاخود بەڕکاتی کۆتایی نوێژی خەوتنان(العشاء)ڕاگەیشت ئایا نوێژی شێوان(المغرب)و نوێژی عیشای دەکەوێتە سەر؟

لەوەڵامی ئەم پرسیارەدا زانایان جیاڕان، بەڵام ڕاستیو دروستیەکەی ئەوەیە کەلەسەری پێویست نیە، مەگەر لەکاتی خۆی دا توشی ببێت کەبریتین لە نوێژی عەسرو کۆتا ڕکاتی نوێژی خەوتنان(العشاء) بەگوێرەی فەرمودەکەی پێغەمبەرﷺ کەفەرمویەتی:{من أدرك ركعة من العصر قبل أن تغرب الشمس فقد أدرك العصر}(٢).

---

(١) أ ـ متفق عليه.

ب ـ واتە هەرچی بەڕکاتێك ڕاگەیشت ئەوە بەنوێژەکەی ڕاگەیشتوە. واتە هەر کەسێك بەیەکێ لەڕکاتەکانی نوێژەکە ڕاگەیشت لەجەماعەتدا ئەوە بائەو ڕکاتە لەگەڵ جەماعەتو ئیمام بکاتو دوای سەلام دانەوەی ئیمام باهەستێتەوەو باقی ڕکاتەکانی تری نوێژەکەی بکاتەوە ئەوە نوێژو جەماعەتەوە بۆ دروستە. ئیدی بۆ ئافرەتانیش لەکاتی زەیستانی دا بەهەمان شێوە. وەرگێڕ.

(٢) أ ـ متفق عليه.

ب ـ واتە: هەرکەسێك بەیەك ڕکاتی نوێژی عەسر ڕابگات پێش ئەوەی ڕۆژ ئاوا ببێت ئەوە بەنوێژی عەسر ڕاگەیشتوە. واتە ئەگەر بەماوەی یەك ڕکات مابێت ڕۆژ ئاوا ببێت ئەوا بانوێژی عەسر بکاتو بۆی دروستە. وەرگێڕ.

لێرەدا نەی فەرموە بەنوێژی نیوەڕۆو عەسر ڕاگەیشتوە، و باسی لە پێویست (فەرز) بونی نوێژی نیوەڕۆشی نەکردوە. ئیدی بنەڕەتو ڕاستیو دروستی قسان ئەوەیە کەلە نوێژی نیوەڕۆ ئەستۆ پاکە واتە لەسەری پێویست نابێت نوێژی نیوەڕۆ بکاتەوە بەڵکو دەبێ تەنیا نوێژی عەسر بکات ئەمە ڕای ئیمامی أبی حنیفەو مالکە کەلە (شرح المهذب ٣ـ٧٠)دا لەهەردو ئیمامەکەوە هێناویەتی.

* بەڵام زیکرو ویردو یادی خوا سوپاسو ستایش ( التسبیح والتحمید)و بەگەورە دانانی خوا(التکبیر) واتە الله أکبر کردن وسبحان الله والحمدلله کردنو باقی ویردەکانی ترو (بسم الله) کردن لەکاتی خواردنو خواردنەوەدا([1]). و خوێندنەوەی فەرمودەکانو فیقەو دوعاو نزاو پاڕانەوەو(آمین) کردن بۆ دوعاکانو گوێ گرتن بۆ قورئان، ئەمانە هیچیان تێدا نیەو بۆی دروستنو حەرام نین. ئەمە لەهەردو فەرمودە ڕاستەکان(الصحیحین)و لەوانی تریشدا چەسپاوە کەپێغەمبەرﷺلەژورەکەی عائشەدا رضي الله عنها ئانیشکی داداوەو قورئانی خوێندوەو عائشەش لەبێ نوێژی(الحیض)دا بوە.

وەهەروەها لەهەردو فەرمودە ڕاستەکان(الصحیحین) داو لەدایکی عطیة رضي الله عنها دەگێڕنەوە کەگوێ ی لەپێغەمبەر ﷺ بو دەی فەرمو:(یخرج العواتق وذوات الخدور والحُیَّض - یعني إلی صلاة العیدین - ولیشهدون الخیر ودعوة المؤمنین، ویعتزل الحُیَّضُ المصلی}([2]).

---

(١) کەلەزمانی عەرەبیدا پێ یان دەگوترێت:((التکبیر والتسبیح والتحمید والتسمیة علی الأکل وغیره والتأمین علی الدعاء) ) وەرگێڕ.

(٢) واتە: ژنانی ئازادو ژێر پەردە یالەکەژاوەدان(ذوات الخدور) و زەیستانداری بێ نوێژ لەگەڵ ئێمەدا لەنوێژەکانی جەژن دا ئامادە دەبونو گوێ یان بۆ وتارو هەواڵەکانو ئامۆژگاریەکانو بانگەشەی ئیسلام دەگرتو ژنانی بێ نوێژ لەجێگەی نوێژ کردن(المصلی) پەناگیر دەبونو نوێژیان نەدەکرد.وەرگێڕ

* بەڵام ئافرەتی بێ نوێژ(زەیستانداروعادەتی ئاسایی مانگانە) بۆ قورئان خوێندن ئەگە تەنیا بەچاو سەیری بکاتو بەدل وەری بگرێتو بیخوێنێتەوە بەبێ گۆکردنی وشەکان وەك ئەوەی کەقورئانەکە یالەوحەکە(١) دابنێتو بەچاو تەماشای ئایەتەکان بکاتو بەدڵ بیخوێنێتەوە ئەوە هیچی تێدا نیەو بۆی دروستە. ئەوەوی لە((شرح المهذب ٣٧٢/٢))دا گوتویەتی:( جائز بلا خوف ـ واتە بەبێ ترس دروستە ) بەڵام ئەگەر خوێندنەوەکەی بەزمانو بەگۆ کردنی وشەکانی بێت ئەوا جەماوەری زانایان واتە زۆرینە زانایان لەسەر ئەو ڕایەن کەقەدەغەیەو دروست نیە.

(بوخاریو إبن جرير الطبري و إبن المنذر)یش دەڵێن دروستە، وەلەمالكو لەشافعی یەو لەگوتەیەکی کۆندا گێڕدراوەتەوە و لە(فتح الباري)شدا لێ یان گێڕدراوەتەوە. هەروەها بوخاری وەك سەرنجو توانجێك لەسەر إبراهيم النخعي باسی کردوە چی تێدا نیە کەئایەتێك بخوێنێتەوە.

وەشێخی ئیسلام (إبن تيمية)ش لە(الفتاوى مجموعة إبن قاسم)دا دەڵێ:((ئەوەی کەئافرەتی بێ نوێژ لەقورئان خوێندن قەدەغە دەکات لەسوننەتدا بنەڕەتی نیە یا سوننەت نیە، چونکە فەرمودەکەی(لاتقرأ الحائض ولاالجنب شيئاً من القرآن)(٢). فەرمودەیەکی بێ هێزو لاوازە بەکۆڕای ئەهلی زانستو زانیاری فەرمودە واتە فەرمودە ناسان. بەدڵنیاییەوەلەسەر دەمی پێغەمبەرﷺئافرەتان دەکەوتنە بێ نوێژیەوەو ئەگەر قورئان خوێندنیان لێ حەرام بایە وەك نوێژ ئەوە پێغەمبەرﷺبۆی ڕون دەکردنەوەو بۆ ئوممەتەکەی شرۆڤەو شی دەکردەوەو دایکانی بڕواداڕانی فێر دەکردنو لەوانیشەوە بەناو خەڵکی دا بڵاو دەبوەوە.. مادام کەس لەپێغەمبەرەوەﷺنامەی ڕانەگواستوەو هیچ قەدەغەیەك نەبوە کەئەوە دروست نیەو حەرام بکرێت، شتێکی ڕونو ئاشکراشە کەئەوﷺقەدەغەی لەمە نەکردوە، وەکە قەدەغەی نەکردوە وێڕای بونی ئەو هەمو بێ

(١) دەبێ مەبەستی ئەو لەوحە بێت کەقورئانی لەسەر نوسراوەتەوە .(والله أعلم) وەرگێڕ.

(٢). واتە ئافرەتی بێ نوێژ نابێ هیچ لەقورئان بخوێنێتەوە. وەرگێڕ.

نوێژیە لەکاتی پێغەمبەرﷺخۆی دا دیارە ئەو زانیویەتی کەحەرام نیە بۆیە قەدەغەو حەرامی نەکردوە)). أ. هـ.(٢٦:١٩١).

* جادوای ئەو هەمو جیاوازییو بگرەو بەردەی نێوان زانایان (أهل العلم) ئەوەی کەپێویستە بگوترێ ئەوەیە کە: باشتر وایە ئەوەی کەوتە بێ نوێژی یەوە باقورئانی پیرۆز بەگۆکردنو بەزمان نەخوێننەوە مەگەر زۆر پێویست بێتو هەر دەبێ بیخوێنن. وەك ئەوەی کەمامۆستایەو وانە دەڵێتەوەو خەڵکی فێر دەکات دەبێ بۆ فێرخوازەکانی هەر بخوێنێتەوەو گۆی بکات تائەوانیش گۆکردنی ئایەتەکانو پیتو وشەکانو زاراوەکان فێر بن. یاخود لەکاتی تاقی کردنەوەدا خوێندکار پێویستی بەخوێندنەوەی ئایەتەکان هەیە کەمامۆستاکەی دەبێ هەر بۆی بخوێنێتەوە تا بتوانێت تێ ی بگاتو گەلێ بابەتی تری لەم جۆرانە.

**دوەم: ڕۆژو:**

ئافرەتی بێ نوێژ ڕۆژو گرتنی لەسەر حەرامە چ فەرزو چ سوننەتو دروست نیە بیگرێت. بەڵام ئەوەی لەسەری پێویستە ئەوەیە کەدەبێ فەرزەکانی بگرێتەوە بەگوێرەی فەرمودەی عائشە رضي الله عنها: ((کان یصیبنا ذلك - تعني الحیض - فتؤمر بقضاء الصوم ولانؤمر بقضاء الصلاة)([1]).

ئافرەت هەر کاتێك کەوتە بێ نوێژی یەوەو بەڕۆژو بو ئەوە ڕۆژوەکەی بەتاڵ دەبێتەوە جابا یەك لەحزەشی مابێت بۆ کاتی ڕۆژ ئاوا بون، و دەبێ ئەو ڕۆژوە بگێڕێتەوە ئەگەر هاتو فەرز بو. بەڵام ئەگەر هاتو هەستی بەجوڵەو تەزوی بێ نوێژی یەکەی لەناو جەستەی خۆی دا کرد لەپێش ڕۆژ ئاوا بون بەڵام هیچ نەهاتە دەرو هیچی نەبینی تادوای

---

(١) أ - متفق علیە.

ب - واتە: ئێمە کەتوشی بێ نوێژی دەبوینو فەرمانمان پێ دەکرا بەگێڕانەوەی ڕۆژوەکانمان، بەڵام فرمانمان پێ نەدەکرا بەگێڕانەوەی نوێژەکانمان. واتە: ئافرەتی بێ نوێژ دەبێ ڕۆژوەکان بگێڕنەوە بەڵام نوێژەکان نەو . وەرگێڕ.

ڕۆژئاوا بون[١]. ئەوە بەپێ ی گوتەی ڕاست(القول الصحيح) ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێت و ڕۆژوی تەواوی بۆ هەیە، چونکە لەو کاتەدا خوێنەکە هەر لەناو بۆشایی ناوەوە دا بوەو دەرنەچوەتە دەرەوە هیچ حوکمێکی لەسەر نیە، وەلەبەر ئەوەی پێغەمبەرﷺ کاتێ پرسیاری لێ کرا لەلایەن ئافرەتێکەوە دەربارەی ئەوەی کە پیاو لەخەودا دەی بینێت بینیویەتی ئایا خۆشوشتنەوەی لەسەرە [٢]. لەوەڵامدا فەرموی:{نعم إذا رأت الماء}(٣). جالێرەدا پێغەمبەرﷺ حوکمەکەی بەبینینی تۆو (المني) بەستۆتەوە نەك بەگواستنەوەو جمو جوڵو ڕاچەنین لەناوەوە، دەی کەواتە بێ نوێژی ئافرەتانیش بەهەمان شێوەیەو حوکمەکانی ناچەسپێن تاوەکو دەرچەیەك نەبینێت. نەك بەجموجوڵو هەست پێ کردن و خزینی خوێن لەناوەوەی لەش دا، کەی خوێنی دەرچوو بینی ئەو کات حوکمەکانی دەچەسپێن.

* وەئەگەر بەری بەیان دەرچو کەوتە بێ نوێژیەوە ئەوە ڕۆژوی ئەو ڕۆژەی دروست نیە هەر چەندە دوای بەری بەیان بەیەك ساتە وەختیش(للحظة) پاك بوبێتەوە.

---

(١) واتە پێش ڕۆژئاوا بون هەستی بەخۆی کرد کەوا خەریکە توشی بێ نوێژی دەبێت بەڵام تادوای ڕۆژئاوا بون هیچ دەرنەچوو خوێنی نەبینی، بەڵکو دوای ڕۆژئاوا بون ئەمجار خوێن هاتە دەرو بینی. وەرگێڕ.

(٢) واتە: لەکوردەواری خۆماندا پێ ی دەگوترێت(شەیتانی بون) کەلەخەودا بەزۆری پیاو دەیبینێت و لەشی پیس دەبێت و دەبێ خۆی بشواتەوە واتەغوسڵ بکات. وەرگێڕ.

(٣) واتە: بەڵێ ئەگەر ئاوی بینی بێت و لەشی تەڕ بوبێت. ئەمەش بەچی دەزانیت کاتێ کەلەخەو هەستایت و شەو خەوت بینی بو کەشەیتانی بویت. بیکە بەعادەت کەلەخەو هەستایت دەست لەخۆت بکوتە ئەگەر لەش و جل و بەرگی دەوروبەری دامێنت تەڕبو جاخەونت بینی بێت یان نا ئەوە لەشت پیس بوەو دەبێ خۆت بشۆیتەوە. وەئەگەر تەڕ نەبوو هیچ ئاوو تەڕایت هەست پێ نەکرد و مجلەکانت و لەشت تەڕ نەبو ئەوە ئەو کات لەشت پیس نەبوەو پێویست ناکات خۆت بشۆیتەوەو لەسەرت واجب نابێت جاخەونت بینی بێت یا نەت بینی بێت. وەرگێڕ.

* وەئەگەر پێش بەری بەیان پاك بو بێتەوەو بەڕۆژو بێت ئەوە ڕۆژوەكەی تەواو دروستە، باهەتاكو دوای بەیانیش خۆی نەشورد بێتەوە وەك لەش پیسی، كەنیەتی بۆ ڕۆژو گرتن هێناوەو لەشیشی پیسەو تادوای بەری بەیان(الفجر)خۆی نەشوشتۆتەوەو ڕۆژوەكەشی تەواوو دروستە، بەگوێرەی فەرمودەكەی عائشە رچی الله عنها كەگوتویەتی:(كان النبيﷺيصبح جنباً من جماع غير أحتلام ثم يصوم في رمضان)([1]).

**سێیەم: سوڕانەوە(الطواف) بەدەوری ماڵی خوادا(الكعبة):**

ئافرەت كەكەوتە بێ نوێژی یەوە دروست نیە بە دەوری ماڵی خوادا بسوڕێتەوە(الطواف البيت)، چ فەرزەكەیو چ سوننەتەكەی. وەئەگەر بیكات لێ ی وەرناگیرێتو دروست نیە. بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺكەبە عائشە خاتونی فەرمو كاتێك كەوتە بێ نوێژی یەوە:{إفعلي مايفعل الحاج غير ألاّ تطوفي بالبيت حتى تطهري}([2]).

* بەڵام دەتوانێت باقی كارەكانی تری ئەنجام بدات وەك هەوڵو تێكۆشان(السعي) لەنێوان سەفاو مەروەو وەستان لەكێوی عەرەفەو شەو مانەوە لەموزدەلیفەو مینادا، ووەبەرد هاویشتن(رمي الجمار) و باقی بەندایەتیەكانی تری حەجو عەمرە و حەرام نیەو بۆی دروستە، لەسەر ئەم بنەمایە ئەگەر مێینە تەوافی كردوو پاك بو، و ڕاستەوخۆ دوای تەواف كەوتە بێ نوێژیەوە، یاخود لەكاتی هەوڵ دان(السعي) واتە لەسەفاو مەروەدا كەوتە بێ نوێژیەوە ئەوە چی تێدا نیەو تەوافەكەو حەجەكەی تەواوو دروستە.

---

(١) أ ـ متفق عليه.

ب ـ واتە: پێغەمبەرﷺبەیانی كردۆتەوەو لەشیشی پیس بوە بەهۆی جیماعەوە نەشەیتانی بون، ڕەمەزانیش بوەو بەڕۆژوش بوە. واتە: لەڕەمەزاندا بەڕۆژو بوەو شەو لەگەڵ خێزانیشی دا جوت بوەو تابەری بەیانیش (الفجر) خۆی نەشردۆتەوە. وەرگێڕ.

(٢) تخريج و واتاكەیمان لەڕابردودا نوسیوە. وەرگێڕ.

**چوارەم: لەسەر لاچونی تەوافی خوا حافیزی( طواف الوداع ):**

ئەگەر ئافرەت بەندایەتی‌و دروشمەکانی حەج‌و عەمرەی هەمو تەواو کردن‌و کەوتە بێ نوێژیەوە پێش ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ شوێن‌و وڵاتی خۆی‌و کەوتە بێ نوێژیەوە و بەردەوام بو تادەرچونی لەمەککە، ئەوا ئەو کاتە دەگەڕێتەوەو تەوافی خوا حافیزی ناکات. بەگوێرەی ئەو فەرمودەیەی إبن عباس رضي الله عنهما:{أُمِرَ النَّاس أن يكون آخر عهدهم بالبيت، إلاّ أنهُ خفف عن المرأة الحائض}(١).

* هیچ پێویست ناکات ئافرەتی بێ نوێژ لەماڵی خواو لەکاتی حەج‌و عەمرەداو لەتەوافی خوا حافیزی دا بچێتە بەردەرگای مزگەوتی حەرام‌و دوعا بکات، چونکە ئەوە لەپێغەمبەرەوەﷺنەهاتوەو بەندایەتیەکان بەندن بەو سوننەتەی کەلە پێغەمبەرەوەﷺبۆمان هاتون‌و ئەمەش پێچەوانەی ئەو سوننەتەیە. لەچیرۆکی (صفية رضي الله عنها)دا هاتوە کەکاتێ لەدوای تەواف ئیفاضة (طواف الإفاضة) پێغەمبەرﷺپێی فەرموە:{فَلْتَنْفُر إذن}(٢). فەرمانی پێ نەکرد بچۆ بەردەرگای‌و دوعا بکە. ئەگەر ئەوە شەرعی بایە ئەو کاتە بۆی ڕون دەکردەوەو پێ ی دەگوت بچۆ بۆ بەردەرگای مزگەوت و دوعا بۆ خۆت بکەو بۆ ئێمەش دەبو بەسوننەت.

* بەڵام تەوافی حەج‌و عەمرەی لەسەر لاناچێت‌و دەبێ هەر کاتێک پاک بوەوە لەبێ نوێژیەکەی تەوافەکەی بکات.

---

(١) أ - متفق عليه.

ب - واتە: خەڵکی کەمەبەستی لەحاجیەکانە بەژن‌و بەپیاوەوە فرمانیان پێ کراوە کەدەبی کۆتا کاریان سوڕانەوەی خوا حافیزی بێت بەدەوری ماڵی خوادا( طواف الوداع) بێت، تەنیا ئافرەتانی بێ نوێژو زەیستاندار نەبێت لەسەریان سوک کراوە کەبۆیان هەیە تەوافی خوا حافیزی نەکەن. وەرگێڕ.

(٢) أ - متفق عليه.

ب - واتە: مادام کەوتویتە بێ نوێژیەوە دەرچو تەوافی خوا حافیزی مەکە. وەرگێڕ.

**پێنجەم: مانەوە لەمزگەوت دا(المكث في المسجد):** مانەوە لەمزگەوتدا بۆ ئافرەتی بێ نوێژ حەرامەو دروست نیە هەتاکو لەنوێژگای جەژنەکانیشدا حەرامە بمێنێتەوە. بەپێ ی ئەو فەرمودەی دایکی عطية رضي الله عنها کەگوێ ی لەپێغەمبەرﷺبوە کەفەرمویەتی:{يخرج العواتق وذوات الخدور والحُيَّض)، وفيه (يعتزل الحُيَّضُ المصلى)}(١).

**شەشەم: جوت بون لەگەڵ مێرد(الجماع):**

ژنی بێ نوێژ دروست نیەو حەرامە مێردەکەی لەگەڵی دا جوت بێتو نابێ ئەو ژنە بهێڵێت مێردەکەی لەگەڵی داکۆببێتەوە. بەگوێرەی فەرمودەی خوای پەروەردگار کەدەفەرموێت ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ ۖ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّىٰ يَطْهُرْنَ ۖ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾ ﴾(٢).

مەبەست لە(المحيض)کاتو شوێنی بێ نوێژیەکەیە واتە توخن نەکەوتنی ئافرەت لەکاتی بێ نوێژی دا لەپێشەوەی (الفرج)و ئافرەتو بەپێ ی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ:{إصنعوا كلَّ شيءٍ إلاّ النكاح }(٣).

---

(١) أ ـ متفق علية.

ب ـ واتە: بائافرەتانی ئازادو کچانی ماڵەوە (ذوات الخدور) و بێ نوێـژانیش دەرچـن بـۆ نوێـژی جەژنو بێنە نوێژگا، هەروەها لەفەرمودەکەدا هاتوەکەدەفەرمویت : باژنافرەتانی بێ نێژ کەنارگیر بنو نەیەنە ناو نوێژگاو لەدەری نوێژگا دابیشنو تنیا باگوێ لەوتارو ئامۆژگاریەکان بگـرنو بانوێـژ نەکـەن. وەرگێڕ.

(٢) أ ـ سورة البقرة: (٢٢٢).

ب ـ واتە: واتاکەیمان پێشتر ڕون کردۆتەوە. وەرگێڕ.

(٣) واتە: هەمو شتێك لەگەڵ خێزانی خۆتدا بکە لەکاتی بێ نوێژی دا تەنیا جوت بون نەبێت لەپێشەوەی(الفرج) نەبێت. وەرگێڕ.

* وەلەبەر ئەوەی موسڵمانان لەسەر حەرام بون‌و دروست نەبونی جوت بون لەڕێگەی دامێنی(الفرج)ی ژنی بێ نوێژ کۆکن، بەهیچ شێوەیەك نابێ‌و دروست نیە بۆ پیاوێك کەبڕوای بەخواو بەڕۆژی دوایی هەبێت دەست پیشخەری ئەم کارە خراپە بکات‌و ئەنجامی بدات. واتە حەرامێکی بڕاوەیەو نابێ پیاو لەڕێگەی(فەرجی) خێزانیەوە لەکاتی بێ نوێژی دا جوت بێت‌و جیماعی لەگەڵ دا بکات، چونکە قورئانی پیرۆزو سونئەتی پێغەمبەرﷺو کۆڕای موسڵمانان قەدەغەو حەرامیان کردوە. هەر کەسێك ئەوە بکات ئەوە فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺەکەی شکاندوە. وشوێن ڕێگایەك کەوتوە کەدورە لەڕێگەی بڕواداران. ئیمامی (النووي) لە(مجموع شرح المهذب ٢/٣٧٤)دا نوسیویەتی، ئیمامی شافیعی گوتویەتی:( من فعل ذلك فقد أتى كبيرة)([1]). هاوەڵانمان‌و غەیری ئەوانیش دەڵێن: (من استحلَّ وطء الحائض حكمَ بكفره)([2]) . أ. ه. قسەکانی نەوەوی.

* ڕێگە دراوە بەپیاو سوپاس بۆ خوا کەئارەزوەکانی خۆی دابمرکێنێتەوەو بەبێ ئەوەی جوت بون(الجماع) بکات، وەك ماچ کردن‌و بەخۆوە گوشین‌و کار لەگەڵ کردن لەشوێنی تر نەك لەدامێنەوە(الفرج). وەباشتریش وایە تخونی نێوان ناوك‌و ئەژنۆی نەکەوێت مەگەر لەپشت پەردەیەکەوە یان بەربەستێکەوە بێت. بەگوێرەی فەرمودەکەی عائشە رضي الله عنها :((كان النبي يأمرني فأتَّزر فيباشرني وأنا حائض))([3]).

**حەوتەم: تەڵاق دان( الطلاق ):**

دروست نیە پیاو ژنی خۆی لەکاتی بێ نوێژی دا تەڵاق بدات بەگوێرەی فەرمایشتی خوای گەورە کەدەفەرموێت:﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ

---

(١) هەر کەسێك ئەم کارە بکات ئەوە گوناحێکی گەورەی کردوە. وەرگێڕ.

(٢) واتە: هەر کەسێك جوت بونی ئافرەتی بێ نوێژ حەڵاڵ بکات ئەوە بەکوفر حوکمی دەدرێت. وەرگێڕ.

(٣) أ ـ متفق عليه.

ب ـ واتە: پێغەمبەرﷺپێ دەکردمکەشتێك بەسەر خۆم دابدەم‌و ئەویش کاری لەگەڵ دەکردم لەکاتێکدا من لەبێ نوێژی دا بوم. وەرگێڕ.

﴿لِعِدَّتِهِنَّ﴾(١). واته لەو حاڵەتەدا پێشوازی یاخود چاوەڕوانی ماوە(عدة)ی خۆی دەكات. ئالەو كاتەدا تەڵاق دان نابێتو دروست نیە، مەگەر لەكاتی سك پڕیو لەكاتی پاك بونەوەی دا تەڵاقی بداتو بێ ئەوەی لەگەڵی دا جوت ببێت، چونكە ئەگەر لەكاتی بێ نوێژی دا تەڵاق بدرێت ئەوا چاوەڕوانی ماوە(العدة)ناكات چونكە ئەو ماوەی بێ نوێژیەی لەماوەی چاوەڕوانی ناژمێردرێت، وەئەگەر لەدوای پاك بونەوەو دوای لەگەڵ دا جوت بونی تەڵاق درا، ئەوا ئەو كات ماوەی چاوەڕوانی(العدة)كەی دیار نیە چونكە نازانێت داخۆ بەو لەگەڵ جوت بونە(الجماع) سكی پڕ بوە یان نا ئەوە ئەو كاتە كەگرتبێتی ئەوا ماوەی چاوەڕوانی(العدة) كاتی سك بڕیەكەیەتی، وە ئەگەر نەشی گرتبو ئەوە ماوەی چاوەڕوانی(العدة)كەی ئەو ماوەیە تاتوشی بێ نوێژی دەبێتەوە. جا كەدڵنیا نەبێت لەجۆری ماوەی چاوەڕوانیەكەی ئەوە ئەو كات تەڵاق دان حەرام دەبێتو دروست نیە هەتاكو كارەكە ڕون دەبێتەوە.

كەواتە تەڵاق دانی ژنی بێ نوێژ حەرامە بەگوێرەی ئەو ئایەتە پیرۆزەی ڕابردو. وەلەبەر ئەوەی لەهەردو فەرمودە ڕاستەكاندا(الصحیحین) و غەیری ئەوانیش چەسپاوە. لەفەرمودەی إبن عمر دا هاتوە كەژنەكەی خۆی لەكاتی بێ نوێژی دا تەڵاق دابو، ئەمەی بەپێغەمبەرﷺڕاگەیاند، پێغەمبەرﷺتوڕە بوو فەرموی:{مُرهُ فَلْيُراجعها ثمَّ ليمسكها حتى تطهر، ثمَّ تحيض، ثمَّ تطهر، ثمَّ إن شاء امسك بعد، وإن شاء طلق قبل ان يمس، فتلك العدة التي أمر الله أن تطلق لها النساء}(٢).

---

(١) أ ـ سورة الطلاق: (١).

ب ـ واتە: واتاكەیمان لەڕابردودا شی كردۆتەوە. وەرگێڕ.

(٢) واتە: برۆ بیگێڕەوەو بیهێنەوە لای خۆتو لێ ی گەڕێ تاپاك دەبێتەوە،و ئەمجار دەكەوێتەوە بێ نوێژی و دیسان پاك دەبێتەوە، جائەوجار گەر ویستت بیهێڵیتەوە ئەوە بیهێڵەوە، وەئەگەر ویستیشت تەڵاقی بدەیت، تەڵاقی بدە، ئائەمەیە ماوەی چاوەڕوانی(العدة) كەخوای گەورە لەتەڵاق دانی ژنان فرمانمان پێ دەكات. وەرگێڕ.

* ئەگەر هەر پیاوێك ژنەکەی خۆی لەکاتی بێ نوێژی دا تەلاّق بدات ئەوە گوناحبارە، پێویستە لەسەری تۆبە بکاتو بگەڕێتەوە لای خوای بالاّ دەستو کار بەجێ، وژنەکەی بگێڕێتەوە لای خۆیو بەتەلاّقێکی شەرعیانەو بەگوێرەی فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ تەلاّقی بدات، لەدوای هێنانەوەی باوازی لێ بێنێت تاکو بێ نوێژیەکەی تەوا دەبێت کەتیایدا تەلاّق دراوە، وەجارێکی تریش بکەوێتەوە بێ نوێژیو لەو بێ نوێژیەش پاك ببێتەوەئەمجار ئەگەر ویستی لەژێر نیکاحی خۆی دا بیهێڵێتەوە بابیهێڵێتەوە، وە ئەگەر ویستیشی تەلاّقی بداتو بەیەکەوە نەگونجان ئەوە باپێش ئەوەی بچێتە لای تەلاّقی بدات.

## سێ شتو سێ حاڵەت هەن لەحەرامیو نادروستی تەلاّقدان لەکاتی بێ نوێژی دا هەلاوێردراون کەبریتین لەمانەی خوارەوە:

**یەکەم:** ئەگەر تەلاّق دانەکە پێش لەگەڵ مانەوەو دەست لێدانی بێت ئەوە هیچی تێدا نیە ئەگەر لەکاتی بێ نوێژیش دا تەلاّقی بداتو بۆیان دروستە، چونکە لەو کاتەدا ماوەی چاوەڕوان(العده)ی لەسەر نیەو ئەو کاتە تەلاّق دانەکەی پێچەوانەی فەرمانو فەرموەدی خوای گەورە نیە کەدەفەرموێت:﴿ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ ﴾ (١).

**دوەم:** ئەگەر هاتو بێ نوێژیەکە لەکاتی دو گیانی (الحمل)دا بو ، کەهۆیەکەیمان لەڕابردودا ڕون کردەوە.

**سێیەم:** ئەگەر تەلاّق دان لەسەر قەرەبو(عوض) بو ئەوە قەیدی نیە ئەگەر لەکاتی بێ نوێژی دا تەلاّقی بدات.

---

(١) أ ـ سورة الطلاق: (١).

ب ـ پێشتر واتاکەیمان نوسیوە. وەرگێڕ.

وەكو ئەوەی كەلەنێوان ژنو مێردا كێشەو خراپ هەڵسو كەوت كردنو لەیەك تێنەگەیشتن لەنێوانیاندا هەبو، مێردەكە قەرەبویەك لەبری تەلاق دانی ژنەكەی وەر دەگرێت، ئەو تەلاق دانە دروستە ئەگە لەكاتی بێ نوێژیش دا بێت.بەپێ ی فەرمودەی إبن عباس رضي الله عنهما كەژنی ثابت كوڕی قیس كوڕی شماس هاتەلای پێغەمبەرﷺو پێ ی گوت: ئەی ڕەسولی خوا من هیچ گلەییم لەڕوی دینو ئاكاروڕەوەشتەوە لەمێردەكەم نیە، بەلاّم من لەئیسلامدا ڕقم لەكوفرە) پێغەمبەر ﷺفەرموی:{أن تردّين عليه حديقته؟} فقالت: نعم. فقال:{ أقبل الحديقة وطلقها تطليقة}([1]). پێغەمبەر ﷺنەی فەرمو ئایا بێ نوێژە یان پاكە، وەلەبەر ئەوەی ئەو تەلاقدانە خۆ بەخشیو قوربانیەكە لەژنە خۆیەوە واتە خۆكڕینەوەكە كەخۆی پێ دەكڕێتەوە، ئەوە لەكاتی پێویستی دا دروستە لەهەر حاڵو گوزەرانو بارێك دا بێت.

لە(المغني)دا گوتراوە كەدروست بونی دەست لێ هەڵگرتن(الخلع) لەكاتی بێ نوێژی دا شی كردۆتەوە (٥٢/٧) بەم جۆرە: (( دروست نەبونی تەلاق دان یا دەست لێ هەڵگرتن لەكاتی بێ نوێژی دا لەبەر ئەو زیانەی كەبەر ئافرەت دەكەوێت لەئەنجامی درێژ بونەوەی ماوەی چاوەڕوانی(العدة)، جا ئەو دەست لێ هەڵ گرتنە بۆ قەرە بو كردنەوەی ئەو زیانەیە كەلە ئەنجامی ڕەفتاری خراپو هەڵسوكەوتو ئەو جێگە ناخۆشەی كەتێ ی دایەو پێ یەوە ناڕەحەتو دل تەنگو بێزارەو حەزی پێ ناكات، دیارە ئەمەشیان گەورە ترە لەدرێژ بونەوەی ماوەی چاوەڕوانیەكە ( العدة) جابۆیە دروستە زۆرەكەیان بەكەمەكەیان لابرێت.

---

(١) أ ـ رواه البخاري.

ب ـ واتە:ئەو باخچەیەی كەدابوی بەتۆ لەبری مارەیی دەی دەیتەوە؟ گوتی: بەڵێ، پێغەمبەرﷺفەرموی: دەبڕۆ باخچەكەتی لێ وەربگرەوەو تەلاقی بدە واتە ئازادی بكە بەئازاد كردنێكی تەواو. وەرگێڕ.

بۆیە پێغەمبەرﷺلەحاڵی دەست لێ هەڵگیراو (المتخلعة)ی نەپرسی چۆنەو چۆن نیە))
تائێرە قسەکانی تەواو بون.

* بەڵام گرێ بەستی هاوسەرێتیو مارە برینی ژن لەکاتی بێ نوێژی دا هیچی تێدا نیەو دروستە چونکە بنەڕەت حەڵاڵ بونەو هیچ بەڵگەیەکیش لەسەر دروست نەبونی نیە. بەڵام چونە لاو جوت بونی مێردەکەی لەگەڵی دا(أدخال) لەکاتی بێ نوێژی دا تەماشا دەکرێ ئەگەر دڵنیا بن لەوەی بەهۆی ئەو جوت بونەی زیان بەئافرەتەکە ناگات ئەوە چی تێدا نیەو دروستە، بەڵام ئەگەر توشی زیان ببێت ئەوە نابێ بچێتە لایو دەبێ چاوەڕوان بکات تاکو پاك دەبێتەوە لەترسی ئەوەی نەوەکو بکەوێتە حەرامی و قەدەغە کراوەکانەوە.

**هەشتەم:** ڕەچاو کردنو گرنگی دان بەماوەی چاوەڕوانی(عدة) تەڵاق واتە بێ نوێژی(الحیض):

ئەگەر پیاو ژنەکەی تەڵاق دا دوای ئەوەی کەچوە لای یا لەگەڵی دا نوستبو پێویستە ئەو ژنە هەتا سێ بێ نوێژی تەواو دەبینێ چاوەڕوانی بکات، ئەگەر هاتو ئەو ژنە لەبێ نوێژدارەکان(الحُیَّض) بوو دوگیانیش نەبو بەگوێرەی فەرمایشتی خوای گەورە کەدەفەرموێت:﴿ وَٱلۡمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٖ ﴾(١).

بەڵام ئەگەر دوگیان بون ئەوە ماوەی چاوەڕوان کردنەکەیان دانانی سکەکانیانە، جائەو ماوەیە درێژ بێت یان کورت، بەگوێرەی فەرمایشتی خوای پەروەردگار دەدەفەرموێت:﴿ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّ ﴾(٢). بەڵام ئەگەر

---

(١) أ ـ سورة البقرة: (٢٢٨).

ب ـ واتە: تەڵاق دراوەکان بۆ ماوەی سێ بێ نوێژی تەواو دەبێ چاوەڕوان بکەنز وەرگێڕ.

(٢) أ ـ سورة الطلاق: (٤).

ب ـ واتە: ژنانی دوگیانی تەڵاق دراو ماوەی چاوەڕوانیان دانانی سکەکانیانە.وەرگێڕ.

تەڵاق دراوەکە لەو ئافرەتانە بو کەبێ توێژ نابن وەك ئەوەی کەکچی بچوكو منداڵ بێتو هێشتا نەکەوتبێتە بێ نوێژیەوە، یاخود لەو ژنو پیرە ژنانە بو کە لەسەر وعوزر شوشتن کەوتونو بێ ئومێد بونو و ئیدی بێ نوێژیان بەسەر دا نایەت، جا بەهۆی تەمەن زۆریەوە بێت یاخود لەو ژنانە بێت کەزامالێ(الرحم)یان دەرهاتوە، یاخود بەهەر هۆیەکی ترەوە بێت کەبێ نوێژی نابینن ئەوانە ماوەی چاوەڕوان کردنیان سێ مانگە بەگوێرەی فەرمودەی خوای گەوری :﴿ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ ﴾(١).

بەڵام ئەگەر لەو ژنانە بون کەبێ نوێژیان لەسەر لاچوە یاوەستاوە بەهۆی نەخۆشیەوە یابەهۆی شیردانو منداڵ بەخێو کردنەوە ئەوە لەو ماوەیەدا هەر دەمێنێتەوەو چاوەڕوانی دەکات هەتاکو بێ نوێژی بەسەردا دێتەوە هەر چەندە ماوەکەشی دورو درێژ بێت ئەوجار لەوێڕا ماوەی چاوەڕوانیەکەی دەست پێ دەکات. خۆ ئەگەر هۆکارەکەی لەسەر نەما وەك ئەوەی کەلەنەخۆشیەکەی چاك ببێتەوەو ماوەی شیر پێدانەکەش کۆتایی هاتو بێ نوێژی نەبینیو هەر بەردەوام بو لەسەر حاڵەتی خۆی واتە نەکەوتە (الحیض)ەوە ئەو کاتە ئەو ژنە دەبێ یەك ساڵ لە کاتی نەمانی هۆکارەکەوە، کەئەمەشیان قسەورای ڕاستەقینەیە کەلەگەڵ بنەماو ڕێساکانی شەریعەتی خوادا دێتەوە. ئەگەر هۆکارەکە(السبب) نەماو بێ نوێژی نەبینی وەك ئەو ژنەی لێ دێ کەبێ نوێژی لەسەر نەماوە نەك بەهۆی هۆکارێکی دیارو ڕونەوە. وەئەگەر بەبێ هیچ هۆیەکی دیارو ئاشکرا بێ نوێژی نەما، ئەوە ئەو ئافرەتە یەك ساڵی ڕەبەق چاوەڕوانی دەکات واتە(العدة) دەگرێتە بەر. نۆ مانگی دوگیانی(سك پڕ ـ الحامل) ی وەك ئیحتیاتێك، چونکە

---

(١) أ ـ سورة الطلاق: (٤).

ب ـ واتە:ئەو ژنانەی کەلەبێ نوێژی بێ ئومێد بونو بێ نوێژی نابینن ئەگەر تەڵاق دران ماوەی چاوەڕوانیان سێ مانگە لەگەڵ ئەوەانەی کەبێ نوێژ نابن. وەرگێڕ.

زۆربەی زۆری ئافرەتـان نـۆ مـانگ دو گیـان دەبـن، هـەروەها سـێ مـانگ عیـددەش ئـەوە دەکاتە ساڵێك.

* بەڵام ئەگەر تەڵاق دانەکە لەدوای گرێ بەستیو مارە بڕین بو کابرا دەستی نەچو بوە لایو لەگەڵی دا نەمابوەوە واتە لەگەڵی دا نەخەوتبوو جوت نەبوبو. ئەوە ماوەی چاوەڕوانی(العدة)ی نیەو پێویست ناکات نەبەبێ نوێژیو نەبەهیچ شتێکی تر چونکە لەگەڵی دا کۆ نەبوەتەوە بەگوێرەی فەرمایشتی خوای گەورە:﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نَكَحۡتُمُ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ثُمَّ طَلَّقۡتُمُوهُنَّ مِن قَبۡلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمۡ عَلَيۡهِنَّ مِنۡ عِدَّةٖ تَعۡتَدُّونَهَا﴾(١).

**نۆیەم: حوکمی ئەستۆپاکی( خاڵی بون ) زامالْ( الرحم ):**

واتە هیچی لەزامالْ دا نەمێنێتو سك پڕی نەمێنێت. ئەمەش پێویستی بەحوکم واتە بڕیار هەیە کەی پێویستی بەئاستۆپاکی زامالْ(الرحم) هەبو ئەم حاڵەتە چەند کێشەو داخوازیەکی هەن لەوانە:

* ئەگەر ژنێك مێردەکەی مردو سکی هەبو، ئەو منداڵە میراتی کابرا دەگرێت، وەئـەو ژنـە خاوەن مێرد بو، ئەو کاتە مێردەکە نابێ لەگەڵی دا جوت ببێت هەتاکو بێ نوێژی دەبێنێ، یاخود تا دەردەکەوێت کەسکی هەیە، ئەگەر دەرکەوت کەسکی هەیە ئەوە ئەو کات حوکم دەدەین کەسکەکەی میراتی کابرای مردو دەگرێت، کەواتە حوکم بەبونی ئەو سکە دەدەین لەکاتی مردنی باوکی دا لەوناو ڕەحەمی دایکی دا هەبوە.

---

(١) أ ـ سورة الأحزاب: (٤٩).

ب ـ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کەبڕواتان بەخواو بەپێغەمبەرو بەڕۆژی دوایی هەیە ! ئەگەر ئافرەتانی بڕوادارتان مارە کردو نەچونە لایانو واتە داخلیان نەبون، ئەوا ئەو ئافرەتانە ئەگەر تەڵاق دران پێویست ناکات ماوەی چاوەڕوانی بگرنە بەرو پێویست ناکات ماوەی(العدة) چاوەڕوان بکەن، بەڵکو دوای تەڵاق دان یەکسەر دەتوانن شو بکەنەوەو ڕانەوەستن. وەرگێڕ، بەسود وەرگرتن لەتەفسیری گوڵشەن ب٢ل١١٠١.

بەڵام ئەگەر کەوتەوە بێ نوێژی، ئەوە حوکم دەدەین بەنەبونی شوێنەوارو جێماوەی مردوەکەو دەتوانین حوکم بەئەستۆپاکی زامالّی(الرحم) ئەو ژنەش بدەین بەهۆی توش بونی بەبێ نوێژی یەوە.

**دەیەم: واجب بونی خۆشوشتنە(الغسل):**

پێویستە لەسەر ئافرەت هەر کاتێك لەبێ نوێژی تەواو وپاك بوەوە خۆی بشواتەوە، بەجۆرێك هەمو لەشی پاك بکاتەوە و ئاوی بەسەردا بڕوات بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺکەبە(فاطمەی کچی حبیش)ی فەرموو:{فإذا أقبلت الحيضة فدعي الصلاة، وإذا أدبرت فاغتسلي}(١).

* بەلانی کەمی واجب بونی خۆشوشتنەوە ئەوەیە کە دەبێ ئاو هەموی لەشی بگرێتەوە هەتاکو ژێر موەکانیشی بگرێتەوە، وەباشتریش وایە کەبەو شێوەیە بێت کەلەفەرمودەیەکی پێغەمبەرداﷺهاتوە، کەئەسمای کچی شکل دەربارەی خۆشوشتنەوەی بێ نوێژی پرسیاری کردو ئەویشﷺفەرموی:{تأخذ إحداكنَّ ماءها وسدرتها فتطهر فتحسن الطهر، ثمَّ تصب على رأسها فتدلكه دلكاً شديداً، حتى تبلغ شئون رأسها، ثمَّ تصب عليها الماء، ثمَّ تأخذ فرصة ممسكةً - أي قطعة قماش فيها مسك - فتطهر بها، فقالت أسماء: كيف تطهر بها؟ فقال: سبحان الله: فقالت: عائشة لها: تتبيعين أثر الدم}(٢).

---

(١) أ - رواه البخاري.

ب - واتە: ئەگەر کەوتیتە بێ نوێژیەوە واز لەنوێژەکانت بێنە، وەئەگەر لەبێ نوێژیش تەواو بویت ئەوا خۆت بشۆوەو دەست بکەوە بەنوێژەکانت. وەرگێڕ.

(٢) أ - رواه مسلم(١/١٧٩).

ب - واتە: هەر یەکێك لەئێوە کەدوای تەواو بونی بێ نوێژی خۆی شوشتەوە با ئاوو هەندێ سدر کەڕوەکێکی بلێن خۆش و کەف کەرە بهێنێت و خۆی پێ بشوات و چاك خۆی پێ پاك بکاتەوە، ئەوجار ئاو بەسەر سەری خۆی دا بکات، توند سەرو قژەکانی بگلۆفێ و تێکیان هەڵ شێلێت هەتاکو هەمو سەرو قژەکانی

* وەهەڵ وەشاندنی پرچو قژی سەر واجب نیە، مەگەر بەسترا بێت یان هۆنرابێتەوەو لەوە بترسێ کەئاو نەگاتە بنی موەکانی یاقژەکانی هەروەکو لە(صحیح مسلم ١/١٧٨) دا هاتوە..لەفەرمودەی أم سلمە رچی الله عنها کەپرسیاری لەپێغەمبەرﷺکردوە: من ئافرەتێکم قژی سەرم چرو پرە ئایا بیکەمەوەو لەبەر یەکی هەڵوەشێنم؟ وەلە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە کەبۆ بێ نوێژی وجوت بون لەگەڵ مێردمدا؟ فەرموی:{لا إنما يكفيك أن تحثي على رأسكِ ثلاث حثيثات ثم تفيضين عليك الماء فتطهرين}(١).

* بەڵام ئەگەر لەکاتی ماوەی نوێژدا پاك بوەوە پێویستە لەسەری خێرا پەلە بکات لەخۆ شوشتنەوە بۆ ئەوەی پێڕا بگات لەکاتی خۆی دا نوێژەکەی بکات. ئەگەر لەسەفەریش بو ئاوی دەست نەکەوت، یا ئاو هەبو بەڵام دەترسا گەئاو بەکار بهێنێت توشی نەخۆشیو زیان ببێت، یان نەخۆشەو نابێ ئاو بەکار بهێنێتو توشی زیانی پتر ببێتو نەخۆشیەکە پەرە دەستێنێ ئەوە با تەیەموم(تیمم) بکات لەبری خۆشوشتن هەتاکو بەربەستو هۆکارەکانی لادەچن ئەوجار خۆی بشواتەوە.

* هەندێ لەئافرەتان لەکاتی ماوەی شەرعی نوێژدا پاك دەبنەوە و خۆناشۆنەوەو بۆ کاتێکی تری لێ دەگەڕێن بەبیانوی ئەوەی لەو کاتە کورتەدا ناتوانن بەچاکی خۆیان بشۆنەوەو خۆ پاك بکەنەوە، بەڵام ئەمە نەبرو بیانوەو نەبەڵگەش، چونکە هەر نەبێ باخۆشوشتنەوە واجبەکە لەسەر خۆیان لابەنو خۆ بشۆنەوەو نوێژەکەش لەکاتی خۆی دا بکات. خۆ ئەگەر کاتێکی فراوانتری بۆ ڕەخسا لەدوایی دا بابەتەواویو بەقەناعەتی دڵی خۆی خۆی بشواتەوە.

---

سەری دەگرێتەوەوپیسیان لێ دەکاتەوە، ئەمجار ئاوی بەسەردا بکات، دوایی پارچە قوماشێك بێنێو جوان خۆی پێ پاك بکاتەوە ئیدی بەمە پاك دەبێتەوە. ئەسماو گوتی: باشە چۆنی خۆ پێ پاك بکەمەوە ؟ پێغەمبەرﷺفەرموی:پاکو بێ گەردی بۆ خوا(سبحان الله) . ئەمجار عائشە خاتون وەڵامی ئەسمائی دایەوەو گوتی: بەو پارچە قوماشە شوێن خوێنەکە بکەوەو پێ ی بسڕەوەو لای بەرەو وردە وەردە لەگەڵی دا ئاوی پێدا بکەو خوێنو شوێنەوارەکەی لێ بکەوە. وەرگێر.

(١) واتە: نەخێر، بەڵکو ئەوەت بەسە کەسێ چەنگ(لوێض) ئاو بەسەری خۆت دا بکەیتو ئەمجار بەهەمو لەشت دا بکەیتو ئەو ئاوە هەمو لەشت بگرێتەوە هەتاکو ژێر موەکا ن(قژەکان)یش ئاویان دەگاتێو تەڕ دەبن، ئیدی بەمە پاك دەبیتەوە. وەرگێر.

# بەشی پێنجەم

## ئیستحازەو حوکمەکانی( الإستحاضة )

بریتیە لەخوێن لەبەر ڕۆیشتنی ئافرەتو هەرگیز نەوەستانی، یاخود ماوەیەکی کەم دەوەستێت وەك ڕۆژێك یادو ڕۆژ لەمانگ دا. بەڵگەی حاڵەتی یەکەم: کە خوێن لەبەر ڕۆیشتنەکە هەرگیز ناوەستێت ئەوەیە کەلە(صحيح البخاري) دا چەسپاوە لەعائشەوە رضي الله عنها کەفەرمویەتی:( فاطمەی کچی أبی حبیش بەپێغەمبەری ﷺ گوت: ئەی ڕەسولی خوا من هەرگیز پاك نابمەوە، لەڕیوایەتێکی تردا هاتوە(خوێنم لەبەر دەڕواتو پاك نابمەوە).

وەبەڵگەی حاڵەتی دوەمیش کەخوێن ناوەستێت مەگەر کاتێکی زۆر کەم نەبێت ئەو فەرمودەی حمنەی کچی جحش کاتێ هاتە لای پێغەمبەرو ﷺ گوتی: ئەی ڕەسولی خوا، من دەکەومە بێ نوێژیەکی گەورەو توندو تیژو بەردەوام خوێنم لەبەر دەڕوا. ئەم فەرموەدەیە أحمدو أبو داودو الترمذي ڕیوایەتیان کردوەو بەڕاستی داناوە، وەلەئیمامی أحمدەوە هاتوە کەئیمام ئەم فەرمودەیەی بەڕاستی داناوەو باشیەتی فەرمودەکەی لەبوخاریەوە هێناوە.

### بارەکانی خوێن لەبەر ڕۆیشتو ( المستحاضة )

**خوێن لەبەر ڕۆیشتو سێ حاڵەتی هەن کەئەمانەی خوارەوەن:**

**حاڵەتی یەکەم:** ئەوەیە کەبێ نوێژ ی(الحیض) دیاری هەیە پێش ڕودانی خوێن لەبەر ڕۆیشتنەکە ( الإستحاضة). ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ماوەی بێ نوێژیە دیارەکەی ڕابردوی کەتیایدا دادەنیشێتو حوکمەکانی بێ نوێژی بەسەردا دەچەسپێن، بێجگە لەو

ماوەش واتە دوای تەواو بونی ماوەی بێ نوێژیەکەی بەخوێن لەبەر ڕۆیشتن دەژمێردرێتو حوکمەکانی خوێن لەبەر ڕۆیشتنی بەسەردا دەچەسپێن.

نمونـە بـۆ ئەمـە: ئافرەتێـك سـەرەتای هـەمو مانگێـك شـەش ڕۆژ دەکەوێتـە بـێ نوێژیەوە، دوایش خوێن لەبەر ڕۆیشتنی بەسەردا دێتو بەردەوام خوێنی لەبەر دەڕوات بێ وەستان، ئەوە ئەو ئافرەتە بێ نوێژیەکەی دەکەوێتە شەش ڕۆژی یەکەمی سەرەتای هەمو مانگێكو لـەدوای ئـەو شـەش ڕۆژەش بـەخوێن لەبـەر ڕۆیـشتن دەژمێردرێـت بـەگوێرەی فەرمودەکـەی عائـشە رضـي الله عنهـا کـەفاطمـەی کـچی أبـی حبـیش بەپێغەمبـەر ﷺی گوت:(ئەی ڕەسولی خوا، من بەردەوام خـوێنم لەبـەر دەڕوات ئایـا نوێـژەکان واز لێ بێـنم؟ ﷺ فەرموی :{ لا إنَّ ذلك عـرقٌ، ولكـن دعـي الـصلاة قـدر الأيـام كنـتِ تحيـضين فيهـا ثـمَّ إغتـسلي وصـلِّي } (١) وەلـە(صـحيح مـسلم)دا هـاتوە کەپێغەمبـەر ﷺبەدایکی حبیبەی کچی جحش فەرموە:{إمكثي قدرَ ماكنتِ تحبِسُكِ حيضَتُكِ ثمَّ اغتسلي وصلِّي}(٢). ئیدی لەسەر ئەم بنەماو بەڵگەیە خـوێن لەبـەر ڕۆیـشتو ( المـستحاضة) تـەنها لەو چەند ڕۆژانەی کەماوەی عادەتی ئاسایی خۆیـەتی نوێـژەکان ناکـات، دوای ئـەو چـەند ڕۆژە خۆی دەشواتەوەو نوێژ دەکاتو ئەوکاتە هیچ گوێ بەو خوێنە نادات.

**حاڵـەتی دووەم:** کـەماوەی دیـاری نـەبێت بـۆ بـێ نوێـژی ئاسـایی لـەپێش خـوێنی دەمـار(الإستحاضـة)، بـەڵکو بـەردەوام خـوێنی لەبـەر دەڕوات هـەر لەیەکـەم جـارەوە کەدەسـتی پـێ کـردوە واتـە هـەر لەسـەرەتای یەکـەم خـوێن بینینـەوە. ئـەو کاتـە دەبـێ

---

(١) أ ـ رواه البخاري.

ب ـ واتە: نەخێر، ئەوە خوێنی دەمار، تەنیا ئەو چەند ڕۆژەی کەعادەتی ئاسایی خۆتە کەتیایدا دەکەویتە بێ نوێژیەوە نوێژەکانت مەکە، دوای ئەو چەند ڕۆژە خۆت بشۆوەو نوێژەکانت بکە. وەرگێڕ.

(٢) واتە: تەنیا ئەو چەند ڕۆژە بمێنەوە کەتیایدا دەکەوێتە بێ نوێژی خۆتەوە، دوای چەند ڕۆژەکان خۆت بشۆوەو نوێژەکانت بکە. وەرگێڕ.

بەجیاکردنەوەی ڕەنگی خوێنەکان ماوەی بێ نوێژیەکەی لێك جیا بکاتەوەبەڕەش باوی، یابەپەیتی خوێنەکەی، یابەبۆنی خوێنەکەی جیای بکاتەوەو ماوەی بێ نوێژیەکە دیاری بکات.و بەم چەند هۆیە حوکمەکانی بێ نوێژیەکە دەچەسپێت. بێجگە لەو ماوەی کەئەم چەند سیفاتانەی کەباسمان کردن تێدا بو بەماوەی خوێن لەبەر ڕۆیشتن(الإستحاضة) دەژمێردرێت.

نمونە: ئافرەتێك لەیەکەم جارەوە کەخوێنی بینی، خوێنەکەی بەردەوام بو بێ پسانەوە، بەڵام لەدەرۆژاندا خوێنێکی ڕەشی بینیو باقی ڕۆژەکانی تر خوێنەکەی سور بو. یاخود لەدەرۆژاندا خوێنێکی ئەستورو پەیتی بینی ولەباقی ڕۆژەکانی تردا خوێنێکی نەرمی گەشی دیت، یاخود دەرۆژان بۆنی خوێنەکەی ناخۆش بووی بۆنی خوێنی بێ نوێژی بوو باقیٚ ڕۆژەکانی تری مانگ بێ بۆن بو، ئەوە ئەو ئافرەتە کەخوێنی ڕەشی بینیوە لەنمونەی یەکەمدا ماوەی بێ نوێژیەکەیەتی(الحیض)، وەخوێنی ئەستورو پەیتەکە لەنمونەی دوەمدا بۆنی خوێنەکەی لەنمونەی سێ یەمدا بێجگە لەوچەند ڕۆژانەش ئەوە خوێن لەبەر ڕۆیشتنە(الإستحاضة) بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ کەبەفاطمةی کچی جحشی فەرمو:{إذا کان دم الحیضة فإنه أسود یُعْرفُ، فإذا کان ذلك فامسکي عن الصلاة فإذا کان الآخر فتوضئي وصلّي فإنما هو عرقٌ}(١). ئەم فەرمودەیە هەر چەند لەدەقو لەپاڵ پشتیەکەی دا(متن والمسند) تێ بینی هەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئەهلی زانستوزانیاری ڕەحمەتی خوایان لیٚ بێت کاریان پێ کردوە، کار پێ کردنی باشترە لەپشت گوێ خستنی لەبواری عادەتی بێ نوێژی زۆربەی ئافرەتاندا.

**حاڵەتی سێ یەم:** ئافرەتێك کەماوەی بێ نوێژیەکەی زانراوو دیاری نەبێتو هیچ نیشانەو بەڵگەیەکی واشی نەبێت کەخوێنی بێ نوێژیەکەی پیٚ بناسرێتەوە ئایا خوێنی بێ نوێژیە یا خوێنی دەمار(الإستحاضة)و بەردەوامیشە لەیەکەم جارەوە کەخوێنی بینیوەو

---

(١) أ ـ رواه أبو داود والنسائي، وصححه إبن حبان والحاكم.

ب ـ واتە: ئەگەر بێ نوێژی بو ئەوە ڕەنگی ڕەشەو بەو ڕەنگە دەناسرێتەوە، ئەگەر ڕەنگی خوێنەکە ڕەش بو ئەوە دەست لەنوێژ هەڵ بگرە، بەڵام ئەگەر ئەوە نەبو واتە ڕەنگی ڕەش نەبو ئەوە دەست نوێژ هەڵ بگرەو نوێژەکانت بکە، چونکە ئەوە خوێنی بێ نوێژی نیە بەڵکو خوێنی دەمارەو دەڕوات. وەرگێر.

خوێنەکەشی لەسەر یەك سیفەت دەڕوات یاخود لە شێوەی چەند سیفەتی نارێك و ئاڵۆز دەڕوات وناتوانرێت بگوترێت ئەمە خوێنی بێ نوێژیە. ئەم جۆرە حاڵەتانە بەگوێرەی عادەتی ئاسایی بێ نوێژی زۆرینەی ئافرەتان کاری پێ دەکرێت کەهەمیشە وایە شەش ڕۆژ یاحەوت ڕۆژ لەهەمو مانگێکدا دەست پێ دەکات و لەیەکەمین ساتەوە کەخوێن دەبینێت دەژمێردرێت و بەماوەی بێ نوێژی دادەنرێت و باقی ڕۆژەکانی تر بەخوێنی دەمار(الإستحاضة) دادەنرێت.

* نمونە: وەك ئەو ئافرەتەی کەیەکەم جار خوێن دەبینێت و لەڕۆژی پێنجەمی مانگدا دەیبینیّ و بەردەوامە بێ ئەوەی هیچ نیشانەو جیاکەرەوەیەکی ڕونی هەبێت کەئەمە خوێنی بێ نوێژیە نەبەڕەنگو نەبەشتی تر، ئەوە ماوەی بێ نوێژی ئەو جۆرە ئافرەتانە لەهەمو شەش ڕۆژێك یاحەوت ڕۆژێکی مانگدا دەبێت و لەڕۆژی پێنجەمەوە دەست پێ دەکات کەیەکەم جار خوێنەکەی تێدا دیوە لەهەمو مانگێکدا، بەگوێرەی فەرمودەکەی حمنة کچی جحش رضي الله عنها کەبەپێغەمبەرﷺی گوت: ئەی ڕەسولی خوا، من خوێنم لەبەر دەڕوات، خوێنێکی زۆرو بەردەوام، ئایا لەمە چی دەبینی، نوێژو ڕۆژوەکانم لێ قەدەغە دەکات؟ﷺفەرموی:{أنعتِ لك (أصف لك) إستعمال الكرسف(وهو القطن) تضعينه على الفرج، فإنه يذهب الدم، قالت: هو أكثر من ذلك ـ وفيه قال:{ إنما هذا ركضة من ركضات الشيطان فتحيضي ستة أيام أو سبعة في علم الله تعالى، ثم إغتسلي حتى إذا رأيتِ أنّك طَهُرتِ واستنقيتِ فصلّي أربعاً وعشرين أو ثلاثاً وعشرين ليلة وأيامها وصومي}([1]).

فەرمودەکەیﷺ:{ستة أوسبعة} بۆ سەر پشکی نیە کامیان ڕەچاو دەکەیت یان نا، بەڵکو بۆ تێ ڕوانین و لێ ورد بونەوەو پشکنینی خۆتە. دەبێ زۆر بەوردی ڕونی بکەیتەوەو تێ

---

(١) أ ـ رواه أحمد وأبو داود والترمذي وصححه، ونُقل عن أحمد أنة صححه، وعن البخاري أنه حسّنه.

ب ـ واتە: چۆنیەتیەکەیت بۆ باس دەکەم، پارچە لۆکەیەك کەپێ ی دەگوترێت(الكرسف) بێنەو لەسەر دامێنت)الفرج(ی دابنێ و پێ ی دا بێنە ئەوە خوێنەکە لادەبات. گوتی: ئاخر لەوە پترە، لەم بارەوە فەرموی: ئەوە پیلاقەیەکە لەپیلاقەکانی شەیتان بۆ ئەوەی بەم جۆرە سەرتان لێ بشێوێنێت و ماوەی نوێژ کردن و نوێژنەکردنەکەتان لێ تێك بچێت، ئەو کاتە ئێوەش شەش ڕۆژ یان حەوت کەلەزانست و زانیاری خوای گەورە دایە بۆ ماوەی بێ نوێژیتان دابنێن و دوای ئەو شەش یان حەوت ڕۆژە خۆتان بشۆنەوەو تادەبینی کەپاك بویتەوەو خۆت خاوێن کردۆتەوە ئەمجار بیست و چوار یان بیست و سێ شەو بەڕۆژەکانیەوە نوێژ بکەن و تیایدا بەڕۆژ بن. وەرگێڕ

بکۆشیت کام ڕۆژە بەبەسەر تۆدا دەنگونجێت ڕەچاوی بکەیت. دەبێ بروانیت کام ڕۆژەیان لەحاڵەتی تۆوە نزیکە واتە سیفەتی کام ئافرەت لەو ڕۆژەدا لەسیفەتو خولقو لەتەمەنو ڕەحم دا لەتۆوە نزیکە بۆ خوێنی ماوەی بێ نوێژیەکەی. ئەم جۆرە دانانو خەملاندنانە ڕەچاو بکرێن. دەبێ بزانی ئەگەر ئەو سیفاتانەی تۆو سیفاتەکانی ئەو ئافرەتانە لەشەش ڕۆژەوە نزیکتر بو. ئەوە تۆش شەش ڕۆژەکە بۆ خۆت دادەنێیت، خۆ ئەگەر لەحەوت ڕۆژەکە نزیکتر بو ئەوە تۆش حەوت ڕۆژەکە بۆ خۆت دادەنێیت.

## ئەو حاڵەتانەی کەبەخوێنی دەمار( الإستحاضة ) دەچێت:

زۆر جار هەیە حاڵەتی وا بۆ ئافرەتان دروست دەبێت کەدەبنە هۆی خوێن بەر بونو خوێن لەبەر ڕۆیشتن لەدامێنەوە(نزیف الدم من الفرج). وەکو ئەنجام دەرانی نەشتەرگەری(العملیة الجراحیة) لەزاماڵ دا(الرحم) یا لەشوێنەکانی تری خوار ڕەحم دا، ئەمەش دو جۆری هەیە:

**یەکەم:** لەحاڵەتێك دا کەئەو ئافرەتە دەیزانی دوای ئەنجامدانی نەشتەرگەری ئیدی بێ نوێژی نابینێت وەك نەشتەرگەری دەرهێنانی منداڵدانی بەتەواوی یاخود بەستنی ئەو ئافرەتە کەدوای بەستنەکە خوێن دەبەستیو ناهێڵێ بێتە خوار، ئائەم جۆرە ئافرەتانە حوکمەکانی خوێنی دەمار(الإستحاضة)یان بەسەردا ناچەسپێت، بەڵکو حوکمیان حوکمی ئەو ژنانەیە کەخوێنی ڕەنگی زەرد باو یاخود ڕەش باوو تەڕایی دەبینن دوای پاك بونەوە لەبێ نوێژی، واز لەنوێژ کردنو ڕۆژو گرتن ناهێننو لەجوت بونیش قەدەغەیان ناکاتو خۆشوشتنەوەشیان لەسەر پێویست(واجب) نابێت بەهۆی ئەم جۆرە خوێنەوە، بەلام پێویستە لەکاتی نوێژ کردندا خوێنەکە بشواتەوە، و پارچە پەڕۆیەك یان قوماشێکی خاوێن لەدامێنی خۆی ببەستێت بۆ ئەوەی نەهێڵێ خوێنی لێ بێتە خوار یابێتەر دەر، بادەست نوێژ هەڵ بگرێتو نوێژی خۆی بکات. دەس نوێژەکانیشی بالەو کاتەدا بن کەدەکەوێتە ماوەی شەرعی نوێژەکان. واتە لەکاتی خۆی دا دەست نوێژەکان هەل

بگرێت. ئەگەر کاتی دیاریکراویان هەبووەکو پێنج فەرزە نوێژەکان. دەنا کەی ویستی نوێژ بکات بائەو کات دەست نوێژ بشوات وەك نوێژە سوننەتە ڕەهاکان(المطلقة).

دوەم: گەر نەیدەزانی کەدوای ئەنجام دانی نەشتەرگەریەکە بێ نوێژی نابینێت، بەڵکو لەوانەیە لەتوانای دا هەیە بێ نوێژی ببینێت. ئەوە حوکمی ئەو ژنە حوکمی خوێنی دەمار(الإستحاضة)ی بەسەردا دەچەسپێت. بەڵگەی ئەمەش ئەو فەرمودەی پێغەمبەرە ﷺ کەبەفاگمەی کچی جحشی فەرمو:{إنما ذلك عرقٌ وليس بحيضة، فإذا أقبلت الحيضة فاتركي الصلاة}. کەدەفەرموێ:{إذا أقبلت الحيضة} ئەوە دەگەیەنێت حوکمەکەی حوکمی خوێنی دەمارە ( المستحاضة) بۆ ئەو ژنانەی کەلەوانەیە بێ نوێژی ببینن لەپێش و لەدوای نەشتەرگەریەکە، بەلام ئەو کەسانەی کە مومکین نیەبێ نوێژیان نەبێت ئەوە خوێنەکەیان خوێنی دەمارە بەهەمو حاڵەتەکانیەوە.

## حوکمەکانی خوێنی دەمار(الإستحاضة)

پێشتر زانیمان کامە خوێنی بێ نوێژیەو کامە خوێنی دەمارە(الإستحاضة)، هەر کاتێك کەخوێنی بێ نوێژی بو ئەوە حوکمی بێ نوێژی بەسەر دا دەچەسپێتو کەیش خوێنەکە خوێنی دەمار بو ئەوە حوکمەکانی خوێنی دەماری بەسەردا دەچەسپێت یاچەسپاوە، لەڕابردودا ئاماژە بەحوکمەکانی بێ نوێژی دا کرا.

بەڵام حوکمەکانی خوێنی دەمار وەك حوکمەکانی لەش پاکی وانو هیچ جیاوازیەك لەنێوان ئافرەتانی لەش پاکو خوێن دەمارەکان(المستحاضة)دا نیە لەم ڕوانەی خوارەوەدا نەبێت:

**یەکەم:** دەست نوێژ هەڵگرتن بۆ هەمو نوێژەکانو لەکاتی ماوەی شەرعی نوێژەکاندا، بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺکەفاطمەی أبی جحش رضي الله عنها فەرمو:{ثم توضئي لكل صلاة}(١). واتا ئەمە ئەوەیە کەئەو ژنانە نابێ دەست نوێژە کات دارەکان واتە پێنج فەرزەکان هەڵ بگرن مەگەر لەکاتی بونی نوێژەکاندا بێت و دەکەوێتە ناو کاتی شەرعی نوێژەکان، بەڵام ئەگەر نوێژەکان کات دار نەبون واتە سوننەتەکان ئەوا هەر کاتێك ویستی نوێژ بکات بادەست نوێژ بشواتو ئەو نوێژە بکات.

دوەم: هەر کاتێك ویستی دەست نوێژ بشوات ئەوە دەبێ شوێنەواری خوێنەکەی بشواتەوە. وەپارچە پەڕۆیەکی خاوێن لەسەر لۆکەوە لەسەر دامێنی خۆی ببەستێت بۆ ئەوەی خوێنەکە بگرێتو نەهێڵێ بێتە دەر، بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺکەبە حمنەی فەرمو:{أنعتِ لكِ الكرسف فإنه يذهب الدم، قالت: فإنه أكثر من ذلك، قال: فاتخذي ثوباً. قالت: هو أكثر من ذلك، قال:فتلجمي} واتە: پارچە لۆکەیەك بەکار بێنەو خۆتی پێ

---

(١) أ ـ رواه البخاري في باب غسل الدم.

ب ـ بۆ هەمو نوێژێك لەکاتی کردنیاندا دەست هەڵ بگرە. وەرگێڕ.

پاك بكەوە، حمنە گوتی: لەوە پترە كەبەلۆكە پاكی بكەمەوە، ﷺ فەرموی: كەواتە پارچە پۆشاكێك بەكار بێنە، گوتی: ئاخر لەمەش پترە، فەرموی: خۆت تەگبەند بكە، (كەئەمڕۆ لەزاراوەی نوژداری دا پێ ی دەگوترێت سانتی یادایبی(الحفاظة) من پێم وایە بەكار هێنانی ئەم جۆرە دایبیە(الحفاظة)یە لەهەمو شتێكی تر باشتربێت بۆ ئەو ئافرەتانەی كەئەم حاڵەتانە توش دەبن ـ وەرگێڕ) جادوای ئەنجامدانی ئەم كارە ئەگەر خوێن هەر هات ئەوە زیانی نیە بەگوێرەی فەرمودەی پێغەمبەرﷺ كەبە فاطمەی كچی حبیشی فەرمو:{إجتنبي الصلاة أيام تحيضكِ ثم اغتسلي وتوضئي لكل صلاة، ثم صلّي، وإن قطر الدم على الحصير}(١).

**سێ یەم**: جوت بون(الجماع): زانایان جیاڕان لە دروست بونی جوت بون ئەگەر لەبڵاو بونەوەی خراپیو بار گرانیو ناخۆشیو گوناحو كێشە نەترسن. بەڵام ڕاستیەكەی ئەوەیە بەڕەهایی دروستە(جوازه مطلقاً) چونكە لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ ژنانی لەم جۆرە زۆر بون نزیكەی دەگەیشتنە دەژنو خواو پێغەمبەری خواش لەجوت بون قەدەغەی نەكردن. بەڵكو لەفەرمودەی خوادا هاتوە كەدەفەرموێ:﴿ فَٱعۡتَزِلُواْ ٱلنِّسَآءَ فِي ٱلۡمَحِيضِ ﴾ البقرة:٢٢٢. واتە: لەكاتی بێ نوێژی دا لەژنەكانتان كەنار گیر بن واتە لەگەڵیادا جوت مەبن. بەڵگەیە لەسەر ئەوە كەلەو ماوەیەدا نەبێت قەدەغە نیە جوت بون لەگەڵ ژندا، وەمادام نوێژی بۆدروستە، خۆ جوت بون ئاسانتریشە لەنوێژ، وەپێوانەی جوت بون لەسەر جوت بونی ئەو ژنانەیە كەدەكەونە بێ نوێژی درۆینەوە(غير صحيح).

---

(١) أ ـ رواه أحمد وإبن ماجة.

ب ـ لەماوەی بێ نوێژیەكەتدا كەماوەی عادەتی ئاسایی خۆتە لەنوێژ دور بكەوە و بۆ هەمو نوێژێك دەست نوێژ لەكاتی بونی نوێژەكان، یان هەر كاتێك ویستت نوێژی سوننەت بكەیت هەڵ بگرەوەو نوێژەكەت بكە ئەگەر خوێنت بدڵۆپێتە لەسەر حەسیرەكەش كەلەسەری نوێژ دەكەیت. وەرگێڕ.

چونكە ئەم دو حاڵەتە یەكسان نین هەتاكو لای ئەو كەسانەش كەدەڵێن حەرامە، دیارە پێوانە كردنیش(القیاس) لەگەڵ بونی جیاوازی دا دروست نیە(لایصح).

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمین، وصلّی الله علی محمد وعلی آله وأزاجه وذریاته ومن والاه إلی یوم الدین.

# چەند وشەیەکی زێڕین

## بۆ خوشکی موسلمانی هاوچەرخ

نوسینی
محمد امین میرزا عالم

وەرگێڕانی
ئەحمەد میرزا ڕۆستەمی ژێرو

بسم الله الرحمن الرحيم

هەموو ڕۆژێ گۆڤارێکی زۆر بەگوڕو تەوژمێکی سەر سوڕهێنەر لەمۆدێلات وبڕینی جل وبەرگی تازەوجۆری نوێی ی تازە داهاتوی پۆشاکی ژنانی بیانی وجۆرەها قژبڕین وداهێنان وخۆڕازاندنەوەو جۆرەهامکیاج دەکە ونەبەرچاومان.

زۆرسەیرە: پێم نالێی چۆن کیژی موسڵمانی باوەڕدار ڕازیەکە بێ سێ ودوولاسایی پۆشاك پۆشانی ڕوت و لاروله‌نجەکەری سەر وەك گۆپانەی حوشتر بکەنەوە.

ئائەمەی پانتۆڵ لەبەردەکات. ئەوەی جل وبەرگی تەسك دەکاتەبەر ....ئەوسێ یەمەی کەلەسەرپانیە بەرز دەڕوات، وئەو چوارەمەی خۆ داپۆشە بەلام بە چی؟ بەعەبایەکی ڕەنگاوڕەنگی ئاڵ و والاپۆش و ڕازاوە...وئەوکیژە پێنجەمەی کەقژەکانی بەڕەنگەکانی شەبەنگ (الطيف) ڕەنگ دەکات. وئەو شەشەمەی کەدەم وچاوکوڵمەکانی خۆی لەدەرمانی مکیاج زەردوسور شەلاڵ دەکات .وەچەندانی ترهەن بەڕێگەدا دەڕۆن وجلەکانیان لەلاتەنیشت یاخودلەپاش ولەپێش قڵشێکی تێدایە تا سەرئەژنۆ ولولاکان. ولەنزیك ئەویشەوە ئافرەتێکی تردەڕوات وبۆنی عەتری پاریسی لێ پەرش دەبێت.

یائەو کیژۆڵەی کەزۆر بەفێلاوی ولەخۆباییەوە بەڕێدا دەڕوات وباڕوکە(قژی دەست کرد)ی تازەی لێ لەسەر کردروەو. ئەمەو . ئەمەو . ئەوە.

فەتوا:پرسیارلەشێخ محمد کوڕی صالح العپیمین ئەندامی دەستەی گەورەزانایانی شانشینی سعودیە کرا:

پ: حوکمی کڕینی ئەوگۆڤارانەچی یە کەپڕو پاگەندەی جل وبەرگی تازە داهاتو بلاو دەکاتەوە بۆئەوەی سود لەهەندێ لە مۆدیلەکانی پۆشاکی تازەوهەمەچەشنی ژنانەوەربگرێت؟

وە: گومانی تێدا نیە کەکڕینی ئەوگۆڤارانەی کەتەنیا وێنەحەرامەکانی تێدان حەرام و قەدەغەیە. چونکە بون وبەدەست هێنانی وێنەکان حەرامن بەگوێرەی فەرمودەی

پێغەمبەر(ﷺ){لاتدخلُ الملائكة بيتاً فيه صور}[1]. بۆیە کاتێك وێنەیەکی لەناو قالّیەکەدا (ڕایەخ) لەماڵی عائیشە(ﷺ) دابینی لەجێی خۆی وەستاو نەچوەژورەوەو نیشانەی پێ ناخۆشی وناڕەزایی لەنێو چاوانی دا دیاربو..دیارە ئەو گۆڤارانەش پڕو پاگەندەی جل وبەرگ بڵاو دەکەنەوە کەدە بێ سەیربکرێن، هەموجل وبەرگەکان حەلآڵ نین ، لەوانەیە ئەوجل و بەرگانەی دەیان خاتەڕو جل وبەرگی ئافرەتان بن و بۆ موسڵمانان دروست نەبن وتایبەت بن بەوا نەوە ئەو کاتە دەبێتە خۆچواندن بەکافران و ئەمیش حەرامە بەپێ ی فەرمودەی پێغەمبەر(ﷺ) {من تشبه بقوم فهومنهم}[2] ئەوەی کەمن ئامۆژگاری برا موسڵمانەکانی پێ دە کەم بەگشتی خوشکانی موسڵمان بەتایبەتی ئەوەیەکەلەوجل وبەرگ وپۆشاکە حەرامانە دور بکەونەوە.چونکە تیایدا هەیە خۆچواندنە بەغیری موسڵمانان وپۆشاکی وا یان تێدایە دامێن (عورة)ی داناپۆشن وبەدەر دەکەون. هەرجل وبەرگێکی تازە داکەوت پێویستە لەعادات وڕەوشت وکلتوری موسڵمانانەی خۆمان هەڵ بهێنجرێن، نەك لە وانەی کە دینەکەمان بفرۆشن وبەعادات و کلتورێك کەلەغەیری موسڵمانانەوەپێمان دەگات وکار دەکاتەسەر بیروباوەڕو ڕواڵەتی دەرەوەشمان.[3]

## مەرجەکانی پۆشاکی شەرعی ئەی خوشکی موسڵمانم

بزانە کەخانەوادەی زانست (أهل العلم) هەشت مەرجیان بۆ پۆشاکی ئیسلام داناوە. پێویستە لە سەری سوربی ولەبەرکردن وکارپێ کردنیان. کەلەم خاڵانەی خوارەوەدا کۆدەبنەوە:

**یەکەم** : پێویستە ئەم پۆشاکە هەمولەش داپۆ شێت بێ هەڵاوێردنی هیچ شوێنێك ،دەم وچاو، هەردودەست،وهەردوپێ،وهەردوقۆڵەکان عەورە تن دەبێ داپۆشرێن.

---

( ١) واتە: فریشتەکان ناچنە ناو ئەوماڵەی کەوێنەی تێدابن.(وەرگێڕ).

( ٢) واتە:هەرکەسێك خۆلەهەرکەس و گەل وکۆمەڵێك بچوێنێت ئەوە لەوانە(وەرگێڕ)

( ٣) بە دە قەوە لە کتێبی : (فتاوى المرأة . ص٧٨) هەڵێنجراون.

**دوەم:** نابیٚ ئەوپۆشاکە بۆخۆڕازاندنەوەبیٚ. وەك بلٚێی ڕازاوەوڕەنگاو ڕەنگی سەرنج ڕاکێش بن، و بەداوی زیوی وزێڕین وبریقەدارچنرابن.

**سیٚ یەم:** پێویستە پۆشاك ئەستوربێت وتەنك و تیوارو ڕوت نەبێت لەشی تێڕادیاربێت.

**چوارەم:** نابیٚ پۆشاك تەنك بێت وئەندامەکانی لەش دەرپەڕێنێت و وێنای شوێنە فیتنەیەکان بکات ودەبیٚ دەبلٚ ەپان وپۆڕو فراوان بێت وبە لەشەوە نەنوسێت.

**پێنجەم:** نابیٚ جل وبەرگەکان بۆندارو ڕازاوەو بۆن خۆش بن.

**شەشەم:** نابیٚ پۆشاکی ژنان بەپۆشاکی پیاوان بچێت. واتە نابیٚ لەقوماشی پیاوانەو لەشێوەی پیاوانە بدروێت. جلی پیاوان لەبەر بکات.

**حەوتەم:** نابیٚ پۆشاکی ژنانی موسلٚمان لە پۆشاکی ژنانی کافر بچێت ولە شێوەی ئەوان بدروێن وکورت وتەسك وڕوت بن.

**هەشتەم:** نابیٚ ئەوپۆشاکەی لەبەری دەکەن پۆشاکێکی بەناوبانگ ودەگمەن وڕازاوەبن و خۆیان پێوەبابدات وشانازی ولەخۆبایی بون و گەزافیان پێوە لێبدات. هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: {من لبس لباس شهرة في دنيا ألبسه الله ثوب مذلة يوم القيامة ثم ألهب فيه ناراً}رواه أبوداوة.[1] (بۆپترزانیاری دەتوانی سەیری کتێبی ((من أمرك بالحجاب)) (نشرة الحقيقه)هەروەها کتێبی (عودة الحجاب.ص٣) بکە).

## گری ڕاشکاوی وڕاستیەکان هەلٚە کاریەکان دەبڕیٚ ودەسو تێنیٚ:

خوشکی موسلٚمانم: ئایا دەزانی ئەو دەستە ڕەشە هەلٚ خەلٚەتێنەرە فێلٚ بازەی کەپێش کەمێك لەمەوبەر لێم ئاگادارکردیەوە کیٚ یە؟ ئەودەستە ڕەشە فریو دەرە بریتیە

---

( ١) واتە:هەرکەسێك لەدنیادا جل وبەرگی بەناوبانگ و دەگمەن لەبەر بکات .خوای گەورە لەقیامەتدا جلی ڕیسوایی و سەرشۆڕی لەبەردەکات و ئاگری تیٚ بەر دەدرێت وبلٚێسەی ئاگری لیٚ هەلٚدەستیٚ.خواپەنامان بدات.دیارە ئەمە تەنیا هەر ژنان ناگرێتەوە بەلٚکو بۆپیاوانیش هەمان حوکمی هەیە.(وەرگێڕ)

لەو ناونیشانە بریقەدارو نوسین ومانشێتە سیحر بازو وشەو زاراوە ئەدەبیاتە ڕازاوانەی کە ستونەکانی ناو ڕۆژنامەو گۆڤارەنی پێ پڕ کراونەوەو داوات لێ دەکەن وبانگەشەی بەناو ئازاد بون وپێشکەوتن و گەشە کردن دەکەن وداوای دەست وهاریکاری تۆ دەکەن لەو بەناو ئازادی وپێشکەوتنەی کۆمەڵگاو بەو بیانوەو دەیانەوێ پەلکێشت بکەن و لەسەنگەری حەیاو شەرەف دەرت پەڕێنن.

کێ دەینوسێ؟ بەکرێ گیراوانی ماسۆنیەت و ئامادە کەران وبڵاوکەرەوان وبانگەشەکارانی بەرەڵایی بۆ سەرلێشێوانت وفریو دانت وبۆ ئەوەی پۆشاکی شەرعی خوایی وبەحەیا حەشمەت وفڕێ بدەیت و ڕەگەڵیان بکەویت وبخەیتە ناو دەستیان ولەپاکی وداوێن پاکی وشەرەفمەندی وسەربەرزی وسەرفرازی دەرت بهێنن ولەبەرنامەی خوا دورت بخەنەوە وتەواو هەڵت بگێڕنەوە وپیس وپۆخڵ و وات لێ بکەن نەخێرت بۆ نەفسی خۆت پێوە بمێنێ ونەبۆ مێردو کەس وکارت ..

ئەوانە لەپیست وگۆشت وهێسکی خۆمانن وهەر بەزمانی خۆشمان قسە دەکەن ودەدوێن و بە ساختە چێتی ولەبن پەردەی درۆین داوای ئازاد بون وڕزگار بونی ئافرەت دەکەن ودەڵێن: چۆن کۆمەڵگا دەتوانێت بەیەك دەست بژیەت وئەویتریان کپ و خنکێنراو بێت ؟! وەهەتاکەی دەبێ ئافرەت لەناوچوار دیواردا کۆت وبەندو زنجیر بکرێت؟! ئایا هەر دەبێ ئەو نیوەی کۆمەڵە لەکار بخرێت سڕ بکرێت ؟! ئاخر کۆمەڵگا ناتوانێت بەقاچێك بڕوات بەڕێوە. بۆچی ئێوە وا سورن لەسەر ئەم کارە؟! نەخێر بەڵکو ئێوە دوا کەوتوی کۆنە پەرستن.

إنَّا سمعنــــــا أختنا شــيئاً عجـــــاب

قالوا كلاماً لايــسرُّ عــن الحجــــاب

قالــوا خيامـــاً غُلِّقت فــوق الرقــــاب

قالوا ظلامـــاً حالكـــاً بين الثيـــاب

قالـــوا التأخر والتخلف فـــى النقـــاب

**قالوا الرشـــــاقة والتطور في غيـــاب**

**نادوا بتحرير الفتات وألفوا فيه الكتــــــاب**

**رسموا طريقاً للتبرج لايضيِّعه الشبــاب**

**ياأختنا هم ساقطون إلى الحضيض إلى التراب**

**ياأختنا هم سافلون بغيهم مثل الكـلاب**

**يـــاأختنا هذا عواءُ الحاقدين مـــن الذئـــاب**

**ياأختنا صبراً تذوب ببحره كل الصعاب**

**يـــــاأختنا العفيفة والمصــــــونة بالحجاب**

**ياأختنا فيـــك العزيمة والنزاهة والثواب**

**فالنــــار مثوى الظالمين لهــــم عقــــاب**

**والله يكشف ظلمهم يــــوم الحســـــاب**

**والجنَّةُ المـــأوى ويــــا حســــن المـآب** [1]

---

( ١) واتە: ئێمە شتێکی سەیرو سەرسوڕ هێنەمەرمان دەربارەی خوشکەکەمان بیست. قسەیەکی ناخۆش دەربارەی پۆشاکی شەرعی خوشکان کەدڵ نیگەران وناگوشاد دەکات.

بەو پۆشاکە شەرەف مەندە دەڵێن: چارشێوێکە و بەسەر ڕوی ئافرەتان دا دراوەو قفڵی داوە. گوتیان : ئەوە تاریکاییەکی ئەنگو ستە چاوە لەنێو هەمو پۆشاکەکاندا بەباڵایدا دراوە. گوتیان ئاخر پەچە وپەردە وئەو پۆشاکە مایەی دواکەوتویی ونەفامیە.گوتیان ڕازاوەیی ولەش جوانی وپێشکەوتن فڕێ دانی ئەو پۆشاکە یە. هاواریان لێ هەستاو بانگەشەی ئازادی کچانیان کردو چەندان کتێب وچاپکراویان لەسەر نوسی. چەندان نەخشەوپلانی خۆڕازاندنەوەو خۆڕوت کردنەوەیان کێشا و هەمو گەنجانیان بۆ جلۆکێش کردن.

ئەی خوشکەکەمان: ئەوانە تێچون وکەوتونە بنکی بنەوەی چاڵ و بەزەوی دا کەوتون .ئەی خوشکی ئێمە ئەوانە سوك وڕێسوان وکردەوەکانیشیان سوك وڕێسوایە وەکو سەگن گوێ یان پێ مەدە . ئەی خوشکی بەڕیزمان ئەو هاوارە هاواری ولورەی لەدورەوەی گورگ وچەقەڵکانە، ئەی خوشکی

## نەخشەی تێك شاکاندنی شه پۆلەکه :

دوژمنانی ئیسلام بەجولەکەو هەمو ئەوانەشی کەلەسەر بەرنامە ئەوان دەڕۆن وشوێن کەوتەی ئەوانن لەعەلمانیەکان.. بانگەشەکارانی بە ڕۆژئاوایی بون وزوڕنا ژەن ودەهۆڵ کوتانی ڕۆژئاواو وجولەکەو نەصرانیەکان مەبەستێکی گڵاویان هەیەو نەخشەو پلانێکی پیس وبۆگەنیان داڕشتوە بۆ بڵاوکردنەوەی خراپی وخراپەکاری لەناوچین وتوێژەکانی کۆمەڵگای موسڵماناندا، بڵند کۆی بانگەشە کردن وزوڕنا ژەنین ودەهۆڵ کوتانی هاواری ڕوت کردنەوەی ئافرەتان وتێکەڵاویان لەگەڵ پیاواندا تاو داوەتێ وهاواریان لێ بەرز بۆتەوە.

ئەوان ڕاستەوخۆ داواو بانگەشەی ئەمە ناکەن.. بەڵکو ژێرەو ژێر بۆی دەچن ولابەلا لێ دەدەن.

ئەوەتا دەڵێن ئێمە دەمانەوێ ئافرەت تەنیا چاوی بەدەر خات تا لەڕێدا نەکەوێت وچاوی ببینێ !! ... ئا ئەمە سەرەتای نەخشەوپلانەکەیان بو یەکەمین هەنگاویان بو. لەمەدا سەرکەوتن ڕوخساری پاکی ئافرەتیان بەدەرخست وچاوی وخائن وبێ باوەڕیان ئەم ڕوخسارە بێ گەردەیان پیس وڕەش کرد. ئەمجار هەنگاوی تازەیان هەڵهێنا وەی

---

بەڕیزمان ئارام بگرە ، دەریای ئارامە کەهەمو کەندو کۆسپەو ناخۆشی و قورسیەك دەتوێبێتەوەو ڕادەماڵیّو پڕ دەکاتەوە.

ئەی خوشکی بەڕێز تۆ بەو پۆشاکە شەرعیە شەرەف وکەرامەت وداوێن پاکیت پارێزراوە ، ئەی خوشکی موسڵمان دەی تاو وگوڕو هیممەت ونیەت ونیاز وپاکی وبێ گەردی لەتووە.پاداشتیش لەخوای گەورەوە. ئەی خوشکی بەڕێز: چارەنوس وجێگای ستەمکارانیش سزا و ئازارو ئەشکەنجەی بەسفت وسوێ ی ئاگری دۆزەخە. دڵنیا بە زۆر دڵنیاو بێ گومان بە کەخوای گەورەلەڕۆژی حساب ولێ پێچانەوەدا ستەم وکردەوە خراپ وبۆگەنەکانیان ئاشکرا دەکات ولەبەر چاوی هەمو خەڵکی ڕۆژی هەستانەوە ڕیسوا و ڕو ڕەشیان دەکات . وبەهەشتی(المأوى) ش بۆ بڕواداران وخۆ لەخوا پارێزان دەبێت ئای لەو شوێنە خۆش وبەلەزەتە ،ئای کەچەند جێگەیەکی چاك وخۆشە.(وەرگێڕ)

دوەمیان دەست پێ کرد کەئەویش ڕوت کردنەوەی ئافرەت بو(تسفیر المرأه) ، گوتیان دەی چی تێدایە بائافرەت دەم وچاوی بەدەر بخات وجلی مۆدە لەبەر بکات خۆ دینی ئیسلام دینی ئاسانکاری ودینێکی نەرمە وڕێگە لەمە ناگرێت و توندو تیژی تێدا نیە. پێغەمبەریش هەواڵی داوە بەلەناو چونی مل ملانێ کاران وتوندو تیژان (المطنطعین) داوە..! !دەی خۆ پۆشاکی ڕاستەقینەی ئلرەتان وا لەناو دڵیاندایە نەك لەسەر دەم وچاو و ڕوی دەرەوەی لەشیان..ئابەم جۆرە جۆرها گومانیان خستە ناو دڵی خوشکانی موسڵمانەوە.

قالـــوا أرفعي عنك الحجابـا

أو مـــا كفاك به إحتجابـا

واستقبلـــي عهد الفســـور

اليوم وإطرحـــي النقابـا

عهـد الحجـاب لقد تـبـــا

عـد يومـــه عنا وغابـا[1]

دەی ئەمجار هەنگاوێ تریان هاویشت وگوتیان: ئەوە چی یە ئەو چارشێوە ڕەش وچڵکنە بەسەر جلەکانتانەوە لەبەر دەکەن وبەسەرخۆتانی هەڵ دەکێشن؟بۆچی ئەو عەبایە جوان وڕازاوە وڕەنگاوڕنگ ومزەرکەشە (الكابات) لەبەر ناکەن؟!

ئایا لەبەر کردنی ئەم جلە میرودارو چنراو بەداوە دەزوە زیوینیەکان دنیا هەڵ دەستێت ونانیشێتەوە یادنیا لەبەر یەك دەچێت؟!

---

( ١) واتە:بەئافرەتانی موسڵمانانیان گوت: دەی پەچەو پەردە و پۆشاکت فڕێ دە و ڕوت بەد ە ر بخە دە ی بەسە چیدی بەم چارشێوە خۆت دامەپۆشە و خۆت وەدە رخە، لەو بەندە وە رە دە رو ڕوبکە سەردە می ئەمڕۆی ئازادی و پەچەکەت فڕی بدە. بەسیە ئیدی سەردەمی پەچە وپەردە وپۆشاك وخۆداپۆشین بەسەرچو، رۆیی و ڕۆژی بەسەرچو لەئێمە دورکەوتەوەو لەپێش چاومان ون بو.(وەرگێڕ).

دیسان گوتیان.. ئاخر تۆ ناتوانی بەم جله تەسکانه بەرێدا بڕۆیت وجلەکانت لەژێرەوە تەسکن وئازارت دەدەن .. ئەی چار چیه؟!

ئه هـ .. چار زۆر ئاسانه .. وەره لەلای ژێرەوەڕا (لەدامێنەوە) قڵیشێك(درزێك) لەجلەکانت (کراسەکەت – تەنورەکەت) بکه فراوان دەبێت!!

ئەمجار گوتیان.. دەی باشه ئەم ڕەش پۆشینەی بۆچی یه؟ پۆشاکێکی ڕەنگاو ڕەنگ لەبەر بکه، بەلأم بەیەك ڕەنگ و لەخۆ ڕازاندنەوەش دوربکەوە وە.

دەی لەسەر ئەم فرو فێڵ وفریو دان وگومان خستنه ناو دڵان و وەسوەسانەیان هەر بەردەوام بون تاتوانیان ئافرەتانمان فریو بدەن وجلەکانیان پێ کورت بکەنەوەو ڕوت وسفوریان بکەن وبەتەواوی پۆشاك وعەباو جل وبەرگی شەرعیان لەبەر دابماڵن و پێ فڕێ بدەن و لچك وپەردەیان لەسەر ڕوان فڕێ بدەن وقژو پرچ وپەرچەمیان پێ واڵاو ڕوت بکەنەوەو قژی ژنان لەگەڵ شنەی هەوای بەهارو هاوین وزستان شنایەوە. ئیدی بەم پێودانگه تابەتەواوی ئافرەت هاته دەرو جڵەوی خۆی لەدەست خۆشی دەرچو و وەك بوکه شوشه ئاڵ وواڵا وڕازاوه وڕوت وقوت بوەوە، بەناوی پێشکەوتن وشارستانیەت وکۆمەڵگای مەدەنی لەگەڵ پیاوانی بێگانەدا تێکەڵ بو.

بەوەشەوە نەوەستان تاگەیشته ئەو ڕادەیەی کەله کەنارەکانی دەریاو لەهاوینه هەوارەکان و شوێنەکانی گەشت وگوزارو ڕابواردن بەشێوەیەکی وادەرکەوتن کەهیچ شتێکیان لەبەردا نەما کەلەشیان دابپۆشێت، بەم جۆره جڵەوی ژنان بەهیچ کلۆجێك نەبەدەست خودی خۆیان نەبەدەست مێرد و نەبەدەست کەس وکاریان ماو بەتەواوی کەوته ناو لەپی دەستی بێگانەکان وگورگه برسیەکانی ناوکۆمەڵ و کەوته دەستی دروستکەرانی جل وبەرگ وپۆشاکی جولەکەو نەسرانی وهاندەرانی ئەو جل وپۆشاکه ناشەرعی وبێ ئابڕۆییانەوە. هەروەکو کەوته دەستی بانگەشه کارانی یەکسانی ژنان بەپیاوان وبەناو پارێزەرانی مافه خوراو وڕفێنراوەکانی ئافرەتان!!

ئابەم شێوە ئافرەتیان فریو داو لەگرێژەنەیان بردو لەڕێگەی ڕاست وفیترەتی خوایی لایان داو ئافرەتی بەستەزمانیان سەر لێشێواندو وەك ڕانە مەڕی گورگ لێدراو بەدوای گورگە دوژمن وکەڵبە تیژو بخۆرەکەی دا ڕای کردو مل بەمل بەدوای کەوت ! !

ئەی خوشکی موسڵمانم : سەدان مەخابن! بینیت چۆن حەیاو شەرم سەر بڕدراو داوێن پاکی چۆن دزراو زرێنرا.. ! ! ئایا هۆشیارو بەئاگا نایەیتەوەو ئاوڕێك لەڕابردوی خۆت نادەیتەوە بزانی داخۆ چی یان بەسەر هێناوی وچی یان پێ کردوی؟ !

أرى خلل الرماد وميض نار وأخشى أين يكون لها ضرام
فإنَّ النار بالعودين تزكـــى وإنَّ الحرب مبدؤهـــا كلامُ[1]

گۆرانی ومۆسیقا لەچەند دێڕێك دا:

خوای باڵا دەست وکاربەجێ دەفەرموێ:﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٦﴾ لقمان:٦.

ئیبن ومەسعود لەڕاڤە کردنی ئەم ئەم ئایەتەدا سێ جار سوێند بە(والله الذی لا إله إلاّ هو) دەخوات ودەڵێ: مەبەستی خوا لەم ئایەتەدا گۆرانی گوتن وگوێ بۆ گرتنیەتی)[2].

---

( ١) واتە: دەبینم کەمەترسی کەوتنەوەی ئاگر لە تروسکە ئاگری بن خۆڵەمێش دایە .دەی دەبێ زۆر ورد بین وبەرچاو ڕۆشن بین چونکە دوژمنانی ئیسلام هەمیشە وابۆمان لەبۆسەدان و خۆیان مەڵاس داوە مەترسیان هەروەکو مەترسی سیسە ئاگرو پشکۆی سیسەماری گەشاوەی ژێر خۆڵەمیش یاوەك کورد گوتەنی( ئاگری بن کایە وایە).ئەی خوشکا ن وئەی برایانی موسڵمانم دەبێ وریاو چاو کراوە بین. ئەدی نازانی ئاگر بەربونەوە لەدو پوشکە یا لەدو چڵە چیلکەوە کڵپە دەستێنێ و دادە گیرسێ و دە تەنێتەوەو لەش دادەگرێت، هەمو جەنگێکی گەورە و وڵات کاول کەر وقڕ تێخەریش سەرچاوەکەی لە قسەو گفتارو بەرنامە ڕێژی وبانگ کردنەوە سەرچاوە دەگرێت. وەرگێر.

( ٢) تفسیر إبن کثیر١/ ٤٤١.

پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی: {لیکونن فی أمتی أقوامٌ یستحلون الحِرَّ والحریر والخمر والمعازف}[١].

ئیمامی أبوبکرﷺ فەرمویەتی: گۆرانی وژەنینی ئاوازەکان وگویٚ بۆ گرتنی زوڕنای شەیتانن. هەروەا هاوەڵانی ئیمامی أبی حنیفه گوتویانە: گۆرانی گوتن و گویٚ گرتن بۆ گۆرانی وئاوازەکان دەرچونە لە لەدین و چێژ وەرگرتن لیٚ یان کوفرە.

ئیمامی مالك کوڕی ئەنەس گوتویەتی: گۆرانی گوتن وگویٚ گرتن بۆی لای ئێمە تەنیا خراپە کاران دەیکەن وپیشەی ئەوانە. ئیمامی شافیعیش ﷺ گوتویەتی: گۆرانی وڕابواردن خۆ خەریك کردن وکات بەفیڕۆ دانەو لەکارێکی بیٚ ناوەرۆك وپڕو پوچ دەچێت.

ئیمامی أحمد ﷺ گوتویەتی: گۆرانی گوتن دوڕویی لەدڵدا دەڕوێنێت. ئیمامی القرطبیی ﷺ گوتویەتی: گۆرانی وئاواز لێدان بەقورئان وسوننەت قەدەغە وحەرامە.

ئیمامی إبن الصلاح گوتویەتی: گۆرانی گوتن لەگەڵ لێدانی ئامێرەکانی مۆسیقا بەکۆڕای زانایان حەرامە.

ئەی خوشکی موسڵمانم، ئەی ئەو کەسەی کەخواو پێغەمبەری خوات خۆش دەوێت پێت دەڵێین:٠(فماذا بعد الضلال إلاّ الحق) ؟![٢]

* فتوا:

پ: بڕیاری شەرع چیە دەربارەی گویٚ گرتن بۆ گۆرانی ومۆسیقا، وحوکمی سەیر کردنی ئەو فیلم و زنجیرانە چی یە کەژنان تیایدا ڕوت وسفوورن؟

---

( ١) رواه البخاري فی صحیحه :٥١/١٠.

واتە: زەمانێك دادێت لەم ئوممەتی منە کەس وگەل وقەومانێك پەیدا دەبن کەداوێن پیسی واتە زینا ولەبەر کردنی پۆشاکی حەریرو مەی خواردنەوە وژەنین ولێدانی ئامێرەکانی مۆسیقاو گۆرانی حەڵاڵ دەکەن. وەرگێڕ.

( ٢ ) دوای هەق لەناهەق بەولاوە چی تر هەیە؟!وەرگێڕ.

وەلام: گوێ گرتن بۆ مۆسیقا و گۆرانی حەرامە وهیچ گومان لەحەرام بونی دا نیە، لەپێشینەی پیاو چاکانی سەحابەکان وشوێن کەوتانەوە پێمان گەیوە گۆرانی دوڕویی لەدڵدا دەڕوێنێت وگوێ گرتن بۆ گۆرانی ومۆسیقا لەڕابواردن وقسەی پڕوپوچ وبێ واتاو گوناحبارییەو لەشەریعەتی خوادا بێزراوە هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ:﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشۡتَرِي لَهۡوَ ٱلۡحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًاۚ أُوْلَـٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٞ مُّهِينٞ ٦﴾ لقمان:٦.

ئیبن مەسعود لەشرۆڤەی ئەم ئایەتەدا دەڵێ:(والله الّذى لا إلهَ إلاّ هو إنَّهُ الغناء) واتە سوێندم بەخوا کەهیچ خوایەکی تر لەو بەولاوە نین بەهەق بپەرسترێ مەبەستی خوای گەورە لەم ئایەتە گۆرانیە. گومانی تێدا نیە کەشرۆڤە کردن ولێکدانەوەی ئایەتەکان لەلایەن سەحابەوە بەڵگەیەو وەردەگیرێت وکاری پێ دەکرێت ولەپلەی سێ یەمدایە لەلێکدانەوەو شرۆڤە کردنی قورئانی پیرۆزز چونکە شرۆڤە کردن و لێکدانەوەی قورئان سێ پلەی هەن کەبریتین لە لەمانەی خوارەوە:

١. لێکدانەوەی قورئان بەقورئان.
٢. لێکدانەوەی قورئان بەسوننەت.
٣. لێکدانەوەی قورئان بەفەرمودەی سەحابەکان.

هەتاکو هەندێ لەئەهلی زانست وزانیاری تا ئەو ڕادەیەش دەڕۆن کەلێکدانەوەی سەحابی حوکمی بەرز کردنەوە(الرفع) هەیە، وەلێ ڕاستەیەکەی ئەوەیە کەحوکمی بەرز کردنەوەی نیە، وبەڵکو نزیکترین قسەو گفتارە لەڕاستیەوە. هەروەها گوێ گرتن بۆ گۆرانی ومۆسیقا کەوتنە ناو سنوری ئەو کردارەیە کەپێغەمبەرﷺ ئاگادارمان دەکاتەوە کەخۆمانی لێ بپارێزین ولێ ی دوربکەوینەوەکەفەرمویەتی:{لیکونن أقوامٌ من أمّتی یستحلون الحِرَّ والحریر والخمر والمعازف }. واتە: زیناوخراپەکاری ومەی خواردنەوەو لەبەر

کردنی حەریرو بەکارهێنانی ئاوازدارەکان واتە ژەنین ولێدانی ئامێرەکانی مۆسیقاو ئاوازەکان وکەیف وسەیف وڕابواردن وهەڵ پەڕین وداپەڕین حەڵاڵ دەکەن کەخوای کەورە لێ ی حەرام کردون[1].

لەڕوانگەی ئەمەوە من ئامۆژگاریم ئاراستەی بریانی موسڵمان دەکەم کەخۆیان دور بگرن لەگوێ گرتن بۆ گۆرانی ومۆسیقا وهەمیشە سڵی زۆری لێ بکەنەوە. بەگۆتەو پروپاگەندەی ئەوانە فریو مەخۆن کەدەڵێن: ئەهلی زانست وزانیاری واتە زانایان ڕێگەیان داوە بەگوێ گرتن لەگۆرانی وئاوازەکان (المعازف) واتە مۆسیقا ، چونکە بەڵگە لەسەر حەرام بونی ڕون وئاشکراو زۆرن.هەروەها تەماشا کردن وبینینی فیلمە زنجیرەییەکان کەئافرەتیان تێدا بێت وئەکتەری ئافرەتیان تێدا بەشدارە حەرام وقەدەغەیە مادام لەو فیلمانەو بەهۆی ئافرەتەوە توشی گوناح و فیتنە دەبیت.دەبێ ئەوەش بزانین کە ئەو قلیمانە زۆربەی زۆریان زیان بەخشن نەك سود بەخش، هەتاکو ئەگەر ئافرەتیشیان تێدا بەشدار نەبێت. دەی ئاخر خۆ بەچاوی خۆمان ژن وپیاوانی بەشدار بوی ئەو فیلمانە دەبینین، کەژنەکەکان پیاوەکان دەبینن حەرامە بۆیان وکەپیاوەکانیشمان ژنە بەشدار بوەکان دەبینن حەرامە بۆیان. بەزۆری وایە کەمەبەستیان لەگەڵاڵە کردن وبەرهەم هێنان و پەخش کردنی ئەو فیلمانە زیان گەیاندنە بەکۆمەڵ لەڕوی ئاکارو ڕەوشتەوە..داوا لەخوای باڵا دەست وکاربەجێ دەکەم کەموسڵمانان لەداو وشەڕو فیتنەو ئاژاوەگێری ئەو فیلم وزنجیرەیی وگۆرانی ومۆسیقایە بپارێزێت وکاربەستانمان بۆ چاك بکات بۆ ئەوەی بواری خێرو بەرەکەتیان بۆ موسڵمانان وگەل ونیشتمانی موسڵمانان تێدا بێت. خوای گەورە ئیصلاحی ئێمەو ئەوانیش بکات ..ئیدی خواش لەهەموان زاناترە(والله أعلم)[2].

---

( ١) رواه البخاري من حديث أبي مالك الأشعري أو لأبي عامر الأشعري.

( ٢) أ.ه(فتوى الشيخ إبن العثيمين من كتاب فتاوى المرأة ص١٠٦) (أسئلة مهمة سؤال ١٣)

## تێکەڵاوی قەدەغەو حەرامە:

خوشکی موسڵمانم ..ئەی گەوهەری کۆمەڵگا :

هەمو ئاڵتون وتەلایەك ئەگەر دزرا یا بزر بو یاخود شکا دەتوانرێ قەرەبو بکرێتەوە یا چاك بکرێتەوە تەنیا تۆ نەبی، کێ دەتوانێ ئافرەتی موسڵمانی بڕوادارو..شەرەفمەندو..داوێن پاك وبەئابڕۆمان بۆ قەرەبو بکاتەوە؟!!

* هەروەها تێ بگە ئەی خوشکی موسڵمانم:

کەلەئاسانکاری وچارەسەریە یەکساتەکانی ئیسلام ئەوەیە کەتێکەڵ بونی هەردو ڕەگەزی نێرو مێ ی لێ قەدەغە کردوینن بۆ بەرژەوەندی خۆمان بۆپاك ڕاگرتن و پاراستنی شەرەف وناموس وکەرامەت و دورکەوتنەوەمان لەگومانە خراپەکان(الشبهات).

دەی کەواتە پۆشاکی شەرعی بۆ تۆ وەك قەڵاو وەك مێرگێك وایە کەلەبن سێبەری دا دەحەسێیەوە و چێژ لەشکۆمەندیەکەی وەردەگریت.پۆشاکی شەرعی زیندان وکۆت وزنجیروهەوری ڕەش وچڵکن نیە هەروەکو عەلمانیەکان وکلك و وابەستەکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات بۆیان وێنا کردوی وتێ یان گەیاندوی. ئاگادار و وریا بە وزۆر هوشیار بە لەفرو فێڵ و تەڵەکەبازیەکانیان. با ئەو گەوهەرە بەهادارو بەنرخە، ئەو میوە پاك وخاوێن وبێ گەردە والا نەبێت ومێش ومەگەزی لێ بنیشێتن بەڵکو با هەروەك خۆی چۆن خوای پەروەردگارمان دروستی کردوە پارێزراو وپەنهان وداپۆشراو بمێنێتەوە وگورگە چاو برسیەکانیش بالە دورەوە هەر کسکەی چاویان بێت.

* بەڵگەکان:

خوای باڵا دەست وکاربەجێ دەفەرموێ:﴿ وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ

ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾ ﴾النور: ٣١ [(١)].

---

( ١ ) واتە:ئەی پێغەمبەرﷺ بەئافرەتانی بڕوادار بڵێ باچاویان لەئاست پیاوانی بێگانەدا دابخەن وسەیریان نەکەن.و ناموس وعەورەتی خۆیان بپارێزن ولەداوێن پیسی و زینا خۆیان بپارێزن ولەڕێگەی شەرعیەوە نەبێت ئارەزوە سێکسیەکانی خۆیان جێ بەجێ نەکەن .داوێن پاك و بە ئابڕۆ بن .باجوانی وزینەتی خۆیان بۆ پیاوانی بێگانە بەدەرنەخەن ،بێجگ لەوەی کەلەکاتی کارو فرمانی ئاسایی وەك نان خواردن ونیش و کاری ناومالّ .با چارشێو وجل وبەرگەکانیان بەسەر قەد وملیاندا بەر بدەنەوە زیێ یان بلێ باجوانی ونازو نوزی خۆیان بۆ پیاوانی بێگانە بە دەر نەخەن مەگەر بۆ مێردەکانی خۆیان ، یا بۆ باوکیان ،یان باوکی مێردەکانیان ،یان بۆ کوڕەکانیان ،یان کوڕی مێردەکانیان ،یا براکانیان ،یا کوڕی براکانیان، یا کوڕی خوشکەکانیان،یان ئافرەتانی خۆیان واتە ژنانی موسڵمانان نەك ژنی ناموسڵمانان کەلەوانەیە لای پیاوانی ناموسڵمان باسیان بکەن وببێتە هۆی کەوتنەوەی فیتنەو فەسادی وخراپە . یان خۆدەرخستن بۆ کەنیزەکانیان کەموڵکی خۆیانن یان بۆ ئەو پیاوانەی کەپێویستیان بە ئافرەتان نەماوە و مەترسی خیانەتیان نیە وەك پیرە پیاوەکانی پەك کەوتو یائەو پیاوە گێلانەی کەلەبارەی سێکسەوە هیچ نازانن و هەمو ویست وئارەزویان تەنیا خۆراك وپڕکردنی ورگیانە .یابۆ ئەو منداڵە ساوایانەی کەهێشتا بالّغ نەبون و سەوداسەری ڕەگەزی یان نەکەوتۆتە مێشك ودڵ ودەرونەوە.هەروەها پێ یان بلّێ: با ئافرەتانی بڕوادار پێ یان بەزەویدا نەکوتن بۆ ئەوەی دەنگی زرنگ وهوڕو خرنگەی خشڵ و زێڕو زەبەرەو پاوانەکانیان بەرز نەبێتەوە و وەك ئاگاداری ووریا کردنەوەی نامەحرەمان وبەخەبەر هێنانی پیاوانی بێگانە. هەروەها عەترو شتەبۆن خۆشەکانیش سەرنج ڕاکێشەرن وحەرامە بەکار هێنانیان . هەروەها هەندێ پۆشاکی جوان وڕازاوەو زاق وبریقەدار

هەروەها پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{إيَّاكُم و الدخول على النساء}فقال رجلٌ من الأنصار: يارسول الله: أفرأيت الحمو؟ يعني أقارب الزوج– فقال(( (الحمو الموت)) [1] متفق عليه.

هەروەها لەفەرمودەیەکی تردا ﷺ فەرمویەتی: {لايخلون رجلٌ بِامرأة فإنَّ الشيطان ثالثهما} رواه أحمد بإسناد صحيح).[2] هەروەها ﷺ فەرمویەتی:{لأن يُطعنَ في رأسي أحدكم بِمخيطٍ من حديدٍ، خيرٌ لهُ من أن يمس إمرأة لا تحل لهُ}رواه الطبراني والبيهقي وهو حديث حسن [3].

لەئەسمای کچی ئەبوبەکری سدیقەوەﷺ دەگێڕنەوە کەگوتویەتی: ئێمە هەمیشە دەم وچاومان لەبەرامبەر پیاواندا دادەپۆشی[4].

---

هەر لەم جۆرەن دروست نیە لەبەر بکرێن بۆ دەرەوە وبۆ ناونامحرەمان. دەی بڕوادارەکان پەشیمان بینەوەو تۆبە بکەن و هەموتان بۆ لای خوای بالاّ دەست وکار بەجێ بگەڕێنەوە و وەرنەوە سەر ڕێگەی ڕاستی خوایی ڕێگەی قورئان وسوننەت و بەدوای کوێرە ڕێگایان مەکەون بۆ ئەوەی لەلای خوای گەورە یا خوای گەورە سەربەرز وسەرفرازتان بکات لەدنیاو لەقیامەتدا.وەرگێڕ.

لە( عیمان عبدالعزیز محمد.تەفسیری قورئانی پیرۆز ج٩، ١٩٩٧.) وەرگیراوە.( وەرگێڕ)

( ١ ) ئەی بڕواداران هەرگیز نەکەن لەگەڵ ژناندا تێکەڵ ببن . یەکێك لە پشتیوانان گوتی:ئەی ڕەسولی خوا : ماڵە خەزورانیش واتە خزم وکەس وکاری مێرد– فەرموی:(( ماڵە خەزوران هەر مردنە)) واتە مردن باشترە لەتێکەڵ بونیان (وەرگێڕ).

( ٢ ) واتە: ژن وپیاوێك بەیەکەوە نابن ویانامێننەوە کەشەیتان سێ یەم کەسیان نەبێت.واتە ئەگەر ژن وپیاوێك بەیەکەوە مانەوە وبەیەکەوە وەستان وتێکەڵ بون ئەوە شەیتا ن سێ یەمین کەسیانە.(وەرگێڕ).

( ٣ ) واتە: ئەگەر دەرزیەکی ئاسن بەچەکوش لەسەر سەرت دابکوتن باشترە لەوەی بەر ژنێك بکەویت کەلێت حەڵاڵ نیە.(وەرگێڕ).

( ٤) رواه الحاكم وقال:إسناده صحيح على شرط الشيخين.

ئالێرەدا دەزانین وبۆمان دەردەکەوێت کە وێنەکانی تێکەڵ بونی حەرام لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا گرد دەبنەوە:

١) تێکەڵ بون ومانەوەی کچان لەگەڵ کوڕە مام وپورەکانیاندا(کوڕانی خوشکی باوکی).

٢) تێکەڵ بون ومانەوەی کوڕە خاڵ وکوڕە پورەکانی(کوڕانی خوشکی دایکی).

٣) تێکەڵ بون ومانەوە لەگەڵ برای مێرد سەبارەت بەژنەکە.

٤) تێکەڵ بون ومانەوە لەگەڵ خوشکەکانی ژن لەگەڵ مێردەکەیدا.

٥) تێکەڵ بون ومانەوەی برای شیری ژن لەگەڵ خوشکەکانی خوشکی شیری.

٦) مانەوەو تێکەڵ بونی دەزگیرانی کچ لەگەڵ کچدا و چونە دەرەوەیان پێش مارە برین.بەڵکو تەنیا ئەوەندەی بۆ هەیە بەئامادە بونی بەخێوکەرو سەرپەرشتیاری کچەکە تەماشای بکات ئەگەر مەبەستی هاوسەرگیرێتی لەگەڵدا هەبێت.

٧) سەرکەوتنی بوك وزاوا بۆ سەر دوانگەو ئەو شوێنەی بۆیان ئامادە کراوە لەڕۆژی گواستنەوەداو لەپێش چاوی ژناندا.

٨) سەرکەوتنی خزمانی بوك وزاوا بۆ سەر دوانگەو ئەو شوێنەی کەبۆیان ئامادە کراوە لەپێش چاوی خەڵکی دا.

٩) کارکردن وخزمەتکردنی پیاوان وژنان بەتێکەڵی لەئاهەنگ وبەزمی هەندێ لە ئوتێل ومیوانخانەکاندا هەروەکو لەهەندێ لەئاهەنگەکانی بوك گواستنەوەدا دەیان بینین .

١٠) تێکەڵ بون ومانەوەی ژنان وپیاوانی بێگانە بەیەکەوە بەگشتی بەبیانوی ئەوەی کەدڵمان پاکە ونیەتی خراپەمان لەدڵدا نیە.یا دەڵێن:(إنَّما الأعمال بالنيات) واتەك هەمو کردەوەیەك بەنیەتە. دەی ئێمە نیەتی خراپمان نیە.

١١) مانەوەی ئەوژنانەی کە پەك کەوتەکارن وبەسالآچون (القواعدمن النساء)لەگەڵ پیاوانی بێگانە، بەڵکوشەرح هەر ئەوەندەی ڕێگە پێداون کەتەنیا دەم و چاویان بەدەربخەن. وەئەگەر خۆبپارێزن وخۆدابپۆشن باشترە بۆئەوان

١٢) تێکەڵ بون و مانەوەی ژنان بەپیاوانی بێگانە بەبیانوی ئەوەی کەخزمەو کەهۆزو عەشیرەتە .

١٣) ئاسان کاری وچاوپۆشی کردن لەتێکەڵ بونی کچان لەتەمەن وساڵی باڵغی دا بەگەنجان وبەپیاوانی بێگانە بەبیانوی ئەوەی کەگوایە هێشتا منداڵن وچیان لەسەرنیە .

١٤) تێکەڵ بونی ژنانی خزمەتچی وکارەکەر بەپیاوان لەماڵدا .

١٥) تێکەڵ بون ومانەوەی شۆفێرو خزمەتکارانی پیاو لەگەڵ ژنانی ماڵ .

١٦) مانەوەی شۆفێری تەکسی و (صاحب اللموزین)لەگەڵ ژندا لەناو ئۆتۆمبیل وماشێندا .

١٧) هەروەها مانەوەی شۆفێری سەیارە بەژنان لەناو ماشێندا .

١٨) حەج کردن هەندێ لەژنان و سەفەر کردنیان لەگەڵ نامەحرەمان دا.

١٩) تێکەلاً وبونی خزمەت کارانی پیاوژن لەگەڵ ڕێبوارو گەشتیاران لەناو فڕۆکەو کەشتی یەکاندا.

٢٠) تێکەڵ بونی قوتابیانی کچ وکوڕ لەپۆلەکانی خوێندن و لەقوتابخانەکان وپەیمانگاو زانکۆکاندا.

٢١) وانە گوتنەوەی ژنان بەپیاوان لەزانکۆو کۆلێژو قوتابخانەکان وهەروەها وانەپێگوتنی پیاوان بەژنان ڕاستەوخۆ.

٢٢) تێکەلاًو بونی خوێندکارانی کە بۆدەرەوە دەنێردرێن لەگەڵ خاوخێزانی ڕۆژئاوایەکان و نیشتەجێ بونیان لەگەڵیاندا ولەیەك ماڵ و خانودا.

٢٣)بانگ هێشتکردنی ژن بۆ دەرس پێ گوتنی مندالآن لەپۆلەکانی خوێندنی سەرەتایی ، بانگ هێشتنێکی پیس و خراپە ویەکەمین پلەیە لە پرۆسەکردن و ئاسایی بونی تێکەڵی.

٢٤)بانگ هێشتکردنی ژنان بۆ ناردنە دەرەوەیان بەبیانوی بەشارستانی کردنی خوێندنی بالآ، وهەموئەوەی کە دەبێتە هۆی ئاسایی وێنا کردن بە بیروبۆچونە ڕۆژئاواییە ڕوخێنەر هەرەس پێ هێنەرەکان.

٢٥)تێکەلآوبونی خوێندکارانی کوڕو کچ لەپۆلەکانی خوێندنی بالآ بەبیانوی خوێندن ولێکۆڵینەوەی مەیدانی .

٢٦) مانەوەوتێکەلآو بونی پیاوانی چاودێرو سەرپەرشتیار بەسەرنامە زانکۆیەکان لەگەڵ خوێندکارەکانی کچ بەبیانوی سەرپەرشتیاری کردن بەسەر نامەکاندا.

٢٧) مانەوەی تێکەڵ بونی مامۆستایانی تایبەتمەندو پسپۆڕی پیاوان لەگەڵ خوێندکارانی کچ بەبیانوی دەرس پێ گوتن.

٢٨) بانگ هێشت کردن بۆئامادەبون لەئێوارە کۆڕەشیعریەکان ودیدەنیە(اللقاء) زانستی وموحازەرە جۆربەجۆرەکان کە هەندی لەژنان ولەپیاوان دەیخەنە ڕو وپێش کەش دەکەن ژنان وپیاوان تیایدا پاڵ بەپاڵی یەکتریە وەتێ ی دا ئامادە دەبن.

٢٩)تێکەڵ بون ومانەوەی سیستەرو نوژدارەکان بەپیاوانی بێگانە هەتاکوئەگەر پیاوانی برین پێچ ونوژدارانیش بن .

٣٠)مانەوەی نوژداری پیاو لەگەڵ سیستەرو نوژداری ژن(الطبية).

٣١)مانەوەی نوژداری پیاو لەگەڵ نەخۆشی ژندا کەنامەحرەمی بێت .

٣٢)خۆدەرخستنی ژن بۆ نوژداری پیاو بەبێ هۆ یابێ ئەوەی پێویست بکات یالەکاتی بونی دکتۆری ژندا.

٣٣)    تێکەڵ بونی ژنان وپیاوان لەئاهەنگەکانی خواحافیزی وبەڕێکردن و پێشوازی لێکردن و هەندێ لەبۆنەکاندا .

٣٤)تێکەڵ بونی ژنان بەپیاوان لەتاقیگە نوژداریەکان ودەرمان خانەکان بەبیانوی پێداویستیەکانی کارکردن .

٣٥)تێکەلا وبونی ژنان وپیاوان لەیاریەکان و شوێنەکانی کات بەسەربردن وڕابواردن بەبیانوی ڕۆژی خێزانەوە(یوم العائلة).

٣٦)    تێکەڵاو بونی پیاوان وژنان لەچێشتخانەکان وکافتریاکاندا بەبیانوی جێگای تایبەت بۆ خێزان(جناح خاص للعئلات أو قسم العائلات).

٣٧)    تێکەڵاو بونی پیاوان وژنان یامانەوەی ژن لەگەڵ خاوەنی پیشانگاو دوکانەکان.

٣٨)    تێکەڵاو پیاوان وژنان لەمەڵبەندەکانی کڕین وفرۆشتن (سوپەرمارکێت).

٣٩)سەفەر کردنی ژنان بەماشێن یافڕۆکە یاپاسەکانی نەفەر هەڵگر وهەر شتێکی تربەبێ محرەمی خۆی.

٤٠) تێکەڵ بونی ژنان وپیاوان لەیاریگاو نادیەکان شوێنە پلەپلەییەکانی دانیشتن (المدرجات).

٤١) یاری وکارە وەرزشیەکانی ژنان و دامەزراندنی تیمی وەرزشی بۆ ژنان حەتمەن دەبێتە هۆی تێکەڵی و دەرکەوتنی لەش وداوێنی (العورات).

٤٢)تێکەڵاو بونی ژنان وپیاوان لە سەیرانگاکان و باخچە گشتیەکان و کەنارەکانی دەریاکان.

٤٣)تێکەڵ بونی ژنان وپیاوان لەکاتی گەشت و گوزارەکان وهەروەها لە کاتی چونە دەرەوەی ژنان وپیاوان بەیەکەوە بۆ گەشت وگوزار کردن ولەکاتی ئامادە بون وکۆبونەوەی ژنان وپیاوان لەساڵۆنەکانی سینەماکان وسەیرەك وشانۆگەریەکان وگولێ شوێنی تری گشتی وشوێنەکانی تێدا ڕابواردن وکات بەسەر بردن.

٤٤) وێنە گرتنی ژنان لەلایەن وێنە گەرانی پیاوەوە.

٤٥) تێکەڵاو بونی ژنان بەپیاوان لەبۆنەکان و ئاهەنگە داهێنراوەکان(البدعیة)ی وەك:ئاهەنگی یادی لەدایك بونی پێغەمبەرﷺ ونیوەی مانگی شەعبان وشەوی شەورەوی وبەرز بونەوە (الإسراء والمعراج) وگەلێکی تر هەروەکو لەهەندێ لەوڵاتانی موسڵماناندا بەناوی ئاینەوە دەگێردرێن خوا پەنامان بدات.

٤٦) تێکەڵاو بونی ژنانی پێشکەش کەرانی بەرنامەکان لەئاهەنگەکان ولەبۆنەکان ولەسەر ئیستگەو تەلەفزیۆن و کەناڵەکاندا بەپیاوانی بێگانە.

٤٧) تێکەڵاو بونی ئەکتەرانی ژن لەگەڵ ئەکتەرانی پیاو لەفیلمەکان وزنجیرەکاندا وئەنجامدانی گەلێ کارو کردەوەی بێ شەرعی.

٤٨) چونە ریزی سەربازی وبەشداری کردنی ژنان لەسەربازی مەیدانی دا بەتایبەتیش لەگەڵ پیاواندا.

٤٩) کۆرِوکۆبونەوە تێکەڵیەکانی نێوان ژنان وپیاوان لەهەر فەرمانگەو کارێك دا بێت بەبیانوی لێکۆڵینەوەو توێژینەوەی بابەت وئاریشەو تەنگژەکان.

٥٠) داواکردن لەژنان بۆ هاوبەشی وهاریکاری وکارکردن لەو کارانەی کەتایبەتن بەپیاوان وەك شۆفێری ولێخورِینی فرِۆکەو شەمەندەفەرو کەشتیەکان وماشینەکان.

٥١) کارکردن لەوەزیفەی رازگری(السكرتيرة) دا لەبەر بونی ئەو هەمو خۆرِازانەوەو روتی (السفور) وتێکەڵی ومانەوەی حەرام وناشەرعی تێدا هەیە دەبێتە هۆی روداني خراپەو فیتنە.

٥٢) هەرکارێك کەببێتە هۆی تێکەڵ بونی ژنان لەگەڵ پیاوان وەك کارکردن لەکارگەکان ولەشوێنەگشتیەکانی تردا بەیانوی پتر کردنی بەرهەم هێنان وهاریکاری کردنی ژن لەگەشە کردن وبەرەو پێش بردنی کۆمەڵگادا.

٥٣)تێکەڵ بونی پیاوانی موسڵمان بەژنانی ناموسڵمان بەبیانوی ئەوەی کەئەوانە کافرن یا مانەوەلەگەڵیاندا .

ئەمانەو گەلێ وێنەی تری حەرام لەوێنەکانی تێکەڵ بونی ژنان وپیاوان.

* فتوا :

پ: بڕیاری شەرع چیە لەسەر ئاڵوگۆڕکردنی نامە لەنێوان گەنج ولاوانی کوڕوکچ دا، بەمەرجێ کە ئەو نامە گۆڕینەوەیە هیچ خراپەو خراپەکاری ودڵداری و ئەوینی تێدانەبێت ؟

وەلاّم: هیچ مرۆڤێك بۆی نیە نامەو نامە گۆڕینەوە لە گەڵ ژنێك دابکات کەبێگانە بێت بەئەو لەبەرێ کەوتنەوە و ڕودانی فیتنە وئاشوب وخراپەکاری، نامەنێر لەوانەیە وا دابنێ کەنامە ناردن وئاڵوگۆڕ کردنی نامەلەنێوان ژن و پیاودا چی تێدا نەبێت وگوناح نەبێت، بەلاّم نەخێرشەیتان بەردەوام لەنێواندایە تاوایان لێدەکات دڵی هەردولا دەگۆڕێ وتوشی خراپەو خراپەکاریان دەکات.

پێغەمبەر(ﷺ)فەرمانی کردووەکە: هەرکەسێك گوێ ی لەدەججال بو باڵێ ی دوربکەوێتەوە، هەروەها هەواڵی پێداوین کەپیاو بڕوا دارە و دەجال بۆلای دەچێت وبەردەوام لەگەڵی داخەریکە هەتاکو توشی فیتنەو ئاشوب وخراپەکاری دەکات، دەی کەنامەو نامەگۆڕینەوەلە نێوان لاوانی کیژو کوڕدا فیتنە و ئاشوبێکی زۆرگەورە ومەترسیەکی زۆر هەیە کە بە دڵنیاییەوە زۆرپێویستە خۆتانی لێ دوربگرن ونزیکی نەبنەوە، هەرچەندە بابای پرسا بڵێ: ئاخرخۆ ئەو نامەو نامە گۆڕینەوانە هیچ باسی دڵداری و ئەوینی تێدا ناکرێت وتەنیا چاك وچۆنی وهەواڵ پرسینە.

بەلاّم نامە ونامەگۆڕین (المراسلة) لەنیوان پیاوان بۆپیاوان وژنان بۆژنان هیچی تێدانیە مەگەر کارێك یا فەرمانێکی قەدەغەکردن لەنێوانیاندا هەبێت.{ أ.ه. (الشیخ إبن جبرین، فتاوی المرأة ص٤٤)}.

# پرسیارو وەڵام

پ: سیفات وجیاکەرەوەکانی کیژو ژنی شارستانیەت و نمونەیی چیە؟

وەڵام: ژنی سارستانیەتی ونمونەیی گەلێك سیفەت و جیاکەرەوەی هەن کەدەکرێ لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان هەڵێنین:

١_ بیروباوەڕەکەی(عقیدتها): دەبێ لەسەرڕەیڕەو پڕۆگرامی ئەهلی سوننەت وجەماعەت بێت.

٢_ پەیڕەو پڕۆگرامی(منهجیها): ئەوەی خوای باڵادەست وکاربەجێ وپێغەمبەری خواﷺ گوتویانە.

٣_ ئاکارو ڕەوشتی(خلقها): دەبێ ئاکارو ڕەوشتی ژنی بڕوادارئاکارو ڕەوشتی ئیسلامی بەهادار بێت.

٤_ ڕەوشت وسەربەرزێتی(آدبها): دەبێ حەیاوشەرم و داوێن پاکی وپاك وخاوێنی وپۆشاکی ئیسلامی بێت.

٥_ پێشەنگێتی(قدوتها): کیژان وژنانی بڕوادار دەبێ پێشەنگی یان دایکانی بڕواداران وهاوەڵان وژن چاکانی پێشینەبن وشوێنی ئەوان هەڵ بگرێتەوە و بە مو شوێن پێ ی ئەوان بزرنەکات.

٦_ خۆشەویستی بۆکێ بێت(محبتها): کیژان وژنانی موسڵمانی بڕواداردەبێ تەنیا خواوپێغەمبەری خوا و ئەوانەکە پابەندن بەدینی خواوە خۆش بون وجوێ لەوان کەسی تری خۆش نەوێت.

٧_ مانەوەی(خلوتها): مانەوەوتێکەڵی کیژو ژنی موسڵمانی بڕواداردەبێ تەنیا لەگەڵ ئەوکەسانەدا بێت کەمحرەمنی ولەپێناو بیرکردنەوە لەڕۆژی دوایی ومالی دوا قۆناغ وتێدامانەوە هەتا هەتایە بکاتەوە وئەو کردارانەی کەپێش خۆی وەڕێ ی کردون بۆ ڕوناك کردنەوەو ڕۆشن کردنەوەی گۆڕو تەنگەبەری دو دیواری گۆڕ ودەبێ لەدنیادا هەمیشە لەبەر چاوی بن تانەتوانێت کاری خراپ وسەرپێچی خواو پێغەمبەرﷺ بکات.

٨- هاوڕێ ودەستە خوشکانی(صديقتها): دەبێ هاوڕێ ودەستەخوشکانی کیژو ژنی موسڵمان هەمو کیژو ژنێکی موسڵمانی بڕوادار وبن کەپابەند بن بەئایین وپرۆگرام وپەیڕەوی خواوە.

٩- ڕقی لەکێ ببێتەوە(بغضها): دەبێ کیژو ژنی موسڵمان هەمیشە ڕقی لەجولەکەو فەلەکان ودو ڕوان وعەلمانیەکان وبانگەشەکارانی ساختەیی ئازادی ژنان ببێتەوە.

١٠- دوژمنەکەی(عدوها): هەمو گۆرانی ومۆسیقاو گۆرانی بێژێك وڕابواردن وهەواو ئارەزو هەمو هۆکارێکی ڕابواردن و لە هەمو ڕۆژنامەو گۆڤارێکی کەوێنەی ڕوت وبێ ئابڕۆیی بڵاو دەکاتەوە بەدوژمن وناحەزی خۆی بزانێت، هەروەها ڕقی لە هەمو بیرو بۆچونێکی نەخۆش وگەندەڵ وپیس وبێ ناوەڕۆك وخراپ ببێتەوە.هەوروەها ڕقی لە هەمو زنجیرەو فیلمێك ببێتەوە کە دڵداری وعیشق وئەوین وسەر لێشێواوی وخۆڵێ ون بون پەخش دەکەن وڕقی لەهەمو ئافرەتێکی ڕوت وسفور و خۆڕازێنەرەوە ولەهەمو ئەوانەی کەخوای پەروەردگار لەخۆ توڕە دەکەن ببێتەوە هەمویان بەدوژمنی خۆی دابنێ.

١١- سور بون وپێدا گرتنی(حرصها): دەبێ کیژو ژنی موسڵمانی بڕوادار هەمیشە سور بێت لەسەر تۆبە کردنێکی ڕاستگۆیانە بەهەمو مەرجەکانیەوە خوای گەورەش لێ بوردەیەو بەبەزەییە.

١٢- هۆنراوە وئەدەبیاتی(شعرها):دەبێ هۆنراوەو ئەدەبیاتی کیژو ژنی موسڵمان لەکانی وسەرچاوەی شیعرو ئەدەبیاتی پاکی ئیسلامیەوە سەرچاوە بگرێت نەك شیعرو ئەدەبیاتی دەبەنگ وسوکەڵە.

١٣- هاوسەر گیریتی(زواجها): دەبێ خوشکانی موسڵمان هاوسەرگیریتی موسڵمانانە بێت ولەگەڵ موسڵمانانی بڕواداری پابەند بێت ومارە بڕین وگواستنەوەشی هەر موسڵمانانەو بەپێ ی بەرنامەی خوا بێت و دور بێت لەبەزم وڕەزم و ئاهەنگی گێڕان وگۆرانی ومۆسیقاو کەیف وسەیف وسەماو سوڕدان وسەرکەوتن بۆ سەر دوانگەو شوێنی گشتی دیاری کراو

ئەو شوێنانەی کەبۆ ئەم مەبەستە ئامادە کراون واتە بۆ ئاهەنگ گێڕانی ڕۆژوشەوانی بوك و زاوایێتی (الكوافير) (١).

١٤- ماوەی پشودان وبوارەکانی(إجازتها): پێویستە خوشکانی موسڵمان ماوەی مۆڵەتیان یاخود کاتی دەست بەتاڵی وبێ ئیشیان لەخوێندنەوە و فێر بون وزانست وزانیاری دا بەسەر بەرن وبۆ لەبەرکردنی قورئان وسونەت بەکاری بهێننن، هەروەها بۆ گیان ئاسودە کردن وبەسەر بردنی کاتەکەیان بەهۆکارە ڕێگە پێدراوەکان(المباحة) ئەنجام بدەن. باماوەی پشودان ومۆڵەتەکانیان بەچونە دەرەوەی وڵات بەتایبەتی بۆ وڵاتە بیانیە ناموسڵمانەکان چونکە حەتمەن لەو سەردانانەدا توشی گوناح وگوناحکاری دەبن.

١٥- کات بەسەر بردن وڕابواردنەکانی(لهوها): دەبێ خوشکی موسڵمان کات بەسەربردن وڕابواردنەکانی بەشتی پڕوپوچ وبێ شەرعی بەسەر نەبات، بەڵکو دەبێ بەشتە شەرعی وڕێگە پێدراوەکانی بەسەر بەرێت.چونکە نەفسی مرۆڤـ هەمیشە خوازیاری خۆشیەکانەو

---

(١) لەوڵاتی خۆشماندا ئێستا فێر بون وکردویانە بەعادەت ونەریت یان هۆڵی شایی و ئوتێلی تایبەتیان بۆ ئاهەنگ گێڕانی گواستنەوەی بوك گوستنەوە دروست کردون ،یاخود لەدەشت ودەرەکان و ناو دارستانەکان و لە دەم جادە و ڕێگا گشتیەکاندا شوێنێك تەرخان دەکەن بۆ لێ گێڕانی ئاهەنگ و زەماوەندی بوك وزاواو خەڵکێکی زۆری بۆ داوەت دەکەن وکارتیان بۆ دەنێرین کەلە فلان شوێنە فلان ڕۆژەو فلان دەم ژمێرە ئامادە بن و ئەو هەمو خەڵکە بەسەر خۆیان دەگێڕن وتیپی مۆسیقاو گۆرانی بێژەکان بانگ دەکەن و ژن وپیاو تێکەڵ دەبن وژنان بەجۆرێك خۆ بۆن خۆش وخۆ دەڕازێننەوە هەر مەپرسە .بەزم وڕەزمێکی ئەوتۆ ئەو ڕۆژە دەسازێ هەر خوا دەزانێ چەندە گوناح وبێ شەرعی وبێ فرمانی خوای تێدا دەکرێت وخوای گەورە لەخۆیان تورە دەکەن ودەرەنجێنن. دیارە ئەمە سیفەتی بابای موسڵمانی بڕوادارو پابەند نین بەدینی خواوە. وێڕای ئەوەی کەبەرەکەت وخێر لەو هاوسەرگیرێتیەو نە لەماڵ ونەلە وەچەکانیاندا چاوەڕوان دەکرێت وهەریەکەش لەو خەڵکانەی کەلەو جۆرە ئاهەنگانەدا بەشداری دەکەن وهەروەها بوك وزاوا و هەردو کەس وکاری بوك وزاواش بەکۆڵێك گوناحەوە دەگەڕێنەوە بۆ لا ی خوا ئەگەر تۆبەی ڕاستەقینەی لەسەر نەکەن.خوا ی باڵا دەست وکاربەجێ پەنامان بدات(وەرگێڕ).

ئارەزو دەکات(تمل) بۆیە دەبێ مرۆڤ هەمیشە جڵەوی نەفسی خۆی بگرێت وبۆی شل نەکات وبەسەر نەفسی خۆیدا زاڵ بێت.

١٦- گەشت وگوزارەکانی(نزهتها): خوشکی موسڵمان دەبێ هەمیشە ولەکاتی گەشت وگوزارەکانی داتێڕامان ولێ ورد بونەوەو بیر کردنەوەی لەدروست کراوەکانی خواو تواناو دەسەلات وزانست وبەزەیی وبەخشندەکانی خواو گیان ئاسودە کردنی خۆی بێت.

## چرپاندنێك بەگوێ ی بوك وزاوادا:

### خوشکی موسڵمانم – ئەی کیژانی ئیسلام:

- بزانە کەهاوسەرگیرێتی سوننەتی پێغەمبەرەﷺ بۆیە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{فمن رغب عن سنَّتي فليس مني}[1].
- بۆیە زۆر وریابە وهەرگیز خۆت لەشو کردن وهاوسەرگیرێتی مەگرەوە بەبیانوی خوێندن وبڕوانامە بەدەست هێنان، یابەبیانوی کار کردنەوە.
- هەر کەسێك لەئەهلی دین وئاکارو ڕەوشتی جوان هاتە داخوازیت شوی پێ بکەو نارازی مەبە هەروەکو گوتراوە:(فإنه إن أحبها أكرمها، وإن أبغضها لم يهنها)(٢)
- مارە بڕین واتە بڕی مارەیی باش و بەرەکەتدار ئەوەیە کەتاکەم بێت باشترەو خەرجی وتێ چونی کەم بێت ودەبێ تا بۆی دەکرێت داواکاری کەمتر بێت وزۆر قورسایی نەخاتە سەر هاوسەرەکەی. (اكثر النساء بركة أقلهن مؤنة)[3].
- ئەی گەوهەری داپۆشراوی چاکە کار : پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی:{تنكح المرأة لأربع،لجمالها ولحسبها ولمالها ولدينها..فاظفر بذات الدين تربت يداك}(١).ئایا تۆ پابەندیت بەدینەکەتەوە؟!

---

( ١) واتە: هەر کەسێك پشت لەسوننەتی من بکات ئەوە لەمن نیە.واتە موسڵمان نیە.(وەرگێڕ).

( ٢) ئەگەر خۆشەویستی لەنێواندا ڕسکا بەڕاستی ئەوە ڕێزی لێ دەگرێت، وەبەپێچەوانەوەش هەرگیز ڕێز لەنێوانیاندا نابێت. چونکە ئەوەی لەئەهلی دینو خوا پەرستی بێت هەمیشە لەسەر بنەمای خۆشەویستی خواو دین مامەڵە دەکاتو ڕێزو خۆشەویستیەکەیان لەسەر بنەمای ئیمانەوە دەبێت کەهەرگیز بناغەی ناڵەقێتو هەمیشە پتەوو ساخلەمە. وەرگێڕ.

( ٣) باشترین وبەبەرەکەت ترینی ژنان ئەوانەن کەکەمترین داواکاری وخەرجی ومەسرەف لەهاوسەرەکەیان دەکەن وبەقەناعەتن.(وەرگێڕ).

- ئەی کیژی چاك ورەوشت بەرز: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی (الدنیامتاعُ وخیرُ متاعها المرأة الصالحة).(٢)
- دوربکەوە لەئەلقەی (الدبلة)دەزگیرانیەتی (الخطوبة) چونکەئەمە لە رەوشت وعادەتی نەسرانیەکانە.
- سوربە لەسەرئاهەنگی گواستنەوەی ئیسلامی وبەپێ ی شەریعەتی خواوخالّی لەهەمو شتێکی بێ شەرعی وخراپ وناپەسەند وەك .

- دیاری کردنی شوێنك بۆئاهەنگ گێران لەدەشت ودەر یاخود لەشوێنە تایبەتیەکانی ئاهەنگ گێران کەشوێنێکی بەرز هەیە وەك سەکۆیەك وبوك وزاوابەیەکەوە سەردەکەون وبەجل وبەرگی ناشەرعیەوەلەپێش چاوی ئەو هەمو خەڵکە بانگ کراوەو کۆبوەوە تێکەلأوی ژن وپیاو. یالەدەشتو دەرو مێرگو مێرغوزارەکانی بەهار لەدەشتو چۆلەکان.
- هێنانی تیمی گۆرانی و مۆسیقا وبانگ کردنی گۆرانی بێژانی ژن وپیاو . چونکە ئەمە حەرامە و هەروەها دەبێتە هۆی بە فیڕۆدانی ماڵ وسامان.
- لێدانی شریتی گۆرانی و مۆسیقا لە بڵند کۆکانەوە. وهەروەها سەما و سوڕدان و گۆرانی گوتن لەلایەن کچانەوە.
- وێنەگرتنی فۆتۆگرافی یا بەڤیدیۆیی .لەبەرچەند هۆیەکی شەرعی قەدەغەکراوەکانی .واتە: شتی بێ شەرعی تێدەکەوێت .

---

( ١) واتە: ئافرەت لەبەر چوار شتان مارە دەکرێن یادەخوازرێن: لەبەر جوانیەکەی،و لەبەر بنەماڵەو حەسەبو نەسەبی، ولەبەر ماڵەکەی، کەماڵی هەبو یالەبەر دینەکەی، تۆ لەبەر دینو ئەخلاقەکەی ئەو کچە یانەو پیاوە هەل ببژێرە ئەوا دەستت بەخۆڵ دەبێت، دیارە کەلەناو عەرەبدا دەست بەخۆڵ بون واتای بەپیتو بەرەکەتی و سەرکەوتنو سەرفرازیە. وەرگێڕ.

( ٢) واتە: دنیا خۆ شی وچێژو پێداویستیە ،باشترین پێداویستی وخۆشترین وبەلەزەت ترین شتی دنیاش ئافرەتێکی چاك وموسڵمانی بڕواداری پابەند ە بەدینی خواوە.(وەرگێڕ).

- ڕۆیشتن بۆوتێل وهۆڵە شایی یەکان (الكوا فیرات) چونکەکاری بێ شەرعی وحەرامی تێ دەکەوێت .
- زیادەڕەوی کردن لەجل وبەرگ و پۆشاکی شەوی زاواو بوکێنی و زیاد خەرج کردن.
- شەونخونی و ئاهەنگ گێڕان لە شەوی بوك وزاوایەتی دا هەتا بەری بەیانی.

**دە گوێ بگرەبۆ ئەم ئامۆژگاریە بەسودە:**

ئومامەی کچی حارپ لەشەوی بوکێنی دا بە کچەکەی کەدایکی ئیاس کچی عەوف بو گوت :(ئەی کچی خۆم : تۆ لە کەش وهەوایەك دەرچوی کەتاکوئێستا تێیدا بوی ئەو هێلانەت بەجێ هێشت کەتێیدا گەورەبوی. ئەگەر هەرژنێك وازی لەمێرد هێنابا لەبەر ئەوەی دایك وباوکی و زۆرپێویستیان پێ ی هەیە ئەوە من یەکەم کەسێك دەبوم کەئەوەم دەکرد. بەلاّم ژنان بۆ پیاوان دروست کراون و پیاوانیش بۆ ژنان !

ئەی کچی خۆم !تۆ لەوکەش وهەوایەت جودا بویەوە کەتێیدابوی وەلەو هێلانەت بەجێ هێشت کەتێیدا گەورەبوی. دەچیت بۆ لانەیەکی تر کەپێ ی ئاشنا نیت، بۆلای هاوسەرو هاوەڵێك کەهۆگری نەبویت، هەرکەبو بەخاوەنت دەبێتە چاودێرو شا بە سەرتەوە، ببە بەکەنیزەی هەرزو دەبێتە کۆیلەت ، کچی خۆم دەسیفەت، دەئاکارو ڕەوشتی بۆبپارێزە بۆت دەبێتە گەنجینە:

**یەکەم ودوەم:** بەقەناعەتەوە مل کەچ بە بۆی، باش گوێ ی بۆ بگرەو گوێ ڕایەڵ و فەرمان بەرداری بکە.

**سێ یەم وچوارەم:** زۆر ئاگات لەشوێنی چاو ولوتی بێت، مەهێڵە باهەرگیز کاری خراپ وناشیرینت تێدا نەبینێت، لەبۆنی خۆش بەولاوە باهیچی ترت لێ بۆن نەکات!

**پێنجەم وشەشەم:** هەمیشە ورياو ئاگاداری کات و شوێنی نوستن وخواردنی بە، مەهێڵە هەرگیز هەست بەبرسێتی نەکات وخواردنی باش وخۆشی بۆ ئامادە بکە،چونکە

برسێتی گڕ تێ بەردەرە (ملتهبة) [1]. گرنگی نەدات بەخەو وجێگاو شوێنی خەوتن وگوێ نەدان بەنوێن وپێخەف وجێگای پاك وخاوێن ونامادە نەكراو دەبێتە هۆی تورە بون وئالۆز بونی دەرونی پیاو بۆیە دەبێ زۆرت ئاگا لێ بێت.

**حەوتەم وهەشتەم:** زۆر ئاگات لەماڵەكەی بێت، چاودێری ماڵ ومنداڵەكانی بكەو شكۆمەندی بپارێزە، لەدەست دابونی جڵەوی كاروسەروەری باشی خەملاندن وزۆر وردی و وریای یە لەناو ماڵ وكاروباری ماڵدا، وەلەناو ماڵ ومنداڵ و بەخێوكردنی منداڵەكانیدا زیرەك وچالاك بە، چونكە كەسێتی تۆ لەو ماڵەدا چاك هەڵسوڕاندن وباش بەڕێوەبردن ووریایی وزرنگیە.

**بەلام نۆیەم ودەیەم:** نەكەی هەرگیز نەكەی سەرپێچی فرمانەكانی بكەی، ەكەی نهێنیەكانی ببەیتە دەرو ئاشكرایان بكەیت ، عەیب وخەوشەكانی هەمیشە بپۆشە، تۆ كەسەرپێچی فرمانە كانیت كرد ئەوە دڵیت ڕەنجاند،هەر كە نهێنیەكانت نەپاراست و نەت پۆشین ئەمین مەبە لەغەدرو ستەمی (لەتۆڵە سەندنی)، هەرگیز لەبەردەمی دا دڵخۆش وكەیف خۆش مەبە كاتێك كەئەو دڵ تەنگەخەمبار بە كاتێك كەئەو دڵخۆشەا.. أ.ه.(تحفة العروس:٩١).

لەكۆتایی دا: خوای گەورە بەرەكەت وپیرۆزی بخاتە تەمەنتەوە ولەسەر خێر كۆتان بكاتەوەو سەلامی خوات لەسەر بێت.

فتوای ژمارە١٩٣٨ لە١٤/٥/١٣٩٨ ك لەگۆڤاری توێژینەوە(البحوث) ژمارە ١٩:

پ: حوكمی ئامادە بونی ژنان چی یەلەئاهەنگی جەژنەكانی لەدایك بون لەگەڵ ئەوەشدا كەبیدعەیەو هەمو بیدعەیەكیش سەرلێشێواویە، هەروەها لەو ئاهەنگە ناوبراوانەدا هەندێ لەگۆرانی بێژان ئامادە دەبن بۆ بەسەر بردنی شەوگار، وەئایا ئامادە

---

( ١) كورد گۆتەنی برسێتی ڕەگی هاری پێوەیە .(وەرگێڕ).

بونی ژنان تیایدا بۆ بینینی زاوا(العروس)و وەك ڕێز لێنانێك بۆ کەس وکاری بوك نەك بۆ گوێ گرتن لەگۆرانی بێژەکان حەرامە؟

وەڵام: ئەگەر ئاهەنگەکانی بوك گواستنەوە هیچ خراپەکاری وگوناحی تێدا نەبێت، وەك تێکەڵ بونی ژنان وپیاوان وگۆرانی بێژانی بێ ئابڕو(الماجن)، یاخود ئەگەر لەو ئاهەنگەدا ئامادە بێت وبتوانێت هەرچی خراپەو خراپەکاری و حەرام هەیە بیگۆڕێت ولای بەرێت ئەوە دەتوانێت تیایدا ئامادەبێت وهاوبەشی ئەو دڵخۆشی وکەیف خۆشیە بکات ، ئەگەر بتوانێت نەهێڵێت و ئەم کارە خراپ وبێ شەرعیانە لابەرێت ئەوە نەك هەردروستە،بەڵکو لەسەری پێویستە (الواجب) کەئامادە بێت.بەڵام خۆ ئەگەر ئەمەی لەتوانادا نەبو واتە کاریگەری نەبو بۆ لابردنی ئەو گوناح وخراپەکاری وبێ شەرعیانە ئەوە بەهیچ شێوەیەك نابێ تیایدا ئامادە بن وحەرامە بەپێ ی ئەم ئایەتە پیرۆزەی خوای باڵا دەست وکاربەجێ کەدەفەرموێ:﴿ وَذَرِ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَعِبًا وَلَهْوًا وَغَرَّتْهُمُ ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا ۚ وَذَكِّرْ بِهِۦٓ أَن تُبْسَلَ نَفْسٌۢ بِمَا كَسَبَتْ لَيْسَ لَهَا مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِىٌّ وَلَا شَفِيعٌ﴾ (٧٠) سورة الأنعام[١].

---

( ١) واتە: ئەی محمد لەو کەسانە گەڕێ و گوێ یان پێ مەدە کە د ینەکەی خۆیان هەروا بەفشە وگاڵتەو بەهەواو ئارەزوی خۆیان وەرگرتوە ماڵی دنیاو زاق وبریقی وخۆشگوزەرانی ئەم دنیایە کاتیە فریوی داون ،تۆ تەنیا لەڕۆژی دوایی وئازارو ئەشکەنجەی بەسفت وسوێ ی دۆزەخیان بۆ باس بکەو پێ یان بڵێ کەهەرکەسە لەڕۆژی قیامەتدا بەندە بەکارو کردە وە کانی خۆیانەوە کەلە ئەم دنیایەدا ئەنجامیان داوە .هەرکەس لە ڕۆژی دوایی دا بامتەی کارو ئەو بیرو باوەڕەیە کەلەدنیادا خولیاو سەودا سەری بوە لەدنیادا ، کورد گوتەنی :( چی بچێنی ئەوە دەدرویەوە ) ئەوانە لەڕۆژی قیامەتدا بێجگە لەخوا هیچ پاڵ پشت و هیچ تکاکارێکیان نیە وکەس بەرگری و بەرەڤانیان لێ ناکات وتەنیا ڕەحم وبەزەیی خوای گەورە نەبێت. وەرگێڕ).

هەروەها لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَشْتَرِى لَهْوَ ٱلْحَدِيثِ لِيُضِلَّ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَيَتَّخِذَهَا هُزُوًا ۚ أُو۟لَـٰٓئِكَ لَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ۝٦﴾. لقمان:٦[1].

وە ئەو فەرمودانەی کەلەزەم کردنی گۆرانی وئاوازەکاندا هاتون گەلێك زۆرن.وەسەبارەت ئاهەنگەکانی لەدایك بون بەهیچ شێوەیەك نابێ براو خوشکی موسڵمان تیایاندا ئامادە ببێت، چونکە بیدعەیە ودروست نیە، مەگەر بۆ ئەوە ئامادە ببێت کەبەرپێچی ئەو ئاهەنگانە بداتەوەو بۆ مەبەستی ڕون کردنەوەی حوکم وبڕیاری خوا لەم بارەیەوە بۆ موسڵمانان وبەرچاو ڕۆشنی خەڵکی ودور کەوتنەوەیان لەو کارە خراپ وبیدعانە.

وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصبه وسلم

---

( ١) واتە:خەڵکانێك هەن کەپارەوپول لەشتی بێ واتاوحەرامدا خەرج دەکەن وەك ئەوەی کەپارەبەگۆرانی بێژوتەپڵ و دەهۆڵ کوت وزوڕناژەن دەدات وبەکرێیان دەگرێت یان پارەیەکی زۆر لەئاهەنگی بێ بایەخ وهیچ و پوچداخەرج دەکات یاخود پارەبە کڕینی شریت وڕادیۆ و ڕیکۆردەرو (المسجل) شتی حەرامیان پێ لێدەدات وکات خەرج دەکات بۆگوێ گرتن لەگۆرانی و مۆسیقا وهەڵپەڕکێ و قسەی حەلەق وەلەق وبێ واتا ڤیدیۆ سیدی وشریتەحەرام وپڕوپوچەکان دەکرێ ودەیان هێنێتەماڵ وخاوخێزانەکەی پێ فاسیددەکات .بەڤشەو گاڵتە بەسەری دەبات ،ئەوانە سزاو ئازارێکی زۆر بەسفت وسویان هەیە لەڕۆژی دوایی دا .(وەرگێر).

# کۆتا وشە

**خوشکی موسڵمان :-**

دوای ئەم هەمو وشە وسەرنجانە.. داوا لەخوای باڵا دەست وکاربەجێ دەکەم کەهەمو لایەك سەرکەوتو بکات بۆ ئەوەی کەخۆی پێ ی خۆشەو پێ ی ڕازیە وامان لێ نەکات کەپێت بڵێین:

ئاگادار بە لەك

- گاڵتە کردن بەکارو بارو حوکمەکانی ئایین یاشتی تازەو حوکمی تازە لەدین دا دابهێنی.
- واز لەنوێژکردن بهێنی ..وکەمتەر خەمی تێدا بکەیت و دوای بخەی.
- خۆڕازاندنەوەو سفوری وماکیاج کردن .
- لاسایی کردنەوەی کافرەکان یارۆ ژاوابیەکان یا خۆشت بون، یا پێ یان سەرسام بیت(الإعجاب بهم).
- غەیبەت کردن ودوزمانی وقسە هێنان وبردن وفیتنە گێڕی.
- گەشت وسەفەر کردن بۆ دەرەوەی وڵات بۆ مەبەستی گەشت وگوزارو ڕابواردن.
- زۆر چونە دەرەوە لەماڵ بەبێ هۆ وبێ پێویستی.
- بێ ئاگایی لەڕۆژی دوایی .
- سەرپێچی کردنی مێرد...یاتوڕە کردنی دایك وباوك.
- گۆڤارە چەقاوەسرۆو بێ ئابڕۆ تکێنەرەکان وگۆرانیە بێ ئابڕۆییەکان.

ئەمەو گەلێکی تر لە جۆرەکانی خراپەو خراپەکاری وگوناحکاریەکان.

خوشکی موسڵمان ... ئامۆژگاریت دەکەم کەزۆر سور بیت لەسەر:

- هێنانە دی وبەرپا کردنی یەکتاپەرستی خوای گەورەو تاك وتەنیاو شوێن کەوتنی سوننەتی پێغەمبەرﷺ.

- نوێژ كردن..،زەكات دەركردن لەماڵ وخشڵ وزێرِوشتەكانى ترت، هەروەها رِۆژو گرتن وحەج كردن.
- هاورِێ یەتى ئەو خوشكانەبكە كەپابەندن بەئايينى خواى باڵا دەست وكاربەجێ.
- نزاو پارِانەوەو رِوكردنە خواو تۆبەكردن وگەرِانەوە هەر بۆلاى خوا.
- خۆئامادە كردن بۆ رِۆژى گەرِانەوە (هەستانەوە– المعاد).

دەى خوا پاداشتى بەخێرت بداتەوە.

# پەنجا گوڵ[٧]

## لە باخچەی ئامۆژگاریەکاندا

ئامادەکردنی

عبدالعزیز المقبل

وەرگێڕانی

ئەحمەد میرزا ڕۆستەمی ژێرو

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدالله والصلاة والسلام على رسول الله.

**خوشکی موسڵمانم:**

ئافرەتێکی چاکی خۆ لەخوا پارێز هەمیشە حەزی لەخێرو چاکەیەو هەرگیز لە زیکرو یادی خوا ناکەوێت‌وهەرگیزاو هەرگیز ڕێگە بەوشەی تیژو کەڵبەدار نادات لەدەمی بێتەدەر . هەر کاتێك باسی ئاگرو سزای دۆزەخ دەبیستێ دەترسێ و ڕادەچڵەکێ و دڵی دەکەوێتە خورپە، دەستەکانی بەرز دەکاتەوە بۆلای خوای گەورەو لەبەری دەپاڕێتەوەو پەنای پێ دەگرێ کە لەسزای ئاگری دۆزەخ بیپارێزێت، وهەر کاتێکیش گوێ بیستی بەهەشت بوو حەزو ئارەزوەکانی بۆ دەبزوێ‌و لەدڵی خۆیدا هەڵ دەچێت‌و تامەزرۆکانی سەرەسوێ دەبن و هەردو دەستی لەبەر خوا پان دەکاتەوەو لەبەری دەپاڕێتەوە کە بەنازو نیعمەتەکانی ئەو بەهەشتەی شاد بکات یەکێك بێت لەئەهلی بەهەشت. خەڵکی خۆش دەویست‌وخەڵکیش ئەویان خۆش دەویست، هۆگری بون‌و ئەویش هۆگری خوشکانی برواداری بو. ئەو ئافرەتە چاکە لەپڕ هەستی بەئازارێکی توند کرد لەڕانیدا . بەپەلەو خێرا گەلێك مەڵحەم‌و دەرمانی ژان بڕی بەکارهێنا بەڵام بێ سود بوو کەڵکی نەبوو ئازارەکەی هەر لەپتربون دابو.

دوای هات‌و چۆیەکی زۆر لەنەخۆشخانەکان‌و سەردانی گەلێ لە نوژدارانی کرد،بەڵام هەربێ سود بو . ناچار مێردەکەی بردی بۆ لەندەن، لەوێ لەنەخۆشخانەیەکی گەورە دوای پشکنین‌و بەدوادا چون‌و گەڕانێکی زۆرلەلایەن نوژدارەکانەوە ئەنجام بۆیان دەرکەوت،کەپیسی و گەنینێك لەخوێنی دا پەیدا بوە، دەگەڕان بە دوای شوێن‌وسەرچاوەکە یدا، دیتیانەوە کە شوێنی ئازارەکەی وا لەڕانی دایە .نوژدارەکان

بۆیان دەرکەوت کەئەو ژنە لەڕانیدا توشی شێرپەنجە )السرطان(بوە، ئازارەکانی لەوێوەدەردەچێتو سەرچاوەی گەنینەکەیە . ئەنجامی ڕاپۆرتی نوژدارەکان بەوە کۆتایی هات کەپێویستە لە سەروی ڕانیەوە ببڕدرێتەوە بۆئەوەی ئەو نەخۆشیە تەشەنە نەکات و چیدی فراوان نەبێت و هەمولەشی دانەگرێت.

ئەو ژنە دڵ پڕ لە ئیمانە لەژوری نەشتەرگەریەکە داو لەسەر تەختەکە درێژ بوە بەتەواوی بەئیمانێکی پتەوەوە خۆی داوەتە دەست قەزاو قەدەری خوای باڵادەست وکاربەجێ و زمانیشی بۆچرکەیەك چیە ل زیکرو یادی خوا ناپچڕێت، پەنا بۆخوا دەبات و لەبەری دەپارێتەوە، چونکە تەنیا هەرخوا دەپەرستێتو هیچ بەرنامەیەکـی تر ناگرێتو لە بەر کەسی ترناپارێتەوە.

کۆمەڵێك لە نوژداران لەسەری کۆبونەوە، چونکە کرداری بڕینەوە کارێکی گەورەو قورسو ناخۆشە . تیغەکەیان نایە ناو مقەستەکەو، لەژنەکە نزیك بونەوەو زۆر بەوردی شوێنی بڕینەکەیان دەست نیشان کرد . بەو پەڕی وردیو ڕونیو بەبیمو ترسێکی قوڵەوە تەزوی کارەبایان لێدا، هێشتا مقەستەکە نەجوڵابو، لەناوگێژاوی سەرسوڕمانی هەموانداتیغەکە شکا، دیسان جارێکی تر تیغیان تێ خستەوە بەهەمان شێوە تاسێ جارئەم کردارەیان دوبارە کردەوە . ئەوە یەکەم جاربو لەمێژوی نەشتەر گەری بڕینەوەدا العملیات البتر (کە ئەنجام دراوە ڕوبدات . بەجۆرێکی وا نیشانەی سەر سوڕمان . ڕامانو دۆش دامانێکی زۆر کە لەسەر ڕوی نوژدارەکانەوە بەڕونی دەبینرا، کەسەیری یەکتریان دەکردو سەریان سوڕ مابو . گەورە نوژدارەکانیان چونە ئەولاوە، دوای مشتومڕو وتو وێژێکی بەپەلەو خێرا نوژدارەکان بڕیاریاندا کەعەمەلیاتێك بۆڕانی ئەوژنە بکەنو نیەتیان وا بو بی بڕنەوە . لەگەڵ سەرسوڕمانو دۆش دامانێکی زۆرەوە . هێشتا نەشتەرگەریەکەیان نەگەیشتبوە ناوڕانی ژنەکە . بەچاوی خۆیان پارچە لۆکەیەکی ڕزیوو بۆگەنیان لەناوڕانی دابینیەوە . دوای عەمەلیاتێکی بچوك پارچەلۆکەکەیان دەرهێناو جوان جوان شوێنەکەیان پاکژ کردەوەو بۆیان تیمار کردو ژنەکە چاك بوەوەو بەیەکجاری ئازاری نەماو ئافرەتەکە

سەیری کرد قاچی چاك بۆتەوەو یەك تۆز ئازاری نەماوەو دەبینێ مێردەکەی هەروا قسە لەگەڵ نوژدارەکان دەکات، کەهێشتا شوێنەواری سەر سوڕمان و دۆش دامانەکەیان بەسەرو چاویانەوە نەڕەویوەتەوەو نوژدارەکان پرسیاریان لەمێردەکەی دەکرد . ئایا ئەو ژنە هیچ جاری تر نەشتەرگەری لەڕانی دا بۆکراوە؟ نوژدارەکان لەژنەکەوە ئەوەیان بیست کە جارێکیان و دەمێکە توشی کارەساتێکی ئۆتۆمبیل )مروری(بوە . لەو شوێنەدا توشی برینێکی قوڵ ببو واتە لەو شوێنەی کەئێستا بەدەستیەوە دەناڵێنێ، بۆیە نوژدارەکان بەیەك زمان گوتیان : ئەمە تەنیا ئاگاداریو چاوەدێریو کاری خواوەندەو بەس.

دەزانی ئەو ژنە چەندە دڵخۆشوکەیف خۆش بو، کاتێ کە بینی کابوسی ئەم مەترسیەی لەسەر ڕەویەوەو خوای گەورە ڕزگاری کرد، بیری لەوە دەکردەوە کە هەرگیز نەیدەتوانی بەتاکە قاچێك بڕوات بەڕێوە، بۆیە هەروەك پیشەی خۆی کەوتەوە سوپاسو ستایشی خوای باڵادەستو کاربەجێ، کەهەست دەکات هەمیشە لێیەوە نزیکەو سۆزو بەزەیی پێدا دێتەوە ڕەحمی پێدەکات.

**خوشکی موسڵمانم:**

ێزوپتەوە یەکێکە لەهەزاران نمونە کەناتوانرێت بژمێردرێن لە خۆشەویستانی خوا، کە هەمیشەپابەندو گیرۆدەن بە بەرنامەو فرمانەکانی خواوهەمیشەگوێ ڕایەڵن بۆی . وهەمیشە ڕەزامەندی خوا هەڵ دەبژێرن بەسەر ڕەزامەندی کەسانی ترو دڵی پڕکردون لە خۆشەویستی خۆی، هەمیشەزمانی بەیادو زیکری خواوە تەڕو پاراوەو بۆچرکەیەکیش بیرو فکرو دڵو زمانیان لای خوا ناپچڕێتو بیرو هۆشیان هەمو کاتوساتێك بەناوی خواوە بەندە بەجۆرێك وای لێ هاتوە زیکرو یادی خوا لایان بۆتە سرودێكو وا بەسەر زمانیانە وەیەو هەرگیزاو هەرگیز لەگوێ ڕایەڵیو زیکرو یادی خوا وەرس نابن، چونکە ئەم زیکرو یادی خوایە شیرینیو چێژو تامێکی زۆر بەلەزەت بەدڵو دەرونیان دەبەخشێت، ئەو ئافرەتوپیاو چاکانە هەمیشە بەشەوقوزەوقوتامەزرۆییەوە بەرەوڕوی جێ بەجێ کردن

فرمانەکانی خواوە دەچن، تەنیا بەرنامەکەی ئەو دەگرن‌وحوکم‌و بڕیارەکانی خواو داواکاریەکانی خوابەخۆشەویستی‌و بەحەزی دڵی خۆیانەوە جێ بەجێ دەکەن‌و دوای هیچ ڕێچکەیەکی تری دەست کردناکەون .ڕوو داواو پشت بەستن(التوکل)یان تەنیا بەخوایەو بەس .دەی کەواتە بۆیەخوای گەورەش هەرگیزاو هەرگیز دەست لەوانەبەرنادات‌و لەهەمو کات‌و سات‌وتەنگ‌و چەڵەمەو تەنگژەیەك دابە هانایانەوە دێت، بەهێزو توانای لەبن نەهاتوی خۆی دەستی یارمەتیان بۆ درێژ دەکات، بەعیزەت‌و کەرەمەتی خۆی ڕزگاریان دەکات‌و لەهەمو ناخۆشی‌و کێشەیەك دافریایان دەکەوێت ڕزگاریان دەکات .سەرباری ئەم هەموچاکەیەش، ئەمجار ڕەزامەندی خۆشیان پێ دەبەخشێت‌ودەیان باتەبەهەشتی بەرینی پڕ لەنازو نیعمەتی خۆیەوە .خوایە گیان، ئەی پەروەردگارا بمان کەیت بە یەکێك لەوانە کەڕەزامەندی خۆتیان پێ دەبەخشیت‌و دەیان خەیتە ناو بەهەشتەوە .ئامین .

**خوشکی موسلمانم :**

مرۆڤ لەم ژیانی دنیایەدا هەمیشە بەهێزو قوەت‌وماڵ‌وسامان فریو دەخوات‌وهەڵ دەخەڵەتێ . فش دەبێتەوەو وا هەست دەکات کەبەهێز تر و بەتوانا ترین کەسەو هیچ کەسێك ناتوانێت نەبەدەسەڵات‌ونەبەقسەو زمان بیبەستێتەوە .ئەو لەهەمو کەس پتربەڵگەی ڕون‌وبەهێزی پێ یە، لەهەمو کەسێك سەرکەوتو ترو باڵا دەست ترە، لەهەمو کەس بێ نیازترو بێ حەوجەترە .بەڵام ئاگای لەوە نیە کەخوای گەورە لەنکاو بای زەمانەی بەسەردا هەڵ دەکات توشی بەڵاو گێرو گرفتی دەکات بە شێوەیەك ناتوانێت تۆزقاڵێك سەری خۆی لێ دەربکات. دەبینێ لەپڕ نەهێزو نەدەسەڵات‌ونەتواناو نەماڵ نەسامانی بەدەست ناهێڵت‌و نەپلەو پایەی دەهێڵێت لەناوخەڵکی داوبەڵکو لەجیهاندا سوك‌و ڕیسوای دەکات . وای لێ دەکات وەك منداڵێکی بێ دەسەڵات بەدوای دایك‌و باوکی دا بگەڕێت، بێ هێزو بێ دەسەڵات،لەبەرخەڵکی دەپاڕێتەوەو داوای یارمەتیان لێ دەکات، ئەوەندە دەکرۆزێتەوەو باسی کارەسات‌و نەگبەتیەکەی خۆی دەکات بۆیان بۆئەوەی

هەرنەبێ ڕەحمیان بجولێ‌و بەزەییان پێدابێتەوە . مرۆڤ بێ گەڕانەوە بۆلای خواو پەیوەست بون پێ یەوەو پەنابردن بۆ ئەو وەك ئاژەڵێکی لێ دێت، هەمیشە شوێن غەریزەو هەواو ئارەزوەکانی خۆی دەکەوێت‌و شەیدای خۆی دەبێت، بەخۆی دەنازێت‌وهەمیشە بەدەوری بەرژەوەندیەکانی دادە خولێتەوەو چاوی کەسی ترنابینێت . تەنیا ورگ وگیرفان‌ودامێنی خۆی پڕوتێر بکات چیدی ناوێت . بەپێچەوانەی مرۆڤی موسڵمانی بڕوا دارو ڕاستگۆ، کەهەمیشە لە سەرچاوەی زانیاری‌وفرمانەکانی ئاینەکەیەوە دەردەچێت، هەمیشە خوازیاری خێرو خۆشیە بۆ خەڵکی‌وهەرگیز شەڕو خراپەی بۆخەڵکی ناوێت . وهەم دەم قۆڵ وبازوی لەیارمەتی کلۆڵەکان دایەوەو قاچی هەڵکردون‌وپەلەدەکات بۆلابردن‌وجێ بەجێ کردنی پێداویستی یەکانی کەم دەست‌وهەژارەکان .

**خوشکی مسلمانم:**

لەکرینگترین‌و دیارترین جیاکەرەوەکانی خوشك‌وبرایانی موسڵمان ئەوانەن کەدڵیان بەخواوە بەندەو لەژیانی خۆیاندا تەنیا برگەکانی شەریعەت‌وبەرنامەی خوارەنگ دەداتەوەو گوێ ڕایەڵی خوان‌وفرمانەکانی جێ بەجێ دەکەن، ئائەوە خۆشی‌وهێمنی‌وئارامی‌وئاسودە بونی دەرونی و ئارام‌وئۆقرە بەدڵ دەبەخشێت . لەهیچ کات‌وساتێکدا نایان بینی جوێ لەبونی زەردە خەنە بەسەر لێوانیانەوەو هەمیشە گەش بینی‌وخەرمانی ئومێدەواری لەڕویاندا دەگەشێتەوە هەتاکولەناخۆشترین‌وتاڵترین بارو دۆخیش دابن . چونکە ئەوان بەر چاوڕونن‌و دەزانن ئەوەی کەتوشیان دەبێت‌ودوچاری دەبن بەهەڵەیان نابات‌وکاریان تێنا کات، وەئەگەر هەڵەش بکەن تۆبە دەکەن‌و دەگەڕێنەوە . هەرگیز بەمردن‌وڕۆیشتنی خۆشەویستانیان دڵ تەنگ‌وتەنگە تیلکەنابن، چونکەدەزانن ئەوەخێری تێدایە بۆئەوان هەر وەکو خوای گەورەدەفەرمێ: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُوا۟ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّوا۟ شَيْـًٔا

﴿وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ ۗ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٢١٦﴾﴾ البقرە ٢١٦[1]. لەبەر ئەوە ڕازاوەو نازونیعمەتیو زەخرەفەی دنیا هەڵیان ناخەڵەتێنێ، هەرچەندە دەست بەرداری بەشی خۆشیان نابن لەم دنیایەدا.

﴿وَابْتَغِ فِيمَا آتَاكَ اللَّهُ الدَّارَ الْآخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ الدُّنْيَا﴾ القصص ٧٧:[2]. چونکە بابای موسڵمان دەزانی ئەم دنیایە بەم تەمەنی کورتیەوە پڕلەئێش‌وئازارو ئەشکەنجەوغەمو پەژارەیەو پێویست ناکات مرۆڤ لە پێناویدا خۆ تورەو تەنگاو و تەنگە تیلکە بکات، هەموداخ وکەسەری بەدەست هێنانی نازو نیعمەتەکانی بێت‌وگوریس ڕابخات، بە هیچ شێوەیەك بوارنادات هیچ شتێکی لەدەست دەربچێت، چونکە دەزانێت هیچ شتێك بەڵکوهەمودنیاو ئەوەشی تیایدایەتی یەکسان نیە بە تەنیا نازێکی بەهەشت، کەبریتی یەلەنازو نیعمەتێکی هەرگیز نەبراوە کە هیچ چاوێك نەی بینیوەوهیچ گوێیەکیش نەی بیستوە،بەسەردڵی هیچ کەسێکیش دانەهاتوە،ئەوە بۆکێ یە؟ بێ گومان بۆ بڕوادارانی ڕاستگۆیە.

**خوشکی موسلمانم:**

ئەگەر دنیا پاك‌وخاوێن بێتەوەو هیچ لێلاییو چڵكو چەپەڵی خراپە کاریو ئاستەنگو تەنگژەکانی تێدا نەمێنن، سافو ڕونو دیارە ئەمەش شتێکی نەبوەو خەیاڵیەو هەرگیز شتی وانابێت. ئالەو کاتەشدا تەنیا بیر کردنەوەیەکی لەپڕی سەرپێی یەوە هەرچی خۆشی و شیرینی ژیانت چەشتوە هەمویت لێ دەکات بەقوزەڵ قوەرتو ژەهری مار، ئەوەندە تاڵ وهەرچەندە زۆریش بو بێت لات تۆزقاڵێکە، هەر چەندە تەمەنی خۆشیو

---

[1]) واتە: ەهەندێ شتیش هەیە حەزت لێیەوپێتان خۆشەکەچی شەڕی تێدایە بۆئێوە، خوالەئێوەچاکتر دەزانێتو ئێوەنەزانن. وەرگێڕ.

[2]) واتە: هەوڵ بدەبۆڕۆژی دوایی وبۆگەیشتن بەبەهەشت وڕەنجی بۆبدەوبەشی خۆشت لەم دنیلیە دالەبیرمەکە وەرگێڕ.

خۆش گوزەرانیت درێژ بوبێت، لات کورت کورت دەبێت .سافیو بێگەردیو ڕۆژی ڕونت لالێڵوتاریك شەوزەنگ دەبێت .ئەمە ئەگەر تەمەنێکی درێژت بوبێت .چۆن ئەم ژیانە بەسەر دەبەیت؟لەکاتێك دا ئەگەر بەیانیت کردەوە دەترسیێ ی کە ئێوارە نەکەیتەوەو ئێوارەت بەسەردا هات،بەیانی نەکەیتەوە، وەئەگەر هەوری بەڵاونە هامەتی ڕاخوڕیوئزیك بوەوە .مرۆڤ دەترسێنیێ هەرچی خزموخوەیشی و نزیکە کانی هەیە لە دەستی دەدات و برادەرە خۆشەویستەکان دەمرن .وە کاتێکیش هەست بەو ئازارێکی لەپڕدەکات لەیەکێك لەئەندامەکانی لەشی ، یاخود داخوڕپانودڵە کوتیێولێدانی دڵ زیاد دەکات، وکاتێك وردە وردە ئارەزوی خواردن نامێنیێو، مۆتەکەو تارمایی مردن لەپێش هەردو چاوەکانو ینا دەبێتو قوت دەبێتەوە، ئەوکاتەدڵ دادەخوڕپیێو دەترسیێو ڕادەچڵەکیێونەخۆشیەکەش وردە وردەپتر دەبێتوهەڵ دەچێت .خەمو خەفەتو پەژارەڕوی تیێ دەکەنو ترسو بیم هروژمی بۆ دێنیێ، هەروەکوبڵیێ ی ئەوترس وبیمە ناهێڵیێ مردن بۆی دابەزێت یاخود لیێ ی دور بخاتەوە.

ئای کەمرۆڤ چەندبیێ هێزو بیێ توانایە،چەندە ڕیسواو سوکی دەکات و چەندە لە پلەو پایەی کەم دەکاتەوەو بارو دۆخی تێك دەچێت،کاتێك دەبینی ئەو مرۆڤە لەهەڕەتی جوانیو شۆخیو شەنگیو تافی لاوێتی دایە، جوانو ڕازاوەو خرپنوسەرو ڕوو درەوشاوەو پرگۆشتو خرکەڵەو لەخۆباییو خۆ بەزل زانو خۆبەتواناو زۆرزان، کەچی لەناکاوو زۆر تەمەن نابات وەرزی تەمەنی ناگاتە پاییز دەبینی پشت کۆماوە،بیێ هێزوبیێ تواناوبیێ دەسەڵات، دەموروپەکی چرچولۆچاوی تێك قرماووتێك قوپاو، کەمترین هەوڵو جوڵانەوە ماندوی دەکاتو سوك ترین ئیشو کاردای دەڕمێنیێو دەی ڕوخێنیێ کاتێك بودەتبینی دەوڵەمەندو هەبوو خاوەنی ماڵوسامانێکی گەلێك زۆربو ، لەکۆشك وتەلاری بەرزی چەند نهۆمی دا دادەنیشت،سواری باشترینوئوتومبیلونوێ ترین مۆدیل دەبو .لەسەر ڕایەخوفەرشی نەرم و نیان دادەنیشت، کەچی لەنکاوخوای گەورە ڕۆژەکانی بەسەردا قلْپ کردنەوەو توشی تالوسوێریو نەهامەتی کرد، چونکە ڕێزی نازو نیعمەتە کانی خوای

نەگرت . دەبینی ئەمڕۆلە خانویەك دا دادەنیشیێ کەدوێنیێ پیێ ی نەنگ بوو بێزی نەدەهات تیایدا دابنیشێت، سواری شتێك دەبێت کەپێشتر بێزی نەدەهات سواری ببێت . ئەمڕۆ پۆشاکێك لەبەردەکات کەپێشتر بەزبر وخراپی دەزانی، ئەمڕۆ شتێك دەخوات، دوێنیێ بێزی نەدەهات تامیشی بکات.

بۆیە دەبێ مرۆڤ هۆشیارو ژیروعەقڵ بێتو بزانێت کەخۆشیوتامو چێژی ژیانوجوانیولوتکەو دۆندی بەختەوەری، لەهیچ شتێکولەهیچ ڕێبازولەهیچ بیروبۆچونێك دانیە تەنیا لەلای خواو لەگویێ ڕایەڵی بۆ خواودەست گرتن تەنیا بەبەرنامەی خودا نەبێت، کەلەبەردەوامیوپیێ دامەزراوی بەولاوە لە سەر بەرنامەو فرمانبەرداری خواو گرتنی ڕێگەی ڕاستی خوا کەبریتیە لەقورئان وسوننەت داوا لەمرۆڤەکان ناکات.بۆنەوەی مرۆڤ لەسەرخولگەی ژیانی بەختەوەریو ویژدانو دەرون ئارامی دا بژیات.خەمو خەیاڵ ومێشك ودەرون ئاسودە بێت، هێدیو هێمنو لەسەر خۆبێتوهەمیشە لەخۆشیو شادی دا بێتوژیانێکی ئازادانەوبیێ کۆتوزنجیر بەرێتە سەر، لەو کەسانەش خۆش بێت کەوستەموغەدری لیێ دەکەن، لەو کەسانەش ببوریێ کەهەڵەی لەگەڵ دادەکەن،بەزەیی بەبچوکەکاندا بێتەوەو ڕێزی گەورانیش بگرێت، هەمیشە تامەزرۆی ئەوەبێت کەپێداویستیەکانی خەڵکی جیێ بەجیێ بکاتو توانای قبوڵ کردنی ئازارو ئەشکەنجەکانیان بێت . زیادەڕۆییولاملیش نەکات لەفرمانەکانی خوا گەورە و بچوکی، ئاشکراو نادیاری، بەڵکوهەمیشە سور بێت لەئەنجامدانی هەرکارێك کەدەبێتە هۆی نزیك بونەوەی لەخوای باڵادەستوکاربەجیێ وهۆی ڕەزانەندی ئەونەگەر توشی بەڵاو موسیبەتو تەنگژەهات دەبیێ بەسینگێکی فراوانەوەو بەئارامی وسەبرێکی زۆر وبە ڕەزا بونەوەبەرەو ڕوی بچێت وهەڵەنەکات بەرامبەر پەروەردگارو خالقەکەی . وە کەمردیش دەبیێ ئەوەی تێدا بخوێنینەوە کەڕزگار بون لەهەمو دەردو بەڵاو قەرقەشەکانی دنیای کاتیوکۆچ کردنو گەشت کردنە بۆخانوومالّی هەتا هەتاییونەبڕاوەی کەهەردەبیێ بۆی بچینوهەر ئەویێ مالّی چارەنوسیو چارەسازیمانە.

**خوشکی مسولمانم :**

ئەم چەندلاپەڕانەی داهاتو کۆمەڵێك ڕێنوماییوئامۆژگاری لەخۆ دەگرن، وکۆمەڵێك ئاڕاستەن ئەگەربێتولەژیانی ڕاستەقینەی خۆت دا جێ بەجێ یان بکەیتوسور بیت لەسەر دەست پێوە گرتنیان، بەپێچەوانەوەش لەدەست دانو پابەند نەبون پێ یانەوە پەشێمان دەبیتەوەو هەرخۆت زیانمەند دەبیت، ئەگەر لەگوێ یان بگریت ئەنجامیان بدەیت ئەوا ژیانی ناخۆشیوتاڵوسوێرت بۆ دەبێتە بەختەوەریوسەربەرزیو سەرفرازی لەهەردو دنیادا . بەدبەختیو کلۆڵیت بۆ دەبێتە بەختەوەریوخۆشگوزەرانی وئاسودەیی . بەڵکو لەژیانت داهەست بەچێژێکی تر دەکەیت، وبەچاوێکی ترەوە دەڕوانیتە ژیانونوسینی ئەم ئامۆژگاریوتێڕوانینانە پاڵنەرو فاکتەرێکن بۆ خۆشویستنوپەلە کردن بۆخێروچاکەکاریو داواو ئومێدی پاداشت دانەوەو تامەزرۆی چاکسازیوئیسلاح لەناو کۆمەڵگادا.

دەی بابەیەکەوە بچینە ناو ئەو باخچە گوڵە بۆن خۆش و بۆندارانەومێشكودڵودەرونوویژدانی خۆمان بەبۆنی گوڵەکانیان بۆندارو بۆن خۆش بکەین تا ئاسودەو سەربەرزو سەرفراز بین . خوای باڵا دەستوکاربەجێ تۆشوئێمەش سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتو بکات، آمین.

## قسەکردن:

**خوشکی موسلمانم:**

١- زۆر وریای زۆر گوتن‌وزۆر قسەکردن بە : خوای بالاّ دەست‌و کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَٰحٍ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ النساء١١٤ : [1] .

٢-خوشکی بەڕێزم زۆر وریابن هۆشیاربن‌و بزانن کەیەکێك هەیە ئاگای لەهەموو قسەکان‌و چرپەچرپ‌و نهێنیەکانت هەیەو هەموویانت بۆئامارو تۆمار دەکات‌و لەسەر هەژمار دەکات‌و ڕۆژی ڕاست بونەوەو زیندو بونەوە دەخرێنەوە بەر دیدو چاوەکانت و پێت دەگوترێت(فکفى بنفسك اليوم حسيب) واتە ئەمڕۆ بۆخۆت بەسیت کەلەنەفسی خۆت بپێچیتەوەو سەرکۆنەی خۆت بکەیت، ﴿عَنِ ٱلْيَمِينِ وَعَنِ ٱلشِّمَالِ قَعِيدٌ ﴿١٧﴾ مَّا يَلْفِظُ مِن قَوْلٍ إِلَّا لَدَيْهِ رَقِيبٌ عَتِيدٌ ﴿١٨﴾﴾ ق١٧:،.١٨واتە :دو فریشتەوان بەسەرتەوە یەکێکیان

٣- لەلای ڕاست‌و ئەوی تریان لەلای چەپ هەرچی بیکەیت لەقسەوگفتارو کردەوەی چاك‌وخراپ لەدەفتەری کردەوەکانتدا تۆماری دەکەن‌وهیچی بزر نابێت‌وهەمو شتێکت لەسەر حسابە، قسەی چاك دەکەیت قسەی فشقیات‌و پروپوچ دەکەیت بێ ئاگا مەبە چاودێرت وا بەسەرەوە وەستاون بە خۆبە دەفتەرو پێنوسەوە .هەرکاتێك قسەت کردو کەوتیتە گفت‌وگۆ با قسەکانت کورت‌و پڕ واتا بن‌و مەبەست بپێکێ.

---

١) واتە: هیچ خێرو چاکەیەك لەزۆربەی سرپەسرپ وقسەوگفت و گۆکانیاندا نیە مەگەر ئەوانە نەبێ کەفرمان بەچاکەدەکەن وقەدەغەی خراپەدەکەن وخێر و چاکە بلاّو دەکەنەوە یائەوانەی هەمیشە هەوڵی چاك کردنەوەی نێوان خەڵکی دەدەن و ئەوانەی لێك تورەبون‌و نێوانیان نیە ئاشتیان دەکاتەوەوهەوڵی جدیانەی لێك نزیك بونەوەیان دەدات لەبەرخاتری خواوبەس .یا فرمان بەخێرودەست گیرۆیی هەژاران و نەداران دەدات .وەرگێر.

٤- هەمیشەقورئانی پیرۆز بخوێنەوە، سور بەلەسەرئەوەی کە رۆژانەو بردی قورئان بخوێنیو هەوڵ بدە ئەوەندەی دەتوانیت لەبەری بکەیت، بۆئەوەی ڕۆژی دوایی پاداشتێکی زۆر گەورەت چنگ بکەویت.

٥- لەعبداللە کوڕی عمرەوە‌ﷺدەگێڕنەوە کەپێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: {یقال لصاحب القرآن إقرأوارتق ورتل کما کنت ترتلُ في الدنیا، فإنّ منزلتك عندآخر آیة تقرؤها}صحیح سنن ترمذی (٢٣٢٩)[١].

٦- شتێکی جوان نیە هەرچی بیستت لەشوێنان بیگێڕیتەوەو باسی بکەیت، چونکە لەم گێڕانەوە یەدا بوار بۆ درۆ کردن دەرەخسێ‌وهەڵەوپەڵەی تێ دەکەوێتوهەرچی بیشی لێیت لە سەرت حیسابەودەنوسرێت لەأبی هریرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: {کفی بالمرءِ کذباً أن یحدث بکلِّ ماسمع}رواه مسلم في المقدمة )ج(٥[٢].

٧- زۆروریای لەخۆبایی بونوخۆهەڵکێشان بەبەوەی کە نیتە: هەر لەبەر ئەوەی پێت بڵێن هەبوە یان زیرەكو ئازاو دانایە،یا گەلێك دەست ڕۆیشتوە،کەچی لەبنەڕەتدا بونیشی نەبێت)واتە خۆهەڵکێشان بەشتێك کەئەسڵەن بونیشی نیە لات - وەرگێڕ .( لەعائشەوە(رضی اللە عنها )کەژنێك بەپێغەمبەریﷺگوت: ئەی ڕەسولی خوا، من لای خەڵکی دەڵێم مێردەکەم فلأن شتەی داومێ کەچی نەشی داومێ؟ پێغەمبەرﷺفەرموی: {المتشبع بمالم یعط کلابس ثوبي زور}متفق علیه(٣).

---

١) واتە: لەڕۆژی دوایی دابەقورئان خوێنان دەگوترێت: قورئان بخوێنەو دەنگت بەرز بکەوە وبەدەنگ بیخوێنەهەروەك چۆن لەدنیادا دەتخوێندەوە، چونکەپلەو پایەو جێگەی تۆلە دیدی دوایین ئایەت دایە کەدەی خوێنیتەوە.

١- ٢) واتە بەسە بۆ ئە و کەسەی گەرچی بیستی باسی بکات وبیگێڕێتەوەکەبەدرۆ بژمێردرێت .واتەدرۆولادانی تێ دەکەوێت.

٣) واتە تێربوبەشتێك کەئەی دراوەتێ وەك لەبەرکردنی پۆشاکی ساختە وایە.

٨- زیکرویادی خوا کاریگەریەکی گەورەی هەیە لەسەر ژیانی ڕوحی‌ودەرونی‌ولەشی‌و کۆمەڵایەتی موسڵماندا: دەی ئەی خوشکی موسڵمانم زۆر سورو بەردەوام بە لەسەر زیکرو وێردو یادی خوا لەهەموکات‌وساتێکدا، لەهەمو حاڵەتێك کە تیایدایت، باهەمو کاتێك زمانت تەڕ بێت بەزیکرو فیکری و یادی خوا .بڕوانە کەچۆن خوای باڵادەست‌وکاربەجێ باس‌ومەدحی بەندە دڵ سۆزەکانی خۆی دەکات: ﴿ ٱلَّذِينَ يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ ﴾ آل عمرن١٩١:[١].هەروەها

٩- عبدالله کوڕی بسر(ﷺ) ەوە دەگێڕێتەوە کەپیاوێك بەپێغەمبەری ( ﷺ) گوت:ئەی ڕەسولی خوا حوکمەکانی شەریعەتی خوا زۆر لەسەرشانم کۆبونەوەوزۆر دەترسم نەتوانم هەمویان ئەنجام بدەم، بۆیە داوام وایە کەشتێکم پێ بڵێ ی کەدەستی پێوە بگرم‌و بتوانم ئەنجامی یان بدەم‌وخواش لێم وەربگرێت . فەرموی :{لا يزال لسانك رطباً من ذكرالله}صحيح سنن الترمذي(٢٦٨٧) [٢] .

٦- ئەگەر ویستت قسەبکەیت ڕاست‌وڕەوان بدوێ‌و بەپێچ‌و پەناو قۆرت ولابەلاوخوارو خێچ‌و بەلەخۆبایی بونەوە قەسان مەکە،چونکە بە ڕاستی ئەمەسیفەتێکی ناشیرین‌وبێزراوو قێزەونە لای خواو پێغەمبەری خوا ﷺئەوەتە فەرمویەتی:{إِنَّ أبغضكم إِلَيَّ وأبعدكم منّي مجلساً يوم القيامة الثرثارون والمتشدقون و المتفيهقون } صحيح سنن الترمذي(١٦٤٢)[٣].

---

١) واتە: ئەوانەی کەهەمیشەزیکرویادی خوادەکەن و هەرگیز خوا لەبیر ناکەن، بە پێوەبن یان بەڕۆیشتنەوەبن یان بەدانیشتنەوەبن،یاخودلەکاتی ڕاکشان ودرێژبون و پشودانداین

٢) واتە : با هەمیشەزمانت بەویردوزیکری خواوەتەڕبێت وەرگێڕ.

٣) واتە: ئەو کەسەی کە ڕۆژی قیامەت لە هەموکەس پتر ڕقم لێ ببێتەوەو دورترین کەس بن لە کۆڕو مەجلسی من بریتین لەزۆر بلێکان وهەڵەوەڕەکان وچاقاوەسڕۆکان وەرگێڕ.

٧ - بۆئەوەی پێغەمبەرﷺپێشەنگت بێتوشوێن پیێ ی ئەوهەڵ بگریت، ئەوا زۆربێ دەنگولەسەخۆوهێدیو هێمن وزۆر بیر بکەرەوە،و زۆر پیێ مەکەنەو هەرگیز قاقا پیێ مەکەنە تەنیا بە زەردە خەنە نەبێت .لە(سمّاك)ەوەگوتیێ بەجابری کوڕی سەمرەم گوت.ئایاهەرگیز لای پێغەمبەر ﷺ دانیشتوی؟ گوتی : بەڵێ،ئەو هەمیشەبێ دەنگ بو، زۆرکەم پیێ دەکەنی، سەحابەکانی گەر کۆدەبونەوە شیعریان دەگوتوباسی کارو بارەکانی خۆیان دەکردوپیێ دەکەنین،بەڵام ئەوﷺ مەگەر زەردەی بهاتبایە دەنا پێکەنینی بەدەنگەوەی نەبو) المسند .(٥/٨٦

ئەگەرقسەت کرد، ئەواقسەی چاكوبەسود بكە دەنابێ دەنگ بە.چونکە ئەوەخێری تێدایە بۆ تۆ . پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{من كان يؤمن بالله و اليوم الآخرفليقل خيراً اوليصمت}رواه البخاری ، الفتح . (٨/٦٠)[1]

٨- تکایەهەرگیزقسەبەخەڵکی مەبڕە ، گەر قسەیان بۆ دەکردیت گوێ بگرەتا لەقسەکانی خۆیان دەبنەوەوسەرەت دێت ،یان هەرگیز قسەکانیان بەڕو دامەدەوە،یاقسەکانیان بێ بایەخ و بەسوکی سەیر مەکەو بەڕەوشتو ئاکارێکی جوانەوە گوێ بۆبەرامبەرەکەت بگرە . هەمیشە بە باشترین شێوە وەڵام بدەرەوەو بائەوەئاکارو دروشمی کەسایەتی خۆت بێت.

٩ – ئاگادار بەو زۆر وریا بە هەرگیز گاڵتە بە قسەی خەڵکان و بەرامبەرەکەت مەکەو بەمینجەوە لاسایان مەکەوە،یان ئەگەر بە رامبەرەکەت زمانی دەی گرت یالاڵ بویازمانی فس بونەکەی پیێ ی پیێ بکەنیت ، چونکە ئەمە سیفەتی بابای موسڵمانو لەخواترس نیە .

---

١) واتە: هەرکەسێك بڕوای بەخواوبەڕۆژی دوایی واتە زیندوبونەوەهەیە لەقسە کردنداباقسەی چاك و باشو خێریکات دەنابەبێ دەنگ بێت .

بڕوانە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّ﴾ الحجرات ١١: [١].

هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی: المسلم أخوالمسلم لايظلمُهُ ولايخذلهُ ولايحقره...بِحسب امرءٍ مِنَ الشرِ أن يحقر أخاهُ المسلم}رواهُ مسلم(٢٥٦٤) [٢]

١٠- ئەگەر گوێت لەخوێندنی قورئان بوخێرا قسەکانت ببڕە جابا هەر بابەتێك بێت، بەڵکو دەبێ‌گوێ بۆقورئانەکە شل بکەیت،ڕێزی فەرمودەکانی خوا بگرە،وگوێ ڕایەڵی بکەو فرمانەکانی جێ بەجێ بکەومەیکە بەغوڵبەغوڵب. هەروەکو خوای باڵادەست وکاربەجێ دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ٢٠٤﴾ الأعراف٢٠٤ : [٣].

١١ - هەمیشە پێش قسەکردن بیرلەقسەکانت بکەوەو جوان لێ یان وردببەوە ئەگەر خێرو چاکەیان تێدا بو بیاکەدەنا مەیان کە) هەروەکو کورد گوتەنی: قسە بیچێژەو بینیژەو ئەوسا بیبێژە -وەرگێڕ.(هەمیشە سور بەلە سەر کردنی قسەی چاکەولێك نزیك

---

[١]) واتە: ئەی ئەوکەسانەی کەبڕواتان هێناوەباهیچ کەس و کۆمەڵوگەلێك گاڵتەوتوانج بەوی ترنەکات وخۆی پێ لەوباشترنەبێت‌وخۆبە بەڕێزتروخاوەن دەسەڵات تربزانێت،هەروەهاباهیچ ژنێك گاڵتەبەوی ترنەکات گوایەئەو بەڕێزتروباشتروچاکترەلەونەخێرنەمەوانیە بەڵکومرۆڤەکان لای خوای پەروەردگار هەمو یەکسانن وەك دانکەکانی شانە؛تەنیاپێوەرێك‌وتەرازوییەك لای خوا خۆلەخواپارێزی‌ولە خواترسان وتەقواکردن‌وفەرمانبەرداری خوای باڵادەست و کاربەجێ یەویەس کێ لە هەموان بەتەقواتربێت ئەوەلای خواخۆشەویستە. وەرگێڕ.

[٢]) واتە: موسڵمان برای موسوڵمانە نابێ ستەمی لێ بکات‌وسوکی بکات ویا سوکایەتی پێ بکات‌ولەکەسایەتی دابەزێنێت‌وپیلان‌وتەڵەی بۆبنێتەوە،بەڵکوبەگوێرەی خراپی خۆی لەگەڵی دابجولێوە. وەرگێڕ.

[٣]) واتە: ئەگەرقورئان خوێندرایەوەوگوێتان لەخوێندنی بوبێ دەنگ بن وگوێ بۆقورئانەکەشل بکەن وفرمانەکانی بەجێ بێنن،بۆئەوەی خوای گەورەبەزەیی وڕەحمتان پێ بکات.

کردنەوەی نێوان خەڵکیوکەسێکی ئیسلاحی بە نەك شەڕەنگێز وفیتنەبازیودو زمانیو دو بەرەکیو قسەهێنانو بردنوقسەی خراپ تێك دەرانەو خەڵکی تێك بەر بدەیت.چونکە ئەم سیفەتە دەبێتە هۆی تورە بونی خواو بێزار بونی لێت دەبێ زۆروریاو زرنگو لەسەر خۆت بیت هەمو قسەکردنێك بەر پرسیاریەتی تێدایەو لەسەرت دەکەوێتو چارە نوسی مرۆڤی پێوە بەندەو چارەنوس سازیە . ئەدی نابینی چەندان کەس بەهۆیو شەو قسەیەکی باشەوە چوەتە بەهەشت چەندان و شەو قسەش خاوەنەکانی خۆیان فڕێ داوەتە ناو بنكو بنی بنەوەی دۆزەخەوە.لەأبی هریرەوە ﷺدەگێڕنەوە کاتێ پرسیار ی لەپێغەمبەر ﷺ کردوە لەوەڵامی دا فەرمویەتی: {إنَّ العبد ليتكلَّمُ بالكلمةِ من سخط الله لايلقي لها بالاً يهوى بهافجهنَّم}رواه البخاري(٧٨ - ٦٤) [1] .وە لەفەرمودەی معاذ ﷺ داهاتوەکە پێغەمبەرﷺبە معاذی فەرموە : {ثكلتك أُمُّك يامعاذ، وهل يكب النَّاس في النَّارعلى وجوههم إلاَّ حصائد ألسنتهم(صحيح سنن الترمذي(٢١١ [2]

١٢- ئەو زمانە،ئەو پارچە گۆشتەی وا لەناو دەمت دایە، نیعمەتێکی خوای گەورەیەو لە) ألله( وەپێت بەخشراوە دەتۆش لەکاری چاکەو شتی خێردا بەکاری بێنەولەفرمان کردن بەچاکە و قەدە غەکردن لەخراپەدا بەکاری بێنە، لەبانگە شەکردن بۆ بەرنامەکەی خواهەڵی سوڕێنە.

---

١) واتە: بەندەهەیەقسەدەکات وهیچ گوێ بە قسەکانی نادات وهەرگیزبیریشی لێ ناکاتەوە، کەخراپی گوتوەیان چاك، ولەولاوەش ئاگای لێ نیە خوای گەورە لێ ی تورە بوەو بەهۆی ئەو قسەو گوفتارە خراپانەوە، ئەو قسە ئاژاوە گێڕیو تێك دەرانەیەوە، ئەوقسە بۆگەنانەوە فڕێ دەدرێتەناوئاگری دۆزەخەوەو سزاوباجەکەیان وەردە گرێتەوە. وەرگێڕ.

٢) واتە : هەی دایکت ڕۆڕۆت بۆبکات ئەی معاذ ،خەڵکان هەن لەڕۆژی قیامەتدالەناوئاگری دۆزەخدا بەسەرروواندا ڕادەکێشرێن، ئەمانە سزاکەیان، باجەکەیان ئەنجامی ڕەفتاروقسەخراپەکانی خۆیانن کەلەدنیادا گوێ یان پێ نەداوەو بەخەیاڵیشیان دا نەهاتوەوبایەخیان پێ نەداوە، بۆیە ئەو ڕۆژە هەر هەمویان دروێنەوبەرهەمی زمانی خۆیانن وتۆباڵەکەیان لەئەستۆی خۆیان دایە . خوا پەنامان بدات.

گوێ بگرە خوای گەورەچیمان پێ دەفەرموێ: ﴿لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾ النساء١١٤:[١] .

**فێرکردن وفێرخوازی:**

١٣-فێرکردن کارێکی بەرزو بێ هاوتایەوڕێگای سەرفرازیو بەختەوەریە .

لە الشفاء کچی عبدالله وەدەگێڕنەوە کە گوتویەتی: پێغەمبەری خواﷺ هاتەلامان ومن لەو کاتەدا لای حفصة بوم پێ ی فەرموم: {ألا تعلمينَ هذه -يعني حفصة -رقية النملة كما علّمتها الكتابة}رواه أحمد٦/٣٧٢[٢] . لەفێربونوخوێندن دابا مەبەستت تەنیا بەدەست هێنانی بڕوانامەوبەدەست هێنانی پلە و پایەو موچە نەبێت بەڵکو یەکەم جار مەبەستت فێر بونی زانستو کارو بارو حوکمەکانی ئاینەکەت -ئایینی ئیسلام بێت ، فێر بونوجوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز بێت، ئافرەت دەبێ بەبەرچاو ڕۆشنیوتێگەیشتنو شارەزاییەوە خوای خۆت بپەرستیت . هەروەها مەبەستت لەخوێندنوفێربونوشارەزا بون وزانینی ڕێگاکانی پەروەردەی پاکو بێ گەرد بێت، هەر وەکو چۆن لەژیانی پێغەمبەرﷺوسەحابە بەڕێزەکانﷺ وپێشینەی پیاوچاکی ئەم ئوممەتە نواندیان، بۆئەوەی ئافرەت بەسەر بەرزیو بەخۆشی بژیت.

١٤-هەرگیز گاڵتەبەوخوشکانەی خۆت نەکەی کە نەخوێندەوارنوهیچ فێرنەبون، لەخۆت بایی نەبیتوخۆت بە سەرئەوانەی کەپلەی خوێندنوزانستیان لەتۆکەمترە هەڵنەکێشیت . هەروەها پلەکەمیونزمی ئەزمونەکانی خوێندنت نەبێتە هۆی ساردکردنەوەو

---

[١]) واتە: لەزۆربەی زۆری قسەکردنو وتو وێژو چرپە چرپەکانی خەڵکی دا سود و خێرو بەرەکەت نیە مەگەر ئەو قسەکردنو سر پەسرپو دەمە تەقێیانەی کەلە چاکەو سەدەقەدا یاخودلەچاك کردن وپێك هێنانەوەولێك نزیك کردنەوەی نێوان خەڵکی دا ئەنجام بدرێن.

[٢]) واتە: ئایا ئەمە فێری دوعا ناکەیت هەروەکو چۆن فێری نوسینت کرد، کە مەبەستی (حفصة) ی خێزانی بو.

بەردەوامیت لەخوێندن‌وفێر بونتدا، بەڵکو بەپێچەوانەوە هان دەرو پاڵ نەرێك بێت بۆپتر هەوڵ و تێكۆشانت بۆ بەرز کردنەوەی پلەكانت‌وهەڵچونت بەپلەكان‌و قۆناغەكانی خوێندن‌وفێربون تادەمریت كەبەتەمەنیشدا چویت مەڵێ تازەمن بەسەرچوم‌و تەمەنم رۆیشت، نەخێر بەهەندێ نیە بەهەوڵ‌و تێكۆشانە،بەخۆماندو كردنە، بەنوچ نەدان‌وكۆڵ نەدانە، گەرسا تمەش بكەیت وسەرە نوچیش بدەیت ، گورِ بدە خۆت‌وهەڵ بستەوە، خۆ توند بكەوەوملی رێگا بگرە بەربە هەورازو نشێواندا سەر بكەوەو بیان برِە تادەگەیتە دوا مەنزڵی مەبەست خوای گەورەش هاریكاری‌و پشتیوانتە، پیشتیوانیت تەنها بەخوابێت‌وهەولێش بدە لەهەرتەمەنێكدا بیت سەر دەكەویت دەگەیتە دواقۆناغ (والله ولیُّ التوفیق)

لە كعب كورِی مالكەوە ﷺ دەگێرِنەوە گوتویەتی: گوێم لە پێغەمبەر ﷺ بوكەدەی فەرمو: {من طلب العلم لیجاري به العلماء، أولیماري به السفهاء، ویصرف به وجوه الناس إلیه، أدخله الله النّار} صحیح سنن الترمذي(٢١٣٨).

## بیستن‌و گوێ گرتن:

١٦- گوێ‌ومێشك‌وبیروهۆشی خۆت پاك بكەرەوەو پاكی رابگرە لەگوێ گرتن بۆگۆرانی‌ومۆسیقاوقسەی خراپ‌وناشیرین و قرپۆك‌وبێ واتاو قێزەون . چونكە گوێ گرتن بۆگۆرانی‌و مۆسیقا وقسەی پروپوچ‌وخراپ لەشەریعەتی خوادا جێگەی نابێتەوە و حەرامەولەتەرازوی ئیسلامدا بونی نیەو شتێكی بێزراو و ناشیرینە ، دڵ‌ودەرون بۆگەن دەكات( هەروەكو چۆن پارچە گۆشتێك لە بەرتیشكی رۆژانی هاویندا بۆگەن‌وكرمە رێژ دەبێت، ئاواش گۆرانی‌و مۆسیقا لێدان‌و گوێ بۆگرتنی دڵ‌ودەرون‌ولەشی مرۆڤ بۆگەن‌و كرمە رێژدەكات. وەرگێر)

## پۆشاك وجل وبەرگ :

١٧- تۆئافرەتێکی موسڵمانیوگەرخۆت بەموسڵمانوبڕوادار دەزانیت دەبێ پۆشاکەکانت لەژێر چەتری پۆشاکی شەریعەتی خوا دابن . دەبێ گشت مەرجەکانی پۆشاکی شەرعی تێدا بن، دەبێ پانو بەرین بنوتەنك نەبن تالەشی تێدا دیار نەبێت و ئەندامەکانی لەش دەرنە پەرێنێتو وێنەی لەش بەرجەستە نەکاتوتەنك نەبن لەشیان تێدا دیاربێت.

١٨- ئەوەی پێ ی دەگوترێت) نیوقۆڵ(و چارەگە قۆڵ ویەخە فراوان) الدلعة(هەموی بڕو بیانووبۆکورت کردنەوەو سفوریەتی پۆشاکە . بەجۆرێکی وا دەبینی کەئافرەت لەکاتی هاتو چۆو سوار بونو دابەزێن لەئوتومبیلو ماشین لەشی بەدەر دەکەوێت و کوناحێکی گەورەیە.

## کۆڕوکۆبونەوەو دانیشتنەکان:

١٩ - هەرگیز ئامادە نەبیت لەکۆڕو کۆبونەوەو دانیشتنە تێکەڵیوخراپوبێ شەرعیەکان. وریابە خۆت بپارێزە لەتێکەڵی ومانەوەت لەو کۆڕو کۆبونەوانە هەی خوابت پارێزێت . بەڵکو هەمیشە هەوڵ بدەو پەلە بکە بۆکۆڕو کۆبونەوەو دانیشتنە شەرعیوباشە کانی کەهەمیشە خێرو چاکەیان لێ چاوەڕوان دەکرێت . خوا چاوەدێریت بکات.

٢٠- لەهەرکۆڕو کۆبونەوەو مەجلیسێك دا لەگەڵ دەستە خوشکانت یالەگەڵ هەرکەسو لەهەرشوێنێك دا دانیشتیت بازیکرو ویردو یادی خواهە میشە لەسەر زمانت بێت بۆئەوەی خێرت دەست بکەوێتو ئەجرو پاداشت بەرهەمی زمان وبیرو هزرت بێت . پێغەمبەری خوا ﷺفەرمویەتی: {من قعد مقعداً لم يذكرالله تعالى فيه كانت عليه من الله ترة، ومن إضطجع مضجعاً لايذكرالله فيه كانت عليه من الله ترة} سلسةالأحاديث الصحيحة

((٧٨)[1].واتــە ئــەو کەســە لــەڕۆژی قیامەتــدا حەســرەتو پەشێمانیوماندوییوشــەکەتی هاودەموهاوڕێیەتی.

وەئەگەرلەهەر کۆڕو کۆبونەوەو لەهەر شوێنێکولەهەرماڵێك هەستایتو ڕۆیشتیت لەبیرت نەچێت ئەمو یردو زیکرە(دوعایە) بخوێنە{ سبحانك أللهمَّ وبحمدك، أشهد أنَّ لاإلـه إلاَّ الله، أستغفرك وأتـوبُ إليـك}صحيح سنن الترمذي (٢٧٣٠) [2] . بۆئـەوەی خـواە گـەورەلێت ڕازی بێتولـەو هەڵـەو پەڵـەو سەرپێـچیانەی نـەی کەلـەو دانیـشتنوکۆڕو کۆبنەوەیەدا کردوتن خۆش ببێت.

٢١-خوشکی موسڵمان ئەممان سەد جار ئەممانو توخوا هەرکاتێك لەماڵو لەهەرشوێنێك کۆبونەوەو بەیەکەوە دانیشتن زۆرئاگادارو وریابن زمانتان لەغەیبەتوباسی ئەمو ئەو ودوزمانی وقسە هێنانو بردن بپارێزنو زمانتان پاك ڕابگرنوگوێ ڕایەڵی فەرمانەکانی خوابکەنو خۆتان لەسزای بەسفتو سوێ ی خوا بپارێزن، چونکە ئەوانە لەسیفاتی سوکەڵەوڕیسواو (المرذولة) و ئاکارو ڕەوشتی بێزراو(الممقوتة)ن . ئەوەتە خوای گەورە دەفەرموێ ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُۚ﴾ الحجرات١٢: [3] .

١) واتە : هەرکەسێك لەشوێنێك دا دابنیشێتو زیکرویادی خوای نەکرد ئەوا خوای گەورە لەڕەحمەتی خۆی دوردەخاتەوە وەهەر کەسێك درێژ بو یا لەسەر جێگە ڕاکشا بەتایبەتی لەکاتی نوستن دا یادو زیکری خوای نەکرد ئەوالەخواوە داخ و کەسەرو پەشێمانیو پەنجە گەزینی بۆمسۆگەرە.

٢) واتە:پاکو بێ گەردیو کەم وکوڕی بۆ تۆ ئەی خوایە سوپاسو ستایشی بێ پایان بۆ تۆ، شاهیدی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بەحەق بپەرسترێت جگە لەتۆ ئەی پەروەردگارا.داوای لێ خۆش بونت لێ دەکەم وتەوبە دەکەم وبۆلای تۆدەگەڕێمەوە .وەرگێڕ.

٣) واتە: هەرگیزاوهەرگیز باس وغەیبەتی یەکتری مەکەن ودوزمانی وقسە هێنان وبردن مەکەن ،ئایاکەس لەئێوەحەزدەکات گۆشتی برای خۆی بخوابەمردویی یابەکاڵی،دیارەنەخێر کەس حەزناکات، دەی کەواتە غەیبەتی یەکتری وفیتنە گێڕی مەکەن وقسەمەهێنن ومەبەن تا ئەو حاڵەتان بەسەرنەیەت وەرگێڕ.

٢٢ –ئەگەرهاتویەکێك لەوخوشکانەی کەلات دانیشن و سەردانیان کردیوقسەی خراپوناشەرعی کردن، یاهەڵەیەکی کردئەوە تۆئامۆژگاری بکە وپێویستە لەسەرت فرمانی بەچاکە پیٚ بکەیت وله خراپە بیگێڕیتەوە. ئەگەرلەلات هەستاو ڕۆیشت بەقسەی خۆش وجوان ونەرم پێشوازی وبەڕیٚ ی بکەو ئامۆژگاری بکە جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەرئەوسیفەتەخراپانە.

**کتێبخانەکەت:**

٢٣- کتێبخانەکەت باهەمیشە کتێبخانەیەکی نمونەیی بێت و پڕی بێت لەکتێبی باشوسودبەخشو کتێبخانەیەکی موسڵمانانە بێت . وریابە هەمیشە کتێبو چاپکراوی باش وبە سودو شەرعیانەی بۆ هەڵبژێرەوبیان کڕە، بۆئەوەی کتێبخانەکەت بە سودوخنجیلانە بێتوخۆتوهەموئەندامانی خێزانەکەت سودی لیٚ ببینن کتێبەکان بابەزۆری ئایینی بنو هەروەهاکتێبی کۆمەڵایەتیوزانستو زانیاریەکانو کتێبی ئاکاروڕەوشت و بەها بەرزەکانی تێدابێت.

٢٤ - زۆروریابە ئەی خوشکی موسڵمانم هەرگیزکاتی خۆت بەخوێندنەوەی کتێب وشتی بیٚ سودبەفیڕۆ نەدەی، زۆر هوشیاروبەرچاوڕۆشن بەشتەزیان بەخشەکانی وەك گۆڤار و ڕۆژنامە خراپو پڕ لە وێنەڕوتو قوتەکانو فیکرەو بیرو بۆچونە بۆگەنو قرچۆكو داڕوخێنەرەکانی بنەماو بەها بەرزەکان مەخوێنەوەو خۆتیان لیٚ دور بگرەوخۆت لەڕیوایەتە خراپ وداڕزێنەرەکان دور بگرە، کە نوسەرەکانیان هەمیشە شتی خراپ وبۆگەن بڵاودەکەنەوەکەدەبنەهۆی بڵاو کردنەوەی ڕیسوایی وسەرشۆڕیوبڵاوکردنەوەی خراپە کاری لەناوچین وتوێژەکانی کۆمەڵگای موسڵمانان، هەرگیز نەهێڵیت لەدەرگای ماڵەوەت بێنە ژورو جەنگیان لەگەڵ دابەرپابکە.

٢٥- باشتروایە کتێبخانەکەت هەمەجۆرەبێتوهەمو پێداویستیە کانتان پڕبکاتەوە، وچارەسەری هەمو جۆرە بابەتەکان بکات . دیارە موسڵمان بەخوشكو بەبراوە پێویستی بەزانستوزانیاری وشارەزا بونو بەر چاوڕۆشنی هەیە لەهەمو بوارەکانی ژیانو گشت

ئەحکامەکانی ئایینەکەی‌و گشت کاروبارو‌کون‌و قوژبن‌و نادیارەکانی بیروباوەڕەکەی (العقیدة) هەیە . هەروەها ئاگاداری بون و شارەزابون وزانین لە هەمو هەواڵ وکارو چالاکیە ئیسلامیەکان‌وزانین‌وهەست پێ کردنی کێشەوتەنگو چەڵەمەو ئاستەنگو تەنگژەکان‌و کردنەوەی گرێ کوێرەکانی جیهانی ئیسلامی شتێکی حەتمی‌و پێویستە. دیسانەوە شارەزابون‌و زانینی هەمو هۆکارە پەروەردەیی یەکان کەیارمەتی دەرو پاڵنەرێکی حا شا هەڵ نەگرن لەپەروەردە کردن‌و پێ گەیاندنی خۆت‌و هەموئەندامانی خێزانەکەت . هەروەها ئاوڕدانەوە لەژیان وبەسەرهات وهەڵس و کەوتی پێشینەی پیاوچاکانی‌و پەندوئامۆژگاری وەرگرتن لێ یان پێویستیەکی تری زەرورە.

٢٦- ئەگەرکتێبکی بەسودوبەکەڵکت کەوتە دەست‌و لات پەسەند بودەستە خوشکەکانتیشی پێ بناسێنەو بیان دەیە بابیخوێننەوە یاخود ئامۆژگاری بکە کەبەدەستی بێنیو بیخوێنێتەوە، بەڵکوئەویش سودی لێ وەربگرێت. وەبە پێچەوانەشەوە هەرکتێب‌و چاپکراوێکی زیان بەخش‌و خراپت بینی، پێویستە لەسەرت کەخوشکو براموسڵمانەکانتی لێ ئاگادار بکەیتەوەو ئامۆژگاریان بکەیت کەلێ ی نزیک مەبنەوەو هەرگیزنەی خوێننەوە خۆلەژەهرەکەی دوربگرن نەبادا هەمو گیانیان ژەهراوی بکات.

٢٧-خوێندنەوەوخۆخەریك کردن بەکتێب‌و سەرچاوە بەسودەکان کارێکی زۆرگرنگ و پڕ سودن هەرگیز نەکەن لە کیس خۆتانی بدەن، ئەوندە تەمەنەی کەماوتانە بابێ بەرهەم نەبێت بۆدنیاوبۆقیامەتتان لەخوێندنەوەو گەڕان بەدوای زانست و زانیاریەکان دابگەڕێن بەتایبەتیش زانست‌و زانیاری دینی خواو فێربونی ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆزوسوننەتی پێغەمبەرەکەتان و شەریعەتی خوای گەورە، خوا یارمەتی دەرو پاڵپشتتان بێت ، خوشکی موسڵمانی خۆشەویستم کاتی بێ ئیشی‌و دەست بەتاڵیتان بەهەل وەربگرن، هەلێکی زێڕینە لەکیس خۆتانی مەدەن بەڵکوزانست‌وزانیاری‌وڕۆشنایيەك بۆبەرچاو روناکیتان لە تاریکی شەوەزەنگی نەزانی‌و بێ ئاگایی‌ونەفامی دا وەدەست بێنن .

## دەرچون بۆبازاڕ:

٢٨- خوشکانی بەڕێزم بازاڕەکان ئەوندە شوێنێکی پەسەندو باش نین، بۆیە هەمیشە پێویستە لەسەرت لەچونە دەرەوەت زۆر سور نەبیت بەتایبەتی بۆ بازاڕ. خۆ ئەگەریەکێکت هەبێت یادەستت بکەوێت کارەکانو پێداویستیەکانت بۆبکرێتو بۆت بێنێتەوە پێویستە خۆتی لێ لادەیتو پێویست ناکا خۆت بچیتە دەرەوە. خۆ ئەگەر هەر ناچاریش بویت دەبێ هەر بچیتە دەرەوە ئەوابەپەلە پێداویستیەکانت بکڕەو بۆ ماوەیەکی کەمو بەپێ ی پێداویستیەکان لەبازاڕ بمێنەوەوخێرابازاڕ بەجێ بهێڵە و بگەڕێوەماڵەوە، چونکە بازاڕ جێگەی خراپەو خراپەکاری و فرو‌فێڵ ونیشتمانی خۆشەویستی شەیتانەوبەیداخی خۆی لە سەرەتای هەموبەیانیەکەوە تێداهەڵ دەکاتو ئەوەی بچێتە بازاڕ چ ژن ژپیاو توشی خراپەی دەکاتو لەخشتەی دەبات بەجۆرەهاشێوە.

٢٩- گەرچویتەدەربۆ بازار لەخۆ جوان کردنوماکیاج ورازانەوە وجلی زاقو بریقی سەرنج ڕاکێش بپارێزەو لەبەریان مەکەن و بۆنی خۆش لەخۆت مەدە، ئەگینا گوناحی خۆشتوهەمو ئەوانەشی کەبەتۆوە توشی گوناح دەبن لە ئەستۆی تۆدایەو گوناحی تۆچەندهێندانەیە . لەأبی موساوە‌ﷺدەگێڕنەوە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: {إذا إستعطرت المرأة فخرجت على القوم ليجدوا ريحها فهي كذاوكذا}رواه أحمد)ع(٤٠٠/[١] . باجل وبەرگوپۆشاکەکانت پانو پۆڕ بنو گشت گیانت داپۆشێت.

٣٠- ئەگەرلەناو بازاڕدا بویت یالەڕێگەدا بویت بۆبازاڕ وریابە زۆرئاوڕان نەدەیەوەو تەماشای ئەملاو ئەولای خۆت مەکە، چونکە تەماشا کردنو بینین زۆر ڕاکێشەرو پێ هەڵخلیسکێنەرە وە ئەگەرگەیشتیە کەل وپەلو پێداویستیەکانی خۆت زۆر لەگەڵ فرۆشیارو دوکاندارەکان وکەسانی دەورو بەرقسەو گاڵتەگەپو قسەی حەلەق مەلەقو

---

١) واتە: ئەگەرئافرەت بۆنی خۆشی لەخۆی داو چوە دەرەوە بۆبەروبازاڕەکان وبەلای خەڵکی دا تێ پەڕی بۆنەوەی بۆنەکەی بۆخەڵکی بچێتو سەرنجیان ڕابکێشێت ئەوا ئەواو ئەوایە واتە زینای کردوە.

حریکەحریك مەکە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی سوك بونی خۆت لەپێش هەمو کەسێکو ئەمجاریش حەیادابەزینوکردنەوەی دەرگاو پەنجەرەی فیتنەو بێ شەرمیو ئەنجام خوانەکات خراپە کاری خوا پەنامان بدات. یان هەرلەبەرئەوەی پێت بلێن بەخوا کەسێکی خۆش و گاڵتەچیوسوحبەت چیە، ناهەرگیزشتی وانەکەیت ئەمە خەتەرە زۆریش خەنەرە بۆ سەر کەسایەتیوحەیاو حەشمەتو شەرمی خۆتو بنەماڵەکەت.

٣١- ئەگەرلەناوبازاڕ یالەڕێگەی بازاڕدا خراپەکارێکت دیت، پێویستە لەسەرت بەرپەرچی بدەیتەوەو دەستی بگریتو نەهێڵی ئەنجامی بدات. ئەگەربەدەست و بەقسەنەت توانیو دەبێ بەدڵ پێت ناخۆش بێتو ڕقت لەوخراپەو خراپە کارە ببێتەوە. خوای باڵادەستو کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَٱلْمُؤْمِنَٰتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾ التوبە .٧١: [١]

٣٢- هەندێ لەژنان وەك خویەك ڕۆژانە بۆ پیاسەو سەیران دەچنە بازاڕ، وزۆر دەچنە دەر هەمو ڕۆژێ، هەمو بەیانیەك بە کۆڵێك شۆخو شەنگیو بۆنی خۆشەوە تاسو لوس پەنا بە خوا دەگرم کەتۆلەوانەنەبی، ئەم جۆرە کەسانە لە هەمو کەسێك پترتوشی فیتنەوئاشوب و بە فیرۆدانی کات دەبن

٣٣ -خوشکی بەڕێزم،بەزەییت بەخۆت و بە مێردەکەت،یابەدایك وباوکت دا بێتەوە ئەگەر کیژۆڵەی لە ماڵدازۆردەست بڵاو مەبەو هیچ پێویست ناکات ماڵەکەتانو مدبەقی ماڵەکەتان بکەیتە لقێکی سەرەکی لەبازاڕ. هەرگیز شتی زیادەوبێ نەویست مەکڕە. تەنیا ئەوانە بکڕە کەڕۆژانە لەماڵەوە پێویستیتان پێ یەتی.

---

١) واتە: بڕواداران چ ژن چ پیاو دۆستو پشتی یەکترینو فرمان بەچاکە دەکەن و دەستی یەکتری دەگرن ولەخراپەیەکتری دەگێڕێنەوە (وەرگێڕ)

## دوعاو زیکرولەخوا پاڕانەوە:

٣٤- تۆهەمیشەلەئاست خوادا بێ هێزوبێ تواناو لاواز، هەمیشە پێویستت بەیارمەتی ودەستگیرۆیی و ڕێنومایی خوای بالا دەستوکاربەجێ هەیە، دەی کەواتەلەبیرت نەچێت هەمیشە وهەموکاتوساتێك لەیادی خوادابەودەستەکانت بۆلای خوا بەرز بکەوەو دەستی مل کەچی پاڕانەوەت والا بکەوەوداوای لێ خۆش بونوتەندروستیو دروستوسەرکەوتنت لەهەموکێشە وکەندو کۆسپەو گیروگرفتەکانی ژیانی دونیایی وڕۆژی دوایی وڕۆژی هەستانەوەو ژیانی نەبڕاوەیی لێ بکە، بگەڕێوە بۆلای خواوداوای خێرو چاکەوبەرەکەتی لێ بکە،خوای گەورەزۆربەڕەحم وبەزەییە وهەمیشەلێ بوردەیەو لەگوناحەکان خۆش دەبیت، دەریای ڕەحم وبەزەیی خوا هەرگیز لەبن نایەت .

پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {إنَّ ربكُم حَيٌّ كريمٌ يستحي من عبده أن يرفع إليه يديه فيردهما صفراً}صحيح سنن إبن ماجة(٣١١٧)[1] .لەوەلام دانەوەی دوعاونزاکانت لەبەرخوای گەورە بەپەلە مەبەو بێ ئومێدیش مەبەبلێ ی من هەرلەبەر خوا دەپاڕێمەوەو هیچیشم دیارنیەو بلێ ی خوای گەورە دوعاکانم لێ وەرناگرێت .دیارە من شایەنی ئەوەنیمو ساردبییەوەوچیدی نەپاڕێیەوە، نەخێر گرنگ ئەوەیە تۆبەردەوام بیت. دەگوێ بگرە بۆ پێغەمبەری نازدار ﷺ بزانە چی دەفەرموێت: {مامن عبديرفع إليهِ يدَيْهِ حتى يبدو إبطهُ يسألُ اللهَ مسألةً إلاَّ آتاهُ اللهُ إيَّاهُ مالم يعجل .قالوا :يارسول الله، وكيفَ عجلتهُ؟ قالَ : يقُولُ قدسألتُ وسألتُ ولم أعط شيئا}صحيح سنن الترمذي(٢٨٥٣)[2]

---

١) واتە: پەروەردگاری ئێوە،هەمیشەزیندووسەخی وبەبەزەییە شەرم دەکات ئەگەر بەندەیخۆی دەستی لەبەریان بکاتەوەوداوای لێ خۆش بون وهەرشتێکی تری لێ بکات بەبەتالی بیان گێڕێتەوە.

٢) واتە: هەربەندەیەك دەستەکانی لەبەرخوای گەورەپان بکاتەوەوبەرزیان بکاتەوە تابن بالی دەردەکەوێتوداوای شتێك لەخوای گەورە بکات، جانەوشتە داوای لێ خۆش بونەلەگوناحەکانی، داوای ڕێنوماییودەست گیرۆییە، داوای حەل کردنی گیروگرفتوتەنگژەکانی یاهەرشتێکی تربێت خوای گەورە دەی داتێ ووەلامی دەداتەوە بەمەرجێ پەلەنەکات. گوتیان ئەی ڕەسولی خوا پەلەکردنەکەی

هەمیشەبادوعاوپاڕانەوەکانت بە سوپاس وحمدی خواوسەلات وسەلام لەپێغەمبەرﷺومـاڵ وخێزان و سەحابەکان وئەوەی کەشوێنی دەکەوێت تاڕۆژی دوایی دەست پێ بکەوهەربـەم کـارەش کۆتـایی پـێ بێنـەو هەمیشە ڕاستگۆیانە بـەرەوخوا بـچۆولەگەڵ پەروەردگارتـدا ڕاستگۆبە. پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: { أدعوالله و أنتم موقنـون بالإجابـة ، وأعلمـوا أنَّ اللهَ لایستجیب دعاءاً من قلبٍ غافلٍ لاهٍ}صحیح سنن الترمذي(٢٧٦٦) (١) .

ئاگاداربەهەرگیزدوعاونزای خراپ نەکـەیت وداوای پـچڕانی سیلەی ڕەحـم نەکـەیت .وەئەگەر وەڵامدانەوەی دوعاکەت دواکەوت یاخودبەڕونی ئەنجامی دوعاکانـت نـەبینین دڵ تەنگ وبـێ ئومێد مەبـە هـەروەك لەپێـشتریش باسمـان کـرد خـوای گـەورە دوای دەخـات بۆرۆژی قیامەت،یاخودلـەبری ئـەوە گوناحتـت لێ ڕەش دەکاتـەوە، یـاخود خراپەیـەکت لێ لادەدات تۆهەر هەستیشی پێ ناکەیت .

٣٥-خۆت لەخوای خۆت نزیك بکـەرەوە بـە ئەنجامـدانی ئـەرك وبەندایەتیـە فـەرزەکان و سـونەتەکان و جۆرەهـا خۆنزیـك خـستنەوە واتـەجۆرەهاکاری بـاش کەلـەخوات نزیـك دەکەنـەوە، دڵنیابەپاداشـتێکی زۆرگـەورەت چـنگ دەکـەوێت، ولای خواپلـەت پـێ بـەرز

---

چیە ؟فەرموی: کەداوات لێ کردوپەلەت کردواتە ئەنجامیت نەدیت بڵێ ئەوەچی بو خوایە من هـەرداوام کردووهـەرداوام کردکەچـی دوعاکـەم قبـوڵ نـەبولێم وەرنـەگیرا .پەلەمەکـە خـوای گەورەلەئێمـە باشـتر دەزانێـت چ شـتێك خێروچـاکەی تێـدابێت بۆئێمەنـەوەمان بۆدەکـات. لەوانەیـە تۆلەدنیاکـەی تـردا پترپێویستت پێ ی بێت بۆئەوێ بۆت هەڵ دەگرێت.(وەرگێڕ).

١) واتـە: داوا لـەخوای گـەورە بکـەنو لەبەرخواپاڕێنـەوەودڵنیاش بـن خـوای گـەورە وەڵامتـان دەداتـەوەزدەبێ زۆریـەئاگایی و وریاییـەوە لەبـەرخوا بپاڕێنـەوە بـیرو هۆشـتان لای خوابێـت لـەکاتی پاڕانەوەدا،نـەك بـەزمان داوالـەخوای گـەورە بکـەن وبیروهۆشیـشتان لەشـوێنێکی ترویەشـتێکی ترەوەسـەرقاڵ بێـت، چـونکە زۆریـاش بـزانن کـەخوای گـەورە وەلا مـی دوعایـەك ناداتـەوە کـەدڵی خاوەنەکەی لەلایەکی ترەوسەرقاڵ ومەشـغوڵەوهیچ ئاگـای لەخوانـەبێت تـەنیادەمی بجوڵێـت ودەستی بەرز کردبێتەوە واتەبەدڵ وهۆشێکی بێ ئاگاولەبەر خوا بپارێتەوە. (وەرگێڕ).

دەبێتەوە، وا بکە کەلەخۆشەویستانی خوابیت نەك لە ناحەزو دوژمنـانی خـوا . هـەوڵ بـدە زۆر هەوڵ بدە لەو کەسانە بیت هـەر لـە مردنیـەوە تادەچیتە بەهەشتەوە نەترسـت لـە سەرەو نەدڵ تەنگیو نائارامی، ئـەو کەسانەی خـوای گـەورە دوعـاو نزایـان وەردەگرێت، ناڕەحـەتیودڵ تـەنگیو ناخۆشـیو تەنگـژەکانیان نـاهێڵێ، ودڵیـان پـڕ دەکـات لەئارامیودامەزراویوئاسودەیی . پێغەمبەری خـوا ﷺ دەفـەرموێ: {إنَّ الله تعـالى قـال:مـن عادىَ لي وليًا فقد أذنته بالحرب، وماتقرّبَ إليَّ عبدي بشيءٍ أحبَّ إليَ ممًا أفرضـته عليـه، ولايزال عبدي يتقرب إليَ بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببتـهُ كنـتُ سمعـه الـذي يـسمعُ بـه، وبصره الذي يبـصر بـه، ويـدهُ الـتي يـبطشُ بهـا، و رجلـه الـتي يمـشي بهـا، ولـئن سـألني لأعطيتهُ، ولئن إستعاذبي لأعيذنّهُ}رواه البخاري(٦٥٠٢)[1] .

٣٦-ئەگەرخوشکێکی بڕواداروموسڵمانت دیت پابەندە بەدینەکەیەوە،و وەڵامەکانی خوای پەروەردگار دەداتەوە و سەر بەرزوسەرفرازەبەهۆی تەواوی عەقیدەو بیرو باوەڕەکەیـەوە، ئەوە پێی بڵێو ئاگاداری بکەوە کەلەبەر خاتری خوا خۆشت دەوێتوخوشـکایەتی لەگەڵدا ببەسـتە، چـونکە خۆشویـستن لەبـەرخاتری خواپلەوپایـەکی بـەرزی هەیـە، ئەوەتـە

---

١) واتە: هەرکەسێك دوژمنایەتی دۆستـی مـن بکاتوئـازاری بـدات ئـەوامنیش جـاڕی دوژمنایـەتی خـۆم لەگەڵ ئەو کەسەدا دەکـەم. وەهەرکەسـێك لەبەنـدەکانم خـۆم لێ نزیـك بکاتـەوە بەشـتێك بەکاروئـەرکێك کەخۆم لەسەرم فەرز نەکردوە واتە بێجگە لەفەرزەکان کەلەسەرم فەرز کردون بەهەرشـتێکی ترخـۆم لێ نزیك بکاتەوە لام خۆشە ویسترە لەئەنجامـدانی فەرزەکان،چونکەئەمانەئەرکو فـەرزن لەسـەرە هـەر دەبێ ئەنجامیان بدات خۆشی بێتوترشی بێت، بـەڵام ئـەوانی ترلـەپیاوەتی خـۆنی، ئەگـەر بەنـدەکانم بەردەوام بەنجامدانی سوننەتەکان {النوافل}خۆم لێ نزیك بکاتـەوە هـەتا خۆشـم دەوێـت، وەئەگـەرمن کەسێکم خۆشویست دەبمە ئـەو گوێیـەی کـەپێی دەبیـستێ، وەدەبمـە ئـەو چـاوەی کـەپێی دەبینـێ، وەئـەو دەستـەی کـەکاری پـێ دەکـات، وەدەبمەئەوقاچـەی کـەپێی دەڕوات ئەوەنـدەم لاخۆشەویـست دەبێت داوای هەرشتێکم لێ بکات دەیدەمێ، وەئەگەر پەنام لەهەرشتێك پێ بگرێت پەنای دەدەم.

پێغەمبەری خواﷺ فەرمویەتی:{قال الله عزوجل: المتحابون في جلالي لهم منابر من نور، يغبطهم النبيّون والشهداء}صحيح سنن الترمذي (١٩٤٨) .[1]

٣٧ – کات زۆر گرنگە لای خوای گەورە وریا بەبەفیڕۆی نەدەی و جوان نەخشەڕێژی بۆ بکەو بەسەر کارەکانتدا ڕێك دابەشی بکە، هیچی بەبەلاش و بێ سودێ وەرگرتن بەسەر مەبە ، تۆپێویستیت بەسەعی کردن و هەوڵدانە لەوانەکانتدا– ئەگەر خوێنکار بیت– دەبێ ئەرکەکانی ماڵەوەت یاهی مێردەکەت جێ بەجێ بکەیت و پێویستیشت بەئاگادار بون و بەرچاوڕشنی و شارەزا بونی پێداویستیەکانی ژیان و دنیادەبێت. کاتێکیش دابنێیت بۆخوێندنەوەی بابەتە زانیاریە بەسودەکان وهەروەها بڕێکیش بۆ سەردانی خزمەکانت .

٣٨– بەجێ هێنانی سیلەی ڕەحم و سەردانەکانت خێرو بەرەکەت هێنەرن بۆتەمەن و بۆ ڕزق و ڕۆزیت کەواتە سورو بەردەوام بەلەسەردانی خزمەکانت ودۆستەکانت وخوشکانی موسڵمانت، باسەردانەکانت سودبەخش بن بۆیان نەك بە پێچەوانەوە. لەسەرچاکەوچاکەکاری ئامۆژگاریان بکەوهانیان بدە، ولەخراپەو خراپە کاریش بیان ترسێنەودەستیان بگرەو بیان گێڕەوە. پاڵنەرێك بەبۆبەرەو چاکەکاری و چاکسازی و سود بەخشی بۆکەسانی تر، وریایان بکەوە لەزیانبەخشی و ئاژاوە گێڕی وفیتنەبازی. ئامۆژگاریان بکە کەهەمیشە دەست پێشخەر بن لەچاکە کردوهاریکاری وهەماهەنگی لەنێو خەڵکیدا . وەهەمیشە لەتەندروستی وساغ و سەلامەتیان بپرسەو

[1] )واتە): خوای گەورەدەفەرموێ: ئەوکەسانەی لەبەرخاتری من یەکتریان خۆشدەوێت لەڕۆژی مەحشەرقوبەی نوریان پێ دەبەخشم،لەوڕۆژە تاریکستان وشەوەزەنگ وئەنك وستەچاوەدا،ڕۆژێکی ترسناك کەس لەتاریکایداناتوانێت لەجێگەی خۆیداپێ بجوڵێنێ کەچی تۆقوبەی نورت دەبێت و ڕێگای پردی سیڕاتی پێ دەدۆزیەوە ئای لەو خۆشیە، لەگەڵ کۆمەڵی پێغەمبەران و شەهیداندادەبیت وئەوان خۆشیان دەویت (وەرگێڕ)

پێغەمبەرﷺفەرمویەتی:{من أحبَّ أن يُبسِطَ لهُ رِزقهُ وَ يُنسأله في أثرِه فليَصِل رَحِمَهُ}[١].متفق عليه.

٣٩ – زۆری‌وبۆری خوانەناسان‌وسەرپێچی کەرانی فەرمانەکانی خواوسست‌و تەمبەڵان‌و پشت گوێ خەرانی شەریعەتی خوا کارت تێ نەکەن‌وهەڵت نەخەڵەتێنن‌و فریو نەخۆیت‌ونەکەی تۆش چاو لەوان بکەیت، چونکەڕۆژێك دادێت پەنجەی پەشێمانی بگەزیت‌ونەو کاتیش پەشێمانی دادت نادات ولەو کاتەدا سەر شۆڕو کلۆڵ‌وداماودەبیت‌ولەهەمان کات دا بڕوا داران دڵی یان گەلێك خۆشەو سەر بەرزو شادمانن لەڕۆژی قیامەتدا بەهۆی پابەندبونیان بەبەرنامەو شەریعەتی خواوە ڕزگاریان دەبێت. کاتێ دەبینێ ئەوخەڵکە هەمویان چۆن گرفتاری کردەوە خراپەکانی خۆیان بون، ئەو زۆر دڵشادو ئاسودەو بەختەوەر دەبێت هەرلەوکاتەوەی کەنامەی کردەوەکانی وەردەگرێتەوە لەخۆشیان بەدەستی ڕاستی وەری دەگرێت‌ودەڵێ: ﴿فَأَمَّا مَنْ أُوتِىَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَيَقُولُ هَآؤُمُ ٱقْرَءُوا۟ كِتَٰبِيَهْ ﴿١٩﴾ إِنِّى ظَنَنتُ أَنِّى مُلَٰقٍ حِسَابِيَهْ ﴿٢٠﴾﴾ الحاقه :١٩–٢٠.[٢]

٤٠– هەوڵ بدە بۆهەمیشەیی سۆزوبەزەیی لە دڵی خۆتدا بچێنیت، بەزەییت بەگەورەو بچوك دابێتەوە. باوك‌ودایکیشت لە پێش هەمو کەسێکەوە. پێغەمبەرﷺفەرمویەتی: {من

---

١) واتەهەرکەسێك حەزدەکات رزق‌و ڕۆزی زۆربێت‌وشوێنەواری نەبڕێتەوەوتەمەنی پڕ خێروبەرەکەت بێت باسیلەی ڕەحم بەجێ بکەیەنێت.(وەرگێڕ).

٢) واتە:هـا..وەرن تەماشا کەن، بەچاوی خۆتان ببینن. ئەوەنامەی کردەوەکانمە، ئەوە شەهادەکەمە، ئەوە بڕوانامەکەمە، ئاخرمن دەمزانی ئەم ڕۆژەناخۆشە توش دەبم وڕۆژی لێ پێچانەوەم لەپێشە بۆیە لەدنیادا بەگوێ ی خواو پێغەمبەری خوام کردو لەڕێگەی ئەوان لام نەداو بەگوێرەی ڕێبازی قورئان‌و سوننەت ڕۆیشتم بەڕێوە و بەمولێم لانەدا، لەبەرنامەی خوابەولاوەهیچ ڕێچکەیەکی ترم نەگرت، بۆیە منیش لێرە خوای گەورە پاداشتی دامەوەو وپەیمانەکەی خۆی بەجێ هێنا. (وەرگێڕ) .

لا يرحم لايُـرْحَمْ }البخـاري الفـتح (١٠/ح٦٠١٣)[1] . وەلـەأبوهريروة ﷺ دەگێرنـەوە كـەرەسـولی خـواﷺ فەرموویـەتی:{بينما رجـل يمشي بطريقـه إشـتدعليه العطـش، فوجـد بئـراً فنـزل فيهـا فشرب،ثـمَّ خرج فإذا كلبٌ يلهثُ يأكل الثرى من العطشِ، فقال الرجل: لقد بلـغ هـذا الكلـبُ مـن العطشِ مثل الّذي كان بلغ بي، فنزل البئرُ فملأ خِفهُ ثمَّ أمسكهُ بفيهِ فـسقى الكلـبُ فـشكرالله لـهُ فغفرلـهُ قـالوا: يارسـول الله، وإنَّ لنـا في البهـائمَ أجراًبـهِ فقـالَ: وفي كـلِّ ذات كبـدٍ رطبَـةٍ أجـرٌ} البخاري(٦٠٠٩) [2].

وەلەعبدالله كوڕی عمرەوە ﷺ دەگێڕنەوە كە پێغەمبەر ﷺ فەرمويەتی:{عُـذِبت إمـرأةٌ في هِرةٍ حَبَستهاحتى ماتت جوعاً فدخلت فيها النار } البخاري (٢٣٦٥)[3].

٤١- زۆروریای بانگەشەكارانی خراپ و پڕو پاگەندەكارانی پێشكەوتن بـە. ئەوانـەی بـە پیـادەو بەسـواری ولاخ و ئۆتومبیـل وفڕۆكەوبەهـەمو چەشـنە هەوڵێكیانـەوە خـەریكی بڵاوكردنەوەی خراپەوخراپـەكاری و فیتنـە و ئاشـوبن بـۆ مـسوڵمانان بەتایبـەتیش ئێـوەی خوشكان . دەیانەوێ بەناوی پێشكەوتن ومـافی ژنانـەوە فریوتـان بـدەن وتێكتـان بـدەن وسـەرتان لێ بـشێوێنن وهـەڵتان بـدێرن ولەسـەنگەری خۆپـارێزی (الـصون) و سـەربەرزی وداوێـن پاكیتـان بێننـە دەرو ڕوت وقـوتی وسـفورتان بكـەن وبەرەولێـژی خلۆرتـان

---

1) واتە: هەركەسێك بەزەیی و سۆزی نەبێت و بەزەیی بەخەڵك دانیەتەوە ، كەسیش بـەزەیی بەئـەودا نایەتەوە.(وەرگێڕ) .

2) واتە: جارێكیان كابرایەك بەڕێگادا دەڕۆیشت لەبیاباندا وتینوێتی تینی بۆهێنا،توشی بیرەئاوێك بـو چوەوخوارەوەو تێرئاوی خواردەوە.كەهاتەدەرەوە بینی وا سەگێك لەتینوان هانكەهانكیـەتی و قـەپاڵی لەخۆڵ و خڵت وخـاش دەدا،كـابراوتی: بـەخوا ئەوسـەگەش دەردی منیـەتی وتینـوێتی تینـی بۆهێنـاوە وەهەروەكوچۆن تینی بۆمن هێنابوزێۆیە دیسان چوەناوبیرەكەو پێڵاوەكەی پڕكردلەئاوولەبیرەكە هاتەوە دەرو بەدەمی سەگەكەیەوەكردوتێرئاوی كردو خوای گەورەش سوپاسی كردوڵێ ی خۆش بو.(وەرگێڕ)

3) پیرەچـنێك لەسـەربەند كردنـی پـشیلەیەك چـوەناودۆزەخەوە، چـونكەلەژوردا بەنـدی كردبووخواردنیشی نەدایەولیشی نەگەڕا بۆخۆشی بخولێتەوە خۆراكی خۆی پەیدابكات.(وەرگێڕ).

بکەنەوەبۆتێر کردنی ئارەزوە بۆگەنەکانی خۆیان،بۆئەم مەبەستە جۆرەها کارو هەمو چەشنە ڕێگایەکیان خستۆتەگەڕ،ئەی خوشکی پاك وداوێن پاك وبێگەرد و بەڕێزم ، زۆر وریای خۆت ودەستە خوشکە موسڵمانەکانت بەو مەهێڵە بکەونە ناوزەلکاوی ئەو فێڵ بازورێوی ئاسایانەوبە فێڵو تەڵەکەوقسەلوسو بەڕواڵەت شیرینی هەنگویناوی وبەناوەرۆك ژەهراویەکانیان هەڵ نەخەڵەتێن و فریو نەخۆن . دڵنیا بن ئەوانە دڵسۆزو خەمخۆری ئێوەنین ، ئەوانە دڕندەن گورگ ئاسا بۆ نێچیری ناسك دەگەڕێن و وەك ڕاوچیان کەوڵی ئاسكو مامزیان لە سەری خۆکردوە.

٤٢ – ئەی خوشکی بڕوادارم،زۆرتونددەست بە ئاینەکەتەوە بگرە،خۆت بە بیرو باوەڕو یەکتا پەرستیەکەت (العقیدةوالتوحید)بەرزڕابگرە،هەها خوای گەورە چی دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ وَلَا تَحْزَنُوا۟ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ آل عمران:١٣٩)[1].

زۆر زرنگو چالاكوهۆشیاربە لەبڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندنی دروشمە بەرزەکانی ئاینەکەتونەکەی هەرگیز شەرم بکەیتو لەکەس نەترسیت، تەنیا لەخوا بترسە. نەکەی شەرم بکەیت لە ڕاگەیاندنی دروشمەکانی دینەکەتو نەوێری ئەنجامیان بدەیت دەناخوای گەورە لێت دەڕەنجێ لەسەرئەمە سزات دەدات ، بە پێچەوانەش گەر ڕات گەیاندن خوای گەورە پاداشتێکی بێ پایانت دەداتەوە.

٤٣ – ڕۆشنبیری ئیسلامیت بەگوێ گرتن لەمحازەرە ئیسلامیەکانوکۆڕو سیمینارە بەکەڵکەکان وەربگرە بالەڕێگەی کاسێتەکانیشەوە بێت، هەمیشە هەوڵ بدە کەڕۆژنامەوگۆڤارە ئیسلامیە بەکەڵكوسودبەخشەکان سەیر بکەو بخوێنەوە.

٤٤ – هەمیشەپاڵنەروهۆکارێکەبە بۆ بڵاو کردنەوەی خێرو چاکە بڵاو کردنەوەی ڕەوشتو ئاکار وبەها بەرزەکان، هەروەها فاکتەرێك بە بۆ بڵاو کردنەوەی زانست وزانیاری

---

١) واتە:هەرئێوە سەربەرزوسەرفرازن ئەگەر بڕوابەخواوبەبەرنامەکەی خوابێنن وبڕوادارین..(وەرگێڕ).

چ لەناو کۆمەڵگای مسوڵماناندا وچ لەناوماڵ وخێزانی خۆت و چ لە قوتابخانەو چ لەناو دراوسێکان وچ لە ناودۆست ودەستە خوشکان و برایانت دابێت و لەهەرشوێنێك بێت.

٤٥ - هەمیشەسوروبەردەوام بەلەیارمەتی دانی دایکت لەئیش و کارەکانی ماڵەوەدا، چونکە ئەمە کارێکی زۆر باشەو پاداشتێکی زۆرت لای خوای گەورەو کار بەجێ دەست دەکەوێت ولای دایك و باوکیشت خۆشەویست دەبیت، سەرباری ئەمەش مەشق و ڕاهێنانێکە بۆخۆت بەیارمەتی خوا- شارەزایی باش پەیدا دەکەیت و لەژیانی دوارۆژدا سەرکەوتودەبیت واتە لە ژیانی ژن ومێردایەتی وخێزانداریت.

٤٦ – هەمیشەزەردەخەنەت لەسەرلێوان بێت و ڕوخۆش بە، هەرگیز ڕو گرژ مەبە، بڕوا بکە ئەمە هیچی تێ ناچێت ، دیارە لەهەمان کاتیشدا کەتۆ لەگەڵ بەرامبەرەکانت بەم شێوە بویت ئەوانیش لەوەڵامی ڕوخۆشیەکەی تۆ دەدەنەوەو تۆیان خۆش دەوێت ولەگەڵت دا ڕوخۆش و لێو بە زەردەخەنەدەبن، لە هەموی خۆشتریش پاداشتێکی بێ ژمارەت لای خوای بالا دەست و کار بەجێ چنگ دەکەوێت. ئەوەتە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمویەتی:{تبسمك في وجه أخيك لك صدقة}صحيح سنن الترمذي (١٥٩٤)[1].

٤٧ – هەرگیز توڕەو تۆسن وڕوتاڵ مەبە. لە أبو هريرەوە ﷺ دەگێڕنەوە کەپیاوێك بەپێغەمبەری ﷺ گوت: ئامۆژگاریم بکە، فەرموی:{لاتغضب} واتە تۆڕەمەبە. کابرا چەند جاری ئەمە دوبارەکردوە ئەویش لەوەڵامدا هەرپێ ی دەفەرمو: {لاتغضب) واتە: توڕە مەبە.البخاري (٦١١٦). ئەی خوشکی موسڵمانم باش بزانە کە توڕە بون لەشەیتانەوە

---

١) واتە: زەردەخەنەی لەسەرلێوی تۆ بۆ خوشك وبرایانت خێروسەدەقەیە بۆتۆ لەڕۆژی زیندوبونەوەدا(وەرگێڕ)

بەئەوەتە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی:{إنَّ الغضب من الشيطان وإنَّ الشيطان خلق من النار، وإنَّماتطفأُ النَّارُ بالماء، فإذا غضب أحدكم فَليتوضأ}رواه أحمد (٤/٢٢٦)(١).

٤٨ – خوشكی برِوادارم زۆروریابە هەرگیزاو هەرگیز لاسایی بێ باوەڕولادەران مەكەوە لەهەڵس‌و كەوت‌وڕەوشت و شێوەو رێگاكانی خواردن‌و خواردنەوەو پۆشاك پۆشین...تد.خۆت بەئەوان مەچوێنە ئەوەتە پێغەمبەر ﷺ فەرمویەتی:{من تشبه بقومٍ فهو منهم}رواه أبو داود(٤٠٣١)[٢].

٤٩ – زۆرلەژنان لەنوێژكردن دا سست و تەمبەڵن، هەمیشە وایە بەدوای دەخاتو لەكاتی خۆی دا نایان كەن. بەتایبەتیش كەسەرقاڵی ئیش‌و كارەكانیان بن یاخودسەرقاڵی قسەكردن وگفت وگۆی بێ سودو قسەی بۆش وبێ كەڵك بن لەگەڵ ژنانی تردا بەتایبەتیش لەبەردەرگاكانیان‌و لەگەڵ خەڵكی بە تایبەتیش لەكاتی داوەت‌و داوەتكاری‌و سەردانی خزم‌و دۆست ودەرودراوسێكاندا. پەنا بەخوا دەگرم لەشەیتان كەلەو پۆلە ژنانە نەبن، دەتۆتۆزێك سەیری ئەم فەرمودەیەی خوا بكەو تۆزێك تێ ی ڕابمێنەبزانە چیت پێ دەڵێ: ﴿فَوَيْلٌ لِّلْمُصَلِّينَ ۝٤ الَّذِينَ هُمْ عَن صَلَاتِهِمْ سَاهُونَ ۝٥﴾ الماعون:٤– ٥ [٣]. واتای زاراوەی (ساهون) كەمتەرخەمی‌و پشت گوێ خستن‌و دواخستنی نوێژەكانیانە تاكوكاتی شەرعی خۆی بەسەردەچێت بە تایبەتیش نوێژی عەسران .

---

١) واتە:توڕەبون لەشەیتانەوەیە،شەیتانیش لەئاگردروست كراوە ، ئاگریش بە ئاو دەكوژێتەوە، جا هەریەكێك لە ئێوەكەتوڕەبو با بچێ دەست نوێژهەڵ بگرێت توڕەییەكەی دەنیشێتەوە.(وەرگێڕ).

٢) واتە:هەركەسێك خۆی بەهەركەس وگەل وكۆمەڵ وقەومێك بچوێنێت ئەوەلەوانەولەكۆمەڵی مسوڵمانان نیە.

٣) واتە:هاواروڕۆڕۆبۆ ئەوكەسانەی كە لە نوێژە كانیا ندا كە متە رخەمن ،یا شیوی وە یل كە شیوێكە لە شیوەكانی دۆزەخ هەروەكو ڕاڤەكارانی قورئان دەفەرمون بۆئەوكەسانەی لەنوێژەكانیان كەمتەرخەمن.وەرگێڕ).

٥٠ – ڕۆژو پلەیەکی بەرزی هەیە لای خوای گەورەو پاداشتێکی زۆریشی هەیە، وسەرباری ئەوەی کەڕۆڵێکی گرنگی هەیە لەپاك کردنەوەی نەفسو خاوێن کردنەوەی و بژدان. ئای چەندخۆش دەبونەفسی خۆت لەسەرڕۆژوگرتن ڕابهێنا بایە، دیارە مەبەستمان لەڕۆژوی سونەتە (التطوع) واتە ڕۆژوی خۆبەخشی وەك ڕۆژوی شەشەڵان لەمانگی شەوالی دوای ڕەمەزانو سێ ڕۆژ لەهەمو مانگێك دا[1].

وآخر دعوانا أن الحمدلله رب العالمين والصلاة والسلام على محمد وعلى آله وصحبه وسلم تسليماً ومن والاه إلى يوم الدين.

**احمد محمد ممند**

**١٤٢٨هـ – ٢٠٠٧**

---

١) سێ ڕۆژلەهەمومانگێك دا بریتین لە سێ ڕۆژە سپی یەکان(الأيام البيض)کەدەکاتەڕۆژی(١٣،١٤،١٥)لەهەمو مانگێك دا کەمانگ تێ یاندا پڕە. هەروەها بەڕۆژوبونی ڕۆژانی دوشەممەو پێنج شەمەان لەهەمو هەفتەیەکدا سونەتێکی دڵنیای پێغەمبەرە ﷺ واتە: پێغەمبەرﷺ بەردەوام ئەودوڕۆژانە لەهەفتەدا بەڕۆژوبوە بۆیەئێمەش کەخۆمان بەموسڵمان وشوێن کەوتەی ئەو بزانین دەبێ ئەودوڕۆژانە بەڕۆژوبین .لێمان تێکەڵ نەبێت ئەمە سونەتە نەك فەرز .هەردەبێ بیگریت .نەخێر بەڵام کەهەرکەسێك ئەم سونەتە زیندوبکاتەوە پاداشتێکی بێ پایانی هەیە ودەبێتە خۆشەویستی خواوپێغەمبەرو لەڕۆژی دوایی دا لەمەجلسی پێغەمبەرەوە نزیك دەبێت لەخۆشەویستانی ئەو دەژمێردرێت.

هەروەها بەڕۆژوبونی ڕۆژی(٩،١٠)عاشورا ونۆڕۆژ ی یەکەمی مانگی ذی الحجة سونەتە وپاداشتێکی زۆری هەیەلای خوای گەورە (وەرگێڕ).

## لە بەرهەمەکانی نووسەر

- پاراستنی تەنها خواپەرستی/إبن باز.
- دە(١٠) نامە بۆ حاجیانو عومرەکاران/د.یحیی بن إبراهیم.
- ڕێبەری حاجیو عومرەکاران دەستەی هۆشیارکردنەوەی لە حەج.
- پۆشاکی ئیسلامی مایەی خۆش بەختی تاکو کۆمەڵە.
- هەڵە باوەکان.
- بیروباوەڕی تەنها خواپەرستی/شیخ صالح فوزان.

## ئەم بەرهەمانەش لەژێر چاپدان:

- تیرۆرو تۆقاندن.
- زانستی کتێبخانەکانو زانیاریەکان.
- حوکمی ڕیش تاشین.

# ناوەرۆك

## ئافرەتی موسلمان و ئەرکی سەرشانی لە رۆژگاری ئەمرۆی هاوچەرخ دا



## بانگەوازێك بۆ براو خوشکانی پەرومردیار

## چەند نزاو پاڕانەوەیەك لە قورئانی پیرۆزدا

**بابەت** **لاپەڕە**

## چەند وشەیەکی زێڕین بۆ خوشکی موسڵمانی هاوچەرخ



## پەنجا گوڵ لە باخچەی ئامۆژگاریەکاندا

